

۱۳

# دەوڵەتی خیلافەت

بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانیەت

وەڵامێك بۆ كتێبی (كۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)

نووسینی

ئیکرام کەریم

# دەوڵەتی خیلافەت

## بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانیەت

وەڵامێك بۆ كتێبی (كۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا)

نووسینی

ئیکرام کەریم

٢٠٠٧ زایینی

١٤٢٨ كۆچی

**ناوی کتێب:** دەوڵەتی خیلافەت بوژاندنەوەی کۆمەڵگەو گەشەسەندنی شارستانیەت، وەڵامێك بۆ کتێبی کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا.

**نووسینی:** ئیکرام کەریم

**ژمارەی سپاردن:** (٣١٦) ساڵی (٢٠٠٧) بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان.

**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر

**نۆرەی چاپ:** یەکەم

**ساڵی چاپ:** ٢٠٠٧

**تیراژ:** ١٥٠٠

**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە ( ١٣)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت:** **www.tishkbooks.com**

**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com



**بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ**

**"أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ هَذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ فَهُم مُّعْرِضُونَ"(الأنبياء: ٢٤).**

**یان بێجگە لە خوا بە چەندان خوای ترەوە هۆگر ئەبن، بڵێ: بێنن بزانم بەڵگەتان کامەیە، ئەم قورئانە بەڵگەی هەموو ئەوانەیە لەگەڵ مندانو بەڵگەی پێش منیش هەیە (کە ئێوە بە هەڵەدا چوون لەوەدا کە هۆگری خوای تریش ئەبن) بەڵام زۆربەی خەڵك حەق ناناسێتو هەر لەبەرئەوەیە دژایەتی ئەکات.**

## پێشەکی

کتێبی "کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا" کە بە زمانێکی پاراوی کوردی نووسراوە، یەکپارچە هێرشە لەسەر ئیسلامو مێژووی ئیسلامیی و زۆرێك لە بەها باڵاکانی ئیسلام.

نووسەر ڕاستە لە سەرچاوەوە زۆرێك لە شتەکانی گواستوەتەوە، بەڵام بێویژدانی زۆریشی بە خەرج داوەو ئەیتوانی هەستی موسڵمانانی کوردیشی ڕابگرتایەو ئەو گومانانەش کە هەیەتی بەشێوەیەکی لۆژیکانە بیوتایەو تەزویرکاری تێدا نەکردایەو بۆ سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئیسلام بگەڕایەتەوە..

منیش کە ئەمەم بینی بڕیارمدا وەڵامێك ئامادە بکەم بۆ ئەو کتێبەو بەرنامەی لێکۆڵینەوەکەشم بەم شێوەیەی خوارەوەیە.

سەرەتا (دە) تێبینی گشتی لەسەر کتێبەکەو پلەی زانستی کتێبەکەو ڕادەی دەستپاکی نووسەر ئەخەمە بەردەستی خوێنەران. پاشان بەش بەش لەگەڵ نووسەردا ئەڕۆین و بڕگە بڕگەی نووسینەکانی شیتەڵ ئەکەینەوە و ئەوە دەردەخەین کە لە ڕاستیدا نووسەر لە هەندێ شوێندا دەستپاکنەبووە لە گواستنەوەی زانیارییەکانداو لە زۆربەی شوێندا بێویژدان بووەو لە هەموو کتێبەکەدا وەك "ناحەز" لەسەر دین و قورئان و سەحابەو خەلیفەکان و مێژووی ئیسلامیی نوسیوویەتی!

لە کۆتاییدا، ئەنجامی ئەم گەشتەمان لەگەڵ نووسەرو کتێبی گۆمەڵگادا لە چەند خاڵێکدا کۆکردۆتەوەو فوئاد مەجید میسریی و هاوڕاو هاومەبەستەکانیمان بانگ کردوەو بۆ ئەوەی بە "عەقڵ" نەك بە سۆز مامەڵە بکەین لەگەڵ زۆر مەسەلەی چارەنوسساز کە ناکرێ بیری لێنەکرێتەوەو پشتگوێ بخرێت.

ئەم نووسینە ئەوەندەی هەوڵدراوە چەمەکەکان ڕاست بکاتەوەو بە پێوەرە ئیسلامییەکان زانیارییەکان بکێشێ، ئەوەندە هەوڵ بۆ ئەوە نەدراوە ڕادەی ڕاستیی و ناڕاستی گواستراوەکان دەربخرێ، چونکە بە بڕوای من بەس نییە نووسەرێك گومانێك دروست بکات و ئێمەش بیسەلمێنین کە ئەو زانیارییە بە ئەمانەتەوە نەگوازراوەتەوەو تەزویری تێدا کراوە، بەڵکو ئەبێت وەڵامی تەواوی ئیسلام بۆ ئەو گومانە ڕۆشن بکرێتەوەو بەڵگە بۆ پووچی ئەو زانیاریی و گومانە بهێنرێتەوە، ئیتر ئەو کاتە وەك خوای گەورە دەفەرموێ: "لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَن بَيِّنَةٍ وَيَحْيَى مَنْ حَيَّ عَن بَيِّنَةٍ". (٤٢/٨) ئەوەی بێدینی هەڵدەبژێرێ و خۆی ئەفەوتێنێ با لە ڕووی بەڵگەوە بێت و ئەوەشی باوەڕو ئیمان هەڵدەبژێرێ و خۆی زیندوو ئەکاتەوە با هەر لە ڕووی بەڵگەوە بێت..

بڕواشم وایە ئەم نووسینە بێ کەموکوڕیی نییەو هیوادارم هەرکەس ئەم نووسینەی ئەکەوێتە بەردەست دوعایەکی خێرم بۆ بکات و هەڵەکانیشم بە دیاری بۆ بنرێتەوە، تا لە چاپەکانی دواییدا ئەویش بەشداری خێری چاککردنەوەیان بێت.

**ئیکرام کەریم**

**هەڵەبجە**

**٢٠٠٧/٢/١٠**

## تێڕوانینێکی گشتی بۆ کتێبی "کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا"

ماوەیەك کە کتێبی "کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا"ی "فوئاد مەجید میسری"م لابوو، کە سەرەتا بە ناوی (عەباس عەبدولکەریم) ناوێکەو بلاوی کردەوە، بەلام حەوسەڵەی وەلامدانەوەیم نەبوو لەبەرئەوەی لە لایەك کتێبەکە زۆر بلاو نەبوو، لەلایەکیش سەرقاڵی خوێندن و لێکۆڵینەوەی تر بووم، بەلام لەو ماوەیەی پێشوودا بە هاندانی چەند برایەکی تری نووسەر دەستم دایە ئەم وەلامانەو هیوادارم لەلایەك دڵی ئەو براو نووسەرانەم خۆش کردبێت و لەلایەکیش ئەرکێکم ئەنجام دابێت کە ویژدان و دینم لەسەری داناوم.

بەڵگە نەویستە کە نووسین لە هەموو سەردەم و زەمانێکدا یەکێك بووە لە ئامرازە کاریگەرەکان بۆ چاککردن یان خراپ کردنی بیرو بیرکردنەوەی خەڵکی، ڕاو ڕای بەرانبەریش لە هەموو سەردەمێکدا هەر هەبووەوە ئەو دوو ڕایە لە هەڵکشان و داکشاندا بوون و کەی هەوادارو نووسەرانی ڕایەکی دیاری کراو لە برەوو گەشەدا بووبن، ئەو ڕایە سەنتەرو کاریگەریی بۆ دروست بووەو ئەویتری کردووە بە ژێر لێوەوە..

ئەوەی من لەم سەرەتایەدا ئەمەوێ بیڵێم، ئەم چەند سەرنجە گشتییەیەو پاشان لەهەر بەشەدا سەرنجی تەواو ئەدەم (ئەگەر خوا بیەوێت).

یەك: نووسەر هەر لە ناونیشانی کتێبەکەیدا کەوتووەتە هەڵەیەکی زمانەوانی زەقەوە، ئەڵێت: "خەلافەت"! کە لە زمانی عەرەبیدا ووشەی (خەلافەت) یانی (حەماقەت و گێلی) نەك "نیيابەت و ئیمارەت"، بەلام "خیلافەت" یانی "ئیمارەت و نوێنەرایەتی کردنی خەڵك و ڕابەرایەتی کردنیان، کە دیارە مەبەستی نووسەر ئەمەیانە نەك ئەویتر یان". لە زمانی عەرەبیدا ئەوترێت: "خلف يخلف، خلافة: الأمارة، = النيابة عن الغير، الأمامة، بەلام بۆ خەلافەتەکەی فوئاد مەجید میسری، ئەوترێ: خلِف يخلف خَلافة و خلوفا الغلام، حمق".[1]

بەو پێیە، ئەبێ ناونیشانی کتێبەکە "کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خیلافەتدا" بێت، نەك لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا.

بڕواشم وایە ووشەی "کۆمەڵگە" ووردرو ڕەواتر بێت لە ووشەی "کۆمەڵگا"، هەرچەند وەك زمانەوانی ئەو "گە"یەش هەر زیادەیەو ووشەی (کۆمەڵ) خۆی مانای "کۆمەڵگە"شی تێدایە[2] و بەسە بوترێت: کۆمەڵ لە سایەی دەوڵەتی خیلافەتدا. سەرەتاوە تا کۆتایی ئەو نووسینەی فوئاد مەجید میسری هەست ئەکەم بەوەی نووسەر ئەیەوێت بە بڕیاری پێشوەخت مامەڵە لەگەڵ شتەکاندا بکات، چ وەك تەفسیر کردن و چ وەك حوکمدان بەسەریاندا.

فوئاد مەجید میسری خۆی ئەیەوێت (یان کتێبە بنەڕەتییەکەی بەردەستی وای هێناوە) تەفسیرێکی ماددی بۆ مێژوو بکات، واتە بە زۆرو زۆرکاری ئەیەوێت بیسەلمێنێت کە "مێژوو بێجگە لە ململانێی چینایەتی شتێکی تر نییە"[3].

تەفسیری ماددیش واتە "توخمی بنەڕەت و پاڵنەر لە ئاکاری مرۆڤدا بە درێژایی مێژوو بریتیە لە بەرژەوەندی ئابووری"[4] بە مانایەکی ڕوونتر بیڵێین یانی هەمیشە خەڵکی پارەو پوول پاڵی پێوە ئەنێت قسە بکات، بنوسێت، بجوڵێت و هەوڵ بدات.

لەکاتێکدا ئەوە تەنیا ڕایەکەو ئەگەر بۆ کەسێك یان کۆمەڵگەیەك ڕاست دەرچێت، ناکرێ ئەو ڕایە وەك لاستیك ڕابکێشرێتو تەواوی مرۆڤەکانو کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی پێی دا بپۆشرێ.

نووسەر ئەڵێت: "باوەڕ کە شێوەیەکە لە شێوەکانی هۆشیاری کۆمەلایەتی دیاردەیەکی مێژووییە".[5] لە هەمان لاپەڕەداو هەر دەربارەی باوەڕ دەڵێ: "وێنەیەکی هێزەکانی سەر زەمینەو لە زەینیدا چووەتە شێوەی هێزێکی ژور

---

[1] ـ المنجد في اللغة. ماددەی "خلف". دار المشرق المطبعة الكاثوليكية، بيروت ١٩٧٣ ط٢١.

[2] ـ شایەنی باسە فوئاد مەجید میسری خۆی لە چەند شوێنی کتێبەکەیدا ووشەی "کۆمەڵ"ی بۆ کۆمەڵگەو "مجتمع" بەکارهێناوە، سەیری "کۆمەڵگا: ل٤و ل٩٥" بکە.

[3] ـ کۆمەڵگا: (ل٣، ل١٤٤).

[4] ـ الموسوعة السياسية. د. عبدالوهاب الكيالي وكامل زهيري، .ص٤٧٤، پیتی (میم) ووشەی (المادية التأريخية).

[5] کۆمەڵگا ل٣.

زەمینەوە"[٦]. دەربارەی "دین"یش ئەڵی: نە بۆ جێبەجێکردنی خواستو ئامانجی تاکە کەس هاتۆتە دنیاوە، نە بەرهەمی فیکری دەستەو تاقمێکیشە ویستبێتیان بیرو رایەکی تایبەتی لە ناو کۆمەڵدا بالاّ دەست بکەن"[٧].

دەربارەی "موڵکیەتی تاکە کەسیش" ئەڵێت: "هەموو ئەو بەرنامە ئابوریانەی موجتەهیدان دایان دەرێژن! و پێیان وایە بەشێکی سەربەخۆن، لە جەوهەریاندا داکۆکی لە خاوەنداریێتی تاکە کەس دەکەن کە کرۆکی ئابوریی سەرمایەدارییە"[٨].

لە لاپەرە (١٣)شدا دەربارەی "ڕەوشت" ئەڵێت: "پەیوەندی کۆمەڵایەتی هۆی ڕاستەقینەی هەر چەشنە ڕەوشتێکی کۆمەڵایەتییە، نەك بە پێچەوانەوە"[٩].

دەربارەی (خیلافەتی ئیسلامی)یش بە گشتی دەڵێت: "دەوڵەتی خەلافەت (مەبەست خیلافەتە) کە نوێنەری ئایینی ئاسمانییەو بە پێی ئیجتیهادی زانایانی ئیسلام، شەریعەت مافی حوکمڕانی داوەتێ، مافی ئەوەشی هەیە کۆنترۆڵی مێشکی خەڵکی بکا.. سنوور بۆ بیرکردنەوەیان دابنێ! زانستو زانیارییەك دەسەلمێنێ لەگەڵ بنەماکانی ئاین بگونجێن! خەڵکی بە ڕۆشنبیرییەك پەروەردە دەکا لە خزمەت ئایدۆلۆژیاو سیستەمە فیکرییەکەیدا بێ، ئەو زانستو زانیارییانەی دەوڵەتی خەلافەت پەسەندیان دەکا دەبێ لەگەڵ دەقەکانی شەریعەت ناکۆك نەبن! زانستو زانیارییەك پەیڕەو دەکاو ماوەی بلاّوکردنەوەی بۆ دەرەخسێنێ، کەلێن نەخاتە سیستەمە فیکرییەکەیەوە"[١٠]. لە کاتێکدا ئەوەی ئەو ئەیەوێتو ئەیلێت "تەفسیری ماددی مارکسییە" کە جۆرێکە لە تەفسیر بۆ بوون بە گشتی چ دونیای ماددیی بێت یان دونیای مەعنەویی بێت، بەلاّم تەفسیری تریش هەن، لەو تەفسیرە ماددیەی ئەو جوانترو زانسیتی ترو واقیعی ترن.

مێژوو ئەکرێ بە "پاڵنەرە ئابوورییەکان" دروست ببێت، ئەشکرێ بە "پاڵنەرە ئایینییەکان" بێتو ئەشکرێ "پاڵنەرەکان" شتی دیکە بن.

تەفسیری زانایان بۆ دروستبوونی "ئاینەکان" بە هەمیشەیی دوو جۆرە:

جۆری یەکەمیان: ئەوەیە، گوایە ئایین دەستکردی مرۆڤەو ترسو بیمی لە نەخۆشکەوتنو هەژاریو تیاچوونو بێهێزی لە بەرامبەر باری ژیاندا وای کردبێت مرۆڤ بە شوێن فریادڕەسێکدا گەڕابێت کە بەهێزو دەوڵەمەندو خاوەن توانا بووبێت، بۆ ئەوەی یارمەتی بداتو بێت بەدەمیەوەو لەو نەخۆشی یان هەژاری یان پێگیرانو تیاچوونە ڕزگاری بکات.

جۆری دووهەمیان: ئەوەیە، ئاین ئاسمانییەو سەرەتا لە خواوە هاتووەو پاشان بە تێپەڕبوونی کات، بەرەی یەکەمی ئەهلی ئەو ئاینانە نەماونو بەرەی دوای ئەوان دەستکارییان کردووە لەبەر "کەم دینییان" یان لەبەر "نەزانینیان"و پاشان پێویست بووە ئاینێکی تری ئاسمانی بێتو بە پێی پێگەیشتنی مرۆڤایەتی ڕێنمایی تازەی لە لایەن خواوە بە ڕێگەی پێغەمبەران هێناوە بۆ مرۆڤەکان.

بۆیە لە هەموو ئەو کتێبانەدا کە باس لە "مێژووی ئاینەکان" ئەکات، ئایین ئەکات بە دوو بەش: ئاینە ئاسمانییەکان، ئاینە داهێنراوەکان، ئایینی ئاسمانی واتە: ئەو ئاینەی ڕیشەی لە پەروەردگارەوە هاتبێتو ئاینی داهێنراویش واتە ئەو ئاینەی ڕیشەی لە خەڵكو زەوییەوە هاتبێتو دەستکردی خەڵك خۆی بێت.

ئیتر نازانم فوئاد مەجید بۆ ئەیەوێت ئەو تەفسیرەی خۆی (یان هی ناو کتێبەکەی بەردەستی) بسەپێنێت بە سەر خەڵكو خوێنەرانیدا.

من وەلاّمی ئەمانەو جگە لەمانە لە شوێنەکانی خۆیاندا ئەدەمەوەو ئەوەندەی پێی بزانم ڕاستو ناڕاستی ئەو ڕایانە دەرئەخەم، بۆیە لێرەدا تەنیا سەرنجە گشتییەکان باس دەکەم.

---

[٦] کۆمەڵگا: ل٣.

[٧] کۆمەڵگا ل٤.

[٨] کۆمەڵگا ل٥.

[٩] کۆمەڵگا ل١٣.

[١٠] کۆمەڵگا ل١٤٢.

سێ: نووسەر لەو نووسینەیدا "بێویژدانییەکی زۆر"ی بەخەرجداوە لە زۆربەی زۆری کتێبەکەیدا، کە ئەوەش بۆ نووسەرێك ڕێز لە خۆی و قەڵەمەکەی بگرێت، کارێکی ناجوان و ناشایستەیە.

ـ زۆر سەیرە نووسەر هیچ شتێکی ئیسلام سەرنجی ڕانەکێشاوەو بە هیچ شوێنێکی ئیسلام "موعجەب" نەبووە! بەڵکو ئیسلامی لە "ئەلفەوە" بۆ "یا" پێ نامەقبوڵ و ناجوانە!

ئەوەتا ئەڵێ: ".. ئایینی ئیسلام بە هەمان شێوەی ئایینی عیسایی، هەژاریی و دەوڵەمەندیی بەکاری خودایی دەزانێ و پێی وایە کاری خوا کردە، لە ویست و ئیرادەی ئادەمیزاد بە دەرە، قابیلی گۆڕان و دەستکاری کردن نییەو خاوەن باوەڕی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە ئازار بچێژێ و برسێتی و نەبوونی بنۆشێ، تا لەو دونیا بە ژیانێکی خۆش پاداشت بدرێتەوە"[11].

هەر لە هەمان لاپەڕەدا ئەڵێ: "ناوەڕۆکی ئەم بیروڕایە خەڵکی لە جەرگەی خەبات دژی چەوساندنەوە دوور دەخاتەوەو فێری قایلبوون و ملکەچبوونیان دەکا"[12].

ـ نووسەر دەربارەی قورئانیش هەر هەمان بێویژدانی بە خەرج ئەدات لەگەڵ (ڕازی) ناوێکدا بە دڵخۆشییەکەوە ئەڵێت: "ڕازی بە توندی ڕەخنە لە بابەتەکانی ناو قورئان دەگرێ و پێی وایە:

یەکەم: پڕیەتی لە ئەفسانەی کۆن.

دووەم: بابەتەکانی زۆربەیان ناکۆك و دژ بە یەکن.

سێهەم: هیچ شتێکی بە کەڵکیان تیا نییە"[13].

جا نازانم لە ڕاستیدا نووسەری کۆمەڵگا هەر لە دڵەوە باوەڕی وایە "قورئان هیچ شتێکی بە کەڵکی تیا نییە! و زۆربەیان ناکۆك و دژ بەیەکن! و پڕیشیەتی لە ئەفسانەی کۆن! یان چی بکات (کتێبەکەی) ئەڵێ: وابڵێ؟؟!

لەلاپەڕە (٩٢)دا ئەڵێت: "قورئان هیچ ڕێوشوێنێکی بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی دەوڵەتدا دانەناوە.. تاقە ئایەتێك لە قورئاندا نییە باسی دەوڵەت و شێوەی پێکهێنانی دەوڵەت بکا. پێغەمبەر بۆ خۆشی تا لە ژیاندا بوو هیچ هەوڵێکی نەداوە دەوڵەتی ئیسلام دابمەزرێنێ"[14].

جا خوینەری بەڕێز ئایا لە ڕاستی دا ئەمە نەزانی و بێویژدانی نییە؟ ئەبوو نووسەر هەر بۆ ئەوەی خەڵکی بە بێویژدانی نەزانن هیچ نەبوایە پەراوێزێکی بنووسیایەو ئەوەی تێدا ڕەت بکردایەتەوە.

ـ نووسەر بە هەمان شێوە هەموو مێژووی ئیسلامیی چز ئەکات و هیچ شتێك لەو مێژووە دوورو درێژە سەرنجی ڕاناکێشێت و بڵێ: ئەشهەدو لە فلانە شتدا مێژوویی ئیسلامیی خاوەنی سەروەرییە. نە بیروباوەڕی ئەو خەڵکانەی قەبوڵە کە مێژووەکەیان دروستکردووە، نە شارستانییەتەکەیان و نە هەڵکەوتوانی ئەو مێژووەش.

ـ نووسەر ئەو هەموو پێشکەوتنە شارستانیەتەی مێژووی ئیسلامیی نەدیوە، یان دیویەتی، بەڵام ویژدانی بە خەرج نەداوەو بۆ خوا، یان بۆ ڕێزی خۆی، دان بە یەکێکیاندا بنێت.

ـ ئەو هەموو پیاوە بەرزو گەورانەی نەدیوە لە مێژوودا، کە هەر کەسەی لە مەیدانێکی (مەعریفە)دا، باڵەخانەیەکی دیارو بەرچاوی هەڵساندووەتەوە.

ـ پیاوانی یاساناس و شەرعزانی وەك: "ئەبوحەنیفەو شافیعی و ئەحمەدی کوری حەنبەل و ئیبن تەیمیەو ئیبن خەلدوون.. هتد".

ـ پیاوانی مێژوونووسی وەك: "تەبەری و ئیبن کەسیرو ئیبن ئەسیرو ئیبن هیشام و ئیبن ئیسحاق ..هتد".

ـ پیاوانی چاکەخوازیی وەك: "جونەیدو عەبدولقادری گەیلانی و حارسی موحاسبی و حەسەنی بەسری و.. هتد".

ـ پیاوانی بیرمەندی وەك: "غەزالی و ئەشعەری و ئامێدی و ..هتد".

---

[11] کۆمەڵگا، ل١١٥.

[12] کۆمەڵگا ، ل١١٥.

[13] کۆمەڵگا ل٢٦٤.

[14] کۆمەڵگا ل٩٢.

ـ ئەو هەموو شەفافیەتەی لە دەوڵەتی خیلافەتدا پیادە کراوە، کە خۆی لە کتێبەکەیدا درێژەی داهاتی هەموو هەرێمە ئیسلامییەکانی تۆمارکردووە، نەك ئەوە بەڵکو درێژەی داهاتی ساڵانەی خەلیفەو ژنی خەلیفەو کوڕو کوڕەزاو ئەوانەشی بە خوێی چێشت پێی گەیشتوون ئەزانێتو ئەشزانێت سەرچاوەکانیشی چی بوون!

دەی کوڕم ئەویٚ لەم سەردەمەدا داهاتی نەك حکومەتو نەك بەرپرسە گەورەکان بزانێت، بەڵکو داهاتی دەزگایەکی بچوکی حکومەتو بەرپرسێکی بچوکیش بزانێت، یان سەرچاوەکانی بزانێت، یان بزانێت چۆنی دەست دەکەوێتو چۆنی ئەخوات؟ یان ئەوە دەربخات ئەوە چۆن ئەو زاتە لەم خواری خوارەوە وا بەو پەلەیە پێیگەیی و فڕی؟!

ـ ئەو هەموو ئاوەدانی دروستکردنەی نەدیوە، چ لە ڕووی خزمەتگوزاریو چ لە ڕووی ئاوەدانییەوە. دروستکردنی شاری گەورە گەورەی وەك "بەغداد"و "سامەڕا"و "واسط"و .. هتد.

ـ دروستکردنی بەنداوو کارێزو ڕوباری گەورە گەورە، بۆ ئەوەی زەویو زاری ووشکی پیٚ زیندوو بکرێتەوەو کە خۆت ئەڵێی: "خالد ئەلقیسری کە لە سەردەمی هیشامدا والی عێراق بووە، لە ماوەی پانزە ساڵدا چەند ڕوباری وەك (الجامع)ی نزیکی کوفەو (المبارك)ی لای (واسط)و ڕوباری (الخالد)و (بارمانا)و (الصلح)ی هەڵکەندو زەویو زارێکی زۆریشی لە دەوروبەری ئەو ڕوبارانە بۆ خۆی چاککرد کە دەرامەتی ساڵانەیان سیازدە ملیۆن درهەم بووە، هەندێکیش دەڵێن: بیست ملیۆن"[15].

ـ دروستکردنی ئەو هەموو هەرێمەو گرێدانیان بە یەکەوەو ئیدارەدانیان بەو کەرەسەو ئامێرە سەرەتاییانەی لەو سەردەمەدا بوون!

ئەم چاو نوقاندنەی فوئاد مەجید میسری لە سەروەرییەکانی مێژووی ئیسلامی کە ئێمە لە شوێنی خۆیدا ووردتر باسی دەکەین، شورەییەکە خۆیی پێی عەیبدار ئەکات، چونکە تەنانەت بە ویژدانەکانی ئەوروپا لەگەڵ ئەو خەلفیەتەش کە "هێرشە داگیرکارییەکانی خاچپەرستی" بۆی دروست کردوون، هەر بە ویژدانەوە سەیری ئەو مێژووە ئەکەنو چاو لە خاڵە گەشەکانی نانوقێنن وەك ئەم.

ڕاستەو نکولی لەوە ناکرێت مێژووی ئیسلامیش وەك مێژووی هەموو میللەتێکی تر خاڵی ڕەشی تێدایە، بەڵام بێویژدانییە تەنها تیشك بخرێتە سەر ئەو خاڵانەو خاڵە گەشەکانی بکرێت بەژێر لێوەوە..

ـ نەك ئەوانە، بەڵکو نووسەر تەنانەت "خوا"شی قەبووڵ نییەو چی شتی خراپو نالەبار هەیە، شێتێك یان لادەرێك لە مێژوودا بەدەمیا هاتبێت، ئەم هاتووەو خستویەتییە قاڵبێکی جوانەوەو بە ڕیز داینەاون!

ـ ڕاڤەی قسەیەکی حەللاج ئەکاتو ئەترسێت خەڵك بە باش لێی تێبگەن بۆیە "پاشکۆی" بۆ ئەکاتو تەفسیری خۆی ئەخاتە سەر قسەکە .."حەللاج" ئەڵیٚ: "ئامۆژگاری من بۆ تۆ ئەوەیە: نەهیواو ئاواتت بە لوتفی خوا هەبیٚو نە لێشی نائومێد ببە .. ئارەزووی خۆشەویستی مەکەو بەوەش قایل مەبە کە خۆشت نەویٚ .. نە قسە لە بوونی بکەو نە لە نەبوونی .. ورپای یەگانەیی بە"[16].

بەڵام نووسەر خێرا فریا دەکەوێتو بە ناوی "حەللاج"ەوە ئەڵێت: ".. داوا لە ئادەمیزاد دەکا لە بریتی پەنا بردنە بەر هێزێکی میتافیزیکی، پشت بە هێزی واقعی ببەستێت، کە ئادەمیزاد خۆیەتی، لە جیاتی ڕوکردنە ئاسمانو بیرکردنەوە لە شتە نادیارەکان، بیرو هۆشی بێنێتەوە سەر زەوی"[17].

ئیتر با بوەستیٚ ئەو هەمووە قسە هەلەقو مەلەقەی تر کە ئەیگوازێتەوەو دڵی پێیان خۆشەو لێیان ڕازییە..

ـ "لەم جوبەییەدا لە خوا بەو لاوە کەسی تری تیانییە"[18].

ـ "جارێك من ببینی، لەوە باشترە هەزار جار خوا ببینی"[19].

---

[15] کۆمەڵگا ل٢٠.

[16] کۆمەڵگا ل٢٧٣.

[17] کۆمەڵگا ل٢٧٣.

[18] کۆمەڵگا ل٢١٦.

[19] کۆمەڵگا ل٢١٦

**ـ "حەللاج ڕای وایە وەك ئادەمیزادێك بە سروشتی مرۆڤانەوە چووەتە جیهانی خواوەندەوەو ئەگەر سیفەتی خودایی لە خۆیدا نەبوایە ڕاستگۆ نەدەبوو"[٢٠].**

**ـ "انا الحق والحق للحق حق لا بس ذاته فما ثم فرق"[٢١].**

**ـ حەللاج لە پەنجا ساڵیدا وتویەتی: "تا ئێستا هیچ ئاینێکم نییە"[٢٢].**

**ـ " هەندێك مێژوونووس ڕایان وایە (حەللاج) نەیهێشتووە هەوادارانی خۆی شەهادەت بە زمانیاندا بێت"[٢٣].**

**نازانم فوئاد مەجید میسری بۆ چووەتە سەر عەقڵی ئەو لادەرو خەڵکە بزرکاوە، باشە لەو هەموو بەڵگەیەی هەیە لە سەر "بوونی خوا"و "کەماڵی خوا" هەر هیچی قەبووڵ نییە؟.. لەو هەموو بەڵگە فەلسەفیو عەقڵییەی هەیە لەسەر بوونی خواو سیفەتە "کامڵەکانی خوا" هەر هیچیان سەرنجی ئەوی ڕانەکێشاوە! نە بەڵگە عەقڵیەکانو نە بەڵگە فەلسەفییەکانو نە بەڵگە دینیەکان، بۆ گەیشتن بەو ئەنجامەی کە، خوا هەیەو ئەو خوایەش دارای هەموو سیفەتێکی کەماڵەو وانەبێ بەڵگەی ناتەواوییەو ئەوەش لە عەقڵدا جێی نابێتەوە، فوئاد مەجید میسری نە ڕێگەی "دەرك و ئیحساس" نە ڕێگەی" ئیستقرائیو ئیستینتاجی"و نە ڕێگەی "هەواڵیو خەبەری ڕاستگۆ"و نە ڕێگەی "ئیشراقاتی ڕۆحی" نەگرتۆتە بەر، تا پێی بگاتە ئەوەی کە عاقلانی پێیگەیشتووە"[٢٤].**

**نە لێکۆڵینەوەیەکی کردووە لەسەر بەڵگەی "وجودی ئیمکان" نە لە سەر "حدوث" و نە لە سەر "پێنج کوموماتەکە"و نە لە سەر "بەڵگەی داهێنانو هیدایەتو ..هتد". بۆیە کەوتۆتە ئەو هەموو هەڵەیەوە.**

**چوار: سەرچاوە بەکارهاتووەکانی فوئاد مەجید میسری "ڕەسەن" نینو هەندێکی باشیان ناڕەسەنو کۆڵەوارن.. ئەو سەرچاوانەی بەکاری هێناون بۆ ئەوەی بیرو ڕاو بۆچونی خۆی پێ پشت قایم بکات سێ جۆرە:**

**ـ جۆرێکیان سەرچاوەی "دژ بە دین" یان "دژ بە مێژووی ئیسلامی"ین.**

**ـ جۆرێکیان سەرچاوەی دووهەمنو ئەبوو ئەو بگەڕایەتەوە سەر سەرچاوە یەکەمەکان.**

**ـ جۆرێکیان لە سەرچاوەکانەوە شتێکی هێناوەو هەندێ پینەی لێداوە لە سەرچاوەی ترو نەترسانە! خۆی هەندێ شتی بۆ زیادو کەم کردووە[٢٥]، وەك ئەوەی بڵێ: خوایە کەس پێم نەزانێت! ئەمە جگە لەوەی نووسەر فێڵێکی تری کردووە بۆ ئەوەی خەڵك بڵێن سەرچاوەی زۆری بەکارهێناوە، بۆ یەك کتێب جاری وا هەیە دوو ناو بەکارئەهێنێ، بۆ نموونە بۆ مێژووی تەبەری جاری وا هەیە ئەڵێ: سەیری "تأریخ الرسل" بکە[٢٦]و جاری وا هەیە ئەڵێ سەیری "تأریخ الطبري" بکە[٢٧] .. وە هەروەها !! لە کاتێکدا ئەو دوو ناوە هەر یەك کتێبن. ئیتر نازانم لەوانەیە وا بزانێت دوو کتێبن!!و ئاگای لە مەسەلەکە نەبێت! یا یەك دوو نموونە بۆ هەر یەك لەو قسانەی سەرەوە بنوسینو خوێنەر پاشان خۆی سەرپشك بێت[٢٨].**

*** ئەو سەرچاوانەی دژ بە دینن لە بنەڕەتدا کەچی ئەم بۆ نووسین لەسەر ئیسلامو مێژووی ئیسلامیی بەکاری بردوون، کە ئەمەش کارێکی ناڕاستو نەگونجاوە. وەك :**

---

[٢٠] کۆمەڵگا ل٢٣٤.

[٢١] کۆمەڵگا ل٢٣٤.

[٢٢] کۆمەڵگا ل٢٦٧.

[٢٣] کۆمەڵگا ل٢٦٧.

[٢٤] زانایانی ئیسلامی بەڵگەکانی ناسینی خوا ئەکەنە ئەو چوار بەڵگەیە.. ١ـ بەڵگەی هەستکردن. ٢ـ بەڵگەی ئەنجامگیری. ٣ـ بەڵگەی هەواڵی ڕاست. ٤ـ بەڵگەی ڕۆشنبوونەوەی ڕۆح. .. سەیری (أسس العقیدە الاسلامیە)ی مەیدانی ل٣٢ بکە.

[٢٥] کۆمەڵگا ل٢٣٤.

[٢٦] کۆمەڵگا ل٢٦٨– ٢٦٩.

[٢٧] کۆمەڵگا ل١٣٧ بۆ نموونە.

[٢٨] ئەم وەڵامانە زیاتر ڕوو لە چەمكو زانراوەکانی کتێبی کۆمەڵگا دەکەنو ڕێژەی ڕاستیو ناڕاستی ئەو چەمکانە ڕوون دەکەنەوە، ڕادەی دەستپاکیو ئەمانەت پارێزی نووسەر لەو سەرچاوانە بۆ دەرفەتێکی تریان نووسەرێکی ترجێ دەهێڵین، بەڵام بە پێی بنەما لۆژیکییەکە بەسە ئەوەندە بوترێت کە (استدل بالمعلوم علی المجهول) واتە لەو چەند نمونەیەوە کە باسیان دەکەین دەردەکەوێ کە نووسەر لەوانی تریشدا دەستپاکو ئەمین نییە!!

**ـ فصوص الحكم ـ ابن عربي، كە كابرايەكى لادەرو فەيلەسوفێكى خڵەفاوەو كتێبەكەش سەراپا قسەى بێ سەروبەرە دەربارەى (خوا) و (دين)و (پێغەمبەرايەتى).**

**ـ النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية. كە هى كابرايەكى عەلمانييەو گاڵتەى بە "ئايين و پێغەمبەران" دێت.**

**ـ المادية الدياليكتيكية جماعة من الاساتذة السوڤيت (وەك خۆى نوسيويەتى).**

**ـ تأريخ الفلسفة ـ جورج طرابيشى.**

**ـ شطحات الصوفية ـ عبدالرحمان البدوى، كە كابراى نووسەر خۆى ناوى ناوە، قسە بزركاوو بێ سەرو بەرەكانى سۆفى، كەچى نووسەر ئەيانكاتە حەقايق و شتيان پێ ئەسەلمێنێ.**

**ـ الفن والتصور المادى للتأريخ ـ بليخانوف / ترجمة/ طرابيشى.**

**ـ حلاج ـ على مير فطروس.**

**ـ ئيسلام ناسى ـ على مير فطروس.**

**ـ تأريخ تمدن الاسلام ـ جورجى زيدان، كە پڕيەتى لە قسەى بێ سەرو بن و ناڕەوا بەرامبەر بە ئيسلام**[29]**.**

*** ئەو سەرچاوانەى "دژ بە مێژووى ئيسلامى" ين و بە واتايەكى تر دژ بە "ئيسلامى سوونى"ين.**

**ـ تأريخ اليعقوبى: أحمد بن يعقوب: نووسەرێكى شيعە توندڕەوەكانەو ناتوانێت دەربارەى مێژووى ئيسلامى بە ويژدانەو قسە بكات، چونكە بڕواى بەو مێژووە يان هەر نييە يان لاوازە.**

**ـ مروج الذهب: المسعودى: بە هەمان شێوە نووسەرێكى شيعە توندڕەوەكانەو بڕواى بە مێژووى ئيسلامى نييە وەك پێويست.**

**ـ تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان كابرايەكى "ڕۆژهەڵاتناس" و نەسرانى مەزهەبەو ناتوانێ بێ لايەن بێت لە نووسيندا**[30]**.**

**ـ ديوان الحلاج.**

**ـ شرح ديوان الحلاج.**

**ـ الحلاج موضوعا: كامل شيبى كە كابرايەكى شيعە مەزهەبەو بوونى (عبدالله كوڕى سبأ) ڕەت ئەكاتەوە لە كتێبى "الصلة بين التصوف والتشيع". بە پێچەوانەى ڕاى هەموو مێژوونوسانەوە، چونكە مايەى شەرمەزارييە بۆى.**

**ـ ئەو سەرچاوانەى كە (تەها حسەين)و (ئەحمەد ئەمين)و (جۆرجى زيدان) نوسيوويانن كە هەريەكەيان لە ڕويەكەوە سەنگەرێكيان گرتووە بۆ تێكشكاندنى بيرى ئيسلامى و مێژووى ئيسلامى و سەرچاوەى سەرەكيشيان بريتييە لە (مەسعودى)و (يەعقوبى)**[31]**.**

[29] ـ لە لاپەڕەكانى دوايدا هەڵسەنگاندن بۆ "جۆرجى زيدان" و نووسينەكانى دەكەين.

[30] ـ كارل بروكلمان ـ بە تايبەتى لەو سەرچاوەدا كە فوئاد مەجيد ميسرى بە كارى هێناوە ـ لە زۆر شوێندا دەمارگيرى ئەكات و بە مەبەستەوە مێژوى ئيسلامى ئەشيوێنێ.. بۆ نموونە گومان لە ساڵى لە دايكبوونى پێغەمبەردا دروست ئەكات بە مەبەستى ئەوەى ڕێگە بۆ ئەو قسەيەى خۆى بكاتەوە كە گوايە موحەممەد ﷺلە (٣٠) ساڵاندا بووە بە پێغەمبەر كەچى پێغەمبەران لە چڵ ساڵاندا ئەبنە پێغەمبەر، كەواتە موحەممەد پێغەمبەر نييە.(بروكلمان ل٣٢). هەروەها سەرەتا هەڵئەچنێ بۆ ئەوەى گوايە موحەممەد پێغەمبەر ﷺسودى زۆرى وەرگرتووە لە تەوارتو لە ئينجيل و دينەكەى هى ئەوانە. (ل٦٩). پێغەمبەر بەراورد ئەكات بە كاهن و جادووگەرەكان (ل٣٧). يان ئەڵێ بۆ دڵراگرتنى يەهودييەكان جارجارە لە ڕێنمايەكانى دينەكەى لاى ئەدا"!! (ل٤٦). هەروەها ئەڵێ: "يەهود لە موحەممەد ﷺشارەزاتر بوون.." ل٤٧. ئيتر با بوەستێ چەند قسەى ناڕەوا لە هەمان سەرچاوەدا ئەكات بەرانبەر بە ئيسلام و (ياساكانى سزا= نظام العقوبات) لە ئيسلامدا. يان ئەڵێ: موحەممەد لەبەرئەوەى ژنى زۆرى هەبوو هەرچەندە هێشتا گەنج بوو، بەڵام ئەوەكاريگەرى لەسەر بارى تەندروستى كردو نەخۆش كەوتو مرد!! ل٦٧. جا كەسێ ئەوە ديدو بۆچوون و ئاستى بێت، چۆن ئەتوانێت بە ويژدانەوە لەسەر ئيسلام بنوسێت. (تأريخ الشعوب الاسلامية / كارل بروكلمان/ تعريب: نبيه أمين فارس و منير البعلبكى) دار العلم للملايين بيروت . طبع ١ سنة ٢٠٠٠.

[31] بۆ هەڵسەنگاندنى نووسينەكانى ئەم نوسەرانە بە درێژى سەيرى كتێبى (قضايا الثقافة والفن والادب: كشف سموم كتب التغريب)ى ئەنوەر ئەلجوندى بكە: هەريەكە لەو نووسەرانەش سەرچاوەى سەرەكى نوسينەكانيان (تأريخ اليعقوبى)و (مروج الذهب)ى مەسعودييە. (سەيرى اسنى المطالب، الصلابي ل٦٠٩) بكە.

*** ئەو جۆرانەیان کە سەرچاوەی دووەمن‌و ئەبوو فوئاد مەجید میسری بگەڕایەتەوە بۆ سەرچاوە بنەڕەتییەکان کەوا دیارە ئەم ئیشەی زۆر کردووە لە نووسینی کتێبەکەیدا .. بۆ نمونە:**

**ـ لە ل١٣٢دا دەڵێت: "بە قسەی (ماوردی) فقهی ئیسلام لە باشترین حاڵدا ئەم ئەرکانە بە دەوڵەت ئەسپێرێت.. هتد" دوایی لە پەراوێزدا نووسیویەتی سەیری "في السیاسة الاسلامیة ل١١٨" بکە، لە کاتێکدا کە ئەو کتێبە هی (هادی العلوي)یەو ساڵی (١٩٧٤) دەرچووە لە (بەیروت)..و "ماوردی" کتێبی ئەسڵی خۆی هەیەو ناوی (الأحکام السلطانیة)یەو گەڕانەوە بۆی کارێکی ئاسانەو دیارە فوئاد مەجید میسری نەیدیوە یان نەیزانیوە بگەڕێتەوە بۆی.**

**ـ لە ل١١٤دا ئەڵێت: "کە دانیشتوانی مەدینە لە دژی دەسەڵاتی ئەمەوی (ساڵی ٦٣ کۆچی) یاخیبوونیان ڕاگەیاند.. تا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێت: دوای ئەوەی (مسلم) چووە ناو شارەوە سێ ڕۆژ مۆڵەتی دا بە سەربازەکانی چییان پێخۆشە لە تاڵان‌و بڕۆو ئەتك کردنی ناموس بیکەن! دەگێڕنەوە (!!) لەو سێ ڕۆژەدا حەوت هەزار ئافرەتی (مەدینە) ئەتك کراوە". کەچی لە جیاتی ئەوەی ڕوداوەکانی (٦٣ی کۆچی) لە کتێبە مێژووییەکانەوە ڕاستەوخۆ وەربگرێت، لە پەراوێزی ئەم سەرچاوەدا ئەڵێت: "من تأریخ التعذیب في الاسلام هادی العلوي ل٧١"[32].!!**

**ئەم جۆرە کردەوانە بۆ نووسەر یەکێکە لە سێ شت یان هەرسێکیانە. یان دەستەوەستانی‌و نەتوانینە، یان بێ ئاگا بوونە لە مەرجەکانی (لێکۆڵینەوەو لێکۆڵەرەوە = شروط البحث والباحث)یان گزی کردن‌و فێڵە.**

*** جۆرێکی تر لەو سەرچاوانە کە فوئاد مەجید میسری بەکاری هێناون "بەلام" بە "مەبەست" گۆڕانکاری تێدا کردون.**

**بۆ نموونە: لە ل١٠٧دا ڕەخنە لە ئیمامی عوسمان دەگرێت‌و ئەڵێت: "بە قسەی مێژوونوسێکی وەك (تەبەری) .. سێ سەد قنطار ئاڵتونی لە دەستکەوتی ئەفریقا داوە بە مەروان کوڕی حەکەم". لە پەراوێزدا ئەڵێت: "تأریخ الرسل (ج٣ ل٣١٠). ت.و**

**کە ڕاستیەکەی ئەمەیە: "کاتێك عوسمان فەرمانی کرد بە عەبدوڵڵای کوڕی سەعد کوڕی ئەبی سەرح لە میسرەوە هێرش بەرێت بۆ تونس‌و ڕزگاری بکات، پێی وت: ئەگەر خوای گەورە لەسەر دەستی تۆدا ئەفریقا ڕزگار بکات‌و فەتح بکرێت ئەوە لەو (فەیئە)ی خوا ئەیدات بە موسڵمانان "پێنج یەکی، پێنج یەك" لەو غەنیمەتەت ئەدرێتێ". ئەویش بە سوپاکەیەوە کەوتەڕێ‌و میسری بەجێهێڵاو خۆی کرد بە وڵاتی ئەفریقاداو شاخ‌و دەشتیان فەتح کرد، عەبدوڵڵا فەیئەکەی بەسەر سەربازەکاندا دابەش کردو پێنج یەکی لێ گل دایەوەو چوار یەکی پێنج یەکەکەی تری ناردەوە بۆ ئیمامی عوسمان.. ئەوەبوو نوێنەرێك شتەکانی بردەوەو گلەییان لە عەبدوڵڵا کرد کە ئەوەندە شتی گل داوەتەوە، عوسمان پێی وتن: من پێم وتووە گلی بداتەوە، ئەگەر ئێوە ڕازی نین ئەوە پێویستە بیگێڕێتەوە، وتیان: ئێمە ڕازی نین‌و پێمان خۆش نییە، عوسمان فەرمانیدا کە عەبدوڵڵا ئەو شتانە بگێڕێتەوە، ئەویش گێڕایەوەو عەبدوڵڵا گەڕایەوە بۆ میسرو ئەفریقاش فەتح کرا!" سەیری (الطبری ٤٩/٥: میسر ١:٢٨١٤. ٢٨١٥ طبعة أوروبا" بکە. دەی ئەمەی (طبری) لە کوێ‌و ئەوەی فوئاد میسری لە کوێ؟! لە هیچدا لەیەك ناچن‌و زۆریش شورەییە نووسەر شتێکی نەبینیبێ بڵێ بینومە یان ئەگەر بینویەتی تەزویر کاری تێدا بکات.**

**ـ لە ل١٣٤ یشدا ئەڵێت: "زانایانی ئیسلام بۆ سەرخستنی سیاسەتی ڕەسمی دەوڵەت دەرهەق بە (ئەهلی ذیمە) ئەم مەرجانەیان دانا: "دەبوو پارچە قووماشێکی زەرد بەجل‌و بەرگیاندا بدروون‌و پشتێنێکی تایبەتیشی لە سەر ببەستن، نەدەبوو خانووبەرەی ئەوان لە هی موسڵمان بڵند تر بێت.. هتد". "الأحکام السلطانیة الماوردي ل٤٥..".**

---

[32] لێرەدا جێی خۆیەتی هەڵوێستەیەك بکەین‌و بیروبۆچوونی هەموو ئەوانەی کە هەواڵی مێژوویی بە نادروست دەگوێزنەوە یان کاری لێکدانەوەی عەقڵی ناکەن بۆ هەواڵە مێژووییەکانیان تەنها زاراوەکان دەجوونەوەو تەوزیفی دەکەن بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆیان.

مادام مێژوونوویس مرۆڤە مەحکومە بە زۆر شت کە کاریگەرییان هەیە لەسەر مرۆڤ، بەلام لێرەدا نەنگییە بۆ کەسێك بە دڵنیاییەوە بزانێت ڕووداوێك یان زانیارییەك هەڵەیەو بیگوازێتەوە .

وەك ئەتك کردنی (٧) هەزار ئافرەت، کە ئەم ڕێژەیە لە هێرشی مەغۆلو تەتەرەکاندا هیچ سەرچاوەیەك باسی دەیەکی ئەوەش ناکەن. تەتەرێکی ئاین جیاواز ئەوە ئەنجام نەدات ئەی هاوئاینییەك چۆن کاری وا ئەنجام دەدا؟ سەیری لاپەڕەکانی دواتری ئەم کتێبەش بکە بۆ زانیاری زیاترو دەربارەی ئەو بوختانە .

نووسەر ئەیەوێ بڵێ: ئەم لە کتێبی (البابکیە)ی دکتۆر حسین قاسم العزیز وەریگرتووەو گوایە حسین قاسمیش لە (الأحکام السلطانیة) وەریگرتووەو فوئاد میسری تاوانی ڕاستیو ناڕاستی قسەکەی خسۆتە ئەستۆی حسین قاسم. بەڵام ئەمە جگە لەوەی شورەیی خاڵی پێشووتری تێدایە کە باسمانکرد، (ماوردی)یش واناڵێتو زۆری پێدانراوە، (ماوردی) دەبارەی ئەو حاڵەتانە ئەدوێت کە پێویستە دەوڵەت مافی تاکە کەس بپارێزێت ئەگەر هاتوو یەکێکی تر پێشێلکاری تێدا کرد، "ماوردی" لە (الاحکام السلطانیة: ص ٢٥٦)دا ئەڵێ: "یەکێکی تر لەوانەی کە ڕێگەی لێ ئەگرێتو مافی هاوبەشە لە نێوان مافە خوداییەکانو مافە مرۆییەکاندا ئەوەیە ڕێگە نادرێت خانووی کەس بڕوانێت بەسەر خانووی خەڵکیدا، زۆرناکرێت لە کەسێك کە خانووەکەی بەرزترە لە دراوسێکەی، "ستارە" دروست بکات، بەڵام زۆری لێ ئەکرێت کە نەڕوانێت بەسەر جگە لە خۆیدا، بەرگری لە "ئەهلی زیمە"ش ئەکرێ کە خانووەکانیان بەرز بکەنەوە بەسەر خانووی موسڵماناندا، ئەگەر خانوویەکیان کڕیو لە خانووی موسڵمانان بەرزتر بوو بۆیان تاپۆ ئەکرێو بەرگری ئەوەیان لێ ئەکرێ کە بڕوانن بەسەر موسڵماناندا، "ئەهلی زیمە" مەرجەکانیان ئەبێت بپارێزن کە بە مەرجیان گرتووە لە جلوبەرگو خۆ جیا نواندنو قسەکردن بە ئاشکرا دەربارەی عوزەیرو مەسیحو ڕێگەی هیچ موسڵمانێکیش ناردی ئەزیەت یان جنێو بدات پێیانو هەرکەسیش پێچەوانەی ئەم یاسایە بێت ژێر ئەکرێت".

بۆ ئەوەش نەك فوئاد مەجید یان کەسێکی تر بڵێ ئەوە لە (الاحکام السلطانیة)دا هاتووەو مەبەست پێی ئەوەی (ابن الفراء)ە، بۆ دڵنیایی زیاتر "ابن الفراء"یش لە (الاحکام السلطانیة)دا هەر وا ناڵێ، بەڵکو ئەویش هەر لە هەمان باسداو پاش ئەوەی زۆر حاڵەت باس ئەکاتو دێتە سەر ئەوەو ئەڵێت: "خەڵك ڕێگەی ئەوەی لێ ئەگیرێت کە خانوەکەی بەشێوەیەك بێت، بڕوانێت بەسەر ماڵی دراوسێکەیدا، ئەگەر وای کرد پێویستە (ستارە) بۆ خانوەکەی بکات، لە ڕیوایەتێکدا کە (ئیبن مەنسور) ئەیهێنێت دەربارەی کەسێك کە ماڵەکەی ئەڕوانێت بە سەر دراوسێکەیدا، ئەفەرموێت: "السترة علی الذی أشرف". "ستارە" دروستکردن لەسەر ئەوەیانە کە خانوەکەی ئەڕوانێت بەسەر خەڵکیدا، بەو شێوەیەش لە ڕیوایەتی (محمدی کوڕی یحیای کەححال)دا هاتووە دەربارەی ئەوەی خانووەکەی بەرزترە لە دراوسێکەی، ئەفەرموێت: "یستر علی نفسه"، پێویستە ستارە بۆ خۆی دروست بکات. ئەگەر بوترێت: پێویست بوو وابڵێی: "نابێت کەس خانوو بە جۆرێك بکات بڕوانێت بەسەر دراوسێکەیدا، نەك پێویستە بۆ سەربانەکەی "ستارە" بکات"! لەوەڵامدا ئەوترێت: "مومکین نابێت لە عادەتدا کە نەڕوانێت بەسەر ماڵە دراوسێکەیدا ئەگەر "ستارە" نەکات، چونکە بەبێ ستارە لەوانەیە بە "سەهو" سەیری ماڵە دراوسێکەی بکات یان ئاگای لە خۆی نەبێتو بۆیان بڕوانێت، چونکە خانووەکەی ئەم بەسەر ئەواندا ئەڕوانێت. بە هەمان شێوە "ئەهلی زیمە"ش مەنع دەکرێت لەوەی خانوەکانیان لە خانووی موسڵمانان بەرزتر بێتو ئەگەر خانووی بەرزیشیان هەبوو ئەوە داوایان لێ ئەکرێت کە "ستارە" بۆ سەربانەکانیان بکەن. "ئەهلی ذمة"ش ئەو مەرجانەی لە نێوان ئەوانو مسوڵماناندا هەیە پێویستە بیپارێزن، بۆ نموونە: بە ئاشکرا لە ناو خەڵکیدا نەڵێن عوزەیر کوڕی خوایە، یان مەسیح کوڕی خوایە یان ئەو جۆرە جلو بەرگە لەبەر بکەن یان فلانە هەیئەت بدەن بە خۆیان.

موحاسەبەو موحاکەمەی ئەو کەسە ئەکرێت مسوڵمانەو ئەزێتیان ئەدات یان جنێویان پێبدات، ئەو کەسەش وا بکات ئەدەبی دا ئەدرێتو ئەکرێتە دەرس بۆ خەڵکی"[٣٣].

جا خوێنەری بەڕێز لەیەکچوونو پینەو پەڕۆی ئەم دەقە چۆن لەیەك جیابکەینەوە.

(ماوردی)و (فراء)یش باسی ئەوە ئەکەن: چۆن ئەو یاسایانە مسوڵمان ئەگرێتەوە هەرواش ئەهلی زیمەش ئەگرێتەوە، ئەوەش بەڕاستی دیاردەیەکی ناشارستانییە کە ئەم بەسەر ئەودا بڕوانێو هەموو کەسیش ئەزانێت ماڵ حورمەتی تایبەتی خۆی هەیەو دانیشتوانی ئەو ماڵە ناتوانن لەبەر دراوسێکەیان هەمیشە بە حەزەرەوە هاتوچۆی حەوشو بەردەرگا بکەن..

ئەگەر ئەمە جێگەی ڕەخنەی فوئاد مەجید بێت پێم سەیرە!

---

[٣٣] ألأحکام السلطانیة: الفراء (٣٠٣ ـ٣٠٤).

لەولاشەوە (پەیمان پاراستن) ئەرکی هەموو کەسێکی پەیمان دەرەو شورەییە کەسێك ئەمڕۆ پەیمان بداتو سبەی خۆی لێ بدزێتەوە. هەرکەس بە شانازییەوە دینی خۆی هەڵدەگرێت با جلو بەرگی تایبەتی دینەکەشی بپۆشێتو هەرکەسیش پێی شورەییە ئەهلی فلانە دین بێت، با بێ ترسو شەرم دەستی لێ هەڵبگرێ. لەولاشەوە کێ زاتئەکات ئەکات وەك (دین)و وەك (یاسا)ش سوکایەتی بە "ئەهلی زیمە" بکات؟! وەك (دین) پێغەمبەر ﷺدەفەرموێت: "من بەریم لە کەسێك ئازاری "ئەهلی زیمە" بدات"، وەك (یاسا)ش ئەوەتا ئەو کەسە ئەکرێتە (عیبرەت) بۆ خەڵکی تریش ئەگەر سوکایەتی کردنێکی لێوە دەربچێت بەرانبەر "ئەهلی ذیمة"، ئیتر نازانم فوئاد میسری چی ئەوێو بەتەمای چییە؟! با ئەم دوو نموونە بەس بێتو ئەوانی تر هەڵبگرین بۆ دوایی.

پێنجەم: تێبینییەکی تری ئاشکرا، بە گشتی ئەوەیە کە نووسەر هەست بکات یان نەیکات بووەتە بڵندگۆی ئەو کەسانەی کە بڕوایان بە (قورئان)و سەحابەو مێژووی ئیسلام نییە.. ئەم هاتووە هەموو ئەو بیروڕایانەی ئەوانی بە داڕشتنی خۆی نوسیوەتەوە قسەو گوتاری ئەوان بە دەستپاکییەوە(!) ئەگوازێتەوە، ئەم دڵ لە یەکتری پاك بوونە یەکێکە لە دوو شتە یان نەزانینو بەسەراکەوتنەو ڕێی لێی کەوتووە یان خەتای هەندێ لە سەرچاوەکانێتی کە هی ئەو کەسانەن ئەم تێبینی نەکردووە یان نانەکەی لەوەدایە. با چەند نموونەیەك بهێنینەوە:

- فوئاد مەجید ئەڵێ: "عەرەبەکان نەگەیشتبوونە ئەو پلەیەی گەلانی ئێران پێی گەیشتبوون، عەرەب بێجگە لە زمانی عەرەبیو ئاینی ئیسلام هیچ شتێکیان بۆ ئێران نەهێنا"[34]. باشە ئەو هەموو زانا بلیمەتە لە ناو ئێراندا پاش ئیسلام هەڵکەوتوون بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی ئیسلام شتی زۆری فێری ئێران کرد. باشە پێش ئیسلام بێجگە هەندێ ئەفسانەی ڕۆستەمو زۆرابو شیرینو خوسرەو چیتریان هەبوو.

- فوئاد مەجید بە خۆی نازانێو ڕێچکەی قسەکانیشی ئەوە هەڵناگرێت کەچی دەڵێت: "بڕیاردان لە سەر ئەوەی کێ دەبێتە ڕێبەرو چۆن ئەو پایەیەی ئەدرێتێ، مەسەلەیەکی ئەوەندە ئاساییو سادە نییە بەئەنقەست دوابخرێو درابێتە دەست مسوڵمانان تا دوایی بەو جۆرەی حەزیان لێیە بڕیاری لە سەر بدەن!!"[35].

سەیر ئەوەیە ئەم قسەیە وەك لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی خۆی هێناویەتی نەك هی خەڵکی تر، کە لە ڕاستیدا ئەوە قسەی خۆی نییە.

"محمد التیجانی السماوی" نووسەرێکی هاوچەرخی شیعە مەزهەبەو جۆرێك توندڕەوی تێدایە ئەڵێت: "لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺچەند کەسێکی دیاری کراو دانراون بۆ خەلیفایەتیو ناویان هێنراوە، بۆیە کەسی تر بۆی نییە ملی بۆ بەرز بکاتەوەو بە تەمای بێتو هەرکەسیش شتی وا بکات ئەوە فاسیقەو لە دین چووەتەوە دەرەوە.

بەڵام "خیلافەت" لای ئەهلی سوننەتو جەماعەت بە هەڵبژاردنو شورایەو بەم قەناعەتەشیان دەرگای خیلافەتیان بۆ هەموو کەسێك کردووەتەوە لەم ئوممەتەداو ناتوانرێت دابخرێت، وە هەموو کەسێك لە دوورو نزیك لە لەڕو قەڵەو خۆی بە ئەوە ئەزانێت دەست بدات بۆ ئەو شوێنە، تەنانەت وای لێهات غەیری قوڕەیشیش لە "مەوالی"و "کۆیلە" کانیشی گرتەوەو چووە ناو فارسو مەمالیکەکانیشو لەوانیشەوە چووە ناو تورکو مەغۆلەکانیش"[36].. لە شوێنێکی تردا دەڵێت: "شیاو نییە بۆ خوای گەورە ئەم ئوممەتە بە بێ "ئیمام" بە جێ بهێڵێ کە خۆی ئەفەرموێ: (اِنَّمَا أَنتَ مُنذِرٌ وَلِكُلِّ قَوْمٍ هَادٍ). هەروەك شیاو نییە بە (پێغەمبەر ﷺ)یش ئەم ئوممەتە بە بێ شوان جێ بهێڵێ"[37]..". "کلینی"یش کە بە دانەری مەزهەبی شیعە دائەنرێت ئەڵێت: "الامامة عهد من الله عزوجل معهود من واحد الی واحد"[38]. ئیتر بابوەستێ فوئاد مەجید میسری لە چەند

---

[34] - کۆمەڵگا ل١٠٤ لە (تأریخ لیران)و بیکولوسکایا، أ. یویاکوبسکی.. وەریگرتووە.

[35] کۆمەڵگا ل٩٧.

[36] لأکون مع الصادقین / التیجانی ل١٤٤، بۆ موناقەشەو وەڵامی ئەم شتانە سەیری کتێبی "کشف الجانی محمد التیجانی في کتبه الاربعة" عثمان خمیس بکە. هەروەها بڕوانە: الانتصار للصحب والآل من افتراءات السماوي الضال. د. ابراهیم بن عامر الموصلي.

[37] هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٦٧.

[38] کسر الصنم / للبرقعي :ص٢١٤.

شوێنی کتێبەکەیدا زەمی خراپی حەزرەتی ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان ئەکاتو ئەوە بۆ معاویەو بەنی ئوممەیەو هارونە رەشیدو ئەمینو مەئمون هەر مەپرسە.. سەیر ئەوەیە لە کتێبەکەی ئەم زاتەدا "لاگیرییەکی زۆر لە گەلی ئێرانی" کراوەو لە بەرانبەر گەلانی تردا ئیمتیازی زۆری دراوەتێ، کەس نازانێ بۆ؟ بۆ نموونە: ئەڵێت:

ـ نکولی لەوە ناکرێت کە داگیرکردنی (مەبەستی فەتحکردنە) ئەرمەنستانو ئێرانو ئازەربایجان گەلێك کارەساتی گەورەی بە سەر گەلانی ئەو وڵاتانەدا هێنا"[39].

ـ "عەرەب بێجگە لە زمانی عەرەبیو ئایینی ئیسلام هیچ شتێکیان بۆ ئێران نەهێنا"[40]. هەروەها دەڵێ: "ئێرانییە زەردەشتییەکان کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا هاتنە ریزی ئیسلامەوە، دەسەڵاتداران وەك عەرەبی موسڵمان تەماشایان نەئەکردن"[41].

"هەندێ توێژەرەوەی ئێرانی (بابەك) دەکەنە شۆڕشگێڕی نەتەوەییو گوایە ئاڵای ڕزگارکردنی ئێرانی لە دژی خەلافەتی عەباسیو دەسەڵاتی عەرەب بەرزرکردۆتەوە"[42].

هەرچەندە فوئاد مەجید میسری (بۆ مەبەستێکی شاراوە) ئەیەوێت ئەم مەسەلەیە دووربخاتەوەو لەگەڵ ئەوەدا "دوو نووسەری ئێرانی" ئەو مەسەلەیە باس ئەکەنو ئەیسەلمێنن، کەچی لە پەراوێزدا ئەڵێت: "دکتۆر عەزیز واتە نووسەری کتێبی "البابکیة" پێیوایە شەخسی بابەك ئێرانی نەبووەو دەڵێ: "بابەك لە ئەسڵدا عێراقییەو خەڵکی "مەدائن"ە..."[43].

شەش: فوئاد لەم کتێبەیدا تێکەڵاوییەکی زۆری دروست کردووە لە نێوان (فەلسەفە)و (زانست)دا، لە نێوان (تەصەوفی فەلسەفی)و (تەصەوفی حقیقی)دا لە نێوان (هێزی ئۆپۆزیسیۆن)و (ئاژاوەچیو چەتەو ڕێگر)دا لە نێوان (گەلانی ئیسلامی)و (کاربەدەستانی ئیسلامی)دا، لە نێوان (زەوی خەراج)و (زەوی موڵك)دا... هتد. ئەم تێکەڵکردنە ئەگەر نەزانین بێت ئەوە گەردنی ئازا بێت وەك ئەڵێن: "مەلاش غەلەت ئەکات". بەڵام جێی خۆیەتی زانیارییەکانی ڕاست بکاتەوەو پاشان قەڵەمی نوسین هەڵبگرێت.. خۆ ئەگەر بە مەبەستیش بێت ئەوە خۆی عەیبدار ئەکاتو تا یەکێکی بۆ ئەخەڵەتێت سەدی لێ دێتە قسە. چونکە لە ڕاستیدا فەلسەفەو (باسەکانی فەلسەفە) جیان لە (زانیاری)و (بابەتەکان زانیاری)و تێکەڵکردنیان سەر لە خاوەنەکەی تێك ئەدات، یان جیاکردنەوەی (تەصەوفی حەقیقی) لە (تەصەوفی فەلسەفی)و قسە بێ سەرو بەرەکانی وەك (ابن عربی)و (حەللاج)و (بایەزید) لە قۆناغی یەکەمی ژیانیدا[44].

یاخود تێکەڵ کردنی نەیار بە چەتەو ڕێگر، لەلایەن هەر کەسێکەوە بکرێت هەقی خۆیەتی مرۆڤ گومانی خراپی پێ بەرێت، کە باس لە دڕندەیی "قەرمەتییەکان" ئەکات ئەڵێت: "ڕاستیەکەی گرنگی ئەو پەلامارو ئەو هێرشە سەربازییە لەوەدانییە کە چەندو چۆن خەڵکیان کوشتووە(!!) وەك هەندێ لە مێژوونوسان دەیگێڕنەوە"[45] مەسەلەکەش ئەوەیە ئەو ئەیەوێت بیسەلمێنێت کە (قەرمەتییەکان) هێزێکی نەیاری شۆڕشگێڕو خاوەن پرۆژە بوون لە کاتێکدا هەر خۆی چەند شت لە مێژوونوسانەوە (بە نابەدڵی) ئەگوازێتەوە لەسەر بەربەرییەتو چەتەگەرییان.. بۆ نموونە ئەڵێت: "مێژوونوسان کە پەلاماری قەرمەتییان بۆ سەر (مەککە) دەگێڕنەوە دەڵێن: "دوای ئەوە چوونە ناو شارەوە لەسەر شەقامو ناو کۆڵانەکاندا

---

[39] کۆمەڵگا ل٢٦.

[40] کۆمەڵگا ل١٠٤.

[41] کۆمەڵگا ل٧٢.

[42] ـ کۆمەڵگا ل١٥١.

[43] ـ کۆمەڵگا ل١٥١.

[44] ـ چونکە لە کۆتایی ژیانیدا بایەزید لە فەلسەفەی خەوبزرکاوی پەشیمان ئەبێەوەو دێتەوە سەر ئاینی ڕاستەقینەی ئیسلامو پەشیمانی خۆی ڕادەگەیەنێو بیروباوەڕی خۆی بۆ خەڵکی ڕوون ئەکاتەوە.. التربية الروحية بين الصوفيين والسلفيين. ل٩٦. ئەوەتا لە قۆناغەکانی کۆتایی ژیانیدا ئەڵێت: (لو نظرتم الى رجل أعطى من الكرامات حتى تربع في الهواء فلا تغتروا له حتى تجدونه عند الامر والنهي وحفظ الحدود وأداء الشريعة) هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[45] ـ کۆمەڵگا ل١٩٢.

**سێ هەزار حاجیان کوشتووە، ئەمە بێجگە لەوانەی بەدیلیان گرتوون و لەبرسا مردوون".[46] هەروەها لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێت: "جارێکی تریش هەر پەلاماری (مەککە) ئەدەن و خەڵکی چەند ئەپاڕێنەوەو داوای (صولح و ئاشتی) ئەکەن کەچی ئەمان قەبووڵ ناکەن و هەڵئەکوتنە سەر شارەکەو شەش ڕۆژ قەتڵ و عام دەکەن (لەماوەی ئەو شەش ڕۆژەدا کە لەوێ ماونەتەوە کەس نەیتوانیوە هیچ ئەرکێکی ئایینی بەجێ بهێنێ و (٣٠) هەزار حاجیشیان کوشتووە، بیری زەمزەمیان پڕ کردۆتەوە، بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود)یان لەبن و بێخ دەرهێناوەو بردویانە بۆ پایتەختی قەرمەتیان"[47].**

**هەر خۆی لە کتێبەکەیدا ئەگوازێتەوە کە پاش تاڵان کردن و ئەتك کردنی ژنان و کچانی شارەکە بە گۆرانییەوە لە (مەککە) دێنە دەرەوەو پێکەوە ئەم گۆرانیانە دەڵێنەوە:**

**فلو كان هذا البيت لله ربنا      لصب علينا النار من فوقنا**

**لانا حججنا حجة جاهلية      محللة لم تبق شرق ولا غربا**

**وانا تركنا بين زمزم والصفا      جنائز لا تبقى سوى ربها ربا**[48]

**هەر فوئاد میسری ئەڵێ: "ڕێبەری قەرمەتیان لە کاتی کوشتن و کوشتارەکەی ناو (مەککە)دا بەدەستی خۆی دەروازەکەی (کابەی) دەرهێناوەو وتویەتی:**

**انا بالله وبالله انا      يخلق الخلق وافنيهم اذا**[49]

**"لە ساڵی (٣١٨)ی کۆچی (عومان)یان گرت و پاشان پەلاماری (کوفە)یان داو تاڵانیان کرد".[50] تەنها ئەم چەند زانیارییە بەسە بۆ ئەوەی بەڕوونی دەری بخات ئەمانە نەك هەر هێزێکی نەیارو شۆڕشگێڕ نەبون، بەڵکو خەڵکانێکی بەرەڵاو دڕندە بوون، ئیشیان تاڵانی و خەڵك کوشتن و چەتەگەری بووە. ئەگینا حاجی هەژار بۆ ئەکوژن، ئەی دیل بۆ بەند ئەکەن و نان و ئاوی نادەنێ تا لەبرسان و لە تینواندا ئەمرن، ئەی ئەتك کردنی ژن و کچ بۆ، قڕ کردنی خەڵکی خوا بۆچی..؟**

**بەڵام نووسەر چ ئەمان و چ بابەکی و ئەو چەند کەسە لادەرەی ناو "سۆفیە فەلسەفیەکان" بە کەسانی شۆڕشگێڕو نەیاری خاوەن پرۆژە ئەزانێت. کە ئێمە لە شوێنەکانی خۆیاندا ووردترو درێژ تر لەسەریان ئەڕۆین و باسی ئەفکارو ژیان و خوڕەوشتیان ئەکەین وەك لە مێژوودا باس کراون، هەر بۆ ڕاستکردنەوەش نووسەر نە ئەبوو تێکەڵی لە نێوان گەلانی ئیسلامی و کاربەدەستانی ئیسلامیدا دروست بکات، چونکە نکولی لەوە ناکرێت زۆرێك لەو کتێبانەی لەسەر مێژووی ئیسلامی نوسراون مێژووی کاربەدەستانی ئیسلامین نەك مێژوی گەلانی ئیسلامی، لەگەڵ ئەوەشدا نکولی لەوەش ناکرێت کە خاڵی ڕەش لەو مێژووەدا هەیە، بەڵام بە بەرانبەرییەوە ئەوەندەش خاڵی گەش و ئیجابی هەیە، تا ئەمڕۆش "مرۆڤایەتی" بەخۆیەوە نەیدیوە، کە مێژوونوسان بە درێژی باس لە ڕووداوەکانی ساڵ بە ساڵی ئەو خیلافەتانە ئەکەن کە چۆن بەرنامەیان داناوە بۆ قەلاچۆکردنی هەژاری و نەبوونی، ئەو هەموو شەفافیەتە هەبووە لە مەسەلە دارایی و ئیدارییەکانداو بەو ماوە کەمە بە تەواوەتی قەلاچۆی هەژاری و بێژنی و قەرزاری کرا کە ئێستاو لەگەڵ ئەم هەموو پێشکەوتنەداو لەگەڵ ئەم هەموو حکومەت و ئیدارەو دەولەتانەدا، هەژاریی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە زیادبووندایەو کیشوەری وا هەیە هەر چەند چرکە جارێك مرۆڤێك لە برساندا ئەمرێت.[51] و بەزەیی و سۆز لە ناو خەڵکدا نەماوەو هەموو کێشەکانی ئەم مرۆڤە بووەتە ئەوەی چۆن پارەیەك پەیدا بکات بۆ ژیان و نەمرێت لە برساندا.**

---

[46] - کۆمەڵگا ل١٩٢.

[47] - کۆمەڵگا ل١٩.

[48] - کۆمەڵگا ل١٩٣.

[49] - هەمان سەرچاوە.

[50] - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[51] - لە ڕاپۆرتێکی (جیمنس مۆرنس) بەرپرسی بەرنامەی خۆراکی جیهانی لە ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ڕۆژی (٢٠٠٧/٢/١٦) بڵاویکردەوەو کەناڵی (الجزیرە)ش چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا کرد دەربارەی ئەو ڕاپۆرتە هاتووە کە: ڕۆژانە هەژدە هەزار منداڵ لە جیهاندا لە برساندا دەمرد، هەشتسەدو پەنجا ملیۆن کەس لە جیهاندا بەدەست برسێتیەوە دەناڵێنن، شەشیەکی دانیشتوانی سەرزەوی بەشی پێویست خواردنیان نییە. هەروەها ناوبراو وتی: ئەم ژمارانە نەك هەر ترسناکن بەڵکو شوورەییە بە ناوچاوی مرۆڤایەتییەوە کە ساڵی (٢٠٠٧) ئەو ڕێژەیە لەخەڵکی برسی بێت.

(ئیبن کەسیر) لە کتێبی (البدایة والنهایة)دا ئەڵێت: "أمر الخلیفة الراشد عمر بن عبدالعزیز من یناد في الناس کل یوم: أین المساکین؟ أین الغارمون؟ أین الناکحون؟ (أي الذین یریدون الزواج) أین الیتامی حتی أغنی کل هؤلاء".[52]

واتە: بە فەرمانی خەلیفەی ڕاشید عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هەموو ڕۆژێك هاوار ئەکرا لەناو خەڵکدا،[53] هەژاران لە کوێن؟ قەرزاران لە کوێن؟ لە کوێن ئەوانەی ئەیانەوێ ژن بهێنن، هەتیوان لە کوێن ، ئەم هاوار کردنە بەردەوام بووە تا هەموو ئەو چینانەی دەوڵەمەند کرد"!

بۆ دەسەڵاتە ئیسلامییەکان هونەرییە لەو چەرخ و زەمانەدا ئەو سەروەرییانە تۆمار بکەن، کە سەرچاوەی گەورەو دەوڵەمەند "کشتوکاڵ و زەوی و زار" بووە.. خۆ وەك ئێستا دونیا دونیای نەوت و میتاڵ و دەزگای بەرهەمهێن و کارگەکانی ئاسن و گۆگردو گومرکی بێ ماناو باجی خانووبەرەو باجی کارەباو ئاو ئاوەڕۆ..هتد. نەبووە، کەچی ئێستا لەگەڵ ئەو هەموو سەرچاوەدا خەڵك هەر لە برساندا ئەمرێت لەگەڵ ئەو هەموو سەرچاوەدا حکومەتە یەك لە دوای یەکەکان کە ئەگۆڕڕێن گەلان و وڵاتان ئەکەن بە ژێر قەرزەوە.. بەڵام خۆ فوئاد مەجید نەك لە یەك جێگەدا بەڵکو لە چەند جێگەدا ئەوە دووبارە ئەکاتەوە کە فلانە دەوڵەت پاش مردنی فلان خەلیفە ئەوەندە ملیۆن دیناری (دیناری ئاڵتونی ئەو کاتە) لە خەزێنەدا هەبوو، بۆ نمونە: "کە مەنصور مرد خەزێنەی دەوڵەت خاوەنی شەش صەد ملیۆن درهەم و چواردە ملیۆن دینار بووە".[54]

حەوت: لە نووسینەکەی فوئاد میسریداو لە چەند شوێندا خوێنەر هەست بەوە دەکات کە نووسەر هەندێ خراپ حاڵی بوون و قسەی دژ بەیەك و عەرەبی نەزانینی تێدایە.. ئەو جۆرە هەڵانە جوان نین بۆ نووسەر گەر لە هەر پلەیەکی خوارەوەی نووسیندا بێت..

بۆ نموونە کاتێك باس لەوە دەکات سیستەمی عەلمانی مافی یاسادانان دەداتە دامەزراوەیەکی هەڵبژێردراو، ئەو دامەزراوەیە بە پێی ئاستی گەشەکردنی کۆمەڵگاو مەوقیعی سیاسی چینی دەسەڵاتدار یاسای جۆربەجۆر دادەنێ".[55] لەولاوە باس لەوە دەکات کە لە "ئیسلامدا هەر پرۆژەیەکی یاسایی هەبێت دەبێت لە شەریعەتەوە سەرچاوە بگرێ"[56]، ئەمە لە هەردوو لقەکەیدا چ (لقە عەلمانیيەکەی)و چ (لقە ئیسلامیەکەی) کەوتۆتە هەڵەوە.

یەکەم: لە سیستەمی عەلمانیشدا کە یاسا دائەنرێت پێویستە یاسایەك دابنرێت دژایەتی هیچ ماددەیەك لە ماددەکانی دەستوور نەکات و هەر یاسایەکیش دژ بە برگەو ماددەی دەستوور بێت "ئۆتۆماتیکی" هەڵدەوەشێتەوە. کەواتە یاسا دانانیش لە سیستەمی عەلمانیدا هەروا هەڕەمەکی و بێ ڕەشمەو جڵەو نییە.

دووهەم: لە سیستەمی ئیسلامیشدا ئەنجوومەنی شوورا کە (ئەهلی حەل و عەقد)ی پێ ئەوترێت کاتێك یاسا دائەنێت پێویستە دژایەتی (شتە نەگۆڕەکان)ی شەریعەت نەکات و ئەگەر کردی ئەوە ئۆتۆماتیکی هەڵدەوەشێتەوە، کەواتە لە سیستەمی ئیسلامی و لە سیستەمی عەلمانیشدا کە یاسا دائەنرێت نابێت دژایەتی ئەو نەگۆڕاوانە بکرێت. تۆ بەویان ئەڵێی شەریعەت و بەمیان دەستوورو ئەکرێت هەردووکیان هەر ناویان دەستوور بێت و ئەویشیان یاسا، یاسا ئەبێت گونجاو بێت لەگەڵ دەستووردا و بە پێچەوانەوە نابێت هەموو ڕۆژێك دەستوور بگۆڕێت و جۆرێك لە (عەبەسیەت) لە یاساکانی دەوڵەتدا دروست ببێت.

---

[52] ـ البدایه والنهایه (٢٠٣/٩).

[53] ـ ئەوسا وەك ئێستا ئامرازەکانی ڕاگەیاندن نەبووەو بەڵکو چەند کەسێك لەناو بازاڕو کۆڵانەکان و شارەکاندا هاواریان کردووەو لە شوێنی قەرەباڵغیدا فەرمانی حکومەتیان خوێندوەتەوە..

[54] ـ کۆمەڵگا ل٣٧.

[55] ـ کۆمەڵگا ل٧.

[56] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

**لە ل٢٤یشدا (بە زەوی شۆر) ئەڵێ:" زەوی شۆرەکات کە لە ڕاستیدا زەوی (شۆر)ە بەڵام دیارە نووسەر (شورەکان) [٥٧] ی لێبووە بە "شۆرەکات"و (ن)ی لێبووە بە (ت)و ئەوەش نەنگیە بۆ نووسەر، من سەرەتا وام زانی هەڵەی چاپە، بەڵام کە سەیر ئەکەم تا کۆتایی کتێبەکە ئەمە هەر "دووبارە" دەبێتەوە لە شوێنێکدا نەبێت ئەوەیان وا بزانم هەڵەی چاپە! [٥٨] .**

**لە لاپەڕە ٧٩شدا مانای ئایەتێك هەڵە ئەکات یان بە مەبەست وا مانای ئەکات، نووسەر ئەڵێ: "ئایینی ئیسلام بە مسوڵمانانی ڕادەگەیەنی: بۆیە سەروەت و سامان بە هەندێك دراوەو دەستەیەکمان لە دەستەیەکی دی بەرز کردۆتەوە، تا کۆمەڵێك کۆمەڵێکی تر بچەوسێنێتەوە"!! و پەراوێزی بۆ داناوەو ئەم ئایەتەی نووسیوە: "أَهُمْ يَقْسِمُونَ رَحْمَةَ رَبِّكَ نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضاً سُخْرِيّاً وَرَحْمَتُ رَبِّكَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ" (الزخرف: ٣٢ ).**

**بەڵام مانای ئایەتەکە بەم شێوەیەیە نەك ئەوەی نووسەر ئەیڵێ: "ئایا ئەوان (واتە موشریك و کافران) ئەیانەوێت ڕەحمەتی خوا بەسەر خەڵکداو بە ئارەزووی خۆیان دابەش بکەن، ئێمە ژیان و زیندەگی خەڵکمان لە نێوانیاندا دابەش کردووەو هەندێکمان بەسەر هەندێکی تردا (لە ڕووی دنیاییەوە) چەند پلە بەرزکردوەتەوە بۆ ئەوەی یەکتری بەکاربهێنن لە ئیش وکارەکانتانداو ڕەحمەتی خوا لە هەموو ئەو شتانە باشترە کە خەڵك هەوڵی کۆکردنەوەی ئەدات". جا کەواتە ووشەی (سُخريا) کە یانی (بەکارهێنانی یەکتری بۆ ئیش و کار) فوئاد مەجید وا تێگەییوە ماناکەی ئەوەیە (یەکتری بچەوسێننەوە)! دیارە لە قوتابخانەیەکدا "بەڕێوەبەر"و "مامۆستا"و "کارگوزار"و "قوتابی" هەیەو هەر یەکەیان پلەیەك لە ژووری ئەوی تریانەوەیە، بەڵام ئەبێت بە لۆژیکی فوئاد مەجید هەموو بخرێتە یەك پلە!. لە کارێکدا کە پرۆژەیەکی خزمەتگوزاری یان (نیشتەجێبوون) بێت، بەڵێندەر هەیەو "ئەندازیار" هەیەو "وەستا"و "کرێکار" هەیەو "چاودێر" هەیەو بەو شێوە نەبێت ژیان بەردەوام نابێت و دیسان نابێت بە لۆژیکەکەی نووسەر هەرچی هەیە هەمووی هەر (ئەندازیار) بێت.. جا کەواتە نووسەر دیارە ئەوەندە بە ڕەحمەو دڵی نەرمە، دڵی نایەت هەرگیز کار بە کرێکار بکات و دڵی نایەت کەس بەکاربهێنێ بۆ ئیشەکانی [٥٩] و خۆی لە کارەکانیدا هەموو شتێکە!! هەر بە هەمان شێوە زۆر خراپ لە ئایەتێکی تر حاڵی بووە لە ل٨٠ داو خۆی بردووە بە هەڵەیەکی گەورەداو ماناکەی لە خۆیشی و خوێنەرانیشی ئاوەژوو کردووەتەوە.**

**بەهەمان شێوە نووسەر گێڕانەوەی "ضمیر"ی لە ناو ڕستیەکدا لێ گۆڕاوەو لەجیاتی بۆ نزیکترین ناوبراوی بگێڕێتەوە، گێڕاویەتیەوە بۆ دورترینیان و مانای ڕستەکەی تێکداوەو خۆشی بە هەڵەدا بردووە، نووسەر ئەڵێ: "خەلیفە مەنصور لە کاتی حەجدا وتارێك ئاراستەی موسڵمانان دەکاو پێیان ڕادەگەیەنی دەسەڵاتی ئەو شتێکی خواییەو کەس بۆی نییە ڕەخنە لە سیاسەتەکانی بگرێ! "خەڵکینە من دەسەڵاتی خواوەندم لە سەر زەوی و بە پشت و پەنای ئەو دەتانبەم بەڕێوە، من پاسەوانی ماڵ و دارایی ئەوم و بە ویست و ئیرادەی ئەو لێی خەرج دەکەم و لێی دەبەشمەوە". بەهەمان شێوە وتارێکی "ئەبولعەباسی سەفاح" دەهێنێت و ئەویش هەر بە هەڵە تەرجەمە ئەکات، (ابو العباس) ئەڵێ: "الحمد لله الذي اصطفى الاسلام لنفسه، فكرمه وشرفه وعظمه واختاره لنا وايده بنا وجعلنا اهله وكهفه وحصنه والقوام به والذا بين عنه والناصرين له". فوئاد "ضمیر" (ه)کەی گەراندۆتەوە بۆ (خوا) لە کاتێکدا گەڕانەوەی بۆ (خوا) بە دوو شێوە هەڵەیە، یەکەمیان: زانستی (نحو) دەڵێت: "اذا دار الضمير بين القريب والبعيد فبالقريب أولى". واتە ئەگەر (ضمیر = ڕاناو) هەڵی ئەگرت بۆ**

---

[٥٧] - "زەوی شۆر" یان "زەوییە شۆرەکان" بە نوون واتە ئەو زەویانەی کە ڕێژەی خوێیان زۆرەو ئاویان پێوە ناوەستێت و بە کەڵکی کشتوکاڵ نایەن، شۆر واتە سوێر. نالی شاعیر ئەڵێ:

مووی سپی کردم بە شوشتن ئاوی عەینی شورە شەط

شورە شەط یەعنی کە تێیدا خود بە خود قەل بوو بە بەط

شورە شەط: سوێرە چەم. دیوانی نالی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ل٢٤٢.

[٥٨] - کۆمەڵگا ل٦٢.

[٥٩] - بە درێژی لە لاپەڕەکانی دواییدا باس لە فەلسەفەی ئەم مەبدەئی (تفاضل)ە ئەکەین و ڕادەی (واقیعی بوون)ی ڕۆشن ئەکەینەوە.

نزیك‌و بۆ دووریش بگەڕێتەوە ئەوە ئەبێت بۆ نزیکەکەی بگێڕیتەوە.. دووهەم: ماناکەی بەو شێوەیەی نووسەر چەند (کوفرێکی) تیٚ ئەکەوێت، بەڵام بۆ ئیسلام بگەڕێتەوە ماناکەی ڕاست ئەبێتەوە..

ماناکەی یانی "سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئیسلامی بۆ خۆی هەڵبژاردوەو ڕێزی داوەتیٚ‌و بە حوورمەتی کردووەو گەورە ڕایگرتووەو بۆ ئێمەشی دەست نیشان کردووەو ئێمەشی کردووەتە پشتیوانی دینەکەی‌و کردوینی بە ئەهلی دین‌و پەنای دین‌و قەڵا بۆ دین‌و بە دین ڕای گرتووین‌و وای کردووە کە بەرگری لە دین بکەین‌و بۆ سەرخستنی تێبکۆشین" کەچی نووسەر "أیده بنا وجعلنا أهله .. هتد" ئەو (ضمیر)انەی هەموو بۆ خوا گێڕاوەتەوەو کەوتووەتە هەڵەی گەورەوەو ئەم فەلسەفەیەی! لیٚ وەرگرتووە، "خەلیفە سایەی خواوەندە لەسەر زەوی کە لە زۆربەی لاپەڕەکانیدا بۆ شۆخی و گاڵتە کردن دووبارەی ئەکاتەوەو ئەشیانخاتە ناو (بازنە)وە بۆ ئەوەی خوێنەر باز نەدا بەسەریداو لێی بیٚ ئاگا نەبێت [60]، هەروەها نووسەر وەك لە خاڵی یەکەمدا وتمان (خیلافەت)و (خەلافەت) لەیەك جیاناکاتەوەو هەروا ئەزانیٚ یەك مانایان هەیە..

هەشت: یەکێکی تر لەو تێبینییە گشتییانەی کە لە کتێبەکەی فوئاد مەجید میسریدا ئەکریٚ، ئەوەیە زۆر حەزی لە گشتاندنە، شتێکی بچووك لە ئیسلام ئەبینیٚ، یان لە مێژووی ئیسلامی ئەبینیٚ، یان لە هەڵسوکەوتی موسڵمانان ئەبینیٚ خێرا ئەیگشتێنیٚ‌و ئەڵیٚ گشتی هەروایە.. ئەم کارەی ئەو هەروا هەڵەیەکی بچووك نییە یان هەر ئەوە نییە هەڵەیەو ئیتر هیچ، بەڵکو ئەوە خۆشی‌و خوێنەرانیشی بێبەش ئەکات لە بەرچاو ڕوونی‌و لەویژدان‌و لەو هەموو حەقیقەتەی کە ئیسلام لە ڕاستیدا لە خۆی گرتووە.

بۆ نموونە: تاکو تەرا کۆمەڵی ئاژاوەچی‌و چەتەو ڕێگر لە مێژووی ئیسلامیدا یاخیبوون‌و لەگەڵ بێگانەدا کلکیان گرێداوە، ئەو ناویان ئەنێت شۆڕشگێڕو سەرتاپای دەسەڵاتی خیلافەتیش پڕ ئەکات لەو جۆرە ڕووداوانە، حەجاجێك بووە لە مێژوودا کەچی هەموو مێژووی پڕ کردووە لە (حەجاج)، یان (سۆفیەکی فەلسەفی لادەر) کە قسەی هەلەق‌و مەلەق ئەکات‌و ئەڵیٚ: من خوام بمپەرستن، یان "تا ئێستا من فەرمانی خوام جێبەجی کردووەو ئیتر لەمەودوا ئەبێت خوا فەرمانی من جێبەجیٚ بکات ..هتد. نووسەر ئەمە جێبەجیٚ دەکات بەسەر هەموو ئەهلی تەسەوفدا، کە لە ناو ئەهلی تەسەوفدا ئەوەندە گوڵی بۆنداریان تێدایە مێژووی مرۆڤایەتی شتی وای بەخۆیەوە نەدیوە، لە ناو هیچ میللەتێکدا، بایەزید لە قۆناغی دووهەمی ژیانیدا لەناو هەندێك لەموریدەکانیدا دانیشتبوو سەرقاڵی زیکرو فیکرو حەڵاڵ‌و حەرامی دینی بوون‌و لەو کاتەدا چەند کەسێکی سەرخۆش‌و گۆرانی بێژ ئەدەن بەلایانداو لاقرتیان پێدەکەن، موریدو قوتابیانی بایەزیدی ئەڵێن قوربان: بە ڕاستی ئێمە چەند خەڵك بەرەو دین ئەهێنین ئەمانە دوو ئەوەندە لە دین دووریان ئەخەنەوە! بایەزیدیش ئەڵێت: دەست بەرز بکەنەو با دوعا بکەین، قوتابی‌و موریدەکانی دەست بەرز دەکەنەوە بایەزید ئەڵێت: خوایە لەبەر قودسیەت‌و گەورەیی خۆت ئێمەش‌و ئەوانەش چاك بکەیت‌و بمانکەیتە خەڵکی بەهەشت.. موریدەکانی بایەزید بەگلەییەوە عەرزی دەکەن: قوربان ئەمە چ دوعایەك بوو جەنابت کردت؟ بایەزید وتی: براینە! باشە ئەگەر ئەمانە بچنە جەهەنم ئێمە هیچ سودێکمان دەست ئەکەوێت، یان جێگە لە ئێمە ئەگرن، ئەی ئەگەر بچنە بەهەشت ئێمە هیچ زیانێکمان لیٚ ئەکەوێت، یان جێگە لە ئێمە ئەگرن، ووتیان: نەخێر، وتی: کەواتە بەرژەوەندی هەردوو لامان لەوەدایە خوا ئێمەش‌و ئەوانیش چاك بکات‌و دەست لە گوناه هەڵبگرین‌و ببینە خەڵکی بەهەشت..

هەر ئەم بایەزیدە (پاش ئەوەی ئەزمونێکی تاڵی ڕێگەی تەصەوفی فەلسەفی) ئەبینێت‌و ئەگەڕێتەوە بۆ لای پرنسیپە ئیسلامییەکانی خۆی ئەڵێت: ئەگەر کەسێکتان بینی ئەوەندەی کەرامات هەبوو لە هەواداو بە ئاسمانەوە چوار مشقی لێی دانیشت، پێی مەخەڵەتێن‌و سەیر بکەن‌و بزانن حاڵی چۆنە لەگەڵ (حەرام)و (حەڵاڵ)داو چەندێك سنوری خوا ئەپارێزێت‌و پابەندی شەریعەتە" [61].

جونەید ئەڵێت:

[60] بۆ نموونە ل٤، ل١٠٠، ل١٢٧، ، ل٢٣٢، ل٢٣٧.

[61] ـ الأعتصام (٦٣/١) برگەی ژمارە (٢٢٦).

.. الطرق كلها مسدودة على الخلق الا على من اقتفى آثار الرسول [٦٢]. واته: ڕێگەی بەرەو خوا چوون هەمووی داخراوە لەسەر خەڵکی، ئەو ڕێگەیە نەبێت کە خەڵك بە شوێن جێ پێکانی پێغەمبەردا ئەڕۆن. هەروەها ئەڵێت: "من لم يحفظ القران ويكتب الحديث لايقتدى به في هذا الأمر لان علمنا هذا مقيد بالكتاب والسنة"[٦٣]. واته: هەر کەسێك قورئان لەبەر نەکاتو حەدیس نەنوسێتەوە لەم کارەدا چاوی لێناکرێت چونکە ئەم زانستەی ئێمە گرێدراوە بە قورئانو حەدیسەوە.

ئەبو سولەیمانی دارانی: کە یەکێکە لە زانایانی ئەهلی تەسەوف ئەڵێت: ڕێ ئەکەوێت مانایەکی جوان ئەکەوێتە دڵم لە حاڵەتێکی ڕوناکبوونەوەی ڕۆحداو چەند ڕۆژ ئەیهێڵمو ئەیبەمو باسی ناکەم تا دوو شایەتی دادپەروەر لە قورئانو حەدیس شایەتی بۆ ئەدەن، چونکە خوای گەورە گرەنتی ئەوەی داوە پێمان کە قورئانو حەدیس پارێزراون لە هەڵە، بەڵام ئەو گرەنتیەی لە شتێکی تردا پێنەداوین"[٦٤].

شێخ عەبدولقادری گەیلانی ئەڵێت: "طر الى الحق بجناحي الكتاب والسنة" واته: بەهەردوو باڵی (قورئان)و (حەدیس) بفڕە بەرەو خوا. هەروەها ئەڵی: "الزاهد المبتديء يفر من الناس، والكامل يطلبهم كيف لا يطلبهم وكل دوائهم عنده، لذلك قال بعضهم رحمة الله عليه، لايضحك في وجه الفاسق الا العارف، فمن عرف الله أصبح دالاً عليه أصبح شبكة يصطاد بها الخلق في بحر الخطايا أصبح قوة تهزم جنود أبليس"[٦٥].

واته: "دونیا نەویستی سەرەتایی" لە خەڵك خۆی ئەشارێتەوەو کامڵەکانیش بە شوێنیاندا ئەگەڕێن، چۆن بە شوێنیاندا نەگەڕێن کە هەموو دەرمانێکی خەڵکی لای ئەوانە، بۆیە هەندی لە زانایان "ڕەحمەتی خوایان لێ بێ" ئەڵێن: تەنیا خواناسی ڕاستەقینە لە ڕووی گوناهبارلندا پێدەکەنن! هەرکەس خوا بناسێ ئەبێتە دەلاّلی ڕێگەی خوا ئەبێتە تۆڕێك خەڵکی لە دەریای گوناهدا ڕاو ئەکاتو دەریان دێنێ ، ئەبێتە هێزێکی وا سەربازانی شەیتان توشی شکست ئەکات.

غەزالیش ئەڵێت: أعلم ان سالك سبيل الله تعالى قليل والمدعي فيه كثير ونحن نعرفك علامتين فاجعلها امام عينيك و تعتبربهما نفسك وغيرك..

فالعلامة الأولى: أن تكون جميع أفعاله الأختيارية موزونة بميزان الشرع موقوفة على حد توقيفاته أيرادا واصدارا واقداما وأحجاما..

والعلامة الثانية: قال الهوجيري في الكشف: الشريعة من غير الحقيقة نفاق، والحقيقة من غير الشريعة الحاد، وتداخلهما كتداخل الروح والجسد واقرار المسلم بالاسلام، تشملها جميعا، فقوله: لا اله الا الله هو الحقيقة وقوله محمد رسول الله هو الشريعة فمن أنكر الحقيقة كفر ومن رفض الشريعة تزندق"[٦٦].

واته: چاك بزانە ڕێبوارانی ڕاستەقینەی ڕێگەی خوا زۆر کەمن هەرچەندە بەدەم زۆر کەس ئەو لافە لێ ئەدات، ئێمەش دوو نیشانەت پێ ئەناسێنین کە تۆ بەردەوام لەبەرچاوتدا دایبنێیو بۆ خۆتو بێجگە لە خۆشت ببێتە مامۆستاو دەرس:

نیشانەی یەکەمیان ئەوەیە: هەرچی کاروکردەوەت هەیە کە سەربەستی لە کردنیاندا بە ترازووی شەریعەت بیانکێشی، لەبەردەم سنوورەکانی شەریعەتدا بوەستی لە کاتێکدا ویستی شتێك ئەکەی یان بڕیاری نەکردنی ئەدەی یان بەرەو ڕووی ئەچێ یاخود لێی ئەگەڕێیتەوە.

نیشانەی دوهەم ئەوەیە: کە هوجیری لە کتێبی (الکشف)دا ئەڵێ: "شەریعەت" بەبێ "حەقیقەت" دوو ڕووییەو (حەقیقەت)یش بەبێ "شەریعەت" ئیلحادو بێ دینییە، تێکەڵبوونی ئەم دووانەش وەك تێکەڵبونی گیانو لەشە، موسڵمانیش کە دان بە ئیسلامدا ئەنێ ئەوە دان بە هەر دووکیاندا ئەنێ، کە ئەڵێ (لااله الا الله) مەبەست (حەقیقەتی

---

[٦٢] ـ التربية الروحية بين السلفيين والصوفيين / الشيخاني، ص٩٥.

[٦٣] ـ التربية الروحية بين السلفيين والصوفيين / الشيخاني، ص٩٥.

[٦٤] ـ تربيتنا الروحية / سعيد حوى، (ص٩).

[٦٥] المنطلق الراشد، ل١٥.

[٦٦] التربية الروحية، ص٩٥.

ئیسلامه)و كه ئەڵێ (محمد رسول الله)دان به شەریعەتی ئیسلامدا ئەنێ، كەواته هەركەس نكولی له (حەقیقەت) بكا ئەوه كافرەو هەر كەسیش نكولی له (شەریعەت) بكا ئەوه زەندیقه".

ئەمه له كوێ‌و ئەوه له كوێ كه بڵێیت: "من‌و خوا جیاوازیمان چییه، یان خوا له ناو ئەم "جوببه"ی مندایه، یان بڵێ: ئالآی من له ئالآی محمد ﷺ بەرزترو شەكاوەتره یان بڵێی منیش ئەتوانم قورئان بهێنم .." [٦٧]. بۆیه لەڕاستیدا "گشتاندن" مرۆڤ ئەخاته ناو ستەم‌و ناو نەزانینەوەو ئەو دوانەش خاوەنەكەی زۆر سووك ئەكات ..

هەر بەو شێوەیه نووسەر یەك به یەكی خەلیفەكانی "بەنی ئومەیه" یەكسان ئەكات‌و تەنانەت هێرشی بەردەوامی خۆشی ئەكاته سەر یەكێكی وەك "عومەری كوڕی عەبدولعەزیز"و به لاقرتی و گاڵته پێكردنەوه ئەڵێ: "ئازاردان‌و سوكایەتی ئەو سیاسەته چەوت‌و ناڕوایه بوو دەوڵەتی ئەمەوی له بەرانبەر خەڵكی ناموسوڵمانیش به خراپترین شێوه پەیڕەوی دەكرد، خەلیفه عومەری كوڕی عەبدولعەزیز "كه له مێژووی ئیسلامدا به خاوەنی بەرنامەی ڕیفۆرم ناوی دەركردووه لەچاو خەلیفەكانی تری ئەمەویدا به هەزار ئاو شۆراوەتەوه (!!)و مێژوونوسان قسه له دادپەروەری ئەكەن ... هتد" [٦٨].

نۆ: ئەم گومان‌و دوو دڵی دروستكردنانه لای نووسەری كۆمەڵگا تازەن، بەڵام لای ئێمەی ئەهلی ئیسلام زۆر كۆن‌و له زووەوه خەڵكی ناحەز به دین خەریكی ئەمەن، (ئەنوەر ئەلجوندی) كه نووسەرێكی ئیسلامی میسرییه له كتێبی "قضايا الادب والثقافة والفن . كشف سموم كتب التغريب والغزو الفكري"دا باسێكی دورو درێژی ئەم هێرشه فیكری‌و ڕۆشنبیرییه بۆ سەر ئیسلام‌و دونیای موسڵمانان ئەكات‌و به بەڵگەنامەو دیكۆمێنت قسەكانی ئەسەلمێنێت ... سەرەتای ئەم هێرشه فیكرییه ئەگەڕێتەوه بۆ ئەو ڕسته به ناوبانگەی كه"لویسی نۆیەم" پاش شكست خواردنی ئەوروپا ڕایگەیاند له هێرشه خاچپەرستییەكاندا كه وتی: ئەبێت لەمەودوا شەڕی ووشه (حرب الكلمة) ڕابگەیەنین "ئەنوەرلجوندی" كورتەی ئەو بەرنامانەی ڕۆژئاواو ڕاستترو ووردتر"بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی‌و بزاڤی به فەڵەكردن "تەبشیر" دایان نا بۆ"تەغریب"" [٦٩] كردنی دونیای ئیسلام‌و موسڵمانان‌و پەرچ دروستكردن له بەردەم زیندوبوونەوەی شەریعەتی ئیسلامدا، تا نەیەتەوه سەر حوكم، لەم خاڵانەدا كورت ئەكاتەوه:

١. دروستكردنی گومان‌و دوو دڵی لەسەر مەسەلەكانی (حدود) له شەریعەتی ئیسلامدا.

٢. سەلماندنی ئەوەی شەریعەتی ئیسلام دۆگماو وەستاوەو قابلیەتی گەشەو خۆ نوێ كردنەوەی نییه.

٣. سەلماندنی ئەوەی شەریعەت تەنیا له "زەمانی خولەفای ڕاشیدین"دا جێبەجێ كراوەو لەوەو دوا توانای "بەخشین"و "وەڵامدانەوەی" نەماوه.

٤. گەمارۆدانی دونیای ئیسلام به "سستەمێكی ئابوری سوو خۆر" (النظام الربوی).

٥ . دەستكاریكردنی یاسا جۆربەجۆرەكان بەو شێوەیەی بگونجێ لەگەڵ ئەم كۆمەڵگانەدا.

٦. ناشیرینكردنی زمانی عەرەبی و گومان دروستكردن لەسەری [٧٠].

٧. بانگەشه كردن بۆ زیندوكردنەوەی "فیرعەونییەت"" [٧١].

---

[٦٧] ـ كۆمەڵگا لاپەڕەكانی (٢٤٠) بەدواوه.

[٦٨] ـ كۆمەڵگا لاپەڕەكانی ٢٤٠ به دواوه.

[٦٩] ـ تەغریب: واته هەوڵدان بۆ گواستنەوەی فیكرو عورف‌و بەهاكانی ڕۆژئاوا بۆ ناو دونیای ئیسلام بێگوێدانه دین‌و عورفی ئیسلام‌و موسڵمانان (أنور الجندی، قضايا الثقافة والفن والأدب، ص١٥).

[٧٠] ـ ئێستا بۆ نموونه ئەم هێرشه له كوردستاندا زیاتر تاوی سەندووه به هەموو شێوەیەك زمانی عەرەبی لەبەرئەوەی زمانی (قورئان‌و حەدیس)ن نەك زمانی میللەتێكی تایبەتییه ناشیرین دەكرێت بۆ ئەوەی نەوەیەك دروست بێت نه عەرەبی بزانێت‌و نه زمانی عەرەبیشی خۆش بوێت،تەنانەت هەوڵی زۆر ئەدرێت بۆ به لاتینی كردنی پیتی كوردی تا به بەردێك دوو چۆلەكه بكوژن، بچڕاندنی كورد له كەلتوره ئیسلامییەكەی‌و دابڕان بۆ یەكجاری له زمانی عەرەبی‌و پیتی عەرەبی! ! بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم هەوڵه سەیری (پرسیارەكان هێشتا تینوی وەرامن، چاوپێكەوتن لەگەڵ فەرهاد شاكەلی) بكە.

[٧١] ـ له میسردا فیرعەونیەت‌و له عێراقدا "ئاشوریەت‌و بابلیەت"و له كوردستاندا "زەردەشتییەت".

٨. گەشەدان بە بزاڤی ڕۆژهەڵاتناسی (حركة الاستشراق)و (بزاڤی تەبشیر)و بڵاوكردنەوەی ئەو كتێبانەی كە باس لە بیروڕاو ڕۆشنبیری "گروپە لادەرەكانی" (الفرق الضالة) ئەكات لە ئیسلامدا وەك "تەصەوفی فەلسەفی"و "بزاڤە باطنییەكان" "قەرمەتییەكان" "قادیانی" "بابییەكان"[٧٢]...هتد.

٩. دانانی بیری هاوردەی "ناسیونالیزمی" لە جێگەی بیری"ئوممەتی ئیسلامی".

١٠. دەرهێنانی ئافرەتانو دورخستنەوەیان لە پەیامە ڕەسەنەكەی خۆیان[٧٣].

"ئەنوەر لجوندی" بە درێژی باس لە هەر یەك لەوانە ئەكاتو وورد ئەیانسەلمێنێتو نموونەیان لە سەر دێنێتەوە، بەڵام ئێمە تەنیا یەك دوو نموونەیان باس دەكەین تا دەربكەوێت ئەمەی فوئاد مەجید میسری باسی ئەكات هەر ئەوەیە كە خەڵكی تر، لە سەرەتای (سییەكان)و پاشان سەرەتای هەشتاكانەوە باسیانكردووەو بۆ ماوەیەك خەڵكی پێوە سەر قاڵبووەو دواتر كە هۆشیانكردۆتەوە، هەستیان بەو ژەهرە كردووە كە خراوەتە ناو ئەو بیروڕایانەوە...

ئەنوەرلجوندی دەربارەی ناشیرینكردنی زمانی عەرەبی ئەڵێت "دیارترین هەنگاوەكانی هێرشی ئیمپریالیزمی بریتی بوو لە پیلان بۆ پەككستنی زمانی "عەرەبی فوصحا" بەوەی گەمارۆ بدرێتو بڵاونەبێتەوە هەر لەماڵەكەی خۆیدا سەركووت بكرێتو گومانی بەرتەسكیو بێ هێزیو دواكەوتویی بە دەوریدا دروستبكرێت" ... لەو كەسانەی كە ڕێبەرایەتی ئەم هێرشانەیان كرد لە میسردا بریتی بوون لە "لوطفی السید"و "سعد زغلول"و "سلامه موسی"و "عبدالعزیز فهمی"و "لویس عوض"[٧٤] ... هتد.

"لویس عوض" لە كتێبی "مقدمة فی اللغة العربیة"دا هەوڵی ئەوە ئەدات كە بیسەلمێنێت زمانی عەرەبی پڕە لە ووشەی عیبریو فارسیو نەبەتی ..هتدو بۆ نموونە ئەڵێت: وشەی "صمد" ووشەیەكی عەرەبی نییەو لە ووشەی (حمت)ی عیبرییەوە هاتووەو ماناكەشی واتە "سیٓ".

لە كاتێكدا ئەمە لە چەند ڕوویەكەوە هەڵەیەو نەزانینی تێدایە بە زمانی عەرەبیو ئێمە لێرەدا باسەكەمان ئەوە نییەو ڕێچكەی ئایەتەكانی سورەتی "الاخلاص" خۆشی ئەوە ڕەت دەكاتەوە.."و هەموو ئەو سەرچاوانەش "لویس عوض" بەكاری هێناون، سەرچاوەی ڕۆژهەڵاتناسانو جولەكە مەزهەبەكانن مەبەست لێیان دروستكردنی بینشێكی ژەهراوییە لە ئاسۆی ئیسلامدا تا حەقیقەتە ڕۆشنەكانی ئیسلام داپۆشێت"[٧٥].

بۆ خاڵی (هەشتەم)یش ئەنوەر لجوندی ئەڵێت: "ڕۆژهەڵاتناسان زۆر بە تەركیزەوە ڕاڤەو شەرحی ئەو "ئەفكارانە" ئەكەن كە خۆیان خزاندووەتە ناو مسوڵمانانەوە لە ڕێگەی فەلسەفەی هاوردەوەو ئەیانەوێت بەشێوەیەك باسیان بكەن، كە ئەو ئەفكارانە لە سەنتەرو جەوهەری ئیسلامدا هەنو لەولاشەوە چاو لەو هەموو وەڵامە زانستیانە دائەخەن كە زانایانی ئیسلام داویانەتەوە دەربارەی ئەو (ئەفكار)انە وەك "ابن حەزمو غەزالیو ئیبن تەیمییەو قازی ئیبنولعەرەبی و ئیبن جەوزی...و غەیری ئەوانیش كە بە هەموو شێوەیەك فیكری ئیسلامیان لە ژێر چنگی ئەو بیروڕایانە ڕزگار كردووە "[٧٦] هەروەها ئەڵێت بەبێ دوو دڵی ترسناكترین كارێكیش كە ڕۆژهەڵاتناسان پێی هەستاون ئەوەیە كە"موسوعات"ێكی زۆریان داناوە بۆ كۆكردنەوەی هەموو ئەو ئەفكارو بیرە لادەرانە بۆ ئەوەی ئامادە بێتو بە ئاسانی نووسەرێك كە ویستی لێیان بگوازێتەوە، نەگەڕێتەوە بۆ سەرچاوە ئەسڵیەكان چونكە سروشتی هەندێ نووسەرو "لێكۆڵەرەوە" ئەزانن كە لە سەر "متمانە"! ئەو شتانە ئەگوازنەوە بێ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەرچاوە ئەسڵیەكان تا بزانن چەند ڕاستەو چەند ناڕاستە".

---

[٧٢] ـ كتێبی كۆمەڵگاكەی فوئاد مەجید سەرتاپا لەم بابەتانەیە.

[٧٣] ـ أنور الجندی، قضایا الثقافة والفن والادب، (ص٤٥تا ٩٨).

[٧٤] ـ أنور الجندی / قضایا الأدب، ل٦٠.

[٧٥] ـ أنور الجندی (قضایا الأدب) ل٦٩.

[٧٦] ـ هەمان سەرچاوە ل٧٥.

**١٠: یەکێکیتر لەو تێبینیە گشتییانەی ئەکرێت لە کتێبی کۆمەڵگای فوئاد مەجید میسری ئەوەیە کتێبی "النزعات المادیە فی الفلسفە العربیە الاسلامیە"ی حسین مروەی هێناوەو زۆرترین بابەتی لێوەرگێراوە کە ئەویش بە دەوری خۆی لە کتێبی "تاریخ التمدن الاسلامی" جورجی زیدان" زۆرترین ڕاوبۆچوونی لە سەر مێژووی ئیسلامی بە ئەمانەتەوە سەر لەنوێ دایڕێژاوەنەتەوە، لە کاتێکدا نە جۆرجی زیدانو نە کتێبی "تاریخ التمدن الاسلامی" ناکرێ سەرچاوەی ڕەسەنی ئیسلامی بن بۆ وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامی یان بیروڕا لەسەر ئیسلام لەبەر زۆر شت:**

**١. لەبەر ئەوەی جۆرجی زیدان نووسەرێکی مەسیحی مەزهەبەو کابرایەکی دەمارگیرەو ناتوانێت بە ویژدانەوە لە سەر ئیسلامو مسوڵمانان بنوسێت.**

**٢. کتێبەکەشی نرخی زانستی نیەو پێویستە بۆ "زانیارییەکانی ناو ئەو کتێبە" خوێنەر بگەڕێتەوە سەر سەرچاوە ئەسڵیەکان..**

**دکتۆری هەڵکەوتووی هیندی "شبلی النعمانی" ئەڵێت: "ان الدهر دار بالعجائب، ومن احدی عجائبە ان رجلا من رجال العصر" جورجی زیدان (صاحب الهلال) یولف فی تاریخ التمدن الاسلامی کتابا یرتکب فیە تحریف الکلم وتمویە الباطل وقلب الحکایة والخیانة فی النقل وتعمد الکذب ما یفوق الحد ویتجاوز النهایة وینشر هذا الکتاب فی مصر وهی غرة البلاد وقبة الاسلام ومغرس العلوم، ثم یزداد انتشارا فی بلاد العرب والعجم، مع هذا کلە فلا یتفطن احد لدسائسە ولم یکن لیجترىء علی مثل هذە الفضیحة فی مبتدأ الامر ولکنە تدرج الی ذلك شیئا فشیئا، فانە أصدر الجزء الاول من هذا الکتاب وذکر فیە مثالب العرب دسیسة یتطلع بها الی أحساس الامة وعواطفها و لما لم یذتبە لذلك أحد و لم ینبض لأحد عرق ووجد الجوّ صافیا أرخی العنان وتمادی فی الغي وأسرف فی النکایة علی العرب عموما وخلفاء بنی أمیة خصوصا"[٧٧].**

**پاشان دکتۆر شبلی النعمانی هەڵەو تەزویرکارییەکانی جۆرجی زیدان ئەکاتە چەند بەشێکەوە کە گرنگترینیان ئەمانەن:**

**١. دەرخستنی ڕەگەزپەرستی عەرەب لە بەرامبەر غەیرە عەرەبدا.. نووسەر لەمەدا زۆر ڕۆ ئەچێتو زۆر لە سەری ئەڕوات ... بەڵام دکتۆر نعمان ئەڵێت: "ئەوە بزانن کە نووسەر(مەبەستی جۆرجی زیدان)ە بۆ بازاڕ دروستکردن بۆ شتە ناهەقەکانی زۆر ڕێگە ئەگرێتە بەر، لەوانە: درۆی ئەنقەست، هەروەها گشتاندنی ڕوداوێك بە سەر هەموو مێژودا، هەروەها گزیکردن لە زانیاری گواستنەوەداو گۆڕینی مەبەستی قسەکان، هەر لەو ڕێگایانەی کە نووسەر پەنای بۆ بردووە: بەکارهێنانی سەرچاوەی بێمتمانەی وەك کتێبەکانی "وانەکانی قوتابخانە"و کتێبی گاڵتەو گەپ کە هەر کەسێك شارەزای مێژووی "فارسیو عەرەبی" بێت ئەو شتانەی لێ ون نابێت"[٧٨].**

**٢. باسکردنی عەیبو عاری بەنی ئومەمەیە... دکتۆر نعمان پرسیارێکی عاقڵانەو جوان ئەکات ئەڵێت: "بابەتی ئەم کتێبە "مەبەستی . تأریخ التمدن الاسلامی . یە" بریتییە لە باسکردنی شارستانییەتی ئیسلامی، ئیتر چ پەیوەندییەکی هەیە بەوە کە بێت باسی خراپەکانی "بەنی ئومەمەیە" بکەی!![٧٩]**

**٣. هەوڵدان بۆ ئەوەی بیسەلمێنێت بە فەرمانی"عومەری کوڕی خەتتاب" کتێبخانەی ئەسکەندەریە سوتێنراوە... جۆرجی زەیدان بە هەموو شێوەیەك ئەیەوێت ئەوە بسەلمێنێتو لە هەموو کونجو قوشبنێکدا بەڵگەی ماشیوەتەوە شەش بەڵگەی لێ دروست کردون کە یەکێکیان ئەوەیە کاتی خۆی عەرەب زۆر حەزیان لەوە بووە بێجگە لە قورئان هەموو شتێکی تر بسوتێننو بفەوتێنن. بەڵام دکتۆرشبلی نعمانی ئەو درۆیە ڕەت ئەکاتەوەو ئەیسەلمێنێت کە: عەرەب کتێبەکانیان**

---

[٧٧] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە، شبلی النعمانی: زانایەکی گەورەی هیندستانە خاوەنی چەند کتێبی گەورەیە لە مێژوو فیکری ئیسلامیداو لەوانە کتێبێکی هەیە لە ژیانی پێغەمبەر کە (حەوت) بەرگەو بە (بیبلۆگرافیای سیرەی پێغەمبەر (ﷺ) دائەنرێت". "الرسالة المحمدیة / سلیمان الندوی، ص٩".

[٧٨] ـ لە ڕاستیدا ماوەیەکی زۆرە هەندێ لە عەلمانیەکانی کورد ئەوەندە بێ ترسانە شتی غەلەتو پەلیت ئەنوسنو وا ئەزانن کەس نییە بەو هەڵەو تەزویرکاریو خراپ حاڵی بوونانەیان بزانێتو بۆ خۆشیانو خەڵکیش ڕۆشن بکاتەوە، کە ئەمانە نەك نووسەری زانلو بە ویژدان نین بەڵکو وەك کاك فازیل قەرەداغی دەڵێت: دەرچووی چەرخی زێڕینی نەخوێندەوارین.

[٧٩] هەمان سەرچاوە، ل٤٢٤.

**پڕیەتی لە زانیاری گواستراوە لە کتێبی میللەتانی ترەوە، جا ئەگەر ئەو کتێبانەیان نەدیبێتو نەمابنو لێوەی نەیانگواستبێتەوە چۆن زانیویانە..... بەڵگەی تری زۆریش باس دەکات بۆ ڕونکردنەوەی ئەو ڕیوایەتەی باسی سوتاندنی کتێبخانەی ئەسکەندەریە ئەکاتو بەهێزترین بەڵگە ئەکاتە دوو خاڵ:**

**أ. ئەو مەسەلە هەر لە ئەساسدا ڕووی نەداوەو بەهیچ شێوەیەك لە کتێبە مێژووییەکانی وەك تەبەریو ئیبن ئەسیرو بەلازەری....هتد باسی نەهاتووە.**

**ب ـ ئەو کتێبخانەو گەنجینەیە هەر پێش ئیسلام فەوتاوەو نەماوەو ئەمەش بە بەڵگەوە ئەسەلمێنێت [80].**

**٤ ـ فشار بردن بۆ "ئەهلی زیمە" جۆرجی زیدان بە هەموو شێوەیەك ڕۆشنای ئەخاتە سەر ئەم مەسەلەیەو ئەیەوێت تەنانەت عومەری کوری خەتتابیش بێبەش نەکات لەم ستەمەو باس لەوە ئەکات کە خەلیفە عومەر فشاری زۆری لە سەر"نەصارا"ی شام دروست کرد بوو چونکە مەیلیان بە لای قەیصەری ڕۆمدا هەبوو، دکتۆر شبلی نعمانی زۆر وورد ڕەتی ئەمەش ئەکاتەوەو پێچەوانەکەی ئەسەلمێنێت.**

**جا بابێینەوە سەر مەبەستی سەرەکیو باسەکەمان کورت بکەینەوەو بڵێین: "کتێبی کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا" کە هی فوئاد مەجید میسرییە کتێبێکە زیاد لە ڕەخنەو تێبینییەك هەڵدەگرێت کە ئێمە "١٠" تێبینی گشتیمان لە سەری ووتو درێژەی تێبینییەکانمان هەڵدەگرین بۆ شوێنە جیاجیاکانی کتێبەکەو مەبەستمان بوو نووسەرو خوێنەری "کۆمەڵگا" بینشێکی گشتی لە سەر ئەو کتێبە وەربگرنو پاشان بەو بەرچاو ڕونییەوە لەگەڵمان بن بۆ خوێندنەوەی تەواوی کتێبەکەو تا بزانین ئێمە یان فوئاد مەجید میسریو هاوبیرانی یەکێکمان هەق دەڵێینو ئەوی ترمان ناهەقی ئەکاتو بوختانی خەڵکی ئەگوازێتەوە..**

[80] "وڵ دیورانت" لە کتێبی "قصە الحضارة: (٢٦٣/١٣)دا ئەڵێ: زۆربەی مێژوونووسان ئەمە بە خورافە ئەزانن" کەچی چەندان نووسەری وەك فوئاد مەجید میسری و هاومەبەستو هاوبیرانی تا ئێستا هەر لە ناو ئەم خورافەدا ئەژین کە هیچی کەمتر نییە لە خورافەی مارەکانی سەرشانی زووحاك!

## پێشەکییەکەی فوئاد مەجید بۆ کۆمەڵگاکەی

نووسەر ئەڵێت: "مێژوو بێجگە لە ململانێی چینایەتی شتێکی تر نییە".

ئێمەش ئەڵێین: ئەمە ئەو قسە"پیرۆز"ەیە لای فوئاد مەجیدو هاوبیرانی کە ئەیانخاتە هەڵەو بەزۆر ئەیانەوێت تەفسیری مێژووی پێبکەن. جاریٚ ئەم قسەیە نەقورئانەو نەحەدیسە، بەڵکو ڕاوبۆچونی کەسێکەو ئەگونجێت ئەمە وابێت یان وانەبێت، کە لە ڕاستیدا وانییەو ئەمەش چەند بەڵگەیەك:

أ . ئەم تەنیا ڕایە ناکرێت بدرێت بە کۆڵی هەموو کەسێکداو سیفەتی پیرۆزی وەربگرێت، چونکە چەند ڕای بەرامبەری هەیەو لەو جوانترو زانستی تر نەبن وەك ئەون.

ب . مێژوو بە چەند فاکتەر دروست ئەبێت: "فاکتەری دین، فاکتەری ئابوریو بەرژەوەندییەکان، فاکتەری سێکس، فاکتەری فیکرو ڕۆشنبیری.

ج . هەموو ئەو مێژووانەی کە ململانێی چینایەتی دروستی کردون " کاتیی"و "بیٚ خێر" بوون بەپێچەوانەی ئەو مێژووانەی "دین"و "ڕزگارکردنی مرۆڤ لە ئەفسانەو ستەم" دروستیکردون، تەنیا بۆ بەراوردکاری سەیری "کاریگەری فتوحاتی ئیسلامیو هەڵمەتەکانی خاچپەرستی بکە"... ئەمەیان بۆ نەماو ئەویان بۆ هەر مایەوە لە ناو ئەو میللەتانەدا، دیارە ئەمیان بۆ داگیرکاریو بە فاکتەری ئابووری بەرپا ئەبوون و ئەویان بۆ فەتحکردنو بە فاکتەری دینو بلاوکردنەوەی دین بەرپا کراوە.

٣ . شۆڕشی ڕۆشنبیریی و دینیی لە زیاندا زۆر لە خوار زیانەکانی شۆڕشی چینایەتی دایەو کە ناخی مرۆڤێك بە شۆڕشی چینایەتی گۆش دەکرێت زۆر سەقەتو ئاڵۆزە لەچاو ئەوەی بە دینو بیرو ڕۆشنبیریو ڕەوشت گۆش دەکرێت.

لە هەمان لاپەڕەدا ئەڵێت: "باوەڕ کە شێوەیەکە لە شێوەکانی هۆشیاری کۆمەڵایەتی، دیاردەیەکی مێژووییە" پاش یەك دوو دێڕی تر دەربارەی باوەڕ دەڵێت: "هێزێکەو ئادەمیزاد پێی وایە دەستی لە هەموو کارو کردەوەیەکدا هەیە"و پاشان لەناو کەوانەدا ئەڵیٚ "وێنەیەکی هێزەکانی سەر زەمینەو لە زەینییدا چووەتە شێوەی هێزێکی ژوور زەمینییەوە".

ئەم "سەرنجە زانستییانەی فوئاد مەجید "!! لە دوو ڕووەوە هەڵەن:

١. ئەوە تەفسیرێکی ماددییە بۆ مەسەلەکانی "ئیمان"و "عەقیدە" و هەر لە ڕێگەوە تۆوی کۆمەڵێکی زۆر هەڵەی لە خۆگرتووە.

٢. ئەوە تەنیا ڕایەکە بۆ تەفسیرکردنی دیاردەی دینداری کە لە ڕاستیدا بە پێی لێکۆڵینەوەی تازە دوو جۆر بۆچوون بۆ گەشەی دینی هەیە:

یەکەم: دین وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و دەستکرد.

دووەم: دین وەك حەقیقەتێکی ئاسمانی و خوایی.

یان ڕۆشنتر بڵێین: دینەکان دوو جۆرن: دینە دەستکردەکانو دینە ئاسمانییەکان.. دینە دەستکردەکان واتە ئەو دینانەی کە مرۆڤەکان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆحی خۆیان پەنایان بردووەتە بەر داهێنانی هەندیٚ "مەشقی ڕۆحی"و "طقوسی عیبادی" بۆ تێرکردنی ڕۆحو دەرونیان چونکە "دینداری" وەك زانایانی دەرونزانی باسی دەکەن "غەریزەیە"و مرۆڤ ئەجوڵێنێت بۆ دەستخستنی، وەك چۆن "غەریزەی سێکس" مرۆڤ ئەجوڵێنێت بۆ خۆتێرکردن یان غەریزەی خواردن یان "بەرگری لە خود" یان "موڵکیەت"... هتد. جا ئەگەر لە شتی ڕێگەپێدراو و باشدا دەستی کەوت ئەوە پیادەی ئەکاتو ئەگەرنا ئەوە ناچارە بۆ پڕکردنەوەی پەنا بۆ شتی ڕێگەپێنەدراوو خراپ بەرێت، بۆ نموونە: مرۆڤ ئەگەر ژنی حەڵاڵی خۆی دەست کەوت ئەوە کاری سێکسی لەگەڵ ئەکاتو خۆ ئەگەر ژنی حەڵاڵی خۆی دەست نەکەوت ئەوە لائەداتو پەنا بۆ زیناو ناموس شکێنی ئەبات یان پەنا بۆ "استمنا" و بەکارهێنانی ئاژەڵ ئەبات، بۆ دینیش هەروا ئەگەر دینی ڕاستەقینەی ڕۆشنی خۆی هەبوو ئەوە پێڕەوی لیٚ ئەکاتو ئەگەرنا ئەوە پەنا ئەباتە بەر "شیرك"و دینە بەتاڵەکان یان پەنا ئەباتە بەر ئەفسانەو فالٚو قاوەگرتنەوەو قسەی کوتو پیرەژنو داهێنانی بتو خوای دەستکرد! ئەوەی یەکەمیان ڕێك ڕۆشتنە لەسەر

سروشتی ڕاستەقینەی خۆی‌و ئەمەی دووەمیان لەهەر دوو حاڵەتەکەدا بریتییە لە"لادان لە سروشت‌و"فطرەت". کەواتە "باوەڕ" ئەکرێت بکەینە دوو بەش:

باوەڕی ڕاست .. باوەڕی چەوت ..

باوەڕی دینی کە دابمەزرێت لە سەر"دڵنیایی"و "یەقین"و "تەسلیم بوون"، باوەڕێکی ڕاست‌و سروشتییەو باوەڕی چەوتیش ئەوەیە لە سەر"دوودڵی‌و گومان"و "لێکۆڵینەوەی هەڵە" یان لەسەر "چەمکی سەقەت"و "نیازی سەقەت" دروست ئەبێت...

"چەمکی سەقەت" وەك "ئەفسانە"و "تەفسیری ماددی بۆ دین‌و دیاردەی دینداری" ... هتد. "نیازی سەقەت" یش وەك "بەرژەوەندی تەسکی تاکە کەسی" یان "بەرژەوەندی ناوەندێکی دەسەڵات" وابکات "چەمکێکی سەقەت" بۆ دین برەو پێ بدرێت‌و پڕوپاگەندەی بۆ بکرێ. بەڵام فوئاد مەجید ئیتر بە ئارەزووی خۆی کەوتووەتە شیکردنەوەو تەفسیر کردنی "باوەڕ"و جارێ دەڵێ: "باوەڕ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌و مێژوو کردە" ل٤، "باوەڕ لە قۆناغێکی هەڵکشاوتری مێژوودا لە بیرۆکەی یەگانەیی "فکرە التوحید"دا خۆی نواند ل٤. "باوەڕ پێ لە سەر قایل بوون‌و قەناعەتی مرۆڤ دادەگرێ"ل٥، "باوەڕ ڕێگا بە بیرکردنەوەو لێکدانەوەی عەقڵی‌و مشتومڕو ڕەخنەگرتن نادات "ل٦، "باوەڕ بناغەیەکی ناعەقڵانی هەیە"ل٦ ... جا خۆ ناکرێت لە سەر دێڕ بەدێڕی ئەو بنوسین‌و ناچار هەندێکی زۆری جێدەهێڵین‌و تەنیا هەڵوێستەیەك لەسەر یەك دوو بڕگەی ئەکەین‌و بەشی خەڵکی تریش زۆر ئەهێڵینەوە کە بیانەوێت لە سەر کۆمەڵگەکەی فوئاد مەجید میسری بنوسن.

نووسەر ئەڵێت : "باوەڕ... ڕای دەگەیەنێت: جیاوازی کۆمەڵایەتی نێوان کەسێك‌و کەسێکی تر، قیسمەت نسیبێکە هێزێکی دەرەکی بۆ بنیادەمی بڕیوەتەوە و ناشێ بەربەرەکانەی بکرێ، باوەڕی وا گەورەترین خزمەت بە سیستەمی چەوساندنەوە دەگەیەنێت ...."ل٥.

ئەم"قەناعەتە فیکرییە"ی نووسەر لە چەند لاوە بوختانە:

١. دینی ئیسلام هیچی وای نەوتووە.

٢. خەڵکی موسڵمان هیچیان وانە بوون‌و وا نین.

٣. هێزی ئیسلامی لە شۆڕشداو لە دەوڵەتیشدا هیچ کات وەها قەناعەتێکی نەبووە.

٤. خەڵکی بە ویژدانیش هیچیان وا ناڵێن.

بۆ ئەمەی کە ئیسلام واناڵێت، وەرە هەموو قورئان بخوێنەرەوە بزانە لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی نووسەری کۆمەڵگاوە ئاراستەی خەڵکی ناکات؟!

. خوای گەورە دەفەرموێت: "إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِمْ" واتە: خوای گەورە بارودۆخی هیچ (کەسێك) یان (هیچ گەلێك) ناگۆرێت تا خۆیان هەڵنەسن بە گۆڕانکاری جا ئیتر لە (چاکەوە) بۆ خراپ بێت یان لە (خراپەوە) بۆ چاك بێت.

. پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: "ان الله يلوم على العجز ولكن عليك بالكيس، فاذا غلبك امر فقل حسبيى الله ونعم الوكيل"[81]. واتە: خوا لۆمەی مرۆڤ ئەکات لە سەر تەمەڵی‌و دەستەوسانی بۆیە ئەرکی سەرشانتە ژیرانە بژیت، ئەگەر شتێکیش دەستی لێ کردیتەوە بڵێ: "خوام بەسەو هەر ئەویش باشترین پشت‌و پەنایە".

.. عومەری کوڕی خەتتابیش ئەفەرموێت: "نفر من قدر الى قدر". ئێمە لە"قەدەر"ێك ڕائەکەین بۆ "قەدەر"ێکی تر.

.. عەبدولقادری گەیلانیش ئەفەرموێت: "العارف من ينازع القدر لا من يوافق القدر". واتە: خواناسی ڕاستەقینە ئەوەیە بەرانبەر "قەدەر" بوەستێت‌و بیبەزێنێت، نەك تەسلیمی ببێت‌و چۆکی بۆ دابدات!

[81] جامع العلوم والحكم : ابن رجب الحنبلي (٥٠٧/٢) ورواه أبوداود (٣٦٢٧).

.. "علی"یش ئەفەرموێ " لعلك تظن قضاءا واجبا وقدرا حتما، لو كا ن كذلك لبطل الثواب والعقاب ولسقط الوعد والوعيد ولما كان تاتى من الله لائمة لمذنب ولا محمدة لمحسن ولا كان المحسن بثواب الأحسان اولى من المسيء ولا المسيء بعقوبة الذنب أولى من المحسن"[٨٢].

واتە: وا گومان ئەبەی "قەزاو قەدەر" حەتمییەو ناتوانی خۆتی لێ لابدەی، ئەگەر ئەوە وابێت کەواتە "پاداشت" و "سزا" شتێکی بەتاڵەو هەڕەشەو پەیمانیش بێ مانا ئەبێتو نابێت لە خوای گەورەوە لۆمەی هیچ گوناهبارێك بکرێت یان پەسەندیدەی هیچ چاکەکارێك بکرێت، ئەگەر ئەوەی تۆ وابێت کابرای چاکەکار شایەن تر نییە بۆ پاداشتی باشە لە پیاوە گوناهبارەکەو پیاوە گوناهبارەکەش شایەن تر نییە بۆ سزای خراپە لە پیاوە چاکەکارەکە"!

ئیتر ئەوە قسەی خوا، ئەوە قسەی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە قسەی سەحابەو ئەوە قسەی خواناسانیش، نازانم ئیتر نووسەری کۆمەڵگا ئەم شتەی لە کوێوە هێناوە؟!

زیاد لەمەش، خەڵکی موسڵمان نەوابوونو نەواشن. وانەبوون، ئەوە سەیری مێژوو بکە بزانە چەند ئیجابی بوون لە ژیانداو چەند وورد پەیڕەوییان لەو ڕێنماییە ئیسلامیانە کردووە، نەزان هەوڵیداوە خۆی زانا بکات، هەژار هەوڵیداوە خۆی دەوڵەمەند بکات. بێهێزو بێ "قەوارە" هەوڵیداوە خۆی بەهێزو خاوەن قەوارە بکات، بێ ناوو شۆرەت بە هەوڵی بەردەوام گەیشتووەتە پلەی ناوداری ... هتد، ئەوە مێژوو!

ئەمە ئێستاش، کوا کام موسڵمان بڕوای وایە "ئەو جۆرە قەدەرانە نسیبوو قسمەتێکە و نابێت دەسکاری بکرێت"؟

کێشەی ئەم عەلمانیانە ئەوەیە زۆر بێویژدانی ئەکەن کاتێك باس لە ئیسلامو ئەهلی ئیسلام دەکەنو کاتێکیش بەڕاشکاوی ئەم حەقیقەتە ئەدەی بەڕوویاندا چەکێکی ژەنگاوی دەردەهێننو ڕووی ئەکەنە مسوڵمان، ئێوە تیرۆرستن، ئیرهابیو عاشقی شتی کۆنن!! هەر هەڕەشە ئەزانن!

ئەم دوانە بەس نییەو با فوئاد مەجید بچێتو واقیعی هێزە ئیسلامیەکانی کۆنو نوێ بخوێنێتەوە تا بزانێت کام هێزی ئیسلامی چ لە قۆناغی (شۆڕش)و چ لە قۆناغی (دەوڵەت)دا بڕوای بە وەها قەناعەتێك هەبووە کە نووسەری کۆمەڵگا بە چەسپو سیکۆتین ئەیەوێت بیلکێنێت بە ئیسلامەوە.... هەرچی هێزی ئیسلامی هەیە لە قۆناغەکانی شۆڕشدا بۆ ئەوە کاریان کردووە کە واقیعێکی داسەپاو هەیەو ئەمان ئەیانەوێت بیگۆڕن ... ڕەبعی کوڕی عامر کە بە نوێنەرایەتی سەعدی کوڕی ئەبی وەقاس چووە لای ڕۆستەم، ئەم ڕستە بەناوبانگەی ووت: "الله ابتعثنا لنخرج الناس من عبادة العباد الى عبادة الله ومن جور الاديان الى عدل الاسلام ومن ضيق الدنيا الى سعة الدنيا والاخرة"[٨٣]. واتە: خوای گەورە ئێمەی بۆ ئەوە ناردووە تا مرۆڤەکان لە کۆیلەیەتی کۆیلەکانەوە بۆ عەبدایەتی خوا بەرین، لە ژێر ستەمی ئاینەکانی تردا دەریان بهێنینو بەرەو دادی ئیسلام بیانبەین لە تەسکی ئەم دونیا ڕزگاریان بکەینو بەرەو فراوانی دونیاو ئاخیرەت بیانبەین.

شۆڕشە کۆنو نوێکانیش هەروا بوون .. شۆڕشی سەعیدی کوڕی جوبەیرو عەبدولرەحمانی کوڕی ئەشعەس بۆ سنووردانان بوو بۆ حەججاجی کوڕی یوسفی سەقەفی.. عومەر موختار بۆ دەرکردنی ئیمپریالیزمی ئیتالی"و "شێخ سەعیدی پیران" بۆ لابردنی کەمالیەتو تۆرانیەتی "ئیتحادو تەرەقی" بوو، بزوتنەوەی ئیسلامی بۆ جیهادی حیزبی بەعسو لابردنی ئەو واقعە بوو کە بەعس سەپاند بووی ....

حکومەتو دەسەڵاتە ئیسلامییەکانیش بە هەموو شێوەیەك بەرنامەی گۆرانکاری واقیعەکانی خۆیانیان هەبوو، ئاستی بژێویو باری سەربازیو سیاسی دەوڵەتیان بەشێوەیەکی بەرچاو گەشە پێداوەو عەقڵی ئیسلامی خۆیان چەند ئەفکاری بەرهەم هێنابێت، ئەوەندەش سوودیان لە عەقڵی جگە لە خۆیان بینیوەو سودیان لێ وەرگرتوە.. ئیتر کوا ئەو قەناعەتەی نووسەری کۆمەڵگا باسی دەکات، مسوڵمان نەوێرێت دەسکاری قسمەتو نسیب بکات.. زیاتر لەمەش ئەوە خەڵك چووزانێت کە ئەمە قیسمەتو نسیبی ئەمە!، دەی کاکە فوئاد خۆتو تۆش ئەی خوێنەری بەڕێز! ئەمە "بوختان" نییەو بەزۆر داسەپاندنی شتێك نییە بە سەر ئیسلامو ئەهلی ئیسلامدا؟ تەنیا شتێك کە نووسەری کۆمەڵگای خستۆتە ئەم هەڵە

---

[٨٢] نهج البلاغة، (ص١٢٥).

[٨٣] الرسول / سعيد حوى، ص٨٦.

گەورەیە ئەوەیە مارکسیەت ئەڵێت: "الدین أفیون الشعوب" دین تلیاکی گەلانە، لای نووسەریش ئەمە جێگای وتووێژ نییەو هەر ئەبێ بزن بێت ئەگەر بشفڕێت. بۆ ئەوەش کە کەسی خوێنەوارو بە ویژدان واناڵێن، لەگەڵمان بەردەوام بن لە لاپەڕەکانی داهاتودا ئەمە ڕۆشنتر ئەکەینەوە..

هەر بە هەمان شێوە نووسەر لە (ل٦)دا ئەڵێت: "باوەڕ ڕێگا بە بیرکردنەوەو لێکدانەوەی ئەقڵی و مشتومڕو ڕەخنەگرتن نادات". دەی باشە ئەمە هەر لە ڕێگەوە درۆیەکی شاخدار نییە؟ لەبەر زۆر بەڵگە:

یەکەم: دەقەکانی قورئان و حەدیس باسێکی زۆری بیرو بیرکردنەوە ئەکات و خەڵکی هان ئەدات کە عەقڵ بخەنە کارو لە "ئایاتی ئافاق و ئەنفوس" وورد بینەوەو یاسای لێ دەربهێنین ... ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت:

ـ "أَوَلَمْ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللّهُ مِن شَيْءٍ وَأَنْ عَسَى أَن يَكُونَ قَدِ اقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ". ئەوە بۆ لە مەلەکوتی ئاسمانەکان و زەوی وورد نابنەوە، کێ دەڵێ نزیك نییە "ئەجەل"یان هاتبێتە پێشەوە!!

ـ "وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ".

ـ "أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِم".

ـ "أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقاً فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ". هەروەها هەموو ئەو ئایەتانەی کە ئەفەرمووێت "لعلکم تتفکرون"، "لعلکم تعقلون"، "لعلکم تتذکرون".. هتد. پێغەمبەر "ﷺ" دەفەمووێت: "تفکر ساعە خیر من عبادة شهر".... هتد.

دووهەم: پێغەمبەر (ﷺ) زۆر کاری لە سەر ئەوە کردووە کە خەڵکی "عقل"ی بجوڵێنێت بە زۆر ڕێگا:

ـ بە پرسیارکردن لە سەحابەی خۆی..."اتدرون من المفلس".. تا کۆتایی حەدیسەکە، "من اعجب المؤمن الیکم"... تا کۆتایی حەدیسەکەو هەروەها، . بە مەتەڵ داهێنان لێیان.. "ئەو دارە چییە کە هەرگیز گەڵای ناوەرێت...." تا کۆتایی حەدیسەکە.

ـ بە مشاوەرەکردن پێیان لە "شەڕ"و "ئاشتی"دا. . "اشیروا علی ایها الناس..." ."کێ بۆ فلانە کار بەکەڵکە...".

سێهەم: هانی داون بۆ "اجتهاد" کردن .. بە معاذی کوڕی جەبەلی فەرموو: چۆن قەزاوەت دەکەیت لە مەسەلەیەکدا کە نە "قورئان"و نە "حەدیسی" لە سەر نەهاتووە .. معاذ وتی "اجتهد ولا الو" عەقڵم ئەخەمە کارو هەوڵی خۆم ئەدەمو کەمتەرخەمی ناکەم "پێغەمبەر (ﷺ) قسەکەی پەسەندکردو پشتیوانی لێ کرد.

چوارەم: زانایانی ئیسلام بە"ئیجتهاد"و "ئەقڵکاری" . کە ئیسلام هانیان ئەدات بۆی . توانیان ئەو باڵەخانە گەورەیە لە سیستەمی "فیقهی ئیسلامی"و "بنەماکانی فیکری ئیسلامی"و "بەرنامەی ڕەوشتی ئیسلامی"و "بەرنامەکانی پەروەردەی ئیسلامی" دروست بکەن کە لە مەیدانی یەکەمیاندا پیاوانی گەورەی وەك . ئەبو حەنیفەو شافعی و مالیك و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و داودی ظاهیری و ئیبن حەزم و ماوردی و ئیبن تەیمیەو سەدان و بگرە هەزارانی تر توانیان ئەو سەروەتە فیقهییە گەورەیە دروست بکەن کە یەکێکی وەك "فەمبەری" ڕۆژهەڵات ناسی مەجەڕی ئەڵێت: هەر چەندە سەیری کتێبە فیقهییەکانی ئیسلام ئەکەم زۆر سەرنجم ڕائەکێشن و سەیرم لەوەدێت چۆن مسوڵمانەکان سیستەمی حوکم و بەرنامەی هەموو بوارەکانی ژیانیان لەو فقهەوە وەرناگرن"[84]. لە مەیدانی دووهەمدا پیاوانی وەك "ئەشعەری و غەزالی و ماتوریدی و ئیبن خەلدون و باقەلانی و ئامێدی و ئیبن تەیمیەو ئیبن حەزم و محمد عبدەو ئیقبالێ لاهوری ....هتد"ی دورستکرد سەروەتێکی فیکری وایان بەرهەم هێنا، بەهەق ئەتوانی ناوی "قوتابخانەی بیری ئیسلامی" لێ بنێی ...

لە مەیدانی سێیەمیشدا ئەو هەموو پیاوەی وەك "حەسەنی بەصری"و "جنیدی بەغدادی"و "حارسی موحاسیبی"و "عبدالقادری گەیلانی"و "مەولانا خالیدی نەقشبەندی"و "ئیبن قەیمی جەوزی"و "ئیمامی نەوەوی... هتدی دروست کرد، کە ئەو تێورانەی ئەوان دایان هێنا بۆ پەروەردەی دەروون و گیان تائێستاش جێگەی سەرنجی خەڵکی خوێنەوارو بە ویژدانن ..

[84] ـ نظام الدين عبدالحميد / مدخل الى الفقه الاسلامي ص٨٦.

له مەیدانی پەروەردەی ئیسلامیشدا ئەو هەموو "بنەماو بەرنامە" بۆ پەروەردە کردنی "تاك"و "خێزان"و "کۆمەڵ" دانراوەو تا ئێستاش بەشێوەی "حیزب"و "کۆمەڵو رێکخراو" پەیرەویان لێ ئەکرێتو ئەکرێت ناوی قوتابخانەی پەروەردەییان لێ بنرێت، ئەمانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی ئیسلام عەقڵەکان ئەجوڵێنێتو دەرگای حیوارو موناقەشەو "بەرهەمهێنانی فیکری" بە هەموو هێزێکەوە ئەخاتە سەرپشت. پیاوانی گەورەی وەك "نورسی"و "حەسەن بەننا"و "سید قطب"و "نەدەوی"و "زەهاوی"و ... هتد. هەندێکن لەو پیاوانەی لە مەیدانی "بەرنامەکانی پەروەردەی ئیسلامیدا" ناویان دیارو لەبەرچاوە ..

"الکتاني" لە کتێبی "التراتیب الاداریة فی الحکومة النبویة"دا ئەڵێت: یەکێك لە زانایانی مەزهەبی شافعی "پێنج سەد" حوکمی لەم حەدیسە کورتە دەرهێناوە "یا أبا عمیر ما فعل النغیر".. "ئەبا عومەیر" منداڵێکی ئەبو تەڵحەی ئەنصاری بوو بولبولێکی هەبوو لەماڵەوە ناوی "نوغەیر" بوو، پێغەمبەر(ﷺ) یش بۆ دڵدانەوەی هەموو جارێك کە لە مزگەوتدا ئەیبینی پێی ئەفەرموو "کاکە عومەیر هەواڵی نوغەیر چییە"؟! ... دەرهێنانی سیستەمو یاساکان لە"قورئانو حەدیس" لێکدانەوەی عەقڵیو مشتو مڕ نەبێت چییە؟ ئەو هەموو کتێبە قانونییەی کە عەقڵی ئیسلامی هەڵی گواستوون لە ئیسلام بەرهەمی ڕەخنەو لێکدانەوەی عەقڵی نەبێت چییە؟ کە کۆنگرەی لاهای چەند جار لە ڕاسپاردەکانیدا ئەوەی ڕاگەیاندووە کە "شەریعەتی ئیسلامی دەوڵەمەندترین سەرچاوەیە بۆ یاسا دانان، چونکە ڕێگەی بە ئیجتیهاد داوەو ئەوەی ئەم مەزهەبی فیقهی نەیوتبێت ئەوی تریان باسی کردووە"[85].

پێنجەم: ئیتر بائەوە بوەستێت کە لە سەدە زێڕینەکانی ئیسلامدا عەقڵی ئیسلامی چ بەرهەمێکی گەورەی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کرد لە هەر دوو مەیدانە گەورەکەی شارستانێتیدا، "مەیدانی مەعریفە"و "مەیدانی تەمەددون"و ئاوەدانی، فوئاد مەجید ئەگەر حەوسەڵەو تاقەتی خوێندنەوەی زۆری نییە با تەنیا سەیری دوو کتێب هەیە بیکات:

١. أخطاء المنهج الغربي الوافد . انور الجندي.

٢ . تأصیل مناهج العلوم . انور الجندي.

بۆ ئەوەی تێبگات کە "هیچ زانستێك نییە لەم زانستانەی کە ئێستا ئەخوێنرێن لە قوتابخانەو دانیشتگاکاندا، مسوڵمانان سەرەتاکانیان نەوتبێتو دوای ئەوان پەرەی پێنەدرابێت"[86].

"مسوڵمانەکان یەکەم کەس بوون کە بنەماکانی "المنهج العلمی التجربی"یان دانا پاش ئەوەی بە ڕەخنەی زانستی فەلسەفە تیۆرییەکەی یۆنانیان ڕەت دایەوە"[87].

مسوڵمانان یەکەم کەس بوون کە تیۆرەکانی ئیغریقییان رەت کردەووە دەربارەی فەلەكو دەریاکانو ئەوان بوون جادوگەرییو ئەفسانەیان بەتاڵ کردەوەو لە جێگەیدا باڵەخانەیەکی زانستی گەورەیان بینا کرد بە تایبەتی لە بواری "تەندروستی"دا[88].

"فیکری ئیسلامی" خاوەنی بنەماو ڕێساو یاسای تایبەتی خۆیەتی لە بوارەکانی زانستە سیاسیەکانو زانستی ئابوریو مێژوو زانستی دەرونی دا، بەپێی ئەو ئیجتهادو بۆچوونانەی "ماوردی"و "فارابی"و "ئیبن خلدون"و "بێرونی"و "غزالی"و "ئیبن سینا" دایان هێنا..

ئەو بۆچوونە ئیسلامیانەی کە فەیلەسوفەکانی ڕۆژئاوا لێزانانە لەناو زانستو لێکۆڵینەوەکانی خۆیاندا تواندویانەتەوەو سەرلەنوێ دایانڕشتووەتەوە لە سەرچاوە ئەسڵیەکانی خۆیان دووریان خستۆتەوە. لە بواری (فیکرو تەشریعو یاسا)دا، فیکری ئیسلامی باڵای لە باڵای هەمووان بەرزترەو .. تائێستاش مەشخەڵە لەڕێگەدا[89])، ئەگەر بڵێین

---

[85] تربیة الأولاد في الاسلام / ناصح علوان هەروەها (الی الشباب أولا) هەر هەمان نووسەر.

[86] تأصیل مناهج العلوم / أنور الجندی، ص١٢.

[87] هەمان سەرچاوە ل٥.

[88] هەمان سەرچاوە ل٥.

[89] هەمان سەرچاوە ل٥.

فیکری ئیسلامی هەندێ زیادەکاری بنەڕەتی زیادکردووە بۆ بیری نوێو هاوچەرخی ئێستا ئەوە بەبێ گومان زیادەڕەوی ناکەین "[٩٠].

ئەو بنەمایانەی "ئیبن خەلدون" دەربارەی زانستەکانی عیمرانو ئاوەدانی دایهێناون تائیستاش بناغەن بۆ زانستەکانی (مێژوو)و (ئابوری)و "سیاسەتو ئیدارە"[٩١].

غەزالی چەند سەدە پێش دیکارت باس لە"بنەماکانی فەلسەفەی شەك" ئەکاتو ئەڵێت "فمن لم یشك لم ینظر ومن لم ینظر لم یبصر ومن لم یبصر بقی في العمی والضلال"[٩٢]. هەرکەس گومان نەبات ناگەڕێت بۆ بەڵگەو هەر کەس نەگەڕێت بۆ بەڵگە هیچی لێ حاڵی نابێتو هەر کەسیش لە شت حاڵی نەبێت لەناو کوێریو لاڕێدا ئەمێنێتەوە. با فوئاد مەجید هەر هیچ نەبێت ئەو دوو کتێبە بخوێننەوەو ئەگەر حەوسەڵەشی هەبوو ئەوە با هەندێ لە کتێبەکانی "ئوصولی فقە" یان "مەجموعی فەتاوای . ئیبن تەیمیە" کە زانایەکی ئیسلامی کورد زبانە بخوێیننەوەو لەو کتێبانەوە بۆ ئیسلام بڕوانێت نەك "ئیسلامناسی" میرفطروسو "تأریخ تمدن أسلام"ی جۆرج زیدانو "النزعات المادیه"ی حسین مەروەو .. کە بە قەناعاتی پێش وەخت لە سەر ئیسلام ئەنوسنو ناتوانن "هەر یەکەیان بە فاکتەرێك" بەویژدانەوە لە سەر ئیسلامو ئەهلی ئیسلام بنووسن ..

نووسەری کۆمەڵگا ئەڵێ "مومارەسەکردنی باوەڕیش بەئازادی تەقلیدیێکی دیموکراسییەو لەگەڵ باوەڕی ئاینیدا یەك ناگرێتەوە"[٩٣].

ئەمەش هەر بوختانە:

چونکە ئەگەر لە ئاینەکانی تردا وابێت ئەوە لە ئیسلامدا وانیەو ئەوەش "دەقەکانی قورئان حەدیس"و ئەوەش "مێژوو" با شایەتی بدەن. خوای گەورە ئەفەرموویێت: " لااکراه فی الدین" هەروەها دەفەرموویێت "فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ" هەروەها ئەفەرموویێت: "أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِين" پێغەمبەر"ﷺ"یش ئەفەرموێت: "ئازاری ئەهلی زیمە مەدەنو هەرکەسێ ئازاریان بدات ئازاری منی داوە".

زانایانیش ئەفەرموون پێغەمبەر "ﷺ" یش فەرموویەتی دەربارەی "ئاگر پەرستان": "سنوا بهم سنه أهل الکتاب"، بۆیە ئەبو یوسف کە زانایەکی قانونزانی مەزهەبی ئەبو حەنیفەیە ئەفەرموویێت: "وجمیع أهل الشرك من المجوس و عبدة النیران والحجارة والاسامرة تؤخذ منهم الجزیة ما خلا أهل الردة من أهل الاسلام وأهل الاوثان من العرب".

با مێژووش بێت شایەتی بدات لەسەر ئەمانە:

١. سوپای ئیسلام هەمیشە سێ "ئیختیار"یان داوەتە ئەهلی شیركو وڵاتانو گەلان "یان قبوڵکردنی ئیسلام، یان جزیەدان، یان شەڕ" لەبەر ئەوە دین بە زۆر نەدراوە بەسەر کەسدا[٩٤].

٢. مانەوەی ئەو هەمووە کەمە نەتەوەو خاوەن ئاینانەی ناو دونیای ئیسلام مانای چی دەگەیەنێت، ئەوە نەبێت هیچ کەسو دینێك کوێر نەکراوەتەوەو خەڵك لە وەرگرتنی دیندا ئازاد بوون.

٣. ژنو ژن خوازیو خواردنی یەکتر خواردنو شەریکایەتیو مامەڵەکردن لەگەڵ یەكو قەرزکردنو قەرزدان بە یەکتری لەگەڵ گاورو جولەکەو "ئەهلی ذییمە"دا یانی چی؟

---

[90] هەمان سەرچاوە ل٥.

[91] هەمان سەرچاوە ل٥.

[92] نزیکەی شەش سەدە پێش دیکارت، تأصیل مناهج العلوم ص٦.

[93] کۆمەڵگا ل٧.

[94] الماوردی /الاحکام السلطانیة"ص١٤٣". ئیمامی طبری "٢٣٧/٤"لە زیادی کوڕی زوبەیدییەوە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: "کاتێك میسرمان فەتح کرد ئەسیرەکانمان هێناو لەگەڵ "نصاری"ی ئەوێدا کۆبوینەوە، هەر ئەسیرێکمان ئەهێنا ئەمانوت ئیختیارت هەیە ئیسلام هەڵدەبژێری یان "نەصرانیەت"، ئەگەر ئیسلامی هەڵبژاردایە ئەوە"الله اکبر"مان ئەکردو لە فەتحی شارێك زیاتر دڵمان پێی خۆش ئەبوو، ئەگەر نەصرانیەتیشی هەڵبژاردایە ئەوەندەمان پێ ناخۆش بوو وەك ئەوە وابوو موسڵمانێك لە ناوماندا بووبێتو چووبێتە ناو ئەوان".

٤. گەرانی کابرایەکی مەسیحی کە "خاچ"ێکی لە ملدایەو هەموو کەس ئەیبینێ یانی چی؟ باشە خۆ ئەو "خاچ"ە یانی قورئان ڕاست ناڵێت کە ئەفەرموویێت "وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـكِن شُبِّهَ لَهُم" کەچی ئیسلامو ئەهلی ئیسلام قەبوڵیش ئەکەنو کەسیش بۆی نییە لە ملی دابکەنێت یان عەساکەی دەستی کە لە شێوەی "خاچ"دایە، لێ بسەنێت.

٥. ئەی هەر بە تەنیا وشەی "ئەهلی زیممە" یانی چی، یانی ئەوە نا کە کەسانێکی بێجگە مسوڵمان لە گاورو جولەکەو دینەکانی تر هەنو مسوڵمان نینو بۆیان هەیە بژینو بژین لەگەڵ مسوڵمانو لەگەڵ دەسەلاتی ئیسلامدا ... ئیتر نازانم ئەمەی نووسەری کۆمەڵگا لە کوێی هێنا کە "مومارەسەی باوەڕیش بە ئازادی تەقلیدێکی دیموکراسییەو لەگەڵ باوەڕی ئایندا یەك ناگرێتەوە"!!

٦. پاشان خەڵکی بە ویژدانی ڕۆژئاوا "لە نووسەرو خوێنەوارەکانیان" واناڵێن، ئەی تۆش وەك "ماڵ " نیت دەی وەك "دەر"بە.

ـ "وڵ دیورانت" لە "قصة الحضارة"دا دەڵێت: "ذیمییەکان لەکاتی خیلافەتی ئەمەویدا چاوپۆشییەکیان لەگەڵدا دەکرا، هاوشێوەی لەم ڕۆژانەدا نابینین". [٩٥]

ـ دۆزی "Dozy"دەڵێت :"چاوپۆشی مسوڵمانانو ڕەفتاریان لەگەڵ ئەهلی زیمەدا وای کرد ئەمانە لە دەوری ئیسلام کۆببنەوە"[٩٦].

ـ ڕۆبەرتسون لە"کتێبی مێژووی شارلکان"دا دەڵێت: "تەنیا مسوڵمانەکان بوون کە هەردوو شتەکەیان پێکەوە کۆکردبوویەوە:

غیرەت بۆ ئاینو چاوپۆشی لەگەڵ شوێن کەوتووانی ئاینەکانی تر، هەرچەندە شمشێریان بۆ بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان هەڵگرت بەلام ئازادی ئەوەیان دا بەو کەسانەی نەیاندەویست ببنە مسوڵمانو لەسەر دینی خۆیان بمێننەوە"[٩٧].

جا ئیتر نووسەری کۆمەڵگا هەق نییە ئەو قەناعەتەی دەستکاری بکاتو واز بهێنێ لە قسەیەك کە ناڕەوایە؟!.

لە لاپەڕەی "٨"یشدا نووسەر سەری لە خۆشیو لە خوێنەرانیش تێکداوەو باسی ئەوە ئەکات "ئەمڕۆ لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا ململانەیەکی توندوتیژی سیاسی لە نێوان هێزە مەزهەبییەکانو هێزە عەلمانیەکاندا دروست بووە"و ئیتر تەقسیمبەندی ولاتان ئەکاتو تەنیا تورکیا بە دەوڵەتی عەلمانی ئەزانێت لە ناوچەکەداو گوایە ئیتر هەموو دەوڵەتەکانی تر دینیو مەزهەبین، نازانم دەوڵەتی "بەعس" چ لە عێراقو چ لە سوریا، عەلمانییە یان مەزهەبیو دینی؟ دەوڵەتی تونسو لوبنانو لیبیا ...و هتد کامە مەزهەبیەتیانو کامە دینیان؟ هەر لەبەرئەوەی "دینی دەوڵەت بەڕەسمی ئیسلامە" ئیتر ئەبنە دەوڵەتی دینیو مەزهەبی، سەیرتر لەوەدایە نووسەر قەناعەتی وایە تێکەڵ بوونی ئاین بە دەوڵەت هۆی بەرپابوونی شەڕو داگیرکارییە! نازانم شەڕی سەدام لەگەڵ ئێران چ پەیوەندییەکی بە دینەوە هەبوو، یان شەڕی سەدام لەگەڵ کورددا چ پەیوەندییەکی بە دینەوە هەبوو، یان شەڕی ئەمریکا لەگەڵ ڤێتنامو یابانو ... هتد چ پەیوەندیەکی بەدینەوە هەبو، ئاخر خۆ ئەوانە کەمترین دەسەلاتیان نەداوە بە دینو ئەهلی دین کەچی ئەو هەموو شەڕە ئەپێچنە دەوڵەتانو میللەتان ... کەچی ولاتێکی وەکو سعودییە بۆ نموونە ئازادیو دەسەلاتی تا سنورێك داوەتە دینو ئەهلی دین بێجگە فریاگوزاریو خێرو خێرات چی بووە بۆ میللەتانو ولاتانی تر[٩٨].

نووسەر بە زمانی هەڕەشەو گوڕەشە بوار ناهێڵێتەوە بۆ ئیسلامو ئەهلی ئیسلام هەر هیچ نەبێت بڵێت: کاکە تۆ ناهەقی ئەکەی بەرانبەرمانو ئەوانەی تۆ ئەیڵێی وانییە، خێرا چەکە تەقلیدییییەکەی دەردەهێنێو ئەڵێ: "تیرۆریستە

---

[٩٥] بە ئیسلامکردنی کورد، ماستەرنامە یان هەڵەنامە ل ٣٨.

[96] "بەئیسلامکردنی کورد ماستەر نامە یان هەڵەنامە" ل٣٨

[97] "بەئیسلامکردنی کورد ماستەر نامە یان هەڵەنامە" ل٣٨

[98] "سعودیە" جگە لەوەی سەرچاوەی خێرو بێرە بۆ زۆر ولاتی دوورو دراوسێ، سەرچاوەی ئارامیشە بۆیان، ئەوەبوو شەڕی خوێناوی لوبنانی ڕاگرتو شەڕی نێوان ( فەتحو حەمماس)ی ڕاگرتو.. وە هەروەها هۆکەشی ئەوەیە دینو چەمکی دین لەم ولاتەدا ڕۆڵی تایبەتی ئەبینێ.

**مەزهەبیەکان"[99]دەربارەی ئەهلی ئیسلام کە ئەو ناوی "تیرۆریستە مەزهەبییەکانیان" لێ دەنێ ئەڵێت: "بۆ خۆ قوتار کردن ناچار دەبن بەراوردی کۆمەڵگای ئیسلام بە کۆمەڵگای عەرەبی بەر لە ئیسلام بکەن" [100] هەروەها ئەڵێت: "زانیاریەکانیشیان لەمەڕ دیاردە کۆمەڵایەتییەکان لە سنوری دیاردەکانی نیمچە دورگەی عەرەبستانی بەر لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە".[101]هەروەها دەڵێت: "تیرۆرستە مەزهەبییەکان ". لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو زیاتریان پێ نییە"[102]ئەمەش دیسان ستەمو بوختانە، بەم بەڵگانە:**

**١. ئیمتیازو جوانی هەر شتێك بە بەراورد لەگەڵ هاوشێوەکانیدا دەردەکەوێت .. بەراوردکاری ئیسلام بە پێش خۆیو بە پاش خۆی کارێکی ناڕەوا نییەو هەموو عەقڵێك پەنای بۆ ئەبات و قەبوڵیەتی نازانم بۆ نووسەری کۆمەڵگا قەبووڵی نییە!.**

**٢. عەرەب جوان ئەڵێت: " کل یعرف بضده" هەموو شتێك دژەکەی باشتر ئەیناسێنێت، واتە نەخۆشی نرخی لەش ساغی دەرئەخات، هەژاری دەوڵەمەندی شیرین ئەکات، دیلی نرخی ئازادی ئەناسێنێ و یاساو دادپەروەری دیکتاتۆریەت و بەرەڵایی ڕیسوا دەکات ... ڕێنماو بنەماکانی ئیسلامو پەیڕەویکردن لێیان دەری دەخەن کە خەڵك چەند توشی زیان دەبێت کە ئیسلامی لێ دوربخرێتەوە.[103]**

**٣. مسوڵمانان بەراوردکاری لە دوو حاڵەتدا ئەکەن:**

**حاڵەتی یەکەم: ئیسلام بە پێش ئیسلام لە هەموو دونیادا، نەك تەنیا لە نیوە دورگەی عەرەبیدا وەك نووسەری کۆمەڵگا ئەیڵێت.**

**حاڵەتی دووهەم: ئیسلام بە ئێستاو واقیعی کۆمەڵگاو حکومەت و سیاسەتەکانی ئەم سەردەمە، جا ئەگەر ئیسلام لە بەراوردکاریەکەدا لە هەردوو حاڵەتەکەدا جوانترو خوێن شیرینتر بێت و بیباتەوە، ئێمە چی بکەین؟! چۆن ئەو ئەنجامە ڕانەگەیەنین؟**

**٤. زانایانی "دەروونناسی"ئەڵێن: هێزو ئیمتیازی هەموو سیستەمێك لەوەدایە کە:**

**أ: ئەو سیستەمە زۆرترین کەس بتوانن جێبەجێی بکەن.**

**ب: زۆرترین ڕەنگدانەوەی هەبێت لەسەر ژیانیان.**

**ج: تا بۆ شوێن و کاتی زۆرتر بگونجێت خاوەن ئیمتیازترە.[104]**

**لەبەر ئەمانە بەراورد کردنی ئیسلام بە ئاینەکانو بیرو ڕاکانی تر کارێکی زۆر سرووشتییەو بەو ڕێگەیە مرۆڤەکان گەورەیی و جوانی ئیسلامیان بۆ دەردەکەوێت .. با ڕونتر ئەمە بڵێین: حاڵەتی دینی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوری ئەوسای کۆمەڵگەکانی نیوە دورگەی عەرەبی و فارس و هیندو ڕۆم و یۆنان لەو پەڕی خراپی و ناچاکیدابوون، بەڵام ئیسلام هات هەمووی گۆڕی، ئەوەشی کەڵکی هەبوو سەلماندیەوەو ئەوەشی(لادانی) تێدا کرا بوو ڕاستی کردەوەو بردیەوە سەر بناغەکەی.[105]**

**ـ ئیسلام گەورەترین کاریگەری لەسەر کۆمەڵگاکان دروستکردووە بە ڕادەیەك ئێستا بووەتە بەشێك لە کەینونەی کۆمەڵگە ئیسلامیەکان.**

---

[99] ـ کۆمەڵگا ل١١

[100] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[101] ـ کۆمەڵگا ل١١

[102] ـ کۆمەڵگا ل ١٤

[103] ـ بۆ زیاتر سەلماندنو بڕوابون بەم مەسەلەیە سەیری کتێبی " ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمین " نەدەوی بکە. کە نوسینگەی تەفسیر وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

[104] ـ الرسول" سعید حوی" ص١٨١ بە دەستکاریو چڕکردنەوەوە.

[105] ـ بۆ زیاتر شارەزابوون لەو باسە سەیری کتێبی"السیره النبویه" ابی حسن الندوی بکە.

**ـ ئەوەی کە شوێنکەوتەی ڕێنماییەکانی ئیسلامە بە ژمارە زیاترن لە یەك ملیار خەڵك کە بە نزیکەی چواریەکی هەموو سەر زەوی ئەکات.**

**ـ ئیسلامیش ئەوە "١٤٢٧" ساڵ زیاترە هاتووەو ئەمڕۆ لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستە بۆ خەڵكو بۆ کۆمەڵگاو ئەوەتا لە ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوادا زۆر لە زانایانو خوێندەواران ڕوو بە ئیسلامەوە ئەنێتو مسوڵمانبوونی خۆیان ڕادەگەیەنن ...**

**ـ گۆرانیبێژی بەریتانی بەناوبانگ "کات ستیڤن" دونیای پووچی ڕۆژئاوا جێ دەهێڵێ کە هەموو شتێکی لە بن دەستدا بوو لە"پارە"و لە "شۆرەت" بەڵام کە زانی ئیسلام ئەو مەنزومە ڕۆحیو فیکرییە پێویستەیە باوەشی بۆ کردەوە "مسوڵمان بوو، ناوی خۆی نا "یوسف ئیسلام"و چی پارەو سەروەتو سامانیشی هەیە خستیە خزمەتی دینو خەڵکی بێ نەوا.**

**ـ لیو ڤۆڵد ڤایس: زانای بەناوبانگی "نەمسایی" کە پاش ئەوەی لێکۆڵینەوەی لە ئیسلامدا کرد موسوڵمانێتی خۆی ڕاگەیاندوو ناوی خۆی نا "محمد اسد"و کتێبی "الاسلام علی مفترق الطرق"و "الطریق الی مکة"ی دانا.**

**ـ "مۆریس بۆکای" زانای بەناو بانگی فەڕەنسی ڕووی لە ئیسلام کردو دەستی کردە کتێب دانان لە سەر ئیسلام، لەوانە کتێبی "الانجیل والقران والعلم الحدیث".[١٠٦]**

**ـ زاناو فەیلەسوفی فەڕەنسی بەناوبانگ "ڕۆجیە گارودی" کە پاش لێکۆڵینەوەیەکی ووردی لەسەر ئاینەکانو بیروباوەڕکانی تر ڕووی کردە ئیسلامو خوێندنەوەی سەرچاوە ڕەسەنەکانیو بۆی دەرکەوت ئیسلام بۆ هەموو کاتو شوێنێك گونجاوو پێویستەو دەستی کردە نووسینو یەکەم کتێبی بەناوی "ئەلتەرناتیف = البدیل" داناو پاشان چەند کتێبی تری لە باسی گەورەییو دەوڵەمەندی ئیسلامدا دانا ..**

**ـ "ڕۆبرت کرین" بەرپرسی گەورەی ئەمەریکی لە ساڵی ١٩٨١دا کە "ڕۆناڵد ڕیگان" کردیە باڵوێزی ئەمەریکا لە "ئیمارات"و گەورە موستەشاری نیکسۆن لە" ١٩٦٣ "ەوە تا "١٩٦٨"، کاتێك ئاشنایی بە ئیسلام بۆ پەیدابوو، گەورەیی ئیسلامی بۆ دەردەکەوێتو مسوڵمان ئەبێتو خۆشی ناو ئەنێت "فاروق عبدالحق"[١٠٧]**

**ـ دکتۆر مراد هوفمان "باڵوێزی ئەڵمانیا لە "مەراکیش" پاش ئەوەی قەناعەتی بە گەورەیی ئیسلام کرد مسوڵمان بوونی خۆی ڕاگەیاندو بە قەناعەتەوە کتێبی "الاسلام هو الحل البدیل"ی دانا کە بوویە چرایەك لە بەردەم ڕۆشنبیرانو خوێندەوارانی ڕۆژئاوادا ... هوفمان ئەڵێت: هەموو ئەو بیروباوەڕە زۆرەی دەربارەی ناسیۆنالیزمو سۆزیالیزم کە لەگەڵ ئەوەدا یەك دەگرێتەوە کە "کەمال ئەتاتورك"و هەموو غەرەبزەدەکانی ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ ئەکەن فەشەلێکی خراپیان هێنا هۆکەشی ئەوەیە ئەو بیرو باوەڕانە نەزۆكو کورت بینو ناتوانن چارەسەری ئەو هەموو دەردە بکەن کە توشی دونیای ئیسلام بووە لەو ڕۆژەوەی کە ئیمپریالیزم داگیری کردوونو یاساو ڕێسا ئیسلامییەکانی لێ دورخستونەتەوەو یاسا دەستکردەکانی خۆی سەپاندووە بە سەریانداو تووشی هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵایەتی کردوون! ...**

**بەڵام زۆری نەبرد خێرا ئەو دیاردە ناوازەیە دەرکەوت کە بریتییە لە ئیسلام ... کە خۆی لەم ڕاپەڕینو بێدارییە ئیسلامیەدا ئەنوێنێو گەڕاوەتەوە بۆ بنەما ئیسلامیەکانو نایەوێ "دین" لە "دەوڵەت" جیا بێتەوە.**

**ڕووتر ئەڵێ: ئیسلام بەو پێیەی کە ئاینێکەو ڕژێمێکە بۆ حوکمڕانی، پڕۆژەیەکی ئامادەو بەردەستە کە هیچ کاتێك ئەرکی خۆی لە دەست نەداوە تەنانەت لە تورکیا خۆشیدا!![١٠٨]**

---

[١٠٦] ـ قضایا والثقافة الفن والادب /انور الجندی ص ٢٨٦ ..شایانی باسە "موریس بۆکای"ئایەتی "(وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ) (یس: ٣٨)"دەرگای هیدایەتی لێ کردەوە،چونکە لەوەو پێش قەناعەتی وابوو کە "ڕۆژ/ خۆر "سەنتەری بونەوەرەو هەموو گەردوون بە دەوریدا ئەسوڕێتەوە، بەڵام ئایەتەکە ئەوە هەڵدەوەشێنێتەوەو دەری دەخات "خۆر"یش ئەجوڵێتو بەرەو ئارامگایەك ئەڕوات.

[١٠٧] ـ کتێبی "مسئول امریکی اعتنق الاسلام / د.یحیی العریضی ص٥ "د. روبرت کرین" ئەڵێ: یەکێك لە تاقیکردنەوە گەورەکان بۆ مسوڵمانانی ئەمریکا ئەوەیە، ئەوانەی کە بە ئیسلام پەروەردە کراون بەردەوام ئەپرسن ئێمە بۆچی مسوڵمان ئەبین؟ لە ڕاستیدا من وا ئەزانم وەڵامی ئەو پرسیارە بریتییە لەم پرسیارەی کە بڵێین: ئەی هۆی چییە ئێوە دەست لە ئیسلام بەرنادەن" !!ل٨١ بەڕاستی ئەمەش پرسیارێکی جوانەو وەڵامی ئەو پرسیارەو ئەم پرسیارە یەك وەڵامن لە بنەڕەتدا .

[١٠٨] ـ انور الجندی :"قضایا الفن والادب والثقافة" ص٢٨٥

ئەم بۆچوونەی "هوفمان" زۆر شتی لەخۆ گرتووە لەو شتانە ئەو بیرۆکەی "برنادشۆ"یە کە لە سەرەتای "سییەکاندا " ڕایگەیاند کە" ئەوروپا "دووگیانە" بە ئیسلامەوەو لە ناخیدا ئەو دینەی هەڵگرتووەو بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕۆژێك هەر دەری دەبڕێت"[109] ئەوەتا قسەکەی "برنادشۆ" هاتە دی‌و ئەمڕۆ خوێندەوارو پیاوە بە ویژدانەکانی ئەوروپا لەسەر گەورەی‌و "پەیامی خودایی"ی ئیسلام ئەنووسن وەك :"درابر"و "گوستاف لوبون"و "کارلیل"و... هتد، زۆرێکیشیا ن موسڵمان بوونی ڕاگەیاندووە وەك "عبدالکریم جرمانوس"و "ئیتان دینیە"و "محمد اسد = لیو بۆلد ڤایس"و دکتۆر موریس بۆکای "و "ڕۆجیە گارودی"و "مراد هوفمان"و "دکتۆرە سجرید هونکە"، کە نووسەری هەر دوو کتێبی "ڕۆژی خوا هەڵدێت لە ڕۆژئاوادا"و "خوا لە سەرو ئەوەوەیە کە بۆی ئەڕوانرێت""[110].

"د. عبدالمجید الزندانی" کە زانایەکی موحافیزکاری ئیسلامیشە، لەم سەردەمەداو لەم ڕۆژانەدا چارەسەری نەخۆشی "ئایدز"ی دۆزییەوە، کە لە بیرکردنەوەی فوئاد مەجیدو هاوبیرەکانیدا تیرۆرستە مەزهەبییەکانە.

دەی ئیتر کوا مسوڵمانان تەنیا بەراوردی کۆمەڵگەی نیوە دوورگەی عەرەب ئەکەن بە ئیسلام یان کوا زانیارییەکانیا ن تەنیا لە سنووری ئەو دیاردانەدایە، ئەی ئەو هەموو زانیارییە تازانە چییە؟!

بەم چەند وەڵامە کورتە پێشەکییەکەی نووسەری کۆمەڵگا بەجێ دەهێڵین‌و ئەچینە سەر لاپەڕەکانی تر هەر چەندە زۆر شتی تر هەبوو کە لە سەری هەڵوێستە بکەین‌و ڕاستی‌و ناڕاستی ئەو زانیاریانە دەربخەین بەڵام لە لایەك لە لاپەڕەکانی دواتردا لەو جۆرە باسانە دووبارە دەبنەوەو لە لایەکیش باشتی تریش بمێنێتەوە بۆ ڕەخنەگران‌و نووسەرانی تر، چونکە لە ڕاستیدا کتێبەکەی فوئاد مەجید میسری بازاڕێکی قەرەباڵغەو هەموو جۆرە دیمەنێکی سەیری لە خۆگرتووە کە کڕیارەکانی ئەو بازاڕە بهێنێتە قسەکردن‌و ڕەخنەگرتن لە کاڵای عەیبداری.

---

[109] - هەمان سەرچاوە ل ٢٨٨

[110] بۆ زیاتر ئاگادار بوون سەیری هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٨٥ تا ل٢٩٠ بکە.

"فوئاد میسری" هەر لە سەرەتاو لە ناونیشانی ئەم بەشەدا ئەڵێ "هەندێ لە ڕواڵەتەکانی کۆمەڵگای ئیسلام" ئێمە سەرەتا دەڵێین: ئەو ڕستەیە دوو هەڵەی گەورە یان ڕونترو ڕاستتر دووگزی تێدایە،

یەکەم: باسکردنی هەندێ ڕواڵەتو شاردنەوەی هەندێکی تری جۆرێك گزی بازی تێدایە، نووسەر بە حسابی خۆی باسی ڕواڵەتە ناقبوڵەکانی دەکات کە ئەگەر چاویلکە ڕەشەکەی چاوی لابەرێتو بە چاوی ساغ سەیری ئەو کۆمەڵگەیە بکات ئەوە، نەك ئاوا ڕەش نایبینێت، بەڵکو جوانیش دەی بینێتو سەرنجیشی ڕادەکێشێت لەچاو ئەمڕۆدا[111]، ئێمەش هەندێکی لەم نووسراوەدا هەر لەژێر ڕۆشنای زانیاریەکانی خۆیدا پێ نیشان ئەدەین[112].

دووهەم: کۆمەڵگای ئیسلام... ئەمە لە ڕووی زمانەوانیەوە هەڵەیە " کۆمەڵگا" لای فوئاد مەجید میسری "مضاف"ەو "ئیسلام" "مضاف الیه"ە بۆی، بەڵام لەڕاستیدا ئەبێ بوترێ " کۆمەڵگەی ئیسلامی" واتە بە "صفە"و "موصوف" نەك بە "مضاف"و "مضاف الیە"، کە ڕۆشنە نووسەر مەبەستی یەکەمیانە نەك دووهەمیان، بەڵام وەك ئەڵێن "وکم من فکرة صاغتها قریحتی تلون بأرجاها فما صاغها الاعراب" هەڵەی نووسەر لەوەدایە لەم بڕگەیەدا تەنیا بۆ خاڵە ڕەشەکان گەڕاوە، یان تەنیا بە سەر برینەوە نیشتووەتەوە"[113] بە داخەوە لە کاتێکدا ئەو ئەیتوانی لایەنی چاكو خراپی کۆمەڵگەی ئیسلامیی پێکەوە باس بکردایەو ئەو کاتە کەیفی خۆی بوو تەنیا درێژەی بەلایەنە خراپەکان بدایەوەو بیدایەتە بەر ڕەخنەو بیکردایەتە "پرۆژەیەك" بۆ ئەوەی ئامۆژگاری ئەم حکوماتو دەوڵەتانەی ئەمڕۆی بکردایەو بیوتایە، ئێوە وابن وامەبن!

هەر دوای "ناو نیشانەکە" نووسەر خێراو بە پەلە ئەڵێت "شەڕو شۆڕی خەلیفەکانی ڕاشیدینو بە ئیسلامکردنی چەندین وڵاتو تەشەنە کردنی ئاینی نوێ، زۆربەی هەرە زۆری زەویو زاری کشتوکاڵی خستە ژێر ڕکێفی دەوڵەتی خەلافەتەوە".[114]

ئەم ڕستەیەی تری نووسەر سێ چوار هەڵەی زەقی تێدایە:

١. شەڕو شۆڕی خەلیفەکانی ڕاشدین.

٢. بە ئیسلامکردنی چەندین ووڵات.

٣. زەویو زاری کشتوکاڵی خستە ژێر ڕکێفی دەوڵەتەوە....

بۆ یەکەمیان ئەڵێین: بزافی فتوحاتی ئیسلامی بریتی نەبووە لە شەڕوشۆڕ، بەڵکو بریتی بووە لە ڕزگار کردنی میللەتانی "مەزڵومو بێ دەرەتان" کە بە دەست دەسەڵاتە سەرکوتکەرەکانەوە زیلەیان هاتووە. بۆ نموونە:

ـ کوردو فارس بە دەست ڕژێمێکی سەرکوتکەری وەك "ساسانیەوە" لەوپەڕی مەحرومیەتدا بوون... وەك مێژوو شایەتی ئەدات... لەبەرئەوەیە نە لەناو فارسدا نە لەناو کورددا بەرگرییەکی وانەکراو بەڵکو وەك تۆماس ئارنۆڵد ئەڵێت:

"مسوڵمانان بەرگرییەکی وایان لەگەڵ فارس نەبینی، نوێنەرەکانی دەوڵەتی ساسانی لە ڕۆژانی دوایەمینی ئەو دەوڵەتەدا فەوزاو ستەمکاری زۆری تێدا بوو، ئیستبدادیان بەرانبەر بە گەلەکە پیادە ئەکرد"[115] تەنانەت دەڵێ: "گەلی فارسی ڕقێکی زۆری بۆ دروست ببوو (بە هۆی چەوساندنەوەوە) بەرانبەر ئاینی زەردەشتیو بەرانبەر بەو دەوڵەتەی ڕەزامەندو هاندەری ئەو چەوسانەوەیە بوو"[116].

---

[111]- لە سەرەتادا هەندێ شتمان ووتو لە لاپەڕەکانی داهاتووشدا باس لەو پێشکەوتنو شەفافیەتە ئەکەین کەدەسەڵاتە ئیسلامییەکان هەیانبووە لە کاتی خۆیدا لە کاروبارە "ماڵی"و "ئیداری"و "سیاسیەکان"دا.

[112] ـ ئێمە لەم بەشەدا هەر ئەو وەڵامانەی ئەدەینەوە کە زیاتر نووسەر خۆی پێوە خەریك کردووەو لە بەشی دووهەمدا بە دوو بڕگە باسی ڕواڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی بە گشتی ڕوون دەکەینەوە..

[113]ـ ئیبن تەیمیە ئەفەرموێت: "بعض الناس کالذباب لا یقع الا علی الجرح". سەیری کتێبی "رؤیة من الداخل"ی (ولید الانصاری) ص٢٤ بکە.

[114] ـ کۆمەڵگا ل١٥.

[115] ـ الدعوه الی الاسلام/ تۆماس ئارنۆڵد /پەراوێزی "ماستەرنامە یان هەڵەنامە" ل٢٢.

[116] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

نەك هەر ئەمە بەڵكو ئارنۆڵد ئەڵێت :" فارسەكان[117] لەبەر سێ هۆ پێشوازیان لە ئیسلام كرد، یەك: ڕزگاریان بێت لە زوڵمی فەرمانڕەواكانیان، دوو: ڕزگاریان بێت لە خزمەتی سەربازی، سێش: ئاواتەخواز بوون ئازادی ئاینیان دەست بكەوێت، چونكە ئیسلام ڕێگەی بە شوێنكەوتووانی هەموو ئاینێك دەدا لەسەر ئەو ئاینە بن كە حەزیان لێیە بە مەرجی جزیەدان"[118].

كەواتە شەڕو شۆڕی خەلیفەكان نەبووەو بەڵكو بزاڤی فتوحاتی ئیسلامی بووە بۆ ڕزگاركردنی گەلان لە ژێر چنگی زاڵمانو دەستڕۆیشتوانی دنیا كە نە ڕێگەیان بە میللەتانو نە ڕێگەیان بە دینەكانی تر نەداوە ئازادو سەربەست بن، لەو نموونەوە سەیری هەموو میللەتانی تری دونیا بكە چ ئەوانەی لە ژێر ستەمو زوڵمی بیزەنتییەكاندا بوونو چ ئەوانەش لە ژێر ستەمی ئەمو ئەودا بوو بن.

بۆ دووهەمیان ئەڵێین: بزاڤی فتوحاتی ئیسلامی بۆ بە ئیسلامكردنی میللەتانو وڵاتان نەبووە، بەڵكو بۆ گەیاندنی پەیامی ئیسلامی بووەو ئیتر ئەو میللەتو وڵاتانە خۆیان سەرپشكو ئازاد بوون بۆ وەرگرتنی ئیسلام یان وەرنەگرتن..

شێوازی داڕشتنەكەی فوئاد میسری دوو سێ سەقەتی تێدایە لەو ڕستەیەدا یەكێكیان: بەئیسلامكردن ڕاست نییەو بە مسوڵمانكردن، ڕاستە لەوەش ڕاستتر بۆ مسوڵمان كردنە، لەوانەش ڕاستتر بۆ مسوڵمان كردنیش نییەو بەڵكو بۆ ڕۆشنكردنەوەی ئیسلامە بۆیان،[119] جا پاش ئەوەی قاچی ستەمكارو طاغوتەكان لە سەر ملی میللەتانی ستەمدیدە لادەبەن، ئیتر ئەو كاتە خەڵك ئازادە، موسڵمان ئەبێتو پێڕەوی لە ئیسلام ئەكات یان لەسەر بیرو باوەڕی خۆی ئەمێنێتەوە ..." فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ".

بۆ سێیەمیشیان ئەڵێین: بزافی فتوحاتی ئیسلامی زەوی و زاری داگیر نەكردووەو بەڵكو ڕۆحێكی گەڕیدە بوو، كرا بە بەری دەشتو دەرو مرۆڤەكانداو ژیانی دروست كرد لەو شوێنانەدا كە تێی ئەچوو.. با بەدوو بڕگە بە كورتی ئەمەش بسەلمێنین:

بڕگەی یەكەم: زەوییە بەپیتەكانی عێراقو سەواد چییان بەسەر هات بە فتوحاتی ئیسلامی.

بڕگەی دووهەم: حاڵی زەویو زار بە گشتی چی بەسەرهات لە فتوحاتدا....

بڕگەی یەكەم: زەوییەكانی "سەواد"

لە بەرئەوەی "خولەفای ڕاشیدین" بە ئاراستەی قورئانو فەرمودەی پیرۆزی "پێغەمبەرﷺ" ئەچوون، بۆ ئیدارەدان و بەرەو پێش بردنی ژیانی خەڵكی، لەلایەك گوێیان شل كرد بوو بۆ "دەقەكانی قورئانو حەدیس" لە لایەكیش گوێیان شل كردبوو بۆ "شورا "ی پیاوە عاقڵو بەدینەكانی سەحابە، بۆیە توانیان بە ماوەیەكی كەم سەرنجی میللەتانو وڵاتان ڕابكێشنو زۆرێك لەو خەڵكە لەدواییداو بە قەناعەتەوە ئیسلام قەبوڵ بكەنو ڕێنماییەكانی لە ژیانی تاكە كەسی و خێزانی خۆیاندا جێبەجێ بكەن، كاتێك فتوحاتی ئیسلامی عێراقو ئێرانی ڕزگار كردو خەڵكی ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیە ئازاد بوونو بوونە خاوەنی خۆیانوماڵو منداڵو موڵكی خۆیان، خەلیفە عومەری كوڕی خەتاب ڕاوێژی بە "سەحابە" كرد دەربارەی زەوییەكانی "شام"و "عێراق"[120] و "میسر"[121]چییان لێ بكرێتو چۆن باری بەرژەوەندییە، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) خۆی ڕای وا بوو ئەو زەوییانە بكرێنە موڵكی گشتی و نەوە بە نەوە بڕوات تا دونیا دونیایەو هەموو نەوەیەك بۆی هەبێت ئەو زەویانە بەكار بهێنێ، ئەم ئیتجهادو فەهمەشی لە ئایەتی :" كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ"[122] وەرگرت،

---

[117] ـ دیارە مەبەستی ئارنۆڵد: "فارسو كوردیشە" بەیەكەوە چونكە ئەو كاتە قەوارەیەكی كوردی سەربەخۆ نەبووەو بەڵكو كورد میللەتێك بووە"تواوە" لە ناو میللەتی فارسدا......

[118] ـ هەمان سەرچاوە ل٢٤ـ٢٥.

[119] ـ لە لاپەڕەكانی دواتردا درێژتر ئەمانە ڕوون دەكەینەوە.

[120] ـ الخراج لابی یوسف "٢٤" پەراوێزی "الاسلام" سعید حوی ص٤٧٨

[121] ـ الاموال / لابی عبید "٥٥" پەراوێزی "الاسلام "سعید حوی ص٤٧٩

[122] ـ واتە: بۆ ئەوەی ئەو زەویو زارانە تەنیا لە نێوان دەوڵەمەندەكاندا هاتووچۆ نەكات، بەڵكو هەموو كەسێك مافی هەبێت تێیدا.

**بەڵام هەندێ لە سەحابە ڕایان وابوو "تمليك" بكرێن‌و هەركەسێ بەپێی حەق‌و حاڵی خۆی بەشی بدرێت. ئەبو يوسف (قانونزانی مەزهەبی ئەبو حەنيفە) ئەڵێت: زياد لە يەكێك لە زانايانی ئەهلی مەدينە ئەمەی بۆ گێڕاومەتەوە كە كاتێك سوپای عێراق (پاش فەتح كردنی عێراق‌و شام گەڕانەوە بۆ لای "عومەری كوڕی خەتتاب" كە بە نوێنەرايەتی سەعدی كوڕی ئەبی وەقاص نێررابوون، داوايان وابوو كە زەوييەكانی عێراق‌و شام تەمليك بكرێت لە سەريان‌و دابەش بكرێن لە نێوانياندا، عومەريش ڕاوێژی بە ئەصحابی "پێغەمبەر (ﷺ)" كرد، هەندێكيان ڕايان وابوو كە دابەش بكرێت بەسەرياندا، بەڵام عومەر فەرمووی: "باشە ئەی ئەو هەموو مسوڵمانەی دوای ئەمانە دێت چی بكەن كە دێنە دنياوەو سەير ئەكەن هەرچی زەوی‌و زار هەيە هەمووی بووەتە موڵكی چەند كەسێك‌و لە باو باپيرانيانەوە بۆيان ماوەتەوە؟ ئەمە ڕايەكی باش نييە!"، "عبدالرحمن كوڕی عەوف" ووتی: باشە قوربان ئەی ڕای جەنابت چييە؟ خۆ ئەمە "فەيئە"و خوا بە موسڵمانانی داوە، عومەر فەرمووی: قسەكەی تۆ وايەو بڕوای منيش هەر وايە، بەڵام قەناعەتم وايە هەر وولاتێكی تر بۆ لەمەودوا فەتح بكرێت نەك خێری زۆری نابێت بەڵكو لەوانەيە ببێتە باريش بەسەر موسڵمانانەوە، [١٢٣] جا ئەگەر زەوی عێراق و شام تەمليك بكەين لەسەر چەند كەسێك ئەی دوايی "فتوحات" بە چی بكرێت، يان "وەچە"و ماڵ‌و منداڵی ئەم خەڵكە چی پێ بدرێت، يان پيرەژن‌و بێوەژنان چييان هەبێت لە زەوی‌و زاری عێراق‌و شام؟! ئيتر هەريەكەو ڕايەكی دەربڕی و كەڵەكەيانكرد لەسەر عومەر، پاشان ووتيان: باشە ئەم زەوی‌و موڵكە زۆرە هەمووی "وەقف" ئەكەيت لەسەر كەسانێك كە هێشتا لە دايك نەبوون‌و شمشێرێكيان هەڵنەگرتووە. [١٢٤]..**

**بەڵام عومەر تەنيا ئەيفەرموو: ئەمە تەنيا ڕای شەخسی خۆمەو هيچی‌تر! پاشان خەڵكەكە وتيان: دەی قوربان بازنەی ڕاوێژەكە گەورە بكە، ئەوە بوو "عومەر" ناردی بەشوێن موهاجيرە كۆنەكاندا، ئەوانەی كە لە سەرەتاوە كۆچيان كرد بۆ مەدينەو ڕاوێژی پێكردن، ئەوانيش دوو ڕای جياوازيان هەبوو، "عەبدولڕەحمان" ڕای لەسەر دابەش كردن‌و تەمليكەكە هەبوو، بەڵام "عثمان"و "علی"و "طلحه"و "ابن عمر" هەمان ڕای عومەريان هەبوو، لەوە زياتريش "عومەر" ناردی بە شوێن "دە" نەفەری تردا لە "ئەنصار" كە گەورەو ڕيش سپی‌و دەمڕاستی ناويان بوون، پێنجيان لە "ئەوس"و پێنجيان لە " خەزرەج"، كە كۆبونەوەو مەجليس گەورە بوو، عومەر "ڕەزای خوای لێبێت" فەرمووی: "حەمدو سەنا بۆ ئەو خوايەی شايەنی هەموو سوپاسێكە.. پاشان فەرمووی: "أني لم أزعجكم الا لئن تشتركوا فی أمانتی فيما حملت من أموركم، فانی واحد كاحدكم، وأنتم اليوم تقرون بالحق خالفنی من خالفنی، ووافقنی من وافقنی ولست اريد ان تتبعوا هذا الذی هوای(أی رأي)، معكم كتاب الله ينطق بالحق، "فوالله لئن كنت ذطقت بأمر أريده، ما أريد به الا الحق [١٢٥]، .. وتيان: ئەميری ئيمانداران تۆ چی بفەرمووی ئێمەش گوێڕايەڵ ئەبين. "عومەر" فەرمووی: دەی خۆ گوێتان لە قسەی ئەم خەڵكەيە كەوا گومان ئەبەن من ستەميان لێ ئەكەم‌و هەقی خۆيان لێ زەوت ئەكەم، پەنا ئەگرم بە خوا كە سواری ستەم ببم، خوانەخواستە ئەگەر ستەم لەم خەڵكە بكەم‌و مافيان پێشێل بكەم ئەوە ماڵ وێران خۆم [١٢٦] بەڵام هەرچەند سەير ئەكەم پاش ئەم وولاتانەی "كيسری"**

---

[١٢٣] ـ سعيد حوی: ئەڵێت مەبەستی عومەر ئەوەيە كە عێراق‌و شام دەوڵەمەنترين ولاتی ئەو سەردەمە بوون، گومانيشی وابووە دوای مردنی هەر ولاتێك فەتح بكرێت پێناچێ خێرێكی وای تێدابێت، بەڵكو ئەبێتە بار بەسەر موسڵمانەوەو پێويستە لە شوێنی ترەوە هاوكاری‌و كۆمەكی بۆ كۆبكەنەوە "الاسلام/ سعيد حوی، ص ٤٨٠".

[١٢٤] ـ ئەم قسەيە لە قسەی ئەو كەسانە ئەچێت كە ئەڵێن: فلانە كەس ڕۆژێك لە ڕۆژان تەقەيەكی نەكردووە لەم كوردستانەدا كەچی "مەعاشەكەی" ئەوەندەيە و ئەوەندە ئيمتيازی دراوەتێ، ئەو كەسانە بە تەمان هەموو سەروەت‌و سامانی ئەم ولاتە بكرێت بە قورگی فلان‌و فيساردا، چييە؟ ئەم كابرا تەقەی كردووە، ئەی باشە ئەو ميللەتە هەمووی لە ژێر زوڵمدا ناڵەی نەهاتووە، هەر يەكەو بە جۆرێك بێ بەش نەكراوە، ئەمە ئەو تێگەيشتنە بوو كە عومەر ڕاستی كردەوە بۆ هەندێك لە سەحابە.....

[١٢٥] ـ واتە: من ئێوەم ڕاپێچ كردووە بۆ ئێرە تەنيا بۆ ئەوەيە شەريكايەتی‌و هاوكاريم بكەن لەو سپاردەيەدا كە هی ئێوەيەو من چوومەتە ژێری، خۆمنيش يەكێكم وەك ئێوە، ئێوەش ئەمڕۆ بڕيار بەدەستن و مافـو هەقەكان ئەسەلمێنن (ئاگاداريشن)، هەيە ڕای پێچەوانەی ڕای منەو هەشە هەمان ڕای منی هەيە، منيش مەبەستم ئەوە نييە كە ئێوەش هەمان ڕای منتان ببێت! ئەوە كتێبی خوا لە بەردەستانداية هەق‌و ڕاستی دەڵێت، سوێند بە خوا ئەگەر من ڕايەكيشم دەربڕيبێت‌و شتێكم ويستبێت، تەنيا مەبەستم هەق بووەو هيچی تر..

[١٢٦] ـ ووشەی (ماڵوێران خۆم)م بەكارهێناوە بۆ (شقيت).

ووڵاتێکی تری وانییە فەتح بکرێت، تائێستاش ئەوەی خوای گەورە بە "غەنیمەت" پێی داوین دابەشم کردووە لە نێوان خەڵکی خۆیداو "خمس"ەکە ماوە، ئەویشم بە پێی یاساو ڕێنمایی ناردووە بۆ شوێنەکانی خۆیانو بەردەوامیش هەر خەریکم، ڕایشم بۆ زەویو زارەکان ئەوەیە کە بکرێتە"وەقف"و "خەراج"ی لەسەر دابنرێتو ببێتە موڵکی گشتی بۆ هەموو مسوڵمانانو ئەو وەچانەشی کە لە دواڕۆژدا لە دایك ئەبن...

"شوراکە" لە کۆتاییدا وتیان: ڕای ئێمەش هاتە سەر ڕاکەی جەنابتو لە ڕاستیدا جوانترین قسەو ڕایە... "عومەر" فەرمووی: کەواتە مەسەلەکە ڕۆشن بوویەوەو ئادەی پێم بڵێن کێ شك ئەبن خاوەنی "عەقڵێکی باش"و "ڕای باش" بێت بیکەین بە بەرپرس لەم ئیشەو بتوانێت سەرپەرشتی ووردی "زەوییەکان"و "کرێکارەکانیش" بکاتو ئەوەندەیان کار لەسەر دابنێت کە لە تاقەتو توانایاندا هەبێتو، بە یەکڕا هەموویان ووتیان: باشترین کەس "عثمان کوڕی حنیف"ە، وتیان: قوربان "عثمان" زۆر وردبینو عاقڵو بە تەجروبەیە... "عومەر" بە پەلە ناردی بە شوێنیداو کردیە "بەرپرس" لە زەویەکانی "سەواد".[127]

عومەر وەك (هەندێ سەرچاوەی تر باسی دەکەن) بۆ ڕۆشن کردنەوەی ڕاو ئیجتیهادەکەی خۆی "ئایەتەکانی کۆتای سورەتی "الحشر"ی بۆ شوراکە خوێندووەتەوەو شەرحی کردەووە بۆ یان.. کە ماف ئەدات بە هەموو وەچەو نەوەیەکی تری مسوڵمانان کە دوای سەحابە دێنە بوونو ژیان .. هەر لەم فەهمەوەیە کە ئەفەرموێت: "ولم يبق احد من المسلمين الا وله في هذا المال حق! الا ما تملكون من رقيقكم، فان أعش ان شاء الله لم يبق احد من المسلمين الا سيأتيه حقه، حتى الراعي بسر وحمير يأتيه حقه، ولم يعرف فيها جبينة"[128]. لەم فەهمەی عومەرەوە زانایانی ئیسلام ئەڵێن: "پێویستە واریداتی دونیای ئیسلام بە عەدل و یەکسانی دابەش بکرێن بەسەر هەمووواندا نەك هەندێك لە خانووی قوڕدا بژین و ئەوانەی تریان لە کۆشکی ئاڵتون دا"[129].

لەم چەند دەقەی پێشووەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە نووسەری کۆمەڵگا ستەم ئەکات کە ئەڵێت دەوڵەتی ئیسلامی زەویو زاری داگیر کردوە.. نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەو دەقانە زۆر شتی تری تێدایە نووسەر حەز ناکات خەڵك بیزانێت لەوانە:

١. کاروباری دەوڵەتی ئیسلام بە "شورا "و "ڕاگۆڕینەوە" براوە بەڕێوە نەك خەلیفە خۆی بە "سێبەری خواوەند زانیبێت" کە فوئاد مەجید میسری بەرودوای کتێبەکەی ئاخنیوە بەو ڕستەیە، ئەوەتا عومەر ئەفەرموێت: "من ئێوەم بۆیە بانگ کردووە تاپێکەوە ئەم ئامانەتەم لەگەڵ هەڵبگرن، چونکە خۆمنیش هەروەك یەکێك لە ئێوە واوو ئێوە هەق ئەسەلمێننو بڕیار ئەدەن[130]!! و ئاگادارن، هەیە ڕای وەك ڕای منەو هەشە ڕای بەرانبەری هەیەو پێچەوانەی ڕای منە، منیش نامەوێ ئێوە بە مەیلی من بکەنو ڕای من پەسەند بکەن، ئێوە ئەوە کتێبی خواتان لە بەردەستدایەو ئەوەی ئەو ئەیڵێت "هەقو خێرە" سوێند بە خوا ئەگەر ڕایەکیش دەرببڕم مەبەستم هیچ نییە هەقو خێر نەبێت...."

٢. دەوڵەت ئەو زەوییانەی پاوەن نەکردووە بۆ خۆی، بەڵکو کردوونیەتە "وەقف" کە ئێستا پێی دەوترێ "زەوی عەقد" بۆ ئەوەی هەموو خەڵکی مافیان هەبێت تێیدا، ئەوەتا تا ئێستاش لە عێراقدا هەر کار بەو سیاسەتە "ئیسلامییە" ئەکرێتو هەر چەند ساڵ جارێك[131]دابەشکردنەوەی زەوی ئەکرێت بۆ ئەوەی نەوەی تازە بێبەش نەبێت لەو زەویانەو لە خێروبێریان، هەر چەندە ئێستا مقۆ مقۆی ئەوە هەیە کە هەموویان "تاپۆ" بکرێت لەسەر ئەوەی ئێستا هەیەو ئیتر بکەویتە دەستی کۆمەڵێکی تایبەتو پشتاو پشت بۆیان بمێنێتەوەو کەسی تر مافی تێدا نەمێنێت بەکڕین نەبێت..

بڕگەی دووهەم: حاڵی زەویو زار بە گشتی لە کاتی فتوحاتدا.. زانایانی ئیسلامیو لەوانە قانونزانو سیاسەت نووسی ناودار "ماوردی" ئەڵێت: "حوکمی زەوی ڕزگارکراو سێ جۆرە:

---

[127] - الخراج / ابی یوسف، ص٢٤، پەراوێزی "الاسلام " ص٤٨١ ....

[128] - تفسیری ابن كثیر (٤/٤٧٥) .

[129] - الاسلام، سعید حوی، ص٣١٥.

[130] - وانتم اليوم تقرون بالحق .

[131] - ئەوەی ئاگادارم لە زەوییە بە پیتەکانی شارەزووردا هەر "١٥ -٢٠ " ساڵ جارێك "تەوزیعات" ئەکرێتەوەو نەوەی تازە بەشی ئەدرێت لەو زەویانە...

جۆری یەکەمیان: ئەو زەویانەی خەڵکەکەی مسوڵمان ئەبن، ئەوە ئەدرێتەوە بەخۆیانو تەنیا (١/١٠) بەرهەمەکەی وەك زەکات لێی دەردەکەن.

جۆری دووهەم: ئەو زەویانەی سوپای ئیسلامی بە پێی "ڕێکەوتن" ئەچنە ئەو وڵاتەوە، حوکمی زەوییەکە بە پێی برگەکانی ڕێکەوتنامەکە ئەبێت.

جۆری سێهەم: ئەو زەویانەی کە بە شەڕ ئەگیرێنو لە دوژمن جێ ئەمێنێت ..

ئەمەی سێهەمیان چەند ڕایەك لەسەری هەیە:

أ. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مامەڵەی " غەنیمە"ی لەگەڵدا ئەکرێتو ئەکرێتە "پێنج پشك"و چواریان دابەش ئەکرێت بەسەر ئەو کەسانەدا کە بەشدار بوون لە فەتحەکەداو پێنج یەکەکەی تر بەو شێوەیە دابەش ئەکرێت کە خوای گەورە ئەفەرمووێت "وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ " (الانفال/٤١).

ب . هەندێکی تر لە زانایان ئەڵێن: ئەدرێتە ئیمامو شورای مسوڵمانان، ئەگەر ڕایان وابوو مامەڵەی غەنیمەتی لەگەڵدا بکرێت ئەوە ئەکرێتە "پێنج پشك"و ئەگەر ڕایان وابوو کە بکرێتە "فەییء"و وەقف بکرێت، ئەوە ئەبێتە ماڵی گشتیو هەموو کەس مافی ئەبێت تێیدا".[١٣٢] بەم پێیە حاڵی زەوی لە کاتی فتوحاتدا چەند شێوەیەك بووە:

١. ئەوەی موڵکی شەخصییەو کابرا "قەواڵە"و "شایەتی" هەیە لە سەری، ئەوە هی خۆیەتیو کەس مافی زەوت کردنی نییە لێی.

٢. ئەو زەوییانەی موڵکی کەس نین، نە "مسوڵمانان " نە "ئەهلی زیممەش" ئەوە ئەبنە موڵکی دەوڵەتو بە ئیزنو بەپێی یاسا هەموو کەس مافی تێیدا هەیە بۆ نموونە:

ـ هەر کەسێك زەویەکی مردو زیندوو بکاتەوە ئەوە ئەدرێت بە خۆیو ئەگەر لە پاشاندا نەیتوانی بە زیندوویێتی ڕاییبگرێتو جارێکی تر زەویەکە بوویەوە بە زەوی مردوو لێی ئەسەنرێتەوەو ئەدرێتە کەسێك کە بتوانێت بەرهەمی لێ دەربهێنێتو زیندووی بکاتەوە.

ـ بەڵام ئەگەر کابرا فرۆشتبوویو ببووە موڵکی یەکێکیتر ئەوە حوکمی جۆری یەکەمیانی هەیە.[١٣٣]

٣-ئەو زەوییانەی هی دەوڵەتنو دەوڵەت مەسروفی تێدا کردووەو خەڵك تێیدا بە "مووچە" یان بە "کرێ" ئیشی تێدا ئەکات، ئەوە ئەبنە موڵکی دەوڵەتی ئیسلامیو بەپێی "یاسای ئیسلامی" مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرێت" مەگەر لە یەکێك داگیر کرابێتو ئەو کەسە "قەواڵە"و "شایەتی" هەبێت، ئەوە ئیتر حوکمی جۆری یەکەمیانی ئەبێت.[١٣٤]

"قازی ئەبی یەعلای فەراء" لە "الأحكام السلطانية"دا ئەڵێت: "زەوی داگیر کراو دوو جۆرە: جۆرێکیان دەسەڵاتدارانی ستەمکار داگیری دەکەن لە خاوەنەکانیان ئیتر لە بەر "تەماعو چاوچنۆکی" بێت یان لەبەر "سوکایەتی کردن بێت بە خاوەنەکەی"، ئەمەیان ئەگەر بەرپرسی "وەزارەتی مەزالم"[١٣٥]پێشتر پێی زانیبێت ئەوە ئەرکی سەرشانێتی بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەی، ئەگەر پێیشی نەزانیبوو ئەوە ئەبێتەوە موڵکی ئەوانەی شکاتیان تۆمار کردووە ئەگەر بەشێوەیەکی ڕەسمی تۆمار کرابوو لە "دیوانی سەڵتەنەتدا" (واتە لە فەرمانگەی تاپۆدا).

جۆری دووهەم: ئەو زەویانەی بە شکات "حجز" ئەکەوێتە سەریان کە ئەم جۆرەیان بە " چوار مەرج" ئەدرێنەوە بە خاوەنە بنەڕەتییەکان:

مەرجی یەکەم: کابرای داگیرکەر خۆی دانی پێدا بنێت.

---

[١٣٢] ـ كتاب الاموال / لأبى عبيد (ص٥٥) پەراوێزی الاسلام، سعيد حوى، ل ٤٧٩ (بە کورتکراوەوە)

[١٣٣]- مباحث فى الفقه المقارن / د. هاشم جميل (٢/ ص٧٥).

[١٣٤] ـ الأحكام السلطانية (الماوردى) ص ٨٢.

[١٣٥] ـ کاتی خۆی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا وەزارەتێك هەبووە بە ناوی "وەزارەتی مەزالم " کاری ئەوە بوو هەموو ئەو ستەمانەی کراون لە خەڵکی پێش ئەمان، لەسەر خەڵکی لاببرێت، ئیتر ماڵ داگیرکردن بێت یان کوشتنو زەوی بردن........هتد بێت....

مەرجی دووهەم: "والی مەزالم" خۆی ئاگای لەو مەسەلەیە هەبێت، چونکە شایەتی ئەو بەسە بۆ سەلماندنی.

مەرجی سێیەم: یان شکاتکەر شایەتو بەڵگەی ئاشکرای هەبێت.

مەرجی چوارەم: یان ئەوەندە ئاشکرا بێت خەڵکێکی زۆر شایەتی بۆ بدەن کە ئەوە وایەو ئەمان ئاگایان لێیەتی.. چونکە ئەگەر "ئاگاداری والی مەزاڵم" مافی خاوەنە بنەڕەتیەکانیان بسەلمێنێت ئەوە ئاگاداری خەڵك باشتر دەیسەلمێنێت".[١٣٦]

کەواتە زەوی لە دەوڵەتی ئیسلامیدا وەك فوئاد مەجید میسری خۆشی باسی دەکات شەش جۆر بووە "هەرچەندە ئەو تەنیا پێنجیان باس دەکات".[١٣٧]

یەکەم: زەویو زاری دەوڵەتی کە بە زەوی خالیسە "الصوافی" ناسراوە، ئەم جۆرەیان هەموو ئەو زەوییانە ئەگرێتەوە کە هی "کیسرا" یان "قەیسەر"ی ڕۆمو کەسوکارو سەرلەشکرەکانیان بووە.

دووەم: زەویو زاری هاوبەش: ئەو زەویانەن کە هەموو خەڵکی بۆیان هەبووە کەڵکیان لێ وەربگرن وەك "مێرگ"و "لەوەڕگاکان".

سێیەم: زەوی بەیار: ئەو زەویانە بوون کە خاوەنیان نەبووە، یان زۆنگاوو شاخاویو لێرەوار[١٣٨]بوونو بە ئاسانی کەڵکیان لێ وەرنەگیراوە، هەر کەسێك لەم جۆرە زەویەی چاك بکردایە دەبووە خاوەنی "بە مەرجێك ڕێبەری مسوڵمانان قایل ببوایە".[١٣٩]

چوارەم: زەوی تایبەت: هەموو ئەو زەوییانەی کە دەسەڵاتداران بۆیان بووە لێی ببەخشنو دابەشکردنی لە سەر بکەن.

پێنجەم: زەویو زاری وەقف: هەرچەندە فوئاد میسری لەم جۆرە زەوییە حاڵی نەبووەو لەخۆیەوە وتوویەتی "کە موڵکی دامەزراوە ئاینیەکان بوونو پیاوانی ئاینیو دامو دەزگاکانی ئاین کەڵکیان لێ وەردەگرت.... کە لە ڕاستیدا وانییە.. زەوی وەقف بریتییە لە "یاساغ کردنی فرۆشتنی ماڵێك کە دانراوە قازانجەکەی سودی لێ وەربگیرێت بۆ شتێکی تایبەت بە نیەتی خێرو نزیك بوونەوە لە خودا"[١٤٠] ئیتر ئەم پیاوانی ئاینو دامو دەزگاکانی ئاینەی لە کوێ هێنا؟ لەوانەیە مسوڵمانێك باخێك ئەکات بە "وەقف" بۆ ئەوەی سود لە بەرهەمەکەی وەربگرێتو یارمەتی هەتیوانی فلانە کەس یان فلانە شار...هتد پێی بدرێت، یان دانرێت بۆ ئیدارەی فلانە مزگەوت، یان دابنرێت بۆ داودەرمانی فلانە خەستەخانە.... و هەروەها ...

شەشەم: زەویو زاری شەخسی واتە"موڵك" کە بە "قەواڵە"و "موڵکایەتی" بە کڕین یان زیندووکردنەوە، یان هەر ڕێگەیەك لە ڕێگاکانی "تەملیك" دەستی کەوتبێت ..[١٤١] جا نووسەری کۆمەڵگا مەبەستی لەم باسە ئەوەیە گوایە خەلیفەکان بە ئارەزوی خۆیان زەویان بەم داوەو لەویان سەندووەتەوەو هی ئەمیان داگیر کردووەو هی ئەویان بەم داوەو بەو شێوەیە، لەکاتێکدا لە کتێبە یاساییەکانی ئیسلامدا ئەوەندە بە درێژی باس لەم " زەوی دانە" (یان وەك نووسەر حەز دەکات بڵێت زەوی بەخشینە) کراوە، ئەگەر لەبەر خوێنەر نەبوایە تەنیا ئەوەی "أحكام سلطانية"ی "أبی یەعلای الفراء"مان بنووسیایە، دەرئەکەوت فوئاد میسری چەند بێ ویژدانی بەخەرج داوەو چەند دوور لە واقیعی "فیقهی ئیسلامی"و "مێژووی

---

[١٣٦]- الاحكام السلطانية، ابي يعلى الفراء، ص ٧٧ ـ ٧٨.

[١٣٧]ـ کۆمەڵگا/ ل١٨.

[١٣٨]ـ گومان ئەبەم نوسەری کۆمەڵگا "لێوار"ی لێ تێکچوبێتو وەڵێی بووبێتە "لێرەوار" ..

[١٣٩]ـ ئەوە ڕایەکە لە چەند ڕای موجتەهیدانو هەندێك ئەفەرموون قایل بونی ڕێبەری مسوڵمانان مەرج نیە لەم مەسەلەیەدا " مباحث في الفقه المقارن / هاشم جميل "٢/ ١٨٤".

[١٤٠]ـ كفاية الأخيار "١/ ١٩٧" .

[١٤١]ـ لە ئیسلامدا دوو جۆر ڕێگە بۆ "موڵك" پێکەوەنان هەیە: ڕێگە حەڵاڵەکانو ڕێگە حەرامەکان .. بە یەکەمیان " موڵکیە ت بۆ خاوەنەکەی دروست ئەبێت، بەڵام بە دووهەمیان ئەو کەسە نابێتە خاوەنی ئەو ماڵەو پێویستە لێی بسەنرێتەوە ... وەك سوخواردن یان قوماریان داگیرکردن یان ..... سەیری کتێبی الاسلام / سعيد حوى، ل٤١٨ بۆ ل٤٣٣ بکە

ئیسلامی" ئەو شتانەی نووسیوە . بەڵام باهەر هیچ نەبێ زۆر بە کورتی شتێك هەر بڵێن: "ئەبی یەعلای فەرائی حەنبەلی" ئەڵێت:

زەوی دان دوو جۆرە:

جۆری یەکەم: بیکەیتە موڵکی کەسێك.

جۆری دوهەم: بەرهەمەکەی بکەیتە موڵکی کەسێك.

جۆری یەکەم سێ بەشە:

بەشی یەکەم: پێ دانی زەوییە مردووەکان "الموات".

بەشی دوهەم: پێ دانی زەوی زیندوو.

بەشی سێهەم: پێدانی زەوی خاوەن "کانزا".

بەشی یەکەم: دوو شێوەی هەیە:

شێوەی یەکەم: زەوییەك هەرگیز زیندوێتی بەخۆیەوە نەدیوە.

شێوەی دووهەم: زەوییەك زیندوێتی بینیوەو پاشان مردنی بەسەردا هاتوەتەوە. ئەم شێوەی دووهەمیان دوو حاڵەتی هەیە:

حاڵەتی یەکەم: هی کاتی کۆن بێت، واتە "سەردەمی جاهیلی".

حاڵەتی دووهەم: هی کاتی تازە بێت، واتە "سەردەمی ئیسلام" .

حاڵەتی دووهەم: دوو شێوەی هەیە:

شێوەی یەکەم: خاوەنەکانی دیارن.

شێوەی دووهەم: خاوەنەکانی دیار نین.

شێوەی دووهەم سێ حاڵەتی هەیە:

حاڵەتی یەکەم: ئەوەی گەورەی موسڵمانان تایبەتی کردووە بە "بیت المال"ەوە.

حاڵەتی دووهەم: کراوەتە زەوی "خەراج" کە ئەمیش دوو جۆرە:

حاڵەتی سێهەم: خاوەنی نەماوەو کەسیش میراتگری نییە.

جۆری دووهەمیش دوو بەشە:

بەشی یەکەم: زەوی دەیەك "ئەعشار".

بەشی دووهەم: زەوی خەراج.

ئەو بەشەی دووهەمیش سێ جۆرە:

جۆری یەکەم: بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بێت.

جۆری دووهەم: تا خۆی لە ژیاندا بێت.

جۆری سێهەم: تانەوەی نەوەکانی ئەو ئەمێنێت، .. بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر سەیری ئەم هێڵکاریە بکە.



زەوی بە خەڵکدان
جۆری یەکەم
زەویەکە بکرێتە موڵکی کەسێك
جۆری دووەم
بەرهەمی زەویەکەی بدرێتێ
بەشی یەکەم
زەوی مردوو
بەشی دووەم
زەوی زیندوو
بەشی سێیەم
زەوی خاوەن کانزا
حاڵەتی یەکەم
تایبەتن بە (بیت المال)
حاڵەتی دووەم
زەوی خەراج
میراتگری نییە
حاڵەتی سێیەم
خاوەنی نییەو کەسیش
بەشی یەکەم
زەوی دەیەك
بەشی دووەم
زەوی خەراج
جۆری یەکەم
بۆماوەیەکی دیاریکراو
جۆری دووەم
تا خۆی لە ژیاندا بێت
جۆری سێیە م
تا نەوەی نەوەکانی ئەمێنێت

جا باسێك ئەوەندە دوورودرێژو پڕ بایەخ بێتو هەر لقو پۆپەی یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەبێت ستەم نییە فوئاد مەجید بە نووکە قەڵەمێك بیەوێت ئەو هەموو (ڕێنمایی)و "یاسا ووردانە" چز بکاتو نووسینەکەش ناوبنێت لێکۆڵینەوەی زانستی ..

"فەراء" لە "الأحکام السلطانية"کەیدا نزیکەی "١٠" لاپەڕەی خەت وورد لەسەر ئەو باسە ڕۆیشتووە ئەوەی لە "ریوایات"و "ئیجتیهاداتی زانایان" لەو باسەدا هەیە هێناویەتیو گەیشتووەتەوە ئەو بڕیارەی کە بەکورتی ئەڵێت: "ئیمامی ئەحمەد ئەفەرموێت: ئەو زەوییانەی پێغەمبەر (ﷺ)و سەحابە داویانە بە هاولاتیان جێگەی خۆیەتیو ئەوانەی کە کاربەدەستانی مسوڵمانان داویانە، من تێیدا ئەوەستم چونکە هەیانە شتێکی داوە کە دروست نییە بدرێتە ئەو کەسە"[142].

نەك ئەوە بەڵکو تەنانەت لە پێناسەی (أقطاع) (بەبوونی ژێر بۆ پیتی ئەلیفەکەی)دا هەموو هەڵەکانی فوئاد مەجید میسری دەردەکەوێت. ("ئیقطاع" تایبەتە بەوەی گەورەی موسڵمانان دەستی تێدەخات، دەست وەردان دروست نییە لە شتێکدا کە خاوەنی دیار بێت یان مافی خەڵکی تر بێت).[143] جا کەواتە زەوی بەخشین هەروا هەرەمەو گۆترە نەبووە، بەڵکو بەپێی یاسا بووەو سنوورو ڕێنمایی زۆری هەبووەو بەو پێیە مامەڵەی لەگەڵدا کراوەو لە هەر حاڵەتێکیشدا ڕەچاوی باری بەرژەوەندی تاكو کۆمەڵ کراوە[144]..

ئەوە ڕاڤەو شەرحی ئەو بڕگەیەی کە ووتمان "حاڵی زەویو زار دوای فتوحات چی لێهات"و لە لاپەڕەکانی دوایشدا (أن شاء الله) گەڕانەوەمان ئەبێت بۆ سەر ئەم خاڵە بە تایبەتی، چونکە فوئاد مەجید میسری زۆر ئەگەڕێتەوە سەر ئەم باسەو وەك بڵێی زۆر لە مەراقی ئەوەدایە چۆن ئەو دەسەلاتە ئیسلامیانە توانیبوویانە تەنیا بە زەویو زار ئەو هەموو داهاتە بۆ دەوڵەتەکانیان دروست بکەن بە ڕادەیەك ئێستاو لەگەڵ بوونی ئەم هەموو سەرچاوەو داهاتانەدا هەژاری خەریکە خەڵك ئەخواتو قەرزاری چۆکی بە دەوڵەتان داداوەو ناچاری هەڵقە لەگوێیو مزوری کردنی کردوون بۆ دەوڵەتە دەست ڕۆیشتووەکان..

فوئاد میسری دوای ئەم ڕستەیەی لە لاپەڕە (١٥)دا یەکسەر دەست دەکاتە هێرش کردنە سەر خەلیفەکانی ئیسلامو ڕیزێك تۆمەتی ناڕەوا دەداتە پاڵ (بنەماڵەی بەنی ئومەمیە)و ئەڵێ: ".. بە پیتترینی زەویو زاری میسرو عێراق کەوتە ژێر دەستی بنەماڵەی بەنی ئومەییەو خێڵە هاوپەیمانەکانیان.. دواتریش زەویو زاری خۆراسانو پشتی قەفقاس کەوتە دەست تاقمێکی بە ڕەگەز عەرەب کە دۆستو هاوپەیمانی بنەماڵەی دەسەلاتداران بوون"[145]. جا بۆ پەندی دنیا پەراوێزێکی بۆ ئەم ڕستەیەش نوسیوەتەوە کە ئێمە لە پێشەوە هەندێك لە ناڕاستییەکانیمان دەرخست، لە پەراوێزەکەدا دەڵێت: "شایانی باسە پێکهاتەی سوپای ئیسلام لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب"ەوە لەسەر بنچینەی ڕەگەزی عەرەب بووە، ئەمەوییەکانیش پەیڕەوی هەمان سیاسەتیان کردووە بێجگە لە خەڵکی بەڕەگەز عەرەب کەسێکی تری غەیری عەرەب لە سوپادا وەرنەگیراوە".

بەکەمترین بیرکردنەوە لەم قسەیە دەردەکەوێ کە بە ئاشکرا قسەیەکی ناڕاستە چونکە ئەگەر بیوتایە غەیرە عەرەب پۆستی بەرزیان نەدراوەتێ لە سوپادا ئەمە تا ڕادەیەك ڕێی تێ ئەچوو، بەلام بڵێ سوپایەکی گەورەی وەك سوپای ئیسلام هەموی عەرەب زوبان بوون ئەوە هەڵەیە.

هەرچەندە نووسەر ئەم قسەیە ئەداتە پاڵ (د. حسين مروه) کە گوایە لەکتێبی (النزعات المادية في الفلسفة العربية الاسلامية) (٤٢٣/١) دا هاتووە.. بەلام دیارە نووسەر خۆشی هەمان قەناعەتی هەیە بۆیە بەسەریدا ناڕواتو باسی ئەکات..

ئێمەش ئەڵێین:

142 ـ الفراء ، الاحکام السلطانية، ص٢٢٧.

143 ـ الاحکام السلطانية (الفراء)، ص١٩٠.

144 ـ أبو يوسف لە پێناسەی "ئیقطاع"دا ئەڵێت: ئەو زەوییانە ئەوانە بوون کە نەخاوەنیان هەبووەو نەمیراتگر.

145 ـ کۆمەڵگا ل١٦.

**١. حاڵەتی زەوریو زاری (عێراقو شامو میسر) بەو شێوەیە بووە کە لە پێشەوە باسمانکرد، زۆر دوورە لەوەی فوئاد مەجید میسری ئەیڵێت.**

**٢. حاڵەتی زەویو زار بە گشتی بەهەمان شێوە بەو شێوەیە نییە نووسەر وتویەتیو ئەیەوێت خەڵك بەو شێوەیەی ئەو حەزی لێ ئەکات بیزانن.**

**٣. "دەق" لە پەراوێزی سەقەتترو ئەم لەو هەڵەتر.. خۆ هەر کەسێك تەنیا ئەلفبایەکی ئیسلام شارەزا بێ ئەزانێت سوپای ئیسلام چەندەهای وەك (صوهەیبی ڕۆمیو سەلمانی فارسیو بیلالی حەبەشیو کێو کێی ) تێدا بووە، ئیتر یانی چی (غەیری عەرەبی تێدا نەبووە). پاشان ترازووی وەرگرتنی خەڵك لە ئیسلامدا کەی بریتییە لە "ڕەگەز" مەگەر خوا نافەرموێت: "ان اکرمکم عند الله أتقاکم" یان پێغەمبەر (ﷺ) نافەرموێت: "لا فضل لعربي على عجمي الا بالتقوى". مەگەر پێغەمبەر هەڵنەشاخا بە "ئەبوذەر"دا کاتێك بە بیلالی وت: "یا ابن السوداء"، نەیفەرموو: "انك امرؤ فيك جاهلية" تۆ کەسێکیت تا ئێستاش جەهالەتت تێدا ماوە دەی پێوەر "تەقواو" و لێهاتوویی بێت ئیتر ئەم بوختانەی "حسین مروە" لە پای چی، یان ئایا فوئاد مەجید میسری ئەم بووختانە بۆ دووبارە ئەکاتەوە.**

**هەروەها لەناو سوپای ئیسلامیدا کە تا عەرەبێکی بەڕەگەز تێدابوو بێت چەند غەیرە عەرەبی تێدا بووە کەسیش لە گوڵی کاڵتری بەرانبەر نەووتون، نەك لە ناو سوپای سەحابەدا بەڵکو لە چەرخو سەردەمەکانی دوای سەحابەشدا..**

**زیاد لەمەش ئەم بوختانەی حسین مروە، کە فوئاد مەجید میسری ئەیگوازێتەوە، سەیر ئەوەیە نەقسەی فوئاد میسرییەو نە قسەی حسین مروەشە، بەڵکو ئەو قسە قسەی جۆرجی زەیدانەو لە کتێبی (تأريخ التمدن الأسلامي) وەریگرتووەو "ئەنوەرالجندی"یش وەلامی ئەو بوختانەی داوەتەوەو ئەڵێت: "جۆرجی زەیدان بە شوێن ڕۆهەلاتناسەکاندا ئەڕواتو عەرەبە مسوڵمانەکان تۆمەتبار دەکات بەوەی نەیان هێڵاوە غەیری عەرەب هیچ پلەو پایەیەك وەربگرێت لە دەوڵەتی ئیسلامیدا" پاشان ئەڵێت: "شێخ شبلی نعمانی لە وەلامی ئەم تۆمەتەدا ئەڵێت: "هەرچی هەرێمو ولاتان هەیە لە سەردەمی بەنی ئومەیەدا هەموویان غەیری عەرەب پێشەواو زاناو قسە ڕۆیشتوو بوون تێیدا، لە مەککەدا "عطاء" هەبوو، لە یەمەندا "طاووس" و لە شامدا "مکحول" و لە میسردا "یزیدی کوڕی حبیب"و لە خۆراساندا "ضحاك کوڕی موزاحیم"و لە بەصرە"حەسەنی بەصری" .. کە ئەمانە هەموویان مەوالی بوونو غەیرە عەرەب بوون، لەگەڵ ئەوەشدا کە عەرەب نەبوون بەڵکو منالی کەنیزەكو عەبدیش بوون کەچی سەرۆكو فەرماندەی ناو خەڵك بوونو هەمو خەڵکی ملکەچیان بووەو خەلیفەو کاربەدەستانی بەنی ئومەیەش ئەوپەڕی ڕێزو تەقدیریان بۆ داناوون"[146].**

**دکتۆر نعمانی زۆر بە درێژی وەلامی ئەم خاڵە ئەداتەوەو ئەیسەلمێنێت "غەیرە عەرەب لە سەردەمی بەنی ئومەییەدا بەرزترین پلەو پایەیان هەبووەو هەموو ئەو قسانەش کە جۆرجی زەیدان باسی ئەکات هەمان قسەن کە "ڕۆژهەلاتناسان" کردویانەو هەموشیان زوڵمو بوختانن"[147](*). فوئاد مەجید لە زۆر شوێنی کۆمەڵگاکەیدا ئەم (هەڵەیە)[148] ئەکاتو قسەی خەڵکی تر ئەکاتو ناوی خاوەنە بنەڕەتییەکانی نابات، بۆ نموونە لە لاپەڕە (١٣٩و١٤٠)دا ئەڵێ: لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا کە میسر کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیسلامەوە (عەمری کوڕی عاس) بۆ خەلیفەی موسڵمانان دەنوسی: چی**

---

146 ـ قضايا الفن والأدب والثقافة، أنور الجندي، ص٤٢٥.

147 ـ هەمان سەرچاوە ل١٢٥.

(*) شێخ شبلی نعمانی ئەڵێت: (ابن عبد ربه) لە (العقد الفريد) دا ئەڵێت: "شعوبیەت بە دوو تاقم وتراوە: ڕەگەز پەرستەکانی عەرەب، کە بە چاوی سووك سەیری غەیری عەرەبیان ئەکرد، بە غەیرە عەرەبەکانیش وتراوە ئەوانەی کە بە چاوی سووك سەیری عەرەبیان ئەکردو بەشێکی تایبەتی بەم ناونیشانە داناوە "أصحاب العصبية من العرب" کەواتە هەبووە لەناو عەرەبەکاندا ڕەگەزپەرست بوون، نەك هەموویان وابوو بن یان سەحابە گەورە بەڕێزەکان وابوو بن، نەخوازەلا سەحابەیەکی وەك عومەری کوڕی خەتتاب کە ئەفەرموێت: (لوكان سالم مولى حذيفة حيا لوليته) الاسلام سعيد حوى ص٣٨٢. ئەگەر سالمی خزمەتکاری حوزەیفە زیندوو بووایە کاندیدم ئەکرد بۆ سەرۆکایەتی میللەت!.

148 ـ ووشەی "هەڵە" ڕەچاوی ڕەوشتی نوسینی تێدا کراوە، ئەگینا ئەوکارە هەر هەڵە نییە بە تەنیا..

له کتێبو نوسراوەکانی ئەسکەندەرییە بکات؟) خەلیفە لە وەڵامدا ئەنوسێ: ئەوەی لەگەڵ قورئان دەگونجێ بیهێڵەوەو ئەوانی تر بسوتێنە"[149].

جگە لەوەی کە ئەم باسە شتێکی مێژووییەو ئەبوو لە سەرچاوە بنەڕەتییەکانەوە بیگوازێتەوە (نەك هەر ئەمەی نەکردووە) بەڵکو هەر لە سەرچاوە (ناوەندییەکانیشەوە) نەیگواستووەتەوە، کە لە ڕاستیدا ئەو (زانیارییە)! هی جۆرجی زەیدانە لە کتێبی "تأریخ التمدن الأسلامی"دا هەیە "بەرگی چوارەمی"[150].

"جۆرجی زەیدانیش پیاوێکی مارۆنی مەزهەبەو لە قوتابخانەی یەسوعییەکاندا خوێندوویەتیو کەسێکە "ئەب لامنس"ی یەسوعی ڕێبەرو پێشەوایەتی لەم هێرشی ڕەخنەدا بۆ سەر عەرەبو بەنی ئومەیە"[151].

دەی باشە کەسێك ئەوە ڕێبەرو پێشەوای بێتو ئەوە مەزهەبو دیدو بۆچوونی بێت چاوەڕوان ئەکرێت لێی کە بە ویژدانەوە لەسەر ئیسلامو مێژووی ئیسلامی بنوسێت.

فوئاد میسری لە ل١٩دا بە دوو لەت قسە لە سەردەمی خەلیفە (عوسمان)یش دەکاتو ئەڵێت: ئەوەندەی زەویو زار بەسەر خزمو کەسو کارو بنەماڵەی خۆیدا دابەشکرد "خەڵکی بە ئاشکرا ناڕەزاییان دەربڕی".. فوئاد میسری لەتی یەکەمی قسەکە بێ سەرچاوە دەڵی واتە ئەیکاتە هی خۆیو لەتی دووهەمی ئەکاتە هی "حسن قاسم العزیز" لە کتێبی "البابکیه" ل٦٥،٦٦و ئەیخاتە ناو کەوانەوە وەك ئێمە خستوومانە.. جا با بزانین ئەم قسە بە هەردوو لەتەکەیەوە چەند ڕاستەو چەند بوختانە، ئیبن سەعد لە کتێبی (طبقات)ەکەیدا ئەڵێت: "عوسمان بە شوراکەی خۆی وت: با من خۆم باسی ئەم خیلافەتەو خۆمتان بۆ بکەم، ئەو دوو دۆستە عەزیزەم کە پێش من ئەرکی خیلافەتیان کەوتەسەر زوڵمێکی زۆریان لە خۆشیانو کەسو کاریشیان کرد لەبەر خاتری خوا، بەڵام خۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتی ئەدا بە خزمەکانی!و منیش عەشیرەتێکی گەورەو خزمو کەس و کارێکی هەژاری زۆر دەوری داومو ئەگەر دەستم (وەك جاران) بۆیان کردبێتەوە لەبری ئەوەی سەرقاڵی کاروباری خەڵکم، بەخێرم زانیوەو ئەگەر ئێوەش لاتان چاك نییە ڕەدی بکەنەوەو هەڵیوەشێننەوە"[152].

حەزرەتی عوسمان لەم دەقەدا چەند حەقیقەتی باسکردووە : یەکەمیان: ئەوەی عومەرو ئەبوبەکر کردوویانە لە برسی کردنی خۆیانو کەس و کاریان ئیمتیازێك بووە و مەرج نییە هەموو کەسێ وابکاتو لەوەش ناچێت هەموو کەسێ ئەوەی پێ بکرێت، بەڵکو مەرج ئەوەیە کار بەدەست دادوەر بێتو مافی کەس پێشێل نەکات. دووهەم: عەشرەتو خزمو کەس و کاری عوسمان لە عەشیرەتو کەسو کاری ئەبوبەکرو عومەر زۆرترو هەژارتر بوونو پێویستیمان بە یارمەتی زیاتر هەبووە وەك هەموو هاوڵاتییەکی هەژاری تری ناو ئەو کۆمەڵگایە. سێهەم: عوسمان هەر پێش خیلافەتیش دەستی گوشادو پیاوێکی دەست کراوەو خێر خواز بووەو ئیتر بۆچی ئەوەی لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا لێ بکرێت بە ڕەخنە، "طبري" ئەڵێت: "عوسمان فەرمووی"ولقد كنت أعطى العطية الكبيرة الرغيبة من صلب مالي ازمان رسول الله (ﷺ) وأبي بكر و عمر رضى الله عنهما وأنا يومئذ شحيح حريص ..، أفحين أتيت على أسنان أهل بيتى وفتى عمرى وودعت الذي لي في أهلي قال الملحدون ما قالوا".[153]

چوارەم: عوسمان بەبێ بەرانبەر کاروباری موسڵمانانی ئیدارە داوەو مووچەی لەسەر ئەو کارە وەرنەگرتوە وەك ئەفەرموێت: "ئەگەر دەستم وەك جاران کردبێتەوە لەبری ئەوەی سەرقاڵی کاروباری خەڵکیم"[154].

پێنجەم: عوسمان لەگەڵ ئەمانەشدا خۆی بە (مولزەم) زانیوە لە بەرانبەر بڕیاری (شورا)داو ئەفەرموێت: "ئەگەر ئێوەش لاتان چاك نییە ڕەدی بکەنەوەو هەڵیبوەشێننەوە.."!! بەڵام دەربارەی ئەو هەموو شتە کە هەندێ ناحەزو (لە ڕاستیدا

[149] ـ پێشتر ناڕاستی ئەم قسەیە رونکراوەتەوە .

[150] ـ قضايا الفن والادب والثقافة ، ص٤٢٥.

[151] ـ أنور الجندى / هەمان سەرچاوە ص٤٢٩.

[152] ـ موقف الصحابة من الفتنة د. أ محزون (٤٣٠/١).

[153] ـ تأريخ الطبري (٣٤٨/٤).

[154] ـ دەقە عەرەبییەکەی ئەفەرموێت: فبسطت يدي في شيء من ذلك لما أقوم فيه "مواقف الصحابة (٤٣٠/١).

بوختانچیو درۆزن) دەربارەی عوسمان ئەیلێن ئەوە جگە لەوەی درۆو زوڵمە، دژایەتی گەورەشی هەیە لەگەڵ ژیاننامەو حاڵەتی ژیانی ئەو کاتەدا..

ئیبن تەیمییە ئەڵێت: "ئەوەش کە ئەڵێت: عوسمان باوی خزمو کەس و کارەکانی داوە بەسەر خەڵکداو پارەی زۆر داونەتی .. و هەزار هەزار دیناری داوەتە مەروان، لە وەڵامدا ئەڵێین: کوا بەڵگەی (نقلی) ڕاست لەسەر ئەو مەسەلەیە؟ ڕاستە عوسمان شتی ئەدا بە خزمەکانی و بە غەیری خزمەکانیشی و بەرانبەر هەموو موسڵمانان چاکەی هەبووەو کەسی بێبەش نەکردووە، بەڵام ئەو "بڕە زۆرە" پێویستی بە "نقلی ڕاست" هەیە، ئەوە یەك. دووهەم: ئەمە دۆریەکی شاخدارە، چونکە نە عوسمانو نە غەیری عوسمان لە خەلیفەکانی ڕاشیدین ئەو بڕە یان شتێك نزیکیشی بکەوێتەوە لەو بڕەی بەکەس نەداوە"[155]. ئێمەش لە پێشەوە باسی ئەو بوختانەی تۆمان کرد کە گوایە "داهاتی ئەفریقای دابێت بە عەبدوڵلای کوڕی ئەبی سەرح"[156]. وە لە وێدا باسمانکردووە کە فوئاد میسری یان "کتێبەکەی کە لێی وەرگرتووە" زۆر تەزویرو دەستکاری ئەو مەسەلەیەی کردووەو زیادەی پێدا ناوە ئەوەش زۆر ناشایستەیە بۆ کەسێك ڕێز لە خۆیو لە قەڵەمەکەی بگرێت. هەڵیش ئەگرێ فوئاد میسری خۆی ئەم زیادانەی پێدا نابێت.

ئەمە سەبارەت بە لەتی یەکەمی قسەکە بوو کە هی فوئاد مەجید میسری خۆیەتی. سەبارەت بە لەتی دووهەمیش کە ئەڵێ: "خەڵکی بە ئاشکرا ناڕەزاییان دەردەبڕی"، ئەم لەتە قسەش ئەداتە پاڵ "حسین قاسم" جا با لای فوئاد مەجید و حسین قاسم و هەموو خوێنەرانیش ڕۆشن بێت کە "ڕەخنەو گازندە لە خەلیفە عوسمان" کاتی خۆی ماسێکی مودار بووەو ئێستاش هەر موو دارە، با ئێمە خۆمان هیچ نەڵێین بزانین مێژوونووسان چی دەڵێن دەربارەی ئەو "تەوژمی ڕەخنەو گازندانەی کە لە خەلیفە عوسمان ئەکرا" و ئایا کێ بون ئەوانەی ئیدارەی ئەم تەوژمەیان ئەداو مەبەستیان چی بوو؟ لەم مەسەلەیدا بەڕاستی تەنیا قسەی مێژوونوسان ئەخوات، چونکە مێژوو پێوستە بە "نقلّ"و "ڕیوایەت" بووترێت، نەك بە "بیرکردنەوە"و "لەوانەیە وابوو بێت"، نەك هەر "نقلّ"و ڕیوایەت"، بەڵکو ئەبێ بە "نقلی صحیح"یش بێت، نەك هەر بوختانچیو درۆزنێك شتێکی ووت، لای هەندێك ببێتە واقیعو شتی لەسەر بینا بکات.. ئەم مەسەلەیە لای فوئاد مەجید میسری ئەوەندە ڕوبەڕوی هەیە لە زۆربەی نووسینەکەیدا گەڕانەوەی هەیە بۆ سەریو خوێنەر وا تێدەگات کە فوئاد میسری پەیامی "ناشرینکردنی حەزرەتی عوسمانی بە تایبەتی" پێیەو ئەیەوێت تا ئەگاتە کۆتایی کتێبەکەی ئامانجەکەی بپێکێت.."[157].

جا ئێمە زۆر بە کورتی لەو مەسەلەیە ئەنوسین بە هیوای ئەوەی کە نووسەرێك بەدرێژی لەسەر ئەو مەسەلەیە بنوسێتو تێیدا موناقەشەو وەڵامی هەموو ئەو بوختانو هەڵبەستراوانە بداتەوە کە ئەدرێتە پاڵ عوسمانو غەیری عوسمان، "قازی ئەبوبەکر ئیبن العربی" ئەڵێت: "هەندێ کەس کە ستەم دەکەنو پشت بە ڕیوایەتی خەڵکانی درۆزن ئەبەستن ئەڵێن: عوسمان لە کاتی خیلافەتدا کاری ناڕەوای زۆر کرد، لەوانە:

١. سزادانی عەممار بەڕادەیەك ڕیخۆڵەکانی تەقاند!

٢. ئەوەندەشی دا لە ئیبن مەسعود تا پەراسووەکانی شکاندو (موچەکەشی) لێگرتەوە.

٣. بیدعەی "کۆکردنەوەی قورئانی" هێنایە کایەوەو ئەو هەموو قورئانەی تری سوتاند.

٤. زەوی قەدەغەی داهێنا.

---

[155] ـ ابن تیمیە "منهاج السنە" (١٨٧/٣).

[156] ـ خاڵی چوارەمی پێشەکی ئەم کتێبە.

[157] ـ سەیری لاپەڕەکانی کۆمەڵگا (١٩، ٦٧، ٩٩، ١٠٢، ١٠٦، ١٠٧، ١٠٨.. هتد) بکە ، کە هەموو جارەکان بە سووکایەتی و ڕەخنەوە باس لەو خەلیفە خاوەن دینو خاوەن (حەیا)یە دەکات، کە لە سەردەمی ئەودا هەژاری خەریك بوو بەرەو کۆتایی تەواو ئەڕۆیشت.. ئەم ڕەخنەو گاڵتە کردنە بە حەزرەتی عوسمان کۆنەو تازەشە، لە کۆندا سەرەتا بە ڕەخنە لە هەندێ لە کاربەدەستانی عوسمان دەستی پێکرد ، پاشان ڕەخنەیان لە هەموویان ئەگرت ، پاشان ڕەخنە لە هەندێ شتی حەزرەتی عوسمان، پاشان لەهەموو شتێکی تا وای لێهات ڕەخنەگرتن لە هەموو خەلیفەکانی ئیسلام بواری بۆ خۆش کرا، (سەیری محاضرات في تأریخ الشعوب والامم الاسلامیة) (١/٢) محمد خضر بگ بکە .

٥. ئەبو زەڕی نەفی کرد بۆ "ڕەبزە".

٦. ئەبودەردائی دەرکرد لە شام.

٧. حەکەمی ئازادکرد کە پێغەمبەر نەفی کردبوو.

٨. قەسرو جەمعی هەڵوەشاندەوە لە نوێژەکاندا.

٩-١٢. معاویەو عەبدوڵلای کوڕی عامری کوڕی کریزو مەروان‌و وەلیدی کوڕی عوقبە (کە کابرایەکی فاسق بوو) کردنییە کاربەدەست.

١٣. پێنج یەکی ئەفریقای دایە مەروان.

١٤. عومەر بە "درة" لە خەڵکی ئەدا کەچی ئەم بە "عەسا"و گاڵۆك.

١٥. چەند پلیکانەیەکی زیاد کرد بۆ پلیەکانەکانی مینبەری پێغەمبەر (ﷺ).

١٦. بەشداری بەدری نەکردوەو لە ئوحود دا ڕایکردووەو لە بەیعەتی ڕیزوانیشدا لەوێ نەبووە.

١٧. لە قیصاصی "هورمزان"دا عەبدوڵلای کوڕی عومەری نەکوشتەوە!!

١٨. بە عەبدێکی خۆیدا کاغەزی نارد بۆ ئیبن ئەبی سەرح ئەوکەسانە بکوژێت کە ناویانی هێناوە. قازی ئیبن عەرەبی ئەڵێت: " هەموو ئەوانە درۆو بوختانن چ لە رووی سەنەدەوە چ لە ڕووی "متن"ەوە هەر لە سەرەتاوە ئەوە درۆیە کە ئەڵێن: "عوسمان لە سەردەمی خیلافەتدا کاری نارەوای زۆری کردووە"[158]. پاشان ئیبن العربی یەك یەكو بە ڕیوایەتی مێژوویی "ڕاستەقینە" ڕەتی ئەو بوختانانە ئەکاتەوە ئەیسەلمێنێت کە ئەوانە بوختان و "بێ بناغە"ن، وەڵامەکانی ئیبن عەرەبی لە "لاپەرە ٦٣دەست پێدەکات تا لاپەرە ١٤٧". کە ئامۆژگاریمان ئەوەیە بۆ فوئاد مەجیدو خوێنەرانی بەرێزیش ئەو کتێبە بخوێننەوەو تا بزانن ئێمە لە خۆڕایی نییە ئەڵێین: "ئەم ماستە مویەکی تێدایە"[159]! بە هەر حاڵ با بێینەوە سەر باسە بنەڕەتییەکەی خۆمان.. ئیمامی تەبەری ئەڵێت: "یەکێك لەو نامانەی کە "السری" بۆی ناردووم لە شوعەیبەوەو ئەویش لە "سەیف"و ئەویش لە "عطیة"و ئەویش لە "یەزیدی نەقعەسی"یەوە کە ئەڵێت: عەبدوڵلای کوڕی سبأ "کابرایەکی جولەکە بوو" خەڵکی سەنعا بوو، دایکی لە ڕەش پێستەکان بوو، لە سەردەمی عوسماندا ئیسلامبوونی خۆی ڕاگەیاند، پاشان دەستی کردە گەشت کردن بەناو وڵاتانی مسوڵماناندا، بەمەبەستی لە خشتە بردنیان سەرەتا لە حیجازەوە دەستی پێکرد، پاشان چووە بەسرەو پاشان چووە کوفەو پاشان چووە شام، لە شامدا کەس گوێی بۆقسەکانی نەئەگرت‌و دەریانکردو ناچار چوو بۆ میسر، لەوێ نیشتەجێ بوو، فیکرەیەکی خستە ناویان‌و وتی: زۆر سەیرم لەو کەسە دێ قەناعەتی وایە عیسا ئەگەڕێتەوە بۆ دونیاو کەچی بڕوا بە گەڕانەوەی (موحەممەد) ناکات، لە کاتێکدا خوا ئەفەرموێت: "إِنَّ الَّذِي فَرَضَ عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لَرَادُّكَ إِلَى مَعَادٍ"، ئەڵێ [160]: ئەم "فکرەیەی" لێوەرگیراو "عەقیدەی ڕەجعە"ی دامەزراند لەناو خەڵکیداو بوویە قسەی ناویان، پاشان بیرۆکەیەکی تری خستە ناو خەڵکیو وتی: "تا ئێستا هەزار پێغەمبەر (ﷺ) هاتوون‌و هەر پێغەمبەرەش "وەصی" یەکی هەبووە، "عەلی"یش "وەصی" موحەممەدە، پاشان ئەیوت موحەممەد خەتمی پێغەمبەرانی کردووە "عەلی"یش خەتمی "وصییەکانی" کردووە، پاشان ئەیوت: کێ لەوە ستەمکارترە کە وەصیەتی پێغەمبەری (ﷺ) جێبەجێ نەکردووە و خیلافەتی تەسلیم بە "وصی" پێغەمبەر (ﷺ) نەکردووەو خۆی کردوەو بە خەلیفەی ئەم ئوممەتە، پاش ئەوانە ئەیوت: عوسمان ئەم خیلافەتەی بە ناهەق وەرگرتووەو ئەوەش "وصی" پێغەمبەری خوایە. ڕاپەڕن‌و ئەم کارە بجوڵێنن‌و سەرەتا بکەونە ڕەخنە گرتن لە کاربەدەست‌و مەسئولە بچوکەکان‌و ناوی بنێنن "ئەمر بە مەعروف‌و نەهی لە مونکەر"و جەماوەر ڕابکێشن بە لای خۆتانداو بۆ ئەم "وەزیفەیە" بانگیان بکەن، ئەوانەی هاتن بە دەمیەوەو قەناعەتیان پێکرد، بڵاوی کردنەوە بەناو خەڵکیداو دەستی کردە نامە ناردنیش بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە "گەندەڵی" ناو شارو وڵاتەکان بوون‌و ئەوانیش کەوتنە نامە گۆڕینەوە لەگەڵیداو بە نهێنی دەستیان دایە "نەهی لە منکر"! نامەیان بەهەموو

---

[158] ـ العواصم من القواصم/ القاضی ابن العربی ص٦٢.

[159] هەروەها سەیری کتێبی (تحقیق مواقف الصحابة ٤١٣/٢ تا ٤٦٢" بکە. کە بە درێژی و بە تەحقیق کراوی وەڵامی ئەو بوختانانە ئەداتەوە.

[160] ـ مەبەستی "یەزید"ە کەو ڕاوی قسەکەیە.

**ولاّتاندا ئەنوسی کە گوایە ئەمە لە فلاّنە کەسەوە هاتووەو پڕیان ئەکرد لە ڕەخنە دەربارەی کاربەدەستانی ئەوێ، پاشان نامەیەکی وەلاّمیان لە فلاّنەوە ئەنوسی بە هەمان شێوە دەربارەی عەیبەکانی کاربەدەستی ئەم ولاّتەی تر، ئەم نامانە لە ناو خەڵکیدا ئەخوێنرانەوە خەڵکی پڕ ئەکران لە کاربەدەستان‌و تا وای لێهات هەموو ولاّتێك بەزەیی بە ولاّتەکەی تردا بێتەوە کە کاربەدەستەکانیان چەندان خراپ‌و بێ خێرن.. ولاّتی وا هەبوو ئەیانوت: شوکر بۆ خوا کاربەدەستانی ئێمە وانین خوا ئێمەی پاراستووە..! تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە خەڵکی "مەدینە"ش بڵێن: "شوکر بۆ خوا ئێمە خوا پاراستوینی لە دەردو بەلاّی ولاّتانی تر.".[161] کار گەیشتە ئەوەی مەسەلەکان ئەوەندە بوونە باسی ناو خەڵك "موحەممەدو تەلحە" چوونە لای عوسمان‌و داوای دانیشتنیان کردو وتیان: قوربان! ئەمیری موسڵمانان! ئەرێ ئەو هەواڵە ناخۆشانەی لە ولاّتانەوە ئەگاتە ئێمە بە جەنابیشت ئەگات؟ فەرمووی: نەوەلا، غەیری هەواڵی خۆش‌و باش هیچم نەبیستووە... وتیان: دەی قوربان ئەم هەواڵە ناخۆشانە هەیەو با جەنابت ئاگات لێیان بێت‌و هەواڵەکانیان پێ وت.. عوسمان فەرمووی: دەی باشە بەڕای ئێوە من چیبکەم؟ ئێوە هاوکارو شایەتی ناو موسڵمانان بفەرموون ڕای خۆتان بڵێن: وتیان قوربان ڕای ئێمە وایە چەند پیاوێکی خاوەن متمانە بنێریت بۆ ئەو ولاّتانەو هەواڵی ڕاستی‌و دروستی ئەو ولاّتانەت بۆ بهێننەوە تا بزانی چ باسە.. "عوسمان ڕایەکەی پەسەند کردن".و ناردی بە شوێن موحەممەدی کوری مەسلەمەداو ڕەوانەی کرد بۆ کوفەو ئوسامەی کوڕی زەیدیشی نارد بۆ بەسرەو عەماری کوڕی یاسری نارد بۆ میسرو عەبدوڵلاّی کوری عومەریشی نارده شام، هەندێ پیاوی تریشی نارد بۆ ولاّتانی تر.. هەموویان پێش عەمار گەڕانەوە بۆ لای عوسمان‌و وتیان: خەڵکینە (خوا ئەزانێ) شتێکمان نەبیستووە لە کاربەدەست‌و بەرپرسان لەو ولاّتانەدا مایەی عەیبداری بێت یان زاناکان یان تەنانەت "عەوامیش" بە خراپی بزانن.. هەموویان ئەیان وت: ئەم کاروبارە هی موسڵمانانەو کاربەدەست‌و بەرپرسەکانیش دادپەروەرن لە ناو خەڵکداو بەدەم خەڵکەوە ئەچن‌و باشن لە گەڵیاندا، بەلاّم خەڵکی گومانیان لە نەهاتنەوەی عەممار بۆ دروست بوو، کە ئەبێت "ترۆر" کرابێت، بەلاّم ئەوەبوو لەناکاودا کاغەزێکی "عەبدوڵلاّی کوڕی سەعدی کوڕی ئەبی سەرح" هات کە عەمار دڵی داوەتە تاقمێك لە میسرداو چووەتە ناویان کە "عەبدوڵلاّی کوڕی سەوداو خالیدی کوڕی مولجەم‌و سودانی کوڕی حەمران‌و کەنانەی کوڕی بشر لە پێرەوەکەیانن"[162]، "طبری" ئەڵێت: "بۆی نوسیووم.. کە موحەممەدو تەڵحەو عەتیە ئەڵێن" عوسمان نامەیەکی نوسی بۆ هەموو هەرێمە ئیسلامییەکان کە ئەمە دەقەکەیەتی: "أما بعد.. فأنى آخذ العمال بموافاتى في كل موسم و قد سلطت الامة منذ وليت على الأمر بالمعروف والنهى عن المنكر فلا يرفع علي شيء ولا على أحد من العمال الا أعطيت وليس لى ولعيالى حق قبل الرعية الا متروك لهم ورفع الى أهل المدينة أن أقواما يشتمون وأخرون يضربون فيا من ضرب سرا وشتم سرا من ادعى شيئا من ذلك فيلبى في الموسم فلياخذ بحقه حيث كان منى أو من عمالى، أو "تصدقوا فان الله يجزى المتصدقين"[163].**

**کاتێك ئەم نامەیە لە ولاّتاندا ئەخوێنرایەوە خەڵکی دەستیان ئەکرد بە گریان‌و دوعای خێریان بۆ "عوسمان" ئەکردو ئەیانووت: بە ڕاستی ئەم ئوممەتە ژانێکی گرتووەو خراپەیەکی لێ ئەکەوێتەوە!! "[164].**

**بەم تاکە ڕیوایەتە بۆت دەردەکەوێت کە "یەهود" لە پێناو لەت‌و پەتکردنی ئوممەتی ئیسلامی هاتن ئەو ئاژاوەو فیتنە زۆرەیان نایەوە کە بووە هۆی شەهیدبوونی "خەلیفە عوسمان"و پاشان ڕشتنی خوێنی ئەو هەموو موسڵمانەی تر لە دوایدا.. ئەم کۆمەڵە ئەڵقە لە گوێیە کە بە کەس ڕازی نەئەبوون و هەمیشە بە دوای فیتنەدا ئەگەڕان و دەوری حەزرەتی (علی)یان داو پاشان کارێکیان کرد کە "عەلی" سەنتەری خیلافەت لە مەدینەوە بەرێتە "کوفە"و بچێتە ناویان، ئەوەبوو بە**

---

[161] ـ تأريخ الطبرى / (٢/٤٨٠ـ ٤٨١).

[162] ـ تأريخ الطبرى (٢/٤٨١).

[163] ئەم شەفافیەتە لەکام سەردەمدا ئەبینی و لە کام ولاّتدا ئەیبینی؟ کێ لە کاربەدەستانی ئەمڕۆ بە ڕاست‌و چەپدا ئامادەیە وەها مافێك بۆ خەڵکی بسەلمێنێت، چەند کەس بەبێ تۆمەت و بەبێ مەحکەمەو یاسا لە مافە سەرەتاییەکانی بێبەش ئەکرێت لە کوردستانەوە بیگرە تادەچێتە ئەوپەری دونیاو ئەگەر خۆی یان کەس‌و کاریشی داوای مافەکانی بکەنەوە ئەوەندەی تر پەتەکەی بۆ توند ئەکرێتەوە!

[164] ـ تأريخ الطبرى (٢/٤٨٢).

**ئەویش ڕازی نەبوون و ئەوەندەیان تالاو کرد بە قوڕگی ئەویشدا پەنجەی پەشیمانی گەست و ئاواتی ئەخواست کە هەر نەیناسینایەو هەر لە ناو "ئەصحابی پێغەمبەر (ﷺ) "داو لە مەدینەدا بمایەتەوە، هەر کەس سەیری "نهج البلاغه" بکات لەو هەموو "گیرۆدە بوون"ەی "عەلی" حاڵی دەبێت بە دەست ئەو کۆمەڵە هەزار ڕووەوە تووشی بوو بوو، بۆ نموونە "عەلی" ئەفەرموێت: "یا أشباه الرجال ولا رجال! حلوم الاطفال وعقول ربات الحجال، لوددت أني لم أركم ولم أعرفكم معرفة" ل٩٠. هەروەها ئەفەرموێت: "اف لكم! لقد سئمت عتابكم .. كأن قلوبكم مألوسة فأنتم لاتعقلون، ما أنتم الا كأبل ضل رعاتها، فكلما جمعت من جانب أنتشرت من آخر". ل١٠٥. هەروەها ئەفەرموێت: ".. كم أدرايكم كما تداري البكار العمدة والثياب المتداعية كلما حيطت من جاذب تهتكت من آخر.."ل١٤٣.. هەروەها ئەفەرموێت: "..ولقد أصبحت الأمم تخاف ظلم رعاتها، وأصبحت أخاف ظلم رعيتي.. أقومكم غدوة وترجعون الي عشية كظهر الحنية، عجز المقوم وأعضل المقوم.. لوددت والله أن معاوية صارفني بكم صرف الدينار، فآخذ مني عشرة منكم، وأعطاني رجلا منهم .. منيت بكم بثلاث واثنتين، صم ذو أسماع، وبكم ذو كلام، وعمي ذو أبصار، لا أحرار صدق عند اللقاء ولا أخوان ثقة عند البلاء.. لقد رأيت أصحاب محمد (ﷺ) فما أرى أحدا تشبههم منكم" ل٢١٦.٢١٧. تەنانەت لە (ل٤٣٩)دا ئەڵێت: "وام لێهاتووە ئەمەوێت بە ئێوە دەرمانی دەردێك بکەم سەیر ئەکەم ئێوە خۆتان دەردەکەن!.. تا دوێنێ بە حیساب من ئەمیر بووم کەچی ئەمڕۆ ئێوە ئەمیرو من مەئمور!". هەروەها ئەفەرموێت: "دەردو بەڵای من ئێوەن ئەی ئەو تاقمەی کە کاتێك فەرمانێکتان پێ ئەکەم گوێ ناگرن و کاتێك بانگتان ئەکەم نایەن بەدەممەوە، ئەگەر چاوپۆشیتان لێ ئەکرێ دەست ئەدەنە قسەی قۆڕو بی مەعنا ئەگەر بۆ شەڕیش ئەبرێن خەریکە زیرە ئەکەن هەر خوا خوای ئەوەتانە خەڵك ڕای بێتە سەر ئەمیرێك و ئێوە دەست بکەنە ڕەخنەگرتن لێی و بیشکێنن".[165]، وەڵلاهی ئەگەر ڕۆژی خۆم دێت (وەهەر دێتیش) ئەو کاتە لێتان جیا دەبمەوەو ناتانناسم، بەڕاستی بێزارم لە هاوڕێیەتیتان و بە ئێوەشەوە هیچ زیاد ناکەم.."ل٣٦١. ئەو قسە ڕاستە کە ئەڵێت: "بەدرێژایی مێژوو نەبووەو نییە کە ئەمیرێك ئەوەندەی حەزرەتی عەلی گیرۆدە بووبێت بەدەست شوێنکەوتووەکانییەوە، هاوەڵانێکیش نییە، وەك هاوەڵانی عەلی ئەوەندە ئازارو سەرئێشەیان بۆ سەرۆك و گەورەکەی خۆیان دروست کردبێت". ئومێد ئەکەم فوئاد مەجید میسری بەخۆیدا بچێتەوەو هەندێ "سەرچاوەی ڕەسەن" کە مێژووی لێوە وەردەگیرێت و بەڕیوایاتی "صحیح" ڕوداوەکان ئەگێڕێتەوە بخوێنێتەوە[166] و بزانێت، خەڵکانێکی لادەرو گزی باز لە هەموو شوێن و سەردەمێکدا هەبوون کە ویستوویانە پیاوانی سەر ڕاست و دەست پڕ لە خێر بشکێنن و مێژوویان بشێوێنن .. ئێمە ناتوانین لێرەدا زیاتر لەمە لەسەر ئەم باسە بڕۆین بەو هیوایەی کە ئەمەی وتمان تیشك بخاتە سەر ئەوەی وتیان و بۆ هەموومان بەس بێت.**

**نووسەری کۆمەڵگا بەردەوام ڕەخنە دەگرێت و هەموو ئەو هەوڵانەی کە دراوە بۆ پێشخستنی وڵاتی ئیسلامی و کشتوکاڵ و زۆر کردنی بەرهەم.. ئەکاتە ڕەخنەو خاوەنەکانیشی ئەکاتە پیاوی ستەمکار و دونیا خۆر ئەوەتا ئەڵێت: ئەو کاتەش کە حەججاج کرایە والی عێراق "موسلمە[167]"برای خەلیفە وەلید سێ ملیۆن درهەمی لە زەوییە زۆنگاوەکانی عێراقدا خەرجکرد بە مەرجێك لەبری ئەمەدا دوو پارچە زەوی بدرێتێ"[168]. حەزئەکەم فوئاد میسری تۆزێك لەم دەقە وردبێتەوەو مامۆستا هەژار ووتەنی: بیخوێنەوە، وەردی دەوە، وردی کەوە، لێی وردبەرەوە، ئەگەر بەهرەی پێگەیاندنی و شتی باشی تێگەیاندی؟ ماڵی ئاوا[169]". جا ئەگەر فوئاد میسریش واناکات با ئێمە وابکەین.. بە ووردبوونەوە لەو جۆرە دەقانە ئەم شتانەمان بۆ دەردەکەوێت:**

---

[165] ـ سبحان الله ئەم خووە پیسە هەر مایەوە تیایاندا لەگەڵ ئەو هەموو حیکمەت و فەلسەفە وردانەش کە حەزرەتی عەلی ئەوانی پێی پەروەردە ئەکرد کە ئەگە لە ناو سەحابەکانی مەدینەدا بووایە ئەوەندەی تر عەلی و سەحابەش بەنرختر ئەبوون.

[166] ـ وەك ئەو زنجیرە کتێبە مێژووییە (د. علی محمد الصلابی) نووسیونی بۆ نموونە.

[167] ـ کۆمەڵگا ل٢٠، بەڵام نووسەر خراپ حاڵی بووەلە ناوەکەو هەڵە خوێندویەتیەوە، ناوەکە "مەسلەمە"یە نەك "موسلیمە" چونکە (موسلیمە) یانی ژنێکی موسڵمان، بەڵام "مەسلەمە" مەصدەری (یمی)یەو یانی سەرچاوەی ئاشتی و موسڵمانێتی..

[168] ـ کۆمەڵگا ل٢٠.

[169] ـ یەك لە پەنا سیفرو خاڵی بێ بڕانەوە/ هەژار، ل١.

١. کەس نەیتوانیوە زەوی داگیر بکات، هەروا لە خۆڕایی بیبەخشێت بە خزمو کاسو کاری با ئەو کەسە برای خەلیفەش بووبێت، ئەگەر وانەبوایە ئەبوو مەسلەمە بەبێ عارەق ڕشتن ئەو دوو پارچە زەوییەی دەست بکەوتایە نەك پرۆژەیەکی گەورە دروست بکاتو بیدات لەبری دوو پارچە زەویدا.

٢. مەسلەمە وەك پیاوێکی دەوڵەمەندی ئەو کاتە هەستاوە بەزیندوو کردنەوەی زۆنگاوەکانی عێراق بە شێوەیەك کردوونیەتی بە زەوی بەرهەمهێنو پرۆژەی خزمەتگوزاری لەو وڵاتەدا بە پارەی گیرفانی خۆی. هەروەك چۆن هەموو سەرمایەدارێك لە هەموو کاتو سەردەمێکدا لەو جۆرە کارانە دەکەن، کاتێکیش ویستویەتی دەوڵەت دوو پارچە زەوی بداتێ کە دیارە ئەو زەوییانە زەوی بازرگانی بوونو بۆ وەها کارێك دەستیان داوە، لەگەڵ دەوڵەتدا "ساقیو باقی"پێکردوونو ئەوەش نە کارێکی ناعاقلانەو نەکارێکی نایاسایشە، دەوڵەتیش کە(شورا بڕیاری بۆ ئەدات) دیارە بە بەرژەوەندی دەوڵەتو میللەتی زانیوە"مقایضە"یەکی وەها بکات.

٣. پەیوەندی دەوڵەت و میللەت پەیوندەییەکی "ئیدارەت"و "عەدالەت" بووە، نەك هەڕەمەو خزم خزمێنە، کەس بۆی نەبووە موڵکێکی دەوڵەتی پێبدرێت ئەگەر بەرانبەرێکی وەك خۆی نەدابێت بە دەوڵەت چونکە ئیدارەدانی دەوڵەت ئەخوازێت داد بەرپا ببێت، دیارە پرۆژەیەکی گەورە کە "سێ ملیۆن درهەم"ی ئەو کاتەی بۆ سەرفکرابێت زیاتر بە دەوڵەت ئیدارە ئەدرێت نەك بەتاکە کەس.

٤. دەوڵەت لەو کاتەدا زانیویەتی کە ئەو پرۆژەیە زیاتر بۆ میللەت بەکەڵکە تا ئەو دووپارچە زەوییە لەبەرئەوەی ئەو پرۆژەیە لەوانەیە بەدەیانو بگرە سەدان خێزان لێی بەهرەمەند ئەبن وەك کرێکاری یان وەك بازاڕ.

٥. ئەو دەقە ئاماژەیەکی ناسکی شاراوەی تێدایە ئەویش ئەوەیە چ دەوڵەت چ میللەت لەو قەناعەتو بیروباوەڕدان کە سەرمایە ئەبێت بخرێتە کار، تا وڵات ئاوەدانو پێشکەوتوو بێت، ئەگەر پارە پرۆژەی پێدروست نەکرێتو ئاوەدانی پێ بەرپانەکرێت بۆچی باشە، ئەوەتا مەسلەمە زۆنگاوەکانی عێراق چاکسازی ئەکات وڵاتی پێ پێش ئەخات، کە چی لە ئەمرۆدا و بەم هەموو عەقڵو تەکنەلۆژیاوەوەو ئەو زۆنگاوانە وێران ئەکرێن و ئەبنە بار بەسەر وڵاتو میللەتەوە..

لە ڕاستیدا دەوڵەت یان ئەبێت خۆی ئاوەدانی دروست بکات، یان هاوکاری خەڵك بکات بۆ ئەوەی ئەوان ئاوەدانی دروست بکەن..وڵاتێکی وەك عێراق ئەمڕۆ بەگشتی و هەرێمی کوردستان بەتایبەت چۆن ئاوەدان ئەبێتەوە ئەگەر دەوڵەت خۆی هەڵنەسێت بەدروستکردنەوەی وڵات، یان هاوکاریو کۆمەکدان بە خەڵکی تا خۆیان ئاوەدانی دروست بکەن..

فوئاد مەجید میسری هەموو ئەو هەولانەی کە لەو شێوەن بە چاویلکەیەکی ڕەش سەیر ئەکاتو دەیان بینێت، هەر بۆ نموونە سەیرکەن چی ئەکاتە نیشانەی ستەمی دەوڵەتی خیلافەت، لە ل٢٠دا ئەڵێت: "خالید ئەلقیسری کە لە سەردەمی هیشامدا والی عێراق بووە لە ماوەی پانزە ساڵدا چەند ڕوباری وەك (الجامع)ی نزیك کوفەو (المبارك)ی لای (واسط)و ڕوباری (الخالد)و (بارمانا)و (الصلح)ی هەڵکەندو زەویو زارێکی زۆریشی لە دەوروبەری ئەو ڕوبارنە بۆ خۆی چاك کرد کە دەرامەتی ساڵانەیان سیازدە ملیۆن درهەم بووە، هەندێکیش دەڵێن: بیست ملیۆن"[١٧٠].

نازانم ئەوە بەڵگەیە بۆ گەورەیی ئیسلام و ئەهلی ئیسلام یان نەنگییە، کابرایەك بە پارەی خۆی بتوانێت ئەو هەموو کارێزو بیرو ڕوبارە لێبداتو ئەو هەموو زەوییە مردووە زیندوو بکاتەوەو دەیانو سەدان خێزان بخاتە ئیشو زەکاتی ساڵانە بداتە هەژارانو ساڵانەش بداتە دەوڵەت و وڵات پڕکات لەبەرهەمو دەوڵەت بەرەو خۆبژێوی بەرێت لەو چەرخەدا کە نە دەزگای بیری ئیرتیوازی هەبووە نە تەکنەلۆژیا هەبووە نە کەرەسەی گواستنەوەو بازاڕ لەم ئاستانەی ئەمڕۆدا بوون، ئەی ئەو جۆرە عەقڵیەت و ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر لە ئەمڕۆدا بوونایە ئەبوو چەندێك ئەم وڵاتانەیان پێش بخستایەو چانسی ئیشکردنیان دروست بکردایە لەبەردەم خەڵكو ئەندامانی کۆمەڵگەکەیاندا.

نووسەری کۆمەڵگا نایەوێت بڵێت: "من هەندێ شت هەیە لە ڕاستیدا لێی تێناگەم و نازانم بۆچی وەهایە لەوانە: دەوڵەت لە ئیسلامدا پەیوەندی چۆنە بە میللەتانەوە، ئایا ئیسلام دەوڵەت لە هەواو بۆشای و ئاسماندا دروست ئەکات یان

---

170 - کۆمەڵگا ل٢٠.

لەسەر ئەم زەوییەو لەناو خەڵکدا.. ئایا ئیسلام کە دەوڵەتی دروست کرد، بەرنامەو یاسای پێیە بۆ تەوزیفکردنی وزەو تواناکانی ئەم مرۆڤە، یان لێیان ئەگەرێت خەڵك چی ئەبەن بیکەن و چی ئەکەن و بیبەن؟!، ئایا دەوڵەت سەرمایەدارییە یان سۆسیالیستییە، نووسەر نازانێت دەوڵەتی ئیسلامی هیچ کامیان نییە، بەڵکو دەوڵەت لە ئیسلامدا دەوڵەتی ئیسلامییە نە سەرمایەداریو نەسۆسیالیستیە، یان زۆر بە کورتی بڵێین: دەوڵەتی ئیسلام بە تایبەتی لەم بواری "موڵکیەتەدا" لەدەوڵەتی سەرمایەداریو سۆسیالیستییەکان بەیەك شت جیا دەکرێنەوە، موڵکیەت لە ئیسلامدا بە یاسا "چۆنییەتەکەی" دیاری کراوەو چەندێتییەکەی دیاری نەکراوە، لە دەوڵەتی سەرمایەدارییدا نە چۆنیەتی و نە چەندێتی یاسای بۆ دانانرێ‌و لە دەوڵەتی سۆشیالیستیدا چۆنییەتییەکەی دیاری ناکات بەڵام چەندێتییەکەی دیاری دەکات"[171]. واتە لە ئیسلامدا یاسا دانراوە بۆ ئەوەی ئەو ڕێگا شەرعیو دروستانە دیاری بکات کە موڵکی پێ پێکەوە ئەنرێت، بەڵام یاسا دانانرێت بۆ ئەوە کابرا نابێت لەوە زیاتر دەوڵەمەند بێت، هەرچەندە کابرا تا دەوڵەمەندتر ببێت لە ئیسلامدا زەکاتی زیاتری ئەکەوێتە سەرو ئەوەش لە بەرژەوەندی هەژارانە.

جا لە ڕاستیدا فوئاد مەجید هەقە لێکۆڵینەوەیەکی وردی بنەماکانی "ئابووریی ئیسلامیی" بکات، ئەگەر حەوسەڵەی خوێندنەوەی زۆری نییە، با سەیری خوێندنەوەی کتێبی (فقه الزكاة في الأسلام : د. يوسف القرضاوي) بکات، لەو شتانەی نووسەری کۆمەڵگا لێی تێنەگەیشتووە و پەنای بردووە بۆ "ئەنگلس"و "مارکس" بەڵکو ئەوەی بۆ ڕوون بکەنەوە ئەمەیە "بۆچی گەلانی ڕۆژهەلات نەگەیشتونەتە قۆناغی خاوەنداریێتی تایبەت بە زەویو دەرەبەگایەتیان پێوە دیار نەبووە"[172].

جا نووسەر چووەتە سەر ئەو مەزهەبەی ئەڵێت: "ئەوەندە درۆ بکە تا بڕوات پێئەکەن" ئەوەتا ئەڵێ: "تاکە کەس لە سایەی ئەو هەلو مەرجە سروشتییەدا توانای بەرهەمهێنانی نەبووە گەشەکردنی کشتوکاڵ لە ڕۆژهەڵاتدا پشتی بە توانای داموو دەزگاکانی دەوڵەت بەستووە"[173]. ئەم قسەیەی نووسەر پێچەوانەی زۆربەی "گواستراوەکان"ی خۆیەتی، هەر خۆی دەڵێ: "مەسلەمە سێ ملیۆن درهەمی لە زەوییە زۆنگاوەکانی عیراقدا خەرجکرد" یان دەڵێت:"خالد ئەلقیسری ئەوەندە جۆگەو ڕووباری دروستکردو ئەوەندە زەوی کشتوکاڵی چاك کرد". ئایا ئەوانە کاری دەوڵەت بون، یان کاری خەڵك، زیاد لەمەش، بۆچی ئەبێت مێژوو قەتیس بکرێت لە جۆرێك یان چەند جۆرێك سیستەمی حوکمڕانیدا و مرۆڤ بە غەڵەتدا بەرێت و قیاسی کەشك لە سەر مەشك بکات، لەبەر ئەو قەناعەتە پێش وەختانەی کە لەسەری گۆشکراوە.

پاشان "مارکس" یان "ئینگلس" کوا ئەتوانن تەفسیری دیاردە مێژووییەکانی دەسەڵاتە ئیسلامییەکان بکەن بابە موقایەسەو بەراوردکاریش بێ، ڕاستە مارکس یان ئەنگلس دوو پیاوی وریاو عاقڵ بوون توانیویانە فەلسەفەیەکی شۆڕشگێڕانە لە قۆناغێکی مێژوویی تایبەتدا دابنێن، بەڵام خۆ نەئەو کاتەی خۆیان توانیویانە لەزۆر مەسەلە هەیە تێبگەن لەوانە "دینو ناسیۆنالیزمی" نەئێستەش بیروڕاکانیان ئەتوانێت خۆی بگرێت لەبەردەم پێشکەوتنی ئەمڕۆدا، با ئەوەشمان لە بیرنەچێت زیاتر لە حەفتا ساڵ ئەو فەلسەفە مارکسییە لە قۆناغی پراکتیكو جێبەجێکردندا خۆی نواندو لە کۆتاییدا ناواقیعی بوونو دژایەتیی دەرکەوت لەگەل هەستەکانی مرۆڤو بەرژەوەندییەکانی تاكو خێزاندا.. ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە وتمان سیستەمی ئابوری ئیسلامی هاوسەنگییەکە لە نێوان دەوڵەتو میللەتدا، نەدەوڵەت خاوەنی هەموو شتێکە لە ئیسلامداو میللەت هەمووی کرێکاری دەوڵەت بێت، نە میللەت خاوەنی هەموو شتێکەو دەوڵەت پۆلیسێکی خەوتوو بێت، بەڵکو دەوڵەت نوێنەرو چاودێری میللەتە، تاکەکەس تێیدا خاوەنی شتەو لەسەر دەوڵەتە پارێزگارو چاودێری بێت، لەسەر ئەو تاکەش واجبە کە دەوڵەت بە خاوەنی میللەت بزانێتو مافی ئەوەی پێبدات کە نەیەڵێت بەرژەوەندییەکانی تاك، بەرژەوەندییەکانی خەڵك بکات بە ژێرەوەو هاوسەنگی ناماقوڵ دروست بکات. هەروەك عومەر فەرمووی مادامێك خوای گەورە ئەفەرموێت: "كي لايكون دولَة بين الاغنياء منكم" کەواتە ئەم ماڵە بەشی هەموو

---

[171] ـ زانایانی ئیسلام ئەڵێن: الملكية في الأسلام محددبكيف غير محدد بكم، وفي الرأسمالية غير محدد بكيف وغير محدد بكم وفي الأشتراكية غير محدد بكيف ومحدد بكم" سەیری "بنەماکانی فیکرو سیاسەتی بزوتنەوەی یەکبوونی ئیسلامی"ل١٤٥ بکە .

[172] ـ کۆمەلگا ل٢٤.

[173] ـ کۆمەلگا ل٢٤.

کەسێکی تێدایە.. هەر لەو فیقهو تێگەیشتنەی عومەرەوەیە کە هەندێ لە زانایان ئەڵێن: بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەیە کاتێك کە ناهاوسەنگی بێتام دروست ئەبێت دەست بخاتە ماڵی دەوڵەمەندەکانەوەو بەزۆر بەشی هەژارانیان لێبسەنێت‌و هاوکێشەکە ڕاست بکاتەوە"[174]. بەڵام فوئاد مەجید میسری هەر بە مەزهەبەکەی پێشووی ئەڵێت: "دەوڵەت (مەبەستی دەوڵەتی ئیسلامییە) دەستی گرتبوو بەسەر زەوی‌و زاری خاوەن موڵکەکانداو ماوەی نەدا موڵکییەتیان پەرەبسێنێ! بۆچی؟ چونکە ".. پێڕەوی دەسەڵاتی ئەرستۆکراتی خێڵەکی دەکرا"[175]. ئەوەش نەسەرەتاکەی‌و نەکۆتاییەکەشی وانییە، نەدەستگیرا بەسەر زەوی‌و زاری خاوەن موڵکداو نە پێڕەویش لەسیستەمی خێڵەکی کرا، بەڵکو پێڕەوی لەو بنەما ئیسلامییە ئەکرا کە ئەفەرموێت: "كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ".

نووسەر لە ل٢٧دا دەڵێت: گومان لەمەدا نییە(!) کە سیاسەتی داگیرکردن‌و دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلام لە وڵاتانی داگیرکراودا گۆڕانێکی بنچینەیی بەسەر باری ژیان‌و گوزەرانی دانیشتوانی ئەو وڵاتانەدا نەهێنا.. دەسەڵاتدارانی تازە هەرچەندە بە ناوی ئایینی نوێی ئیسلامەوە بانگەشەیان بۆ چاککردنی وەزع‌و حاڵی خەڵکی ژێر دەسەڵاتیان دەکرد بەڵام بە کردەوە هیچ کام لەو گفت‌و پەیمانانەی بەجێ نەهێنا"[176].

ئەم حوکمەی نووسەری ناوبراو لە دوو لاوە ئاشکرایە کە ناڕەواو نادروستە:

یەکەمیان: دەسەڵاتی ئیسلامی گۆڕانی بنچینەیی بەسەرباری ژیان‌و گوزەرانی خەڵکیدا نەهێنا!!

دووهەمیان: دەسەڵاتدارانی ئیسلام پەیمان‌و بەڵێنەکانی خۆیانیان نەبردە سەر!!

بۆ یەکەمیان ئەڵێین: ئیسلام لە هەموو ئەو شوێنانەدا کە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست لە هەموو بوارەکانی ژیاندا گۆڕانکاری ئیجابی کردووەو ئەکرێت لەم بوارانەدا کورتی بکەینەوە:

١. فەلسەفەی ژیان‌و تێڕوانین بۆمرۆڤو بوونەوەر.

٢. سیستەمی حوکمڕانی و چۆنیەتی ئیدارەدانی دەوڵەت.

٣. سیستەمی ئابوریی‌و چۆنیەتی دابەشکردنی سەروەت.

٤. جیهادو دانانی یاسا بۆ جیهادکردن‌و حاڵەتی شەڕیان ئاشتی.

٥. سیستەمی خوێندن‌و خوێندەواری.

٦. دیاری کردنی مافی تایبەت‌و مافە گشتییەکان.

٧. دانانی یاسا بۆ پاراستنی مافەکانی کەمە نەتەوەی‌و مەزهەبییەکان.

٨. دانانی بنەما بۆ "مەدەنیەت" چ وەك تەرسانەی ڕۆشنبیری‌و چ وەك "تەمەدوون‌و ئاوەدانی دروستکردن".

بۆ یەکەمیان بە کورتی ئیسلام ئەم کارانەی کرد:

أ. بە بەڵگەی عەقڵی سەلماندی کە خوایەك هەیە، ئەو خوایە (واجب الوجود)ەو دارای هەموو سیفەتێکی "کەماڵ"ەو دروستکردن‌و یاسادانان بە دەستی ئەوەو ئەم مرۆڤە لە زاتیدا ئاتاج‌و هەژارەو پێویستی بەو خوایە هەیە کە لە زاتیدا دەوڵەمەندو بەخشندەیە و ئەبێت ئەم عەبدایەتی بۆ بکات.

ب. یاساو ڕێساییەکی وردی دینی لە بواری (عقائدو ئەخلاق‌و عیبادات)دا دانا بۆ ئەوەی خەڵکی بە پێڕەوی لێکردنی بەرەو کەماڵی نەفسی‌و فکری‌و کۆمەڵایەتی بچن (اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ).

ج. دەرگای حیواری لە نێوان دینەکاندا والآ کردو فەرمووی: "وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ". و فەرمووی: "تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ...".تا فیکری خەڵك بجوڵێنێت بۆ چاکترو چاکتر "فبشر عباد الذين يستمعون القول فيتبعون احسنه".

بۆ دووهەمیان هەر بەکورتی ئیسلام ئەم کارانەی کرد:

---

[174] - سەیری (الإسلام)ی سعید حوی، بکە.

[175] - کۆمەڵگا ل٢٦.

[176] - کۆمەڵگا ل٢٧.

أ. حاكم بە تەنیا (خوایە)و هەر ئەوە کە مافی ئەوەی هەیە (حکم) بکات بەسەر بەندەکانیداو ئەوانیش بیٚ بیٚزاریو بیٚ فرتو فیٚڵ پیٚڕەوی لەو حوکمانە بکەن، "فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً" (النساء: ٦٥). "لاتكونوا كبنى أسرائيل ان تحلوا محارم الله بأدنى الحيل".

ب . ئیدارەی دەوڵەت پیٚویستە بە (شورا) بیٚت نەك تاکڕەویو دیکتاتۆری.

ج . دەوڵەت سیٚ جۆر دەزگای تیٚدا بیٚت:

. دەزگای یاسادانان کە لە ژیٚر ڕۆشنایی دەستووری ئیسلامیدا کە قورئان و حەدیسە، یاساکان دابنریٚت بەو مەرجەی کە دژ نەبن بە شتە نەگۆڕەکانی ئیسلام.

. دەزگای جیٚبەجیٚ کردن کە کاربەدەستەکان پیٚویستە خزمەتکارو ڕیٚپیشاندەر بن نەك باجگرو ستەمکار.

. دەزگای قەزاوەت کە پیٚویستە سەربەخۆ بنو تەنانەت (شەخصی) خەلیفەش هەڵنەویٚریٚ لە لیٚپرسینەوەو دادگایی کردن.

بۆ سیٚیەمیشیان هەر بە کورتی، ئیسلام ئەم کارانەی کرد:

أ. دانانی بنەمای "كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ".

ب . دانانی یاسای زەکاتو ئەو کەسانەی زەکاتیان پیٚ ئەشیٚت.

ج . دانانی بنەمای "ئیقتباس" لە هەموو عەقڵیٚکی مرۆڤایەتی کە دادی تیٚدابیٚت، بەرهەمەکەشی ئەوە بوو ئەو هەموو وڵات و شارو ئاوەدانییە دروستکراو سەرزەمینی ئیسلام کرایە بەهەشتیٚکی ڕازاوە کە دونیا خۆرو چاو چنۆکەکان چاویان تیٚبڕیو چەندجار لە چەند قۆڵەوە هیٚرشیان هیٚنا بۆ داگیرکردنی..

بۆ چوارەمیان هەر بە کورتی ئیسلام ئەمانەی کرد:

أ. جیهاد ئەبیٚت بە پیٚی ڕیٚنماییەکانی ئیسلام بکریٚت نەك گیانی تۆڵەکردنەوەو ڕاو ڕووت بەڵکو ئامانج لە جیهاد ڕزگارکردنی ستەملیٚکراوانە.

ب . جیهاد ئەبیٚت بۆ خوا بیٚتو بۆ ناساندنو گەیاندنی دین بیٚت نەك شتی تر.

ج . حاڵەتەکانی شەرو ئاشتی تیٚکەڵ نەکریٚت بەڵکو ئەبیٚت شەڕ شەڕیش بیٚتو ئاشتیش ئاشتی بیٚتو ڕیٚنماییەکانی ئەو دوو بوارەش جیا بن لە یەکتری.

بۆ پیٚنجەمیان بە کورتی ئیسلام ئەمانەی کرد:

أ . خویٚندنو خویٚندەواری ئەرکی هەموو موسڵمانیٚکە.

ب . خەڵکی خویٚندەوارو نەخویٚندەوار نەلای خواو نەلای خەڵك نە لە دونیاو نە لە ئاخیرەتدا وەك یەك نین.

ج . گەیاندنی دینو ڕۆشن کردنەوەی ڕیٚنماییەکانی جۆریٚکە لە جیهاد.

بۆ شەشەمیان ئیسلام بە کورتی ئەمانەی کرد:

أ. موڵکیەتی تاکە کەسی سەلماند چونکە یەکسانی ڕەها، کاریٚکی هەرگیز نەکراوە.

ب . مافە گشتییەکان پیٚش مافە تاکە کەسییەکان دیٚت.

ج . پاراستنی دەوڵەت ئەرکی گەلەو پاراستنی گەلیش ئەرکی دەوڵەتە.

میللەت گویٚگرتنو گویڕایەڵی لەسەرەو دەوڵەت جوڵانەوە بەدادی لەسەرە.

بۆ حەوتەمیان ئیسلام بە کورتی ئەمانەی کرد:

أ. هەموو خاوەن دینەکانی تری ناو نا "خاوەن کتیٚبەکان = ئەهلی کیتاب".

ب . بە قیاس بۆ سەر ئەوان هەموو دینە دەستکردەکانی تری خستە ناو ئەوان.

ج . مافی دینیو مافی هاوڵاتی بوونی دابە گشت کەسیٚك بە پیٚی یاسای دەوڵەت.

بۆ هەشتەمیان ئیسلام بە کورتی ئەمانەی کرد:

**أ. خیلافەت یانی ئاوەدانکردنەوەی سەر زەوی "..هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا .." (هود: ٦١) خوا لە زەوی ئێوەی دروستکردوەو داواشتان لێدەکات ئاوەدانی بکەنەوە.**

**ب . "أقتباس" لە دینذا دروست نییەو لە دونیادا ئەرکی سەرشانە لە ژێر ڕۆشنایی چەند یاسایەکدا.**

**ج . شارستانیەت دوو باڵی گەورەی هەیە: لایەنی ڕۆشنبیریو لایەنی ئاوەدانی، نابێت ئەمیان بێ ئەویان بجوڵێنێت، چونکە هاوسەنگی لەدەست ئەچێت..**

**ئەمە سەبارەت بە ئەو خاڵانەی کە فوئاد مەجید میسری ئەڵێت ئیسلام هیچ گۆڕانکاری نەکرد لەو شوێنانەدا کە حوکمی ئەکرد...**

**نازانم بنەمای "ان الحکم الا للە" لە سیاسەتداو بنەمای "كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ" لە ئابوریداو بنەمای "لە الخلق والامر" لە فەلسەفەداو بنەمای "جیاکردنەوەی دەسەڵات لە حوکمڕانیداو بنەمای "وَمَا لَكُمْ لاَ تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَالْمُسْتَضْعَفِينَ" لە جیهادداو بنەمای گوێگرتنو بە گوێکردنو لادانی خەلیفەو تیۆری شۆڕشکردن دژ بەکاربەدەستی کافرو ستەمکار و "واستعمرکم فیها " لەو گۆڕانکارییانە نەبوون کە خەڵك لەوەو پێش یان نەیان ئەزانی یا خود ئەیانزانی بەڵام کەس لە واقیعدا نەی ئەبینین، ئەمە وەك تیۆرو وەك مێژووش، شارستانیەتێکی گەورە دروست بوو بەناوی "شارستانی ئیسلامیی؟!".**

**سەبارەت بە خاڵی دووهەمی ڕەخنەکەی فوئاد مەجید میسری کە گوایە مسوڵمانان خاوەنی وەعدو بەڵێنی خۆیان نەبوون لەو وڵاتانەدا.. ئەوە ئێمە و نووسەرو ئەوەش مێژوو بزانین ئەوە تا چەند ڕاستە؟!**

**نووسەری ناوبراو ئەتوانێت تەنیا لە دوو شت ورد بێتەوە:**

**١. ئیسلام چۆن توانی ئەو هەموو میللەتو وڵاتە بۆ ماوەی (چوارده سەدە) پێکەوە گرێ بداتو بەیەك سیستەمی سیاسی ئیدارەیان بدات کە وڵاتەکەشیان لە هەموو ڕوویەکەوە جێگەی چاوتێبرینی دوژمنانو جێگەی سەرنجی دۆستان بێت.**

**٢. ئەو هەموو پێشکەوتنە (فیکری)و (عمران)یە چییە کە دونیای مسوڵمانان بە خۆیەوە بینی لە ڕۆژانی دەسەڵاتی ئیسلامیدا کە تا ئێستاش شوێنەوارەکانی هەرماوە.**

**دیارە ئەم دوکارە (بەڕێوەبردنی تاکەکان)و (بەڕێوەبردنی ئاوەدانی) بەرهەمی ئەو پەیمانو بەڵێنانە بووە کە موسڵمانان داویانە بە خواو داویانە بە خەڵك هەروەك بەرهەمی ئەو ڕێنماییە وردانەی ئیسلام بووە کە خەڵك وەك عیبادەت کردن سەیری کردوون و نەیتوانیوە چاوپۆشییان لێ بکاتو جێبەجێیان نەکات.**

**. نووسەر لە لاپەرە (٢٨)دا ئەڵێت: "لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا جوتیاران بە چەند شێوەی ناڕەوا ئازار ئەدران.. ئەو باجو خەراجەی ئەوان لەسەر خەڵکیان دانا زۆر لەوە زیاتر بوو کاتی خۆی دەوڵەتی ساسانی لە خەڵکی وەردەگرت".**

**نووسەر لەم قسەشدا هەر ناڕەوایی کردووە:**

**١. ئەو زانیارییەی لە کتێبی (تأریخ الیعقوبی) (١٩٤/٢) وەرگرتووە (بە قسەی خۆی)!، سەرەتا بڵێین: د. محمد علی الصلابی لە ژێر ناونیشانی "من بعض الکتب التي شوهت تأریخ الصحابة" ئەڵێ: "یەعقوبی ناوی: ئەحمەد کوڕی ئەبی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی جەعفەری کوڕی وەهەبی کوڕی واضحی عەباسی)یەو خەڵکی بەغدادە، مێژوونوسێکی شیعە مەزهەبە لە ناو دەوڵەتی عەباسییدا بە (الکاتب العباسی) مەشهور بووە، یەعقوبی تەنیا بڕوای بە خیلافەتی (عەلی)و مناڵەکانی هەیە ..، نەخەلیفەیەك نەصەحابییەکی نەبواردووەو قسەی خراپی بەرانبەریان نەکردبێت، کە باسی (سەقیفەی بەنی ساعیدەش) ئەکات بە پیلانو موئامەرەیەکی سەحابەی ئەزانێت بۆ داگیرکردنی خیلافەت لە عەلی کە لە بڕوای ئەودا (وصي) پێغەمبەرە (ﷺ). کاتێك باسی خەلیفەکانی ئەمەوی ئەکات ناویان ئەنێت (پاشاکان) بەڵام بە (تەقیە) خەلیفەکانی عەباسی ناو ئەنێت (خەلیفەکان)و تەنانەت لە کتێبی (البلدان) ل٤٣٢دا دەوڵەتی عەباسی ناو ئەنێت (الدوله المبارکه) ١٧٧[177].**

---

[177] ـ سەیری کتێبی "اسمی المطالب في سیرة أمیر المؤمنین علی بن طالب" / الصلابي، ص٦٠٩ بکە.

جا كەسێك ئەوە حاڵی دین‌و پاشخانی فیكری‌و ڕۆشنبیری بێت، چی لیٚ چاوەڕوان دەكرێت دەربارەی مێژووی ئیسلامی بیڵێت. كەسێك هەموو مێژوو لای بریتیی بیٚ لە مێژووی (دوانزە كەس)و ئەوانی تر داگیركەرو خراپەكار بن، ئیتر چۆن بتوانیٚ باس لە سەروەرییەكانی مێژووی ئیسلامی بكات.

٢. خەڵكە بەویژدانەكانی تر لە مێژوونوسان و پیاوانی ڕۆژئاوا وانالێن كە نووسەرە كورد زبانەكەی لای خۆمان ئەیلێت: بەڵكو پێچەوانەی ئەم دەڵێن‌و بەگۆشەیەكی سەدو هەشتا پلەیی، بۆ نموونە:

١. جۆرج قۆرم كە كتێبەكەی نامەی دكتۆرایە لە زانكۆی پاریس ساڵی ١٩٦٩ وەری گرتووە ئەڵێت: ئەمڕۆ هەموو مێژوونوسان دان بەوەدا ئەنێن كە ئیسلام لە قۆناغی یەكەمدا تەنگانەی ڕەواندەوەو ئاشتی هێنا بۆ گەلانی ڕۆژهەلاتی كە نارەحەتییان بەدەست بێزەنتییەكان دەچەشت، لە چەوساندنەوەو ستەمكاریی‌و ماندوو كردن لە ڕووی داراییەوە).[178] لە ڕووی باج‌و خەراجیشەوە ئەلی: "نیزامی باجی دەولەتی ئیسلامی زۆر ئاسان بوو ئەركی سووك بوو".[179]

. (فیشەر) باس لەوە دەكات كە خواستی دەستكەوتی ماددی پاڵنەر نەبووە بۆ فتوحاتی ئیسلامی، بەڵكو دەڵێت: "ئەو ڕۆحیەتە لەناو عەرەبدا (مەبەست موسڵمانانە) بلاوبووبوویەوە بەرزتر بوو لە تەنیا ئارەزووی جەنگ‌و دەستكەوت.. ئەو گیانە نەبوایە ئەمان نەیانئەتوانی خەڵكی شام‌و میسرو فارس‌و بەربەرەكان لە حوكمی خۆیان ڕازی بكەن".[180]

هەر "فیشەر" دەری دەخات ئەو گیانەش ئیسلام بۆی دروستكردن كە مەبەستیان بێت دین بگەیەننە خەڵكی‌و تەعلیماتی ئیسلامی پیادە بكەن لە شەڕو ئاشتییدا".[181]

فوئاد میسری لە زۆر شوێنێدا لە شتەكان حاڵی نەبووەكەچی نەپرسیویەتی لە خەڵكی بزانێت ئاخۆ ئەمە وایە كە ئەو بۆی ئەچێت نەشتەكەشی لە بازنەی (بۆچون)دا داناوە تا خەڵكی خوێنەر بڵێن: ئەوە ڕای ئەوەو چی تیایە خەڵك ئازادە لە ڕاو بۆچووندا، بەڵكو نووسەر هەر بڕیار دەدات‌و ئەڵێت ئەمە وایەو ئەوە وایە، بۆ نمونە كە باسی بازرگانی نێوان ولاتی ئیسلامی‌و نائیسلامی ئەكات ئەڵێت: "ئەگەر دانیشتوانی ولاتی داگیركراو بەرهەمیان بهێنایە دەبوو خەراج بدەن".(١٨٢)[182]

نووسەر نازانێت ئەم باسە باسی خەراج نییەو باسی (گومرك)ە كە ئەم گومركەش لە سەردەمی خەلیفە عومەری كوڕی خەتتابەوە دانراو هۆی دانانەكەشی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە لە هەندیٚ هەرێمە ئیسلامییەكانەوە نامەیان نووسی بۆ خەلیفە عومەرو تێیدا پرسیاری ئەوەی لێدەكەن كە چارەسەری ئەوە چییە، كە بازرگانە موسڵمانەكان ئەچنە دەولەتە غەیرە ئیسلامییەكان باجیان لیٚ ئەسەنرێت‌و كالاكانیان لەسەر گران ئەبێت، كەچی بازرگانە ناموسڵمانەكان كە دێنە ناو دەولەتی ئیسلامی هیچیان لیٚ ناسەنرێت، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی كە ئەوان وەك (سەرمایە) زیادیان كردووە، خەلیفە عومەریش ئەفەرموێت: ئێوەش باجیان لێوەربگرن.

ئەبو یوسف لە كتێبی (الخراج ص٦١)دا ئەڵێت: خەڵكی (منبج) نامەیەكیان نووسی بۆ عومەری كوڕی خەتتاب تێیدا نووسیبوویان: ڕێگە بدە بێینە زەوی ئیسلام بۆ بازرگانی كردن (شت بهێنین‌و شت بەرین) و دەیەكمان لێبسەنە، (عومەر)یش هاوەڵە بەرێزەكانی پێغەمبەری ﷺكۆكردەوە و لێكۆڵینەوەیەكی ئەم پێشنیارەی لەگەڵیاندا كرد، سەحابە ڕایان وابوو ڕێگەیان بدریٚ‌و گومركی (١/١٠) یان لێوەربگیرێت، عومەریش ڕێگەی دان".[183] هەروەها (یەحیای كوڕی ئادەم) لە ئەبوموسای ئەشعەرییەوە دەگێڕێتەوە كە نامەیەكی بۆ عومەری كوڕی خەتتاب نوسی و تێیدا وتی: بازرگانە موسڵمانەكان كە دەچنە ولاتی كافران (١/١٠)یان لیٚ ئەسەنن، چی بكەین؟ عومەرییش فەرمووی: وەك چۆن ئەوان لەمان

---

[178] ـ تعدد الأديان وأنظمة الحكم، جورج قرم ص١٤٦. پەراوێزی (ماستەر نامە یان هەڵەنامە ـ فاضل قەرەداغی ل٢٥).

[179] ـ تعدد الأديان أنظمة الحكم، جورج قرم ص١٤٦. پەراوێزی (ماستەر نامە یان هەڵەنامە ـ فاضل قەرەداغی ل٢٥).

[180] ـ ماستەر نامە یان هەڵەنامە ل١٨.

[181] ـ ماستەرنامە یان هەڵەنامە ل١٨.

[182] ـ كۆمەلگا ل٣١.

[183] ـ محاضرات في تأريخ الأمم والشعوب الأسلامية (١٥٢/٢).

ئەسەنن تۆش لە بازرگانەکانی ئەوانی بسەنە، کە دێنە وڵاتی ئیسلام". زانایانی ئیسلام ئەڵێن: "سەندنی ئەم گومرکە بە بەرانبەر گومرکی وڵاتانی دەرو جیرانەوە چەند فەلسەفەی تێدایە لەوانە:

١. ئەم مامەڵەیە مامەڵەی بەرانبەرەو ستەمێك نییە لەوانەن بکرێت.

٢. ئەو بازرگانانەی وڵاتی نائیسلامی کە دێنە دەوڵەتی ئیسلامی سوود لە هەموو دەزگاکانی دەوڵەت وەردەگرن وەك (پاسەوانی سەرسنوور، دادگاکانو ..)، کە ئەمانە هەموویان خەرجیان پێ ئەدرێتو جێی خۆیەتی بە بەرانبەرییەوە ئەو برە پارەیە بسەنرێت.

٣. ئەم گومرك سەندنە وا ئەکات، (چانسی ئیشکردن) زۆر بێت بۆ بازرگانەکانی دەوڵەتی ئیسلامی، چونکە ئەگەر ئەمان لە وانی نەسەنن و ئەوان لە مانی بسەنن وای لێدێت هەلو چانسەکانی بازرگانی دەکەوێتە دەست ئەوانو بازرگانە موسڵمانەکان دوائەکەونو توانای کێبەرکێ کردنیان نامێنێتو ناموسڵمانەکان دەست ئەگرن بە سەر تەواوی بازاڕەکاندا.

٤. ئەم گومرك سەندنە دوو جۆر ڕای لەسەرە: یەکەمیان: ساڵی یەك جار وەردەگیرێت لێیان، ڕایەکەی تر دەڵێ لەگەڵ هەموو کاڵایەکدا لێیان وەردەگیرێت. بەهەرحاڵ ئەوە مەسەلەیەکی ئیجتیهادییەو زانایان ئەتوانن قسەی تێدا بکەن، بە تایبەتی کە ئەمڕۆ مەسەلەی گومرك بووەتە دیاردەیەکی جیهانیو جۆرەها یاساو ڕێنمایی بۆ دانراوە.

مەبەستی ئێمە ئەوە بوو فوئاد میسری ئەم مەسەلەی گومرکەی لێبووەتە خەراجی زەویو زارو هەمووی تێکەڵ بە یەك کردووە و چاوی لە واقیعی ئێستای دەوڵەتانیش داخستوە، کەچ زۆر و ستەمێك لە خەڵك ئەکەن لەم مەسەلەی گومرك سەندنەداو هیچ نەبێت ڕەحمەتێکی نەناردووە بۆ ئەو سەردەمانەی کە خۆی لە لاپەڕە (٤٨)ی کۆمەڵگاکەیدا ئەڵێت: "ئیبنو سەلامیش دەڵێت: "هەر پرۆسەیەکی بازرگانی لە بایی دووسەد درهەم کەمتر بوایە باجی لەسەر وەرنەگیراوە". کە پێنج درهەمی ئەو کاتە حەیوانێکی چاکی کردووە واتە (٢٠٠) درهەم، نرخی (٤٠تا ٥٠) سەر حەیوانی باشبووە ئێستا ئەکاتە نزیکەی (٨ بۆ ٩) ملیۆن دیناری عێراقی، کەچی لەم حکومەتە تازانەدا تەنانەت باجو گومرك لەسەر ماسی زینەش دائەنرێت و کەسێك سەرمایەکەشی چەند سەد هەزار دیناریش بێت هەر ئەبێت گومرك بدات.. نووسەری کۆمەڵگا بە ناڕەواو بە تەعبیری ناشایستە و ڕقاوی زۆر خراپ باسی (جزیە) ئەکاتو ئەڵێت: "جزیەش باجێکی تربوو کە ئیسلام لەسەر خەڵکی ناموسڵمانی دانا، ڕاستییەکەی ئەم باجە لەجەوهەردا بێجگە لە سەرانیەك کە دەبوو بە خەزێنەی دەوڵەت بدرێت شتێکی تر نەبوو. (جزیە) سەرەتا لەسەر ئەو موساییو عیساییانەی دانرا کە وڵاتەکانیان کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامەوە، بیانوی ئیسلام بۆ سەپاندنی ئەم باجە ناڕەوایە ئەوەبوو گوایە ئەوان لە بەرانبەر ئەو باجەدا سەرو سامانیان دەپارێزرێ بۆیە ناوی (ئەهلی ذمە)شیان لێنان بە حساب لە سایەو پەنای ئیسلامدا ئازادنو بێترس مافی پەیڕەوکردنی ئاینی خۆیان هەیە".[184] لەم دەقە ڕەخنەو گاڵتە ئامێزەی فوئاد مەجید میسرییەوە چەند ڕاستی بەرجەستە ئەبێت:

١. دەوڵەتی ئیسلامی خاوەنی هەموو هاوڵاتییەکە لەسەر زەمینی ئەو دەسەڵاتەدا بژی، ئەگەر موسڵمان بێت (زەکات) ئەدات بە دەوڵەتو ئەگەر ناموسڵمان بێت (جزیە) ئەدات، کەواتە (تمیز)و جیاکردنەوەی خەڵك بوونی نییە لەم بوارەدا.

٢. ئەگەر (جزیە) باجی ناڕەوا بێت، ئەوە بە (لۆژیکە) خوارەکەی فوئاد میسریش زەکاتیش هەمان حوکمی هەیەو ئەوەش وانییەو ئێمە ئەگەر خوا ویستی باس لە فەلسەفەکانی زەکات ئەکەین لە شوێنی خۆیدا.

٣. ئەگەر دەوڵەمەندی موسڵمان زەکات بدات، بۆ ئەهلی زیممە دوو حاڵ هەیە: یان زەکاتیش لە دەوڵەمەندەکانی ئەوان بسەنرێت کە نەبڕوایان بە ئیسلامو نەبڕوایان بەزەکات نییە. یان ئەبێت هیچیان لێ نەسەنرێت و هیچ واجبێکیان لەسەر نەبێت بەرانبەر بە دەوڵەت.

جا لە هەردوو حاڵەتەکەدا ستەمو جیاکردنەوە دروست ئەبێت، ئەمەی زەکاتی لێ بسەنری وەك مسوڵمانەکان ستەمو ناڕەوانییەو ئەو بڕوای بە زەکاتو بە ئیسلام نییە چۆن زەکاتی لێئەسەنرێت؟! ئەگەر مسوڵمانەکان زەکات بدەنو ئەوان

---

[184] ـ کۆمەڵگا ل٣٢.

هەر هیچ نەدەن ئەوەش ستەمو جیاکردنەوەیە، وای لێدێ "ئەهلی ذیمە" هەموویان پاڵی لێئەدەنەوە و بەردەوام داوای (ماف) ئەکەنو هیچ (ئەرك)ێك ناکەوێتە سەریان.

٤. ئەو جزیە نەباجەو نەسەرانەی ناڕەوا، وەك فوئاد مەجید میسری ئەڵێت، بەڵکو ئەوە نیشانەی (هاولاتی بوون)ی ئەو کەسانەیە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەژینو ئەمەش لە هەموو سەردەمو شوێنێکدا هەیەو کەس نکولی لێناکات.

٥. نووسەر ئەڵێت: "بۆیە ناوی "ئەهلی ذیمە"شیان لێنان بە حساب لە سایەی ئیسلامدا ئازادن و بێترس مافی پەیڕەوکردنی ئایینی خۆیان هەیە". ئەی باشە ئەگەر ئەمە وانییە ئەی چییە؟ مەگەر:

أ . ئیسلام هەموو خاوەن کتێبەکانی ناو نەناوە "ئەهلی کتێب" کە خۆی بۆ خۆی ووشەکە جۆرێکە لە قەدرزانی و ڕێز دانان بۆیان.

ب . مەگەر ئازاد نین لە مومارەسەکردنی "شەعائیر"ی خۆیاندا (اللهم) مەگەر شتێك کە پێچەوانەی (یاسای گشتی) دەوڵەت بێتو بۆ کەس نەبێت (نەئەوانو نە بێجگە لە ئەوان) دژ بەو یاسا گشتییانە بجولێتەوە.

الفراء لە (الأحكام السلطانية)دا ئەڵێت: واذا تشاجروا في دينهم واختلفوا في معتقدهم لم يعارضوا فيه، ولم يكشفوا عنه، واذا تنازعوا في حق ارتفعوا فيه الى حاكمهم لم يمنعوا منه، وان ترافعوا فيه الى حاكمنا حكم بينهم بما يوجبه دين الأسلام).[١٨٥]

واتە: ئەگەر کێشەیەك لە مەسەلە دینییەکانی خۆیاندا ڕوویدا لە نێوانیاندا ڕەخنەیان لێناگیرێتو دژایەتیان ناکرێتو خەڵکیشیان لێئاگادار ناکرێت، وە ئەگەر کێشەشیان لە مافە تاکە کەسییەکاندا بۆ دروست بوو لەناو خۆیانداو بەرزیان کردەوە بۆ دادوەرەکانی خۆیان بەرگرییان لێناکرێت، ئەگەر بۆ دادوەری موسڵمانانیش بەرزیانکردەوە ئەوە بە پێی یاساکانی ئیسلام داوەری ئەکرێن.

ج . "ئەهلی زیمە" دوو جۆرن: ئەوانەیان خاوەنی دینی ئاسمانین، ئەوانەیان خاوەنی دینی ئەرزین، هەردووکیان بە ڕێنماییەکانی "ئەهلی کیتاب" مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرێت، تەنیا ئەوە نەبێت حەلاڵە ژن لە ئەهلی کیتابی ئاسمانی بهێنرێ و سەربڕاویان بخورێت بە پێچەوانەی ئەهلی دینە ئەرزییەکان. خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان لەو دوو خاڵەدا ئیمتیازیان بە سەریانەوە ئەبێت.

د. مەگەر بە شایەتی مێژوو، هەروەها بە شایەتی بەویژدانەکانی ڕۆژئاوا، کە ئێمە لە باسی ئازادی مومارەسەکرنی بیروباوەڕدا درێژەیەکمان بەم باسەدا، چونکە نووسەری ناوبراو قەناعەتی وایە (مومارەسەکردنی باوەڕ بە ئازادی تەقلیدێکی دیموکراسییەو لەگەڵ باوەڕی ئاییندا یەك ناگرێتەوە".[١٨٦] ئەمەش نووسەر ئەیڵێ وانییەو ئومێد ئەکەین بگەڕێتەوە سەر ئەو وەلامەی لە پێشەوە وتمان.

٦. حەزئەکەم خوێنەرو فوئاد مەجید میسریش هەندێ بە ووردی لێکۆڵینەوەیەك لەسەر فەلسەفەو هۆکارەکانی دانانی (جزیە)و بڕوکاتو کەسی جزیە لەسەردانراو بکەن، تا بزانن ئەوە تەنیا ووشەیەك نییە لە فەرهەنگی ئیسلامداو فوئادا میسریو جگە لە ئەو بیکەنە ڕەخنەیەك لە ئیسلامو ئەهلی ئیسلام. ئێمە زۆر بە کورتی ئەم چەمکی جزیە لێرەدا باس ئەکەینو هیوادارین هەرکەس ویستی زیاتر لەمە بزانێ بگەڕێتەوە بۆ کتێبە یاساییەکانی ئیسلام کە بە درێژی باس لە پێناسەی جزیەو بڕوکاتو خەڵكو هۆو ئاستەکان و .. هتد"ی جزیە ئەکەن.

. سەرەتا جزیە بریتییە لەو بڕە پارەیەی کە ساڵانە ئەخرێتە سەر پیاوی عاقڵی ئازادی ئیشکەری دەوڵەمەندی باڵغی غەیری موسڵمان کە لە ناو دەوڵەتی ئیسلامیدا ئەژیو قبووڵی (هاولاتێتی) کردووە لەو وڵاتەدا، بەڵام ئیسلامی قبووڵ نەکردووە.

. جزیە تەنیا لە پیاوانی عاقڵ و باڵغ وەردەگیرێت واتە نەلە ژنو نە لە منداڵ نە لە شێتو نە لە کۆیلە وەرناگیرێت.

---

[185] ـ الأحكام السلطانية، الفراء، (١٦٠ـ ١٦١).

[186] ـ بگەڕێوە بەشەکانی پێشتری ئەم کتێبە.

**. جزیه له پیاوانی هه‌ژارو بێئیش وه‌رناگیرێت.(١٨٧)**

**. ئاسته‌كانی توانای جزیه‌دان سیّ ئاسته:**

**یه‌كه‌م: ئاسته ده‌وڵه‌مه‌نده‌كان وه‌ك: ئاڵتونچی، بازرگان، خاوه‌ن كۆمپانیاكان، دكتۆری ناودار.. هتد.**

**دووهه‌م: ئاسته مام ناوه‌نده‌كان وه‌ك ئه‌وانه‌ی سه‌ره‌وه به‌ڵام وه‌ك ئه‌وان ناوبانگیان نییه بۆ ده‌وڵه‌مه‌ندیو سه‌رمایه‌داری.**

**سێهه‌م: ئاسته‌كانی خوار ئه‌وان وه‌ك: ئاسنگه‌ره‌كان، دارتاشه‌كان، به‌كورتی ئه‌وانه‌ی كه پیشه‌یه‌كیان هه‌یه.** [188]

**. ئیمامی شافیعی ئه‌فه‌رموێت: "ساڵێك جارێك جزیه ئه‌سه‌نرێتو لانی كه‌م دینارێك لای سه‌روه‌شی ئه‌درێته ده‌ست بریاری موسڵمانان".** [189] **الأحكام السلطانية (ص١٣٨). ئه‌بوحه‌نیفه ئه‌فه‌رموێت: "لای كه‌می (٥) درهه‌مه‌و لای سه‌ری جێگه‌ی ئیجتیهاده".**

**. جزیه له زمانی عه‌ره‌بیدا به‌و مانایه دێت، شتێك له پاداشتو جه‌زای شتێكی تردا بدرێت واته: له پاداشتی ئه‌وه‌ی كه ئه‌مان سه‌روماڵیان ئه‌پارێزرێت ساڵانه (٥) درهه‌م یان (یه‌ك) دینار ئه‌ده‌ن، یان له جه‌زای ئه‌وه‌ی كه ئه‌مان كافرنو ئیسلا م قه‌بووڵ ناكه‌ن ئه‌وه جزیه ئه‌ده‌ن.(١٩٠)**

**. فه‌لسه‌فه‌ی جزیه‌دان وه‌ك زانایان باسی ئه‌كه‌ن چه‌ند شتێكه:**

**١. له‌به‌رئه‌وه‌ی "ئه‌هلی زیممه" هاوڵاتینو وه‌ك موسڵمانان ته‌واوی سوود له ته‌واوی دامه‌زراوه و ده‌زگاكانی ده‌وڵه‌ت وه‌رده‌گرن و "ئه‌مان" یان پێ ئه‌درێتو نه‌ك هه‌ر ئه‌وه به‌ڵكو كه‌مترین سته‌م چییه ناكه‌وێته سه‌ریان، چونكه ئه‌وان پێغه‌مبه‌ری ئیسلام ﷺ خاوه‌نیانه‌و ئه‌و له په‌یمانو به‌ڵێنه‌كانیان ئه‌پرسێته‌وه.. ئیبن عومه‌ر ئه‌فه‌رموێت: "كان آخر ما تكلم به النبي ﷺ ان قال: احفظوني في ذمتي".** [191]

**٢. داوا له "ئه‌هلی ذیممه" ناكرێت، سه‌ربازی بكه‌ن، بۆ ده‌وڵه‌تی ئیسلامی و سنووره‌كانی ده‌وڵه‌ت بپارێزنو به‌شداری شه‌ڕو غه‌زا بكه‌ن وه‌ك چۆن داوا له موسڵمانه‌كان ئه‌كرێتو فه‌رزه له‌سه‌ریان، ئه‌وه‌ش "لۆژیكێكی واقیعی" ئیسلامه كه داوا له كه‌سێك ناكرێت كه بڕوای به عه‌قیده‌و دینی ئیسلام نییه بێت به‌رگری له قه‌واره‌كه‌ی بكات!!**

**٣. هه‌ركه‌سێكیش كه به‌شداری (شه‌ڕ) بكاتو به‌رگری له‌وڵاتو گه‌ل بكات، جزیه‌ی له‌سه‌ر هه‌ڵده‌گیرێت.**

**٤. هه‌ركه‌سێكیش له "ئه‌هلی ذمة" موسوڵمان ببێت ئه‌وه ئۆتۆماتیكی جزیه‌ی له‌سه‌ر نامێنێتو وه‌ك موسڵمانان ته‌نیا زه‌كاتی شه‌رعی ئه‌كه‌وێته سه‌ر.**

**٥. جزیه له‌سه‌ر "ئه‌هلی زیممه" نامێنێت كاتێك موسڵمانان توانای پاراستنو به‌رگری كردنیان نه‌مێنێت لێیان.**

**(به‌لازه‌ری) مێژوونوسی چه‌رخی عه‌بباسی له كتێبی (فتوح البلدان)دا ئه‌ڵێت: "موسڵمانان كاتێك چوونه (حمص) جزیه‌یان له ئه‌هلی كتابی ئه‌وێ سه‌ند له‌وانه‌یان كه نه‌یانویست بێنه ناو ئیسلام، به‌ڵام كاتێك كه زانییان ڕۆم سوپایه‌كی گه‌وره‌ی ناوه به‌یه‌كه‌وه به‌نیازه بكاته سه‌ریان و شاره‌كه‌یان لیّ بسه‌ننه‌وه، موسڵمانان هه‌ستیان كرد كه ناتوانن به‌رگری له شاره‌كه‌و خه‌ڵكه‌كه بكه‌ن، بۆیه هه‌موو ئه‌و جزیه‌ی وه‌ریانگرتبوو گه‌ڕاندیانه‌وه بۆ خه‌ڵكه‌كه‌و پێیان وتن: ئێمه توانای پاراستنی ئێوه‌مان نییه بۆیه خۆتان ئازادن چیده‌كه‌ن. "ئه‌هلی حمص" وتیان: أن ولايتكم وعدلكم أحب الينا مما كنا فيه من الظلم والغشم، ولندفعن جند هرقل، عن المدينة مع عاملكم". ڕیوایه‌ته‌كه ده‌ڵێت: "ونهضوا بذلك فسقط عنهم الجزية".** [192](*)

---

[187] ـ الأحكام السلطانية ـ الماوردي ١٣٨.

[188] ـ الخراج، أبويوسف (ص١٤٨)، بۆ زیاتر ئاگاداری سه‌یری (بنه‌ماكانی فیكرو سیاسه‌تی بزوتنه‌وه‌ی ئیسلامی ل١١٨) بكه.

[189] ـ الأحكام السلطانية الفراء ١٣٨.

[190] ـ الأحكام السلطانية الفراء ١٥٣.

[191] ـ الأحكام السلطانية (١٢٧و ١٢٨).

[192] ـ فتوح البلدان ص١٤٣.

(*) واته: فه‌رمانڕه‌واییو دادی ئێوه لامان خۆشه‌ویستتره له‌و سته‌مو داپڵۆساندنه‌ی تێیدا بووین، له‌گه‌ڵ والیه‌كه‌ی ئێوه‌دا ئێمه‌ش ئه‌چین به‌گژی سه‌ربازه‌كانی (هرقل)دا، كه به‌م كاره هه‌ستان "جزیه"یان له‌سه‌ر هه‌ڵگیرا.

. خاڵێك هەیەو من زۆر بە گرنگی ئەزانم کە سەرنجی فوئاد مەجید میسری و خوێنەرانی بۆ ڕابکێشم ئەویش ئەوەیە، ئەم جزیەدانە لەسەرتادا لای ئەهلی کیتاب و ئەوانەی حوکمی ئەوانیان هەیە زۆر سووکتر و چاکترە لە شەڕیان قەبوڵکردنی ئیسلام، چونکە نە ئیسلامەو نە ئەهلی ئیسلام ناناسن، بەڵام بە درێژایی مێژوو ئەوە دووبارە بووەتەوە کە کاتێك "ئەهلی زیممە" بە تێپەڕبوونی کاتو ساڵ، جوانیو گەورەیی ئیسلامیان بۆ دەرکەوتووەو دادی ئیسلامیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، شایەتمانیان هێناوەو بوونەتە موسڵمانو ئیتر جزیەیان لەسەر نەماوە.

مێژوو ئەڵێت: "لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا ئەوەندە خەڵك لە "ئەهلی زیبمە" موسڵمان بوون و ڕوویان کردە ئیسلام یەکێك لە کاربەدەستەکانی عومەر کاغەزێکی بۆ عومەر نوسیو تێیدا پێشبینی ئەوەی کردبوو کە لەوانەیە هەموو "ئەهلی کتاب" موسڵمان بن، و سەرچاوەیەکی دارایی کە جزیەیە هەر نەمێنێتو (بیت المال) زیانێکی گەورەی لێبکەوێت، بۆ مەحکەمکردنی سوپاو سنورەکانی دەوڵەت. عومەریش بۆی نوسییەوەو فەرمووی: نامەکەتم پێگەیشتو لە مەبەستەکەت حاڵی بووم، وەڵڵاهی من حەزم لەوەیە هەموو خەڵکی موسڵمان بن. منو تۆش ببینە جوتیارو ئەو کاتەم خۆشە کە دیاردەی وا دەبینم و ئامادەم و پێمخۆشە منو تۆیش بچین زەوی بکێڵینو نانی کاسبی دەستی خۆمان بخۆین".[193]

مێژوونووسان ئەڵێن: "أنه یسره ان یحرث الارض ویأکل من عمل یده اذا أسلم أهل الذمة کلهم، فتنقطع الجزیة وتعجز مالیة الدولة ان تکفله".[194]

هەرچەندە فوئاد مەجید میسری ئەم موسڵمان بوونە ئەگێڕێتەوە بۆ ئەوەی گوایا نیازیان بووە خۆیان لە جزیە قوتار بکەن بۆیە موسڵمان بوون!! نازانم دانی زەکات زۆرە بیدات کاتێك کە موسڵمان ببێت یان دانی جزیە، کە هەر بە نا موسڵمانی بمێنێتەوە؟ خۆشە مرۆڤیش بە ویژدانو عاقڵ بیت.

فوئاد مەجید میسری! جزیە چ بڕەکەی و چ چۆنییەتیەکەی کارێکی ئیجتیهادییەو سەرۆکی وڵاتو شوورای ئیسلامی بۆیان هەیە قسە لەسەر هەموو بڕگەکانی بکەنو یاساو ڕێنمایی تایبەتی بۆ دابنێنو هەندێك لە زانایان دەڵێن: دیاری کردنی جزیەو چۆنییەتییەکەی پەیوەندی بە هەردوو لایەنی (ئیسلامی)و (غەیرە ئیسلامی)یەوە هەیە، واتە بە ڕەزامەندی ئەهلی ئیسلامەو ئەهلی ئەدیانەکانی تر دائەنرێت، تەنانەت ئەو بڕیارانە ئەچێتە ناو شوورای ئیسلامیو لەوێدا (متمانە)ی پێئەبەخشرێتو ئەبێتە یاسا، جا کەواتە جزیە هەروا وشەیەك نییە فوئاد مەجید میسری دووسێ قسەی لەسەر بکاتو بنیشێت بە ڕایەکی تایبەتی زانایەکی تایبەتەوە کە لە سەردەمێکی تایبەتدا کردوویەتیو وابزانێت ئەوە ئیتر تانو پۆی باسەکەیەو تەواو.

فوئاد مەجید میسری لەزۆر شوێنداو بە زۆر شێوە ئەم بابەتە ئەوروژێنێ، ئومێد ئەکەم ئەو چەند بڕگەیە وەڵامێکی باش بێت بۆ ئەو گومانانەی ئەو کە بەربایان ئەکات. بەگاڵتە پێکردنەوە ئەڵێت: بەتەنیا موسایيو عیسایی (ئەهلی زیممە) نینو بەڵکو (سابئە)و مەجوسییەکانیش (ئەهلی زیممەن)و ئەبێت جزیە بدەن".[195]

نووسەر دیسان بەڕەخنەوە دەڵێت: "دیسان لەگەڵ ئەم باجەش چەند ئەرکێکی تری لەسەر دانرابوو، دەبوو ڕێبواری موسڵمان تێر بکات".[196] فوئاد میسری ئەیەوێت بە یاساو ڕێنماییەکانی ئەم چەرخو سەردەمە دادگایی ئەو ڕۆژە دوورانەی مێژوو بکات.. کاکە فوئاد! حەزئەکەم تێبینی سێ خاڵ بکەیلەم مەسەلەیەدا:

١. ئەو داننان بە مافی دینەکانی صابیئەو مەجوسی ڕێزلێنانیان و بەرزکردنەوەیانە نەك سوك کردنو بە هیچ نەزانین، ئیتر نازانم بۆچی تۆ بە شتێکی خراپی ئەزانی، ئەوە هۆکەی ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت دەربارەی

---

[193] ـ سيرة عمر بن عبدالعزيز ـ السيوطي ص٩٩ـ ١٠٠.

[194] ـ رجال الفکرة والدعوة، الندوي، ص٤٩، هەروەها الخراج ـ ابن أبي آدم، ص ٢١و ٢٢و ٢٣.

[195] ـ کۆمەڵگا ل٣٢.

[196] ـ کۆمەڵگا ل ٣٣.

**ئاگرپەرستان: "سنوا بهم سنة أهل الكتاب". وەك ئەهلی کتێبەکان مامەڵە لەگەڵ ئاگرپەرستەکانیش بکەن، باشە ئەگەر وانەبوایە تۆ چیت ئەوت؟**

**٢. ئەو میوان تێرکردنو میواندارییە ئەرکو واجبی مسوڵمانو ئەرکی "ئەهلی زیمە"ش بووەو تەنیا واجبی ئەوان نەبووە،[197] هۆکەشی ئەوەیە کە ڕێبواران لەو ڕۆژگارەدا زۆر پێویستیان بەوە هەبووە، دەوڵەت یاسایەکی لەو جۆرەیان بۆ دەربکات، چونکە زۆرجار ڕێککەوتووە ڕێبوارێك ڕێی کەوتووەتە شوێنێكو تینی بۆ هاتووە کەچی میوانداری لێنەکراوە، و ئەوە بووەتە هۆی تیاچونی! خۆ ئەمڕۆ نەبووە (چێشتخانەی زۆرو زەوەندە هەبێت) یان میوانخانەو هۆتێلی جۆراوجۆرو پلە هەبێت، هەبووە نەبووە، چەند ماڵێك هەبوون لە کوێرە دێیەکدا، ئەو یاسایە دانراوە بۆیان بۆ ئەوەی کەس لەو ڕۆژو سەردەمانەدا پەکی نەکەوێت. چونکە بەڕاستی خەڵك یان ئەبێت لە لێپرسینەوەی خواو قیامەت بترسێت یان لە لێپرسینەوەی یاساو دەوڵەت بترسێت.**

**٣. ئەم مەسەلەی میوانداری کردنی ڕێبوارانە، چەمکێکی شارستانیو زۆر گەورەیە کە فوئاد میسری یان لێی تێنەگەیشتووە یان نایەوێت خەڵکی لێی تێبگات.. لە ئیسلامدا میوان کەسێکی بەڕێزەو بچێتە هەر ماڵێك ڕزقی خۆی ئەخواتو میوانپەزیریش سونبولی پیاوەتییە لە مرۆڤدا، هەرکەس خەلکی ڕووی تێنەکات ئەوە دیارە بە مەردو خاوەن ماڵی نازانن.. میوانداری لە ئیسلامدا یەك ڕۆژ واجبەو سێ ڕۆژ سووننەتە، واتە تا سێ ڕۆژ پیاوەتی نییە بۆ مرۆڤ جوابی میوانی بکات، بەڵام پاش سێ ڕۆژ بۆی هەیە لێی بپرسێت: کاکە خێرە؟ نیازتە بەرەو کوێ بڕۆی؟ و دوای ئەو سێ ڕۆژە ئەبێ خۆی مەسروفی خۆی بکات، تەنانەت زانایان ئەفەرموون: هەرکەسێك میوان دەربکات بۆ "دادگای ئیسلامی" هەیە شکاتی میوان قبوڵ بکاتو مافی ئەو ڕێبوارو میوانە لە خاوەن ماڵ بسەنێت.**

**جا کاکە! ئەگەر موسوڵمان ئەم ئەرکە بخرێتە سەرشانی، بۆچی غەیری موسڵمان ئەو ئەرکەی نەخرێتە سەر، مەگەر ئەوانیش هاوڵاتی نین، مەگەر ئەوانیش (پیاوو مەرد) نین، زیاد لەمەش، دەسەڵاتی ئیسلامی ئەرکی سەرشانێتی کە "یاسا"و "ڕێنمایی" دەربکات، بۆ ئەوەی بەهێزترین پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان موسڵمانانو "ئەهلی زیمە"دا دروست ببێت، نەك ئەو ئەم بە میوان ڕانەگرێتو ئەم ئەو بە "گول"و پیس بزانێتو نانی ماڵی نەخوات. مەگەر پێغەمبەر ﷺ دراوسێیەتی "ئەهلی کیتابی" نەئەکرد، قەرزی لێنەئەکردنو نەئەدانێ، مەگەر لە ئیسلامدا ژن و ژنخوازی لە نێوان موسڵمانانو ئەهلی کیتابدا نییە. دەی ئیتر بۆچی تۆ ئەتەوێت تۆوی حەساسییەت و یەکتر نەویستن بچێنی لەناو خەڵکدا، خوا هەڵئەگرێت؟!**

**فوئاد میسری زۆر بە تەشەرەوە باسی زەکات ئەکات لە کۆمەڵگاکەیداو لە زۆر شوێندا هەر ناوی ئەنێ (باج)و (سەرانە)، نازانم ئایا فوئاد مەجید جگە لە کتێبی (النزعات المادیة)و یەك دوو نامیلکەی تر چی لەسەر زەکات خوێندووەتەوە؟ زەکات ئەو مەسەلە ئابورییە گەورەو فراوانەیە کە ئەگەر وەك ئیسلام و ڕێنماییەکانی ئیسلامی دیاری کردووە، وەربگرێت، بە ڕاستی زۆرترین کێشەی ناو کۆمەڵگا چارەسەر دەکات، با فوئاد مەجید میسری تۆزێك لە خۆی ببورێت و هەر هیچ نەبێت کتێبی (فقه الزكاة في الأسلام)ی دکتۆر (یوسف القرضاوي) بخوێنێتەوە تا کەمێك لە فەلسەفەی زەکات حاڵی ببێتو بزانێت زەکات چ مەسەلەیەکی گەورەیەو من ناچارم هەندێ زۆر بە کورتی و بە خاڵ باسی زەکات و فەلسەفەی زەکاتو ئەو کێشانەی بەزەکات چارەسەر ئەکرێت بکەم، تا خوێنەرو فوئاد مەجید میسری خۆیشی بزانێت بە ڕاستی ناهەقی ئەکات لە گوڵی کاڵتر بەرانبەر بە ئیسلامو زەکات بڵێت..**

[197] ـ (الفراء) لە (الأحكام السلطانية)دا ئەڵێت: ئەم میوان بەخێوکردنە لە دووشتدا وەك یەکن، سەبارەت بە کافرو موسڵمانو لە دوو شتدا جیاوازی لە نێوان کافرو مسوڵمان ئەکرێت: لەوەدا کە میوانداری کردنیان واجبە یان کارێکی باشە یەکسانە بە نیسبەت هەردوولاوە. بەڵام لەسەر موسڵمان بە "شەرع" دائەبەزێتو لەسەر کافر بە "شەرت"، دائەبەزێت، لەسەر موسڵمان لە شارو لادێدا هەر واجبە بەڵام لەسەر غەیری موسڵمان تەنیا لە لادێدا واجب ئەبێت، کەواتە فوئاد میسری ناحەقی ئەکات کە حوکمی ئەوە ئەدات ئەم ئەرکە تەنیا لەسەرشانی (خاوەن کتێبەکان) بووە، یان وائەزانێ ئەوە کارێکی ناجوانو نەشیابووە.

**١. زەكات: بڕبڕەی پشتی یاسا ئابوورییەکانی ئیسلامەو هەموو یاساکانی تری ئابوری لق و پۆپن بۆ زەکات، وەك : "خەراج، جزیە، صدقات، ئەوقاف،.." ئەم زەکاتە لە زۆریدا ئەگاتە چڵەپۆپە بە تایبەتی کاتێك کە کاروباری بازرگانی و کشتوکاڵی چالاك بن.**

**٢. سەروەت و سامان ئەبێت بجوڵێت و سڕ نەکرێت، ئەگینا خەرجی سەری هەمووی دەخوات، بە زەکات ئەو جوڵەیە لە سەروەت و ساماندا دروست دەبێت، چۆن؟ بۆ نمونە: کەسێك ئەگەر ملیۆنەها دیناریشی هەبێت، هەموو ساڵێك (٢,٥)ی لەسەددا بداتە صندوقی زەکات، پاش ماوەیەك ئەو زەکات و خەرجییەی خۆی تەنیا (حد النصاب)ەکەی بۆ ئەهێڵێتەوە، بۆیە کابرای دەوڵەمەند ناچار ئەبێت ئەو پارەیە بجوڵێنێت تا (زەکات)ەکەی لەسەر حسابی قازانجەکە بێت، نەك لەسەر حسابی سەرمایەکە.**

**٣. زەکات لە ڕێگەی دامەزراوەیەکی تایبەتی دەوڵەتەوە کۆ ئەکرێتەوە، کە پێویستە لق و نوسینگەی تایبەتی لە هەموو شارو گەڕەکێکدا هەبێت و کۆنترۆڵی دابەشکردنەوەشی بەسەر (موستەحەققەکانی خۆیدا) بکات، جا هەر لەو سندوقی زەکاتە (مووچەی) هەموو ئەو کارمەندو شوێنانە ئەدرێت و ئەرکیان ناکەوێتە سەر خەزێنەی دەوڵەت.**

**٤. کەسێك زەکات نەدات بە دەوڵەت بە زۆر لێی ئەسەنرێت، چونکە ئەوە مافی هەژارانەو بۆ ئەو نییە زەوتی بکات لێیان. یان ئەگەر کۆمەڵێك کلك گرێبدەن پێکەوەو یاخیبن لە دەوڵەت و زەکات نەدەن، ئەوە بۆ ئەو دەوڵەتە دروستە شەڕیان لەگەڵدا بکات و مافی هەژاران و کەمدەست و قەرزارانیان لێبسەنێت.**

**٥. سندوقی زەکات سندوقێکی تایبەتی سەربەخۆیەو پەیوەندی نییە بە خەزێنەی گشتی دەوڵەتەوەو لە کاتی پێویستیدا نەبێت دەستکاریی ئەم سندوقە ناکرێت و تەنیا بۆ ئەو هەشت (جۆرە) کەسە بەکاردێت کە قورئان دیاری کردوون.**

**٦. زەکات ڕوو ئەکاتە (پارەی نەقد) و (ماڵی بازرگانی)و (کشتوکاڵ و باخ)و (ئاژەڵ)..هتد. واتە وەك زانایان دەڵێن: نزیکەی "دەیەکی"ی سەروەتی ئوممەتی ئیسلامیی دەگرێتەوە، جگە لە ئاژەڵ و زەوی و زار.**

**٧. ئەم پارەی زەکاتە لە (٨) بواردا خەرج ئەکرێت و ئەوەشی ئەمێنێتەوە لە بەرژەوەندییە گشتییەکانی دەوڵەتی ئیسلامی و کۆمەڵگەی موسڵماناندا سەرف دەکرێت، ئەو هەشت بوارەش ئەمانەن:**

**بواری یەکەم: هەژاران (الفقراء).**

**بواری دووهەم: کەم دەستان (المساکین).**

**بواری سێهەم: کارمەندانی زەکات (والعاملین علیها).**

**بواری چوارەم: دڵراگیراوەکان (المؤلفة قلوبهم).**

**بواری پێنجەم: قەرزارەکان (الغارمین).**

**بواری شەشەم: کڕینەوەی مرۆڤە دیل و عەبدەکان (وفی الرقاب).**

**بواری حەوتەم: ڕێبوارو ئاوارەو دابڕاو لە خزم و کەس و کارو ماڵی خۆی (ابن السبیل).**

**بواری هەشتەم: لە پێناو خواو دیندا (فی سبیل الله).**

**زانایانیش لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا کە ئەم هەشت بوارەی دیاری کردووە چەند حاڵەت و کەسی تریان بە "قیاس" لکاندووە بە هەریەك لەو بوارانەوە. ئایەتەکە ئەفەرموێت: "إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاء وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِّنَ اللّهِ وَاللّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ". (التوبە: ٦٠).**

**زانایان ئەفەرموون:**

**. کەسێك لەسەر ژنهێنان قەرزار بێت لە سندوقی زەکات قەرزەکەی بۆ ئەدرێتەوە.**

**. کەسێك مارەیی ژنەکەی بۆ نەدرێت لەسەر سندوقی زەکات بۆی ئەدرێت.**

**. کەسێك لەسەر خانوو کردن قەرزار بێت لە سندوقی زەکات قەرزەکەی بۆ ئەدرێتەوە. ئەمانە بە (قیاس) ئەچنە ناو (غارمین).**

**. ئەو قوتابیانەی کە ئەخوێننو (باڵغ) بوونو موڵکی تایبەتی خۆیان نییە با باوکیشیان دەوڵەمەند بێت لە سندوقی زەکات مووچەی تایبەتییان ئەدرێتێ تا خوێندن تەواو بکەن.**

**. ئەو کرێکارانەی بەشی پێویست سەرمایەیان نییە کارەکانی خۆیانی پێ بەڕێوەبەرن بە پێی پێویست یارمەتی و هاوکاری لە سندوقی زەکات وەردەگرن.**

**. هەموو کەسێکی بێ کار کە کاری دەست ناکەوێت لە سندوقی زەکات هاوکاری ئەکرێ.**

**. پزیشکو "سەیدەلانی" وەك (کرێکار)ن کاتێك لە خوێندن دەرئەچن یارمەتییان ئەدرێت لەم سندوقە تا بتوانن (عیادە)و شوێنی کارکردن دابنێن.**

**. هەموو کەسێك کە بتوانێت بۆ دین و دەوڵەت تێبکۆشێت تفاقی جیهادو تێکۆشانی لەم سندوقە بۆ دابین ئەکرێتو هەموو کەرەسەکانی شەڕو تفاقەکانی ئەبێتە موڵکی خۆی.**

**. موچەی بەردەوام ئەدرێتە پێشمەرگەو هێزی یەدەکی ئیسلامی لە سندوقی زەکات.**

**بەکورتی: زەکات بۆ هەموو کەسێك سەرف ئەکرێت کە یان (نییەتی) یان (بەشی پێویستی نییە).. لە "شێخ حەسەنی بەسری"یان پرسی: کەسێك خانووی خۆیو خزمەتکاری خۆی هەبێت زەکاتی پێ ئەشێت؟ فەرمووی: "كانوا يعطون الزكاة لمن يملك عشرة آلاف درهم من الفرس والسلاح والخادم والدار".[198]**

**٨. زەکات وەك چۆن گرفتی هەژاریو کەمدەستیو بەتاڵیو نەزانینو نەتوانینو ئیفلاسیو بێ ژنیو بێ خانوویی پێ چارەسەر ئەکرێت، هەروەها کارگەی ئیش پێکردنی پێ دروست ئەکرێت، بۆ ئەوەی خەڵك تییدا ئیش بکاتو خۆیان لە بەرهەمەکەیدا (شەریك بن)و هەموو ئەمانە بەبێ بەرانبەر پێیان ئەدرێت.[199]**

**٩. کەسێك خاوەنی هێزبێتو توانای ئیشکردنو کاسبی کردنی هەبێت، بە سندوقی زەکات ئەخرێتە ئیش! چۆن؟ کەرەسەی ئیشکردنی بۆ ئەکڕێت. ئەگەر خەیاتی بزانێت مەکینەی خەیاتی بۆ ئەکڕێت، ئەگەر دارتاشی بزانێت ئەوە کەرەسەی دارتاشی بۆ ئەکڕێت، وە هەروەها، عەبدوڵڵای کوڕی عەدی خەیار ئەڵێت: "دوو پیاو بۆیان گێڕامەوە کە چوونەتە خزمەتی پێغەمبەرﷺو داوای زەکاتیان لێکردووە، پێغەمبەریش لێیان ورد ئەبێتەوە، جوان چاو ئەگێڕێت بە سەریاندا کە ئەبینێ دوو کەسی بە تواناو بەهێزن، ئەفەرموێت: "ئەگەر حەز بکەن بەشتان ئەدەم، بەڵام ئەوە بزانن ئەم زەکاتە پشکی دەوڵەمەندو خەڵکی بەهێزو ئیشکەری تێدانییە".[200]**

**کەسێك خۆی یەکلا بکاتەوە بۆ عیبادەت کردن وەك نوێژکردنو زیکر کردن، ئەرکی سەرشانێتی بچێت کاسپی بکاتو زەکاتی پێ ناشێت، وە ئەو کارەی کاری شەخسییە، بەڵام ئەو کەسەی کە خۆی یەکلاکردۆتەوە بۆ (زانست) و خوێندنو ناتوانێت لە هەمان کاتدا بشخوێنێتو کاسبیش بکات، ئەوە لە سندوقی زەکات پارەی بۆ دەبڕدرێتەوە، بۆ ئەوەی خوێندنەکەی بە (خەیاڵ ڕاحەتی) تەواو بکات، چونکە کارەکەی ئەم سوودی بۆ کۆمەڵگە هەیەو ئەو بە کارێکی فەرزی کیفایە هەڵدەستێت.**

**زانایانیش ئەفەرموون:**

---

[198] ـ بدائع الصنائع، (٤٨/٣) پەراوێزی (الاسلام/ سعید حوی، ل٢٨٣). عومەری کوڕی عەبدالعزیز فەرمانێکی میری نووسی بۆ یەکێك لە "والی"یەکانی کە قەرزی هەموو قەرزارێك ببژێرێ، والیەکە بۆی نوسی قوربان هی وا هەیە خانووشی هەیەو خزمەتکاریشی هەیە و ئەسپو ماڵی باشیشی هەیە( زەکاتی چۆن پێئەشێت).، عومەر بۆی نوسییەوە : هەموو کەسێك پێویستی بە خانوویەك هەیە تێی بچێت و پێویستی بە خزمەتکارێك هەیە کاروباری بۆ جەموجۆر بکات و ئەسپیشی ئەوێ بۆ ئەوەی جیهادی دوژمنی پێبکات و ماڵیشی ئەوێ کە خانووەکەی پێ پۆشتە بکاتەوە، لەگەڵ ئەمانەدا هەر قەرزارە، کەواتە تائەتوانن قەرزیان بۆ بدەنەوە.. سەیری (سيرة عمر بن عبدالعزيز) / أبو محمد عبدالله بن عبدالحكم ص١٦٤). بکە.

[199] ـ لەوانەیە خوێنەرو نووسەری کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خیلافەتیشدا سەریان لەمە سوڕ بمێنێت، بەلام ئەوە حەقیقەتێکەو "بەشاردنەوەی ئیسلام" ئەو ز یانە گەورەیە لە هەژاران ئەکەوێتو ڕۆژیان بەم ڕۆژە ئەگات کە یان وەك مرۆڤ سەیر ناکرێن یان وەك مرۆڤێکی پلە خوار سەیر ئەکرێنو پێویستە نەهێڵرێت دەوڵەمەند ببن!!

[200] ـ قال رسول الله ﷺ : "أن شئتما أعطيتكما ولاحظ فيها (أي في الزكاة) لغني ولا قوي مكتسب" رواه أحمد وأبوداوود، قال أحمد: ما اجوده من حديث، المجموع/ النووي (١٨٩/٦).

"ئەساسەن زەکات بۆ دوو شت ئەبێت: بۆ ئیحتیاجیی موسڵمان‌و بۆ موسڵمانی موحتاج"[201]

خوێندنی قوتابیان هەردووکی لە خۆ گرتوە، قوتابیان خۆیان موحتاجی موسڵمان‌و کارەکەشیان لە ئیحتیاجاتی موسڵمانانە.

"زانایانی ئیسلام لەژێر ڕۆشنایی دەقەکانی شەریعەتدا دوو ڕایان هەیە لەسەر مەسەلەی زەکات دان بە "هەژاران"و "کەم دەستەکان".

ڕای یەکەم: ئەوەندەی ماڵ ئەدرێتێ کە کیفایەتی هەموو ژیانی بکات‌و ڕزگاری بکات لەو نەبوونییە.

ڕای دووهەمیان: بەشی ساڵێکی پێ ئەدرێت‌و ئەگەر لەو هەژاری‌و کەم دەستییە ڕزگاری نەبوو ساڵانە بۆی تازە ئەکرێتەوە.

فەلسەفەی ئەم پارە پێدانەش ئەوەیە کە حاڵەتی هەژاری‌و نەبوونی پێویستە نەهێڵرێت لە ناو کۆمەڵگادا ئەو جیاوازییە زۆرە کەم بکرێتەوە لەنێوان هەژارو دەوڵەمەنداو بنەما ئیسلامییەکەیە بێتەجێ کە ئەفەرموێت: "كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاء مِنكُمْ".

ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: "المسالة الثانية: فی القدر المصروف الى المسكين والفقير، قال أصحابنا العراقيون وكثير من الخراسانيين: يعطيان مايخرجهما من الحاجة الى الغني، وهو ماتحصل به الكفاية على الدوام"[202]

هەندێك لە زانایان ئەفەرموون: ئەگەر ئەو هەژارە یان ئەو کەم دەستە پیشەوەرێك بێت ئەوە لە ماڵی زەکات "کەرەسەکانی پیشە"کەی بۆ ئەکرێت ئەخرێتە ئیش بۆ ئەوەی لەو نەبوونییە ڕزگاری ببێت‌و نەك پێویستی بەزەکات وەرگرتن نامێنێت، بەڵکو ئەویش بکەوێتە زەکاتدان.

١٣. یەکێك لە گەورەترین سەروەرییەکانی یاسای زەکات: کردنەوەی دەرگای ژنهێنانە بەماڵی زەکات .. ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية)دا، دەربارەی (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) ئەڵێت: "....وكان مناديه فى كل يوم ينادي: أين الغارمون؟ أين الناكحون؟ أين المساكين ؟ أين اليتامى؟ ....حتى أغنى كلا من هؤلاء"[203] بەڵگەی ئەم کارەی عومەریش حەدیسێکی پێغەمبەرە "ﷺ" کە ئەبوهورەیرە ئەگێڕێتەوە ئەڵێت: "کابرایەکی ئەنصاری هاتە لای پێغەمبەرو ووتی: قوربان! ژنم هێناوە، پێغەمبەر فەرمووی: لە سەر چەند مارەت بڕیوە؟ ووتی: لەسەر چوار "ئەواق"، پێغەمبەر فەرمووی: "چوار ئەواق"؟! ئەڵێی لەو شاخە زێڕ دەردەهێنی! پاشان فەرمووی: "ما عندنا ما نعطيك ولكن عسى ان نبعثك فى بعث تصيب فيه".[204]

ئەم فەرموودەیە وادەردەخات کە یارمەتیدانی پێغەمبەر "ﷺ" وەك سەرۆکی دەسەڵاتی ئیسلامی، لەو حاڵەتانەدا لای "سەحابە" زانراو بووە، بۆیە ئەم سەحابەیە دێتە لای پێغەمبەرو ئەو داوایە ئەکات‌و پێغەمبەریش ئەفەرموێت: "ما عندنا مانعطيك"، نافەرموێت: ئەم ماڵە مافی ئێوە مانانی تێدانیە، وەك بە دوو کابراکەی تری فەرموو: ئەم ماڵە مافی دەوڵەمەندو کەسی بەهێزی تێدانیە"، بەڵام پێغەمبەر "ﷺ" بۆ ئەم کابرایە چارەسەرێکی تری دانا فەرمووی: بەڵکو بتنێرن بۆ غەزایەك‌و لەو غەزایەدا تووشی خێرێك ببیت.

١٤. ڕێگاکانی سەرف کردنی زەکات بەبێ گومان لەم ڕۆژانەدا گۆڕانکاری زۆریان بەسەردا هاتووە، جاران چەند تیمێکی گەڕیدە دائەنرا بۆ شارێك‌و ئەو شارەیان ئەکردە چەند "مقاطعة"یەك‌و بانگەوازیان ئەکرد بۆ ئەوەی دەوڵەمەندەکانی ئەو شارو گەڕەکانە زەکاتەکانیان تەسلیم بکەن‌و هەر ئەو تیمە بەپێی ڕێنماییەکانی ئیسلام ئەو ماڵ‌و سامانەیان بەسەر هەژارانی ئەو شارو گەڕەکەدا دابەش ئەکردوەوەو هەژارانیان پێ زیندوو ئەکردەوە. بەڵام ئەمڕۆ لەم ڕۆژەدا ئەتوانرێت

---

[201] ـ الاسلام، سعيد حوى، (ص٢٢٣).

[202] ـ سعيد حوى / الاسلام، ص ١١٥.

[203] ـ البداية والنهاية (٩/ ٢٠٣).

[204] ـ نيل الأوطار ـ الشوكاني، "ئەواق" لەو کاتەدا بریتیی بووە لە (٤٠) درهەم کە مەڕێکی چاك بە (٥) درهەم بووە.

سوود له تەکنۆلۆژیاو "هونەری بەڕێوەبەربردن" وەربگیرێتو له ڕێگەی دامەزراوەیەکی تایبەتیەوە ئەم کارە ئەنجام بدرێت: بۆ نموونە: بۆ جێبەجێ کردنی خاڵی (١٣) ئەتوانرێت وابکرێت (له جیاتی هاوارکردنو جاڕدانی جاران):

. له دەزگاکانی ڕاگەیاندن ئاگاداریەك بڵاوبکرێتەوە بۆ ئەو مەبەستەو داوای بەڵگەنامەو مەدرەکیان لێ بکرێت وەك: "ناسنامە، شایەت، وێنەی خۆیان، عەلامی شەرعی، ...هتد".

. چەند بەرنامەیەك له تەلەفزیۆنو ڕادیۆکاندا ئامادە بکرێت بۆ دروست کردنی هۆشیاری لەو بوارەدا.

. سەقفێك دابنرێت بۆ کارەکەو ببێتە هاندانێکیش بۆ خێراکردنی ئەو کارە خێرە.

. پاشان ئاهەنگی" ژنهێنانی بەکۆمەڵ" ساز بکرێتو دەوڵەت له سندوقی زەکات خەرجیەکانی بگرێتە ئەستۆی خۆی.

بۆ مەسەلەی "قەرزارەکان"و جۆرەکانی تری زەکاتیش بەهەمان شێوە له ڕووی بەرنامەیەکی وردەوە چارەسەری گیروگرفتەکانیان بکرێتو دۆسیەی تایبەتییان بۆ بکرێتەوەو ئامار بکرێن.

١٥. هەندێك بە گاڵتە ئەپرسنو دوور نییە فوئاد مەجید یەکێکیان بێت: ئایا ئێوە ئەتانەوێت بە زەکاتو سەرفیترە گیروگرفتی دەوڵەت چارەسەر بکەن؟! له وەڵامدا ئەڵێین:

یەکەم: سەرچاوەکانی داهاتی دەوڵەتی ئیسلامی تەنیا زەکاتو سەرفیترە نییە، وەك ئێوە گومان ئەبەن، ئیسلام نە له هەواداو نە له فەزادا دەوڵەت دروست ناکات، بەڵکو لەسەر ئەم زەوییەو لەناو ئەو خەڵکەدا دەوڵەت دروست ئەکاتو سەروەتەکانی سەر زەوی ئیدارە ئەداتو ئەیان خاتە خزمەتی گەلانو میللەتانەوەو ئەو خەڵکە ئەجولێنێت بۆ ئەوەی بەرهەمهێن بن نەك چەپەرو بار بن بەسەر خۆیانو خەڵکەوە...

سەرچاوەو داهاتەکانی دەوڵەتی ئیسلامی وەك زانایان باسی دەکەن ئەمانەن[٢٠٥]:

١. ریکاز (واتە: سەروەتەکانی ژێر زەوی: نەوت، لێوەرگیراوەکانی، کانزاکان، ئاو، ئاساری کۆن ....هتد.

٢. بەرهەمی دەزگاو پرۆژە بەرهەمهێنەکانی دەوڵەت: کارگەکان، کۆمپانیاکان، پرۆژەکان: ئاژەڵی، کشتوکاڵی .. هتد.

٣. دەیەكو گومرگ.

٤. خەراج.

٥. جزیە.

٦. دەسکەوتەکانی دامەزراوەکانی دەوڵەت (کارەبا، ئاو، غاز.. هتد).

٧. تەعزیزاتی ماڵی، کە وەك سزایەك ئەخرێتە سەر هەندێ تاوان.

٨. دەسکەوتی شەڕ "غەنیمە"و دەسکەوتی تری وەك "فەیء".

٩. ئەو سەروەتو سامانەو عەقارانەی له مردوویەك بەجێ دەمێنێ کە میراتگری نییە.

١٠. موصادەرەکردنی ماڵی ناڕەوا له کاتی پێویستدا.

١١. هەندێك باج کە بۆ ڕاستکردنەوەی ناهاوسەنگی بێتام کە ڕووئەدات یان بۆ ڕووبوونەوەی لێقەوماو و کارەساتی کتوپڕ

١٢. مافە گشتیەکانی دەوڵەت وەك: (ئەرزە، باغو لەوەڕگاکان، زەویە عەقدەکان.. هتد).

١٣. زەکاتو سەرفیترە.

١٤. بەرهەمی "ماڵە وەقفەکان".

جا نازانم ئیتر بۆچی خەڵك وائەزانێت دەوڵەتی ئیسلامی تەنیا بە زەکات ئەیەوێت دەوڵەت بەڕێوە ببات .. ئەمە یەك.

یەکێکی تریش: بەڵێ زەکات ئەوەندە مەسەلەیەکی گەورەو بەسوودە تەنیا بە زەکات ئەتوانرێت زۆرترین کێشەو گیروگرفتی پێ چارەسەر بکرێت. با بەنموونە ئەم خاڵەش بسەلمێنین:

وەك ئاشکرایە گەورەترین کێشەکانی ئەمڕۆی ناو خەڵك برتییە له:

---

[205] * من زۆرتر زاراوە کۆنەکانی زانایانم بۆ ئەو خاڵە بەکار هێناوە، کە دیارە له ئێستادا گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتووە، وەك زاراوەو وەك سەرچاوە ش

**١. پیرو پەککەوتەو خانەنشین کە توانای بەرهەم هێنانیان نییە.**

**٢. خەڵکی بێکارو بێوەزیفەو ئەوانەی نەکاسبیو نە کارێك شك نابەن.**

**٣. بێژنیو بیٚ ماڵی.**

**جا با بزانین ئیسلام چۆن بە ماڵی زەکات ئەو سیٚ گرفتە گەورەیە چارەسەر دەکات...**

**لە مەزهەبی شافیعیدا هاتووە: بۆ پیرو پەککەوتەو خانەنشینیان "عەقارێك" دائەنرێتو تایبەت ئەکرێت پێیانەوە یان بە هەریەکەیانەوەو لە قازانجی ئەو "عقار"ە ژیانیان دابین دەکرێت تا مردن "[٢٠٦] جا ئەگەر ئێمە زەکاتی ساڵێکی موسڵمانەکانمان دانا بۆ ئەوەی ئەو گیروگرفتەی پیٚ چارەسەر بکەین ئەوا ساڵی داهاتوو یان ئەو گرفتە بنەبڕ دەکرێت یان شتێکی سادەو کەمی وای ئەمێنێتەوە کە شایانی باس نەبێت. ئەو کاتە ئەتوانین زەکاتی ساڵی داهاتوو تایبەت بکەین بە کێشەی ژنهێنانو خانووکردنەوە بۆیان بە پارەی زەکات.**

**بۆ گرفتی بێکاریو بەتاڵیش بەهەمان شێوەو هەر بەپێی مەزهەبی شافیعی ئەتوانین ئامارێکی هەموو بێکارەکان لە هەموو شارەکاندا بکەینو دەست بە چارەسەرکردنیان بکەین بەم شێوەیە:**

**. هەر کامێکیان ئەتوانن کارێك بکەنو بەڵام سەرمایەیان نییە ئەو کارەیان بۆ دابمەزرێنرێتو سەرمایەیان بدرێتیٚ.**

**. هەندێك کار نازانن، خولێکیان بۆ بکرێتەوەو فێری "پیشە"یەك بکرێن، دارتاشی، خەیاتی، ئاسنگەری، کۆمپیوتەرو ئەلەکترۆنیات، کارەبایی .. هەروەها، پاشان بخرێنە سەرکار لە فەرمانگەو شوێنەکاندا.**

**. ئەتوانرێت ئەو کارانە بەرنامە ڕێژیان بۆ بکرێت کە دەوڵەت پێویستی پێیان هەیە، بۆ نموونە دەوڵەت پێویستی بە بڕێکی زۆر دارتاش هەیە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمی دارستانەکان یان پێویستی بەکارگەی شیرەمەنی هەیە بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمی پڕۆژەکانی گاوداری .. یان تەصنیعی عەسکەری .. یان مەسەلەکانی کشتوکاڵو بانقو.. هتد.**

**زانایان ئەڵێن: دەوڵەت ئەتوانێت کارگە دروست بکاتو خەڵکە بێکارەکە بخاتە سەریو بیکاتە موڵکی خۆیان (یان بەرهەمەکەی بکاتە هی خۆیان) یان بیانکاتە شەریكو لەڕووی ئیدارەشەوە سوود لە بەرنامە پێشکەوتووەکانی دونیای ئەمڕۆ وەربگرێت.. جا ئەگەر زەکاتی ساڵێك تایبەت بکرێت بە چارەسەری ئەم گرفتەوە ئەوە پاش ئەو ساڵە لەوەناچێت ئەو گرفتەمان بمێنێت .. هەربەو شێوەیە لەماوەی چەند ساڵێکی کەمدا یەك یەك چارەسەری ئەو گرفتو کێشانە ئەکرێتو لەولاشەوە خەزێنەی گشتی دەوڵەت فشارێکی وای نەکەوتۆتە سەر.**

**با نموونەیەکی "عملی"باس بکەین .. وا دائەنێین پارێزگای سلێمانی (دە) هەزار کەسی دەوڵەمەندی پارەداری تێدایە کە بتوانن زەکات بدەن[٢٠٧] لە دەوڵەمەندی" پلە یەك "و "پلە دوو"و "پلەسیٚ".. "پلە یەکەکان" سەرمایەکانیان لە نێوان دوو سەد ملیۆن دۆلارەوە بۆ یەك ملیۆن دۆلار بێتو پلە دووەکان لەیەك ملیۆن دۆلارەوە بۆ دە هەزار دۆلار بێت "پلە سیٚ کان"یش لە دە هەزار دۆلارەوە بۆ نزمترین سنووری "نیصاب" بێت، لە پلە یەکەکاندا هەزار کەسمان هەبێت کە بە سەر پێنج ئاست دا دابەشی بکەین، بۆ نمونە (پەنجا نەفەر)یان لە ئاستی یەکەمو (سەد نەفەر) لەئاستی دووهەمو دووسەد بۆ سێیەمو چوار سەد بۆ چوارەمو پێنج سەد بۆ پێنجەمو بەو شێوەیە ..**

**بۆ پلە دووەکانیش بەهەمان شێوەو بۆ پلە سیٚ کانیش هەروەها. ئەو کاتەش چوار خشتەش دروست دەبێت: خشتەی زەکاتی (نەقد)، خشتەی زەکاتی مەڕوماڵات، خشتەی زەکاتی دەغڵو دان، خشتەی زەکاتی ماڵی بازرگانی، بەپێی مەزهەبی ئەهلی حەدیس خشتەی پێنجەمیش هەیە کە زەکاتی میوەو سەوزەواتو باغ...**

**با وا دابنێین کە لە پلە یەکەکاندا (بیست هەزار دەفتەرێك) وەردەگیرێتو لە پلە دووەکانیش دە هەزار دەفتەر دۆلار لە پلە سیٚ کانیش پێنج هەزار دەفتەر دۆلار بە هەموویانەوە بکاتە (چل هەزار دەفتەرێك) خشتەی دووهەمیش بکاتە سی**

---

[٢٠٦] ـ الاسلام: سعيد حوى، (ل١٤٣).

[٢٠٧] ـ دیارە کەسێك ئەبێت زەکات بدات کە نرخی (بیست مسقالٚ) ئاڵتون پارەی هەبێتو ساڵی بە سەردا بڕوات کە لە شارێکی گەورەی وەك سلێمانیدا لەوە ئەچیٚ سیٚ بەرامبەر زیاتریش لەو ژمارەیە زەکاتدەر هەبێت، بە تایبەتی ئەگەر بەرپرسەکان بخرێنە ئەو بازنەوە. بۆ زانیاری لەم بارەیەوە سەیری (سایتی ئاوێنە) بکە، چەند ئامارێکی تێدایە.

**هەزار دەفتەرێكو خشتەی سێهەم بكاتە بیست دەفتەرێك خشتەی پێنجەمیش بكاتە دە دەفتەرێك ..و بەو پێیە ئەتوانرێت لە ناوچەی سلێمانیدا سالآنە زیاتر لە چل هەزار دەفتەرێك زەكات وەربگیرێت لە ڕووی بەرنامەیەكی ووردەوە با هەرواش دابنێن ئەو برە زەكاتە دائەنرێ بۆ سەد هەزار هەژاری ئەم ناوچەیە ...كەواتە هەر هەژارێك چل وەرەقەی بەر دەكەوێتو كە دابەشی مانگەكانی سالّی بكەین مانگی سێ وەرەقەی بەردەكەوێت جا ئەو كاتە حكومەت وەك (بیمەی بێكاری) یان وەك (سیستەمی سۆسیال) پێیان ئەدات یان وەك كردنەوەی چەند پڕۆژەیەكی بەرهەمهێنن كەبیانكاتە شەریك ئەیكاتەوە، گرنگ ئەوەیە كێشەی سەد هەزار كەسی بێكار بە مالّی زەكاتی سالّێك چارەسەر ئەكات.**

**باشە ئەگەر بە مالّی زەكات بتوانرێت سالآنە ژمارەیەكی زۆری ئاوەها چارەسەر بكرێت ئەبێت پاش (دە ـ پازدە) سالّێك وەزعی خەلّكی بەرەو كوێ بڕوات ... لە مێژووی ئیسلامدا لەو جۆرە حالّەتانە زۆر ڕوویداوە كە پاش ماوەیەك هەژارێ نەماوە كە مالّی زەكاتی بدرێتێ .. بۆ نمونە با گوێ بۆ ئەم شایەتانە بگرین ئەو سەردەمانەیان بینیوە:**

**ئیبن كەسیر ئەلّێ: جاڕدەری عومەر هەموو ڕۆژێ هاواری بە ناو خەلّكدا ئەكردو ئەیوت: قەرزاران لەكوێن؟ ئەوانەی ئەیانەوێ ژن بێنن لە كوێن؟ ئەوانەی كەم دەستو هەژارن لەكوێن؟ ئەوانەی باوكیان نەماوە لەكوێن؟ تا گەیشتە ئەوەی ئەمانەی هەموو دەولّەمەند كرد"[208]**

**"سیوتی" ئەلّێ: عومەری كوڕی ئوسەید ئەلّێ: وەلّلاهی عومەر هێشتا نەمردبوو پیاوی دەولّەمەندی واهەبوو پارەو پولێكی زۆری ئەهێنا ئەیوت ئەم پارەیەم بۆ بدەن بەوانەی خۆتان ئەیانناسن، كابرا ماوەیەكی زۆر ئەمایەوە كەس شك نەئەبرا پارەو مالّەكەی بدرێتێ، ناچار كابرا پارەو پولەكەی ئەبردەوە، عومەر هەمووی دەولّەمەند كرد بوو"[209].**

**ئیبن سەعد ئەلّێ: سالّی واهەبوو چەند جارێك "عطاء"(*) دابەش ئەكرا لەناو خەلّكدا، عومەر سێ جار "عطاء"ی بە سەر خەلّكی مەدینەدا لەنێوان دوو سالّو پێنج مانگدا دابەش ئەكرد..و كابرای كوفەیی ئەلّێ، هەموو خێرێكمان لە عومەرەوە بۆ دەهات"[210].**

**"ئیبنولجەوزیش" ئەلّێ: هەندێك لەخەلّكی مەدینە جارێكیان هاتنە لای عومەر ئەویش لێی ئەپرسین: ئەرێ لە فلآنە شوێندا كۆمەلّێك هەژار هەبوون ئەوە ماون؟.. ئەوانیش ووتیان : قوربان! عەیامێكە لەوێدا نەماونو خوا دەولّەمەندی كردن، هەندێك لەو هەژارانە داریان بە ڕێبواران ئەفرۆشت هەوالّی ئەوانیشی ئەپرسی عەرزیان ئەكرد: قوربان لەخوا بەزیاد بێت پێوستمان بەوەش نەماوە.."[211]تەنانەت لەو ئەفریقا ووشكو بێ ئاوەدا هەژار نەماوە، كەس نەماوە خێری پێ بشێت، هۆكەشی ئەوە بووە بەرنامەی وورد بۆ سیاسەتی ئابووری داڕێژراوە ... تەنانەت پارە ئەوەندە زیادی كردووە بەشی ولآتانی دەرو دراوسێ دراوە لە ئەهلی ذیمەش "عمالدین خلیل" لە "ئیبن عبدالحكم"ەوە ئەگوازێتەوە كە ووتویەتی: "... عومەر نامەیەكی نوسی بۆ "عامل"ەكەی لە كوفەو تێیدا نوسیبوی: "باسی ئەوەت كردووە كە پارەو مالّێكی زۆرت لاماوەتەوە پاش ئەوەی بەشی سەربازانت هەمووی داوە، دوای ئەم نامەیە بچۆ لەو پارەیەی لات ماوە قەرزی هەموویان بدەرەوە بۆیان ئەوانەش ژنیان هێناوەو پارەی تەواویان نییە بۆیان تەواو بكە، (عاملە)كەی بۆی نوسیوە: قوربان پاش ئەوانەش هەر پارە مایەوە چی لێ بكەین؟ عومەر لە وەلآمدا فەرمووی: بە دیاری بیدە بە "ئەهلی ذیمە" چونكە تا یەك دوو سالّی تر پێویستمان پێی نابێت.[212]**

**ئێمە لەو گریمانو فەرزكردنانەماندا لەپێشەوە ووتمان وامان داناوە كە "دە" هەزار دەولّەمەند هەبێت لە شارێكی وەك سلێمانیدا، كە بە دلّنیاییەوە لەو ژمارەیە زیاتر دەولّەمەندو زەكاتدەر هەیە، هەروەها ووتومانە گەورەترین دەولّەمەند**

---

[208] ـ "البدایه والنهایه" (٢٠٣/٦) هەروەها (ملامح الانقلاب الاسلامی / عمادالدین خلیل، ص١٤١).

[209] ـ تأریخ الخلفاء (ص١٥٦)

(*) ئەو بەخشیشو هاوكارییە بوو زیاد لە مووچەی هاولآتیان، ئێستا ناونراوە جەژنانە !.

[210] ـ طبقات ابن سعد، ص (٢٥٥و ٢٧٦) بەرگی پێنجەم.

[211] ـ سیرە عمر بن عبدالعزیز (ص٧٦) پەراوێزی (ملامح الانقلاب ص١٤٢).

[212] ـ سیرە عمر بن عبدالعزیز (ص٦٧) "ملامح الانقلاب، ص١٤٢".

خاوەنی (دوو سەد) ملیۆن دۆلار بێت کە هی واهەیە هەر"مەشروعێکی" ئەوەندە پارەی تێدایە..[٢١٣] دیارە شتی "تیۆری"یش زۆر جیاوازە لە شتی "عملی"و مەیدانی. کەواتە ئەگەر پەیڕەوی ڕێنماییە پڕ ووردەکارییەکانی ئیسلام بکرێت بە ڕاستی هەر بە ماڵی زەکات گەل‌و میللەت‌و وولات قۆناغ بە قۆناغ بە ئەچێتە پێشەوە..

١١. جارێکی ترو هەر بە گاڵتەکردنەوە، هەندێك‌و لەوانەیە فوئاد مەجیدیش یەکێکیان بێت، ئەڵێن: باشە ئەگەر هەموو گرفتەکانی هەژاری‌و بێژنی بە زەکات چارەسەر کرا، ئەی دوایی چی ئەکرێت لەو هەموو پارەو پوڵ‌و ئاژەڵ‌و دەغڵ‌و دانەی کە کۆ ئەکرێتەوە لە دەوڵەمەندەکان؟!

لە وەڵامدا ئەڵێین:

أ. ئەکرێ بە شێوەی (عەلاوە)و (تەرفیع) بخرێتە سەر مووچەو (ڕاتب)ی ئەوانەی ماڵی زەکاتیان پێ ئەشێت، بۆ نموونە: قوتابی یارمەتی بدرێت بۆ ئەوەی خوێندنی بالاش بخوێنێت، یان خەڵکانێك یەکلا (تفرغ) بکەینەوە بۆ ئەوەی بە دونیادا بگەڕێن‌و دین بلاو بکەنەوەو خەڵکی لە (ئەفسانە)و (دوودڵی‌و گومان)و (تاریکی) دەربهێنن.

ب . ئەکرێ ئەو ماڵە بگوازرێتەوە بۆ شوێنە هەژارەکانی تری دونیاو یارمەتی لێقەوماوانی پێدرێت، چونکە زەکاتی هەموو شوێنێك بۆ شوێنی خۆی سەرف ئەکرێت‌و ئەگەر لەوێدا هەژار نەما ئەوە نقل ئەکرێت بۆ شوێنێکی تری هەژار.

ج . بوارێکی تری زەکات، (فی سبیل الله)ە بۆ نمونە، کە ئەتوانرێت بەو پارە "تەراکومە"ی زەکات پرۆژەی (قوتابخانە)و (نەخۆشخانە)و (پرد)و (جادەو ڕێگاو بان)و..هتد دروست بکرێت، وەك زۆرێك لە زانایانی ئیسلام فەتوایان لەسەر داوە.

د . وەك لە پێشەوەش ووتمان ئەتوانرێ بە دیاری‌و خەلات بدرێتە دەرو دراوسێ لە ئەهلی (ذیمە)و هاوکاریان بکرێت..

١٧. هەندێکی تر بە ڕاستیانە یان بە مەبەستەوە ئەڵێن: کاکە! دین ئیشی ئەوە نییە قسە لە مەسەلە سیاسی‌و ئابورییەکاندا بکات‌و باس لە ئیدارەدانی دەوڵەت‌و یاساو حوکم بکات، چونکە ئەوانە کاری سیاسەتمەدارانەو ئەبێت دین دەخالەتی تێدا نەکات‌و خۆی نەپێچێت بە سیاسەت‌و دەوڵەتەوە، چونکە سیاسەت (مودەننەسە)و دین (موقەدەسە)!! دین کاری ئەوەیە کە ویژدانەکان بە خەبەر بهێنێ‌و دڵەکان پڕ لە ئومێدو دڵنیایی بکات‌و کۆمەڵێك بەهای ڕۆحی بسەلمێنێت‌و لە پێش چاوی مرۆڤدا دایان بنێت‌و پاشان بە چیرۆك‌و باسی ڕۆحی خەڵکەکەی بۆ کەمەند کێش بکات‌و پەیوەندی عەبدو خوا ڕێك بخات‌و وەسەلام!! لە وەڵامدا ئەڵێین:

ئەمە ئەگەر بەرامبەر دینێکی تری غەیری ئیسلام بووترییێت جێگەی خۆیەتی، بەڵام بەرامبەر ئیسلام ئەوە بووترێت ئەوە زۆر ناڕەوایە بەدەیان بەڵگەی (شەرعی)و (واقیعی).. چونکە لەئیسلامدا نە مرۆڤ کراوەتە دوو لەتەوە، لەتێکی بۆ دین‌و لەتێکی بۆ دونیا بجوڵێت، نە دونیاش کراوەتە دوولەتەوە، لەتێکی هی (قەیسەر) بێت لەتەکەی تری هی خواو دین بێت.. بەڵکو لەئیسلامدا دین بۆ خۆشکردنی دونیاو ئاخیرەت هاتووە، بۆ پەروەردەکردنی ڕۆح و عەقڵ‌و دونیای مرۆڤ هاتووە، ئیسلام وەك چۆن مەنزومەیەکی ڕۆحی‌و ئەخلاقی‌و عیبادی لە خۆگرتووە، واش مەنزومەیەکی فیکری‌و سیاسی‌و ئابوری‌و زانستیشی لەخۆگرتووە... کێش بڕوا ناکات با بڕوات دیراسەیەکی ئیسلام بکات‌و پاشان بێتەوە سەرلەنوێ موناقەشەی ئەم مەسەلانە بکات....

زیاد لە ئەمانەش ئیسلام دەورەیەکی تەتبیقی بە درێژای (چواردە) سەدە بەخۆیەوە بینیوە کە لە هەندێك دەوراتی دەستەلاتیدا "مرۆڤایەتی" گەیشتووەتە چڵەپۆپەی ڕەفاهو خۆشگوزەرانی... هەر بۆ ئەمەیە زەکات نەکراوەتە کارێکی تاکە کەسی‌و شەخصی لە ئیسلامدا، بەڵکو کارێکی "کۆمەڵی‌و حکومەتییە" وەك لە پێشەوە بۆمان دەرکەوت ...

بۆیە چۆن پێغەمبەر ﷺو خولەفای ئەو لە سەردەمەکانی خۆیاندا زەکاتیان وەرگرتووە لە ڕێگەی تیمی تایبەتەوە دابەشیان کردۆتەوە بەسەر کەسانی خۆیدا، ئێستا پێویستە هەموو حوکمەتێکی ئیسلامی بەو وەزیفەیە هەڵبسێت‌و ناذی هەژاران لە دەوڵەمەندەکان بسێنێت.

---

[٢١٣] ـ برایەکی بازرگان لە شاری سلێمانی باسی بازرگانێکی کرد کە سامانەکەی لە دوو سەد ملیۆن دۆلار ئەوبانە، بەڵام خۆزگەی خواستووە کە هەموو سامانەکەی بدات‌و لەش ساغی پێ بکرێتەوە وەك جاران.

ئەم کارەش فەلسەفەیەکی زۆر گەورەی تێدایە کە زەکات (تاکە کەسیو شەخصی) نییەو بەڵکو کارێکی دەستە جەمعیو دەوڵەتییە، چونکە:

أ. زۆر کەس ویژدانی ئەمرێتو زەکات نادات‌و هەژاران بیٚ بەش ئەکات، ئەگەر بە زۆر لێی نەسەنرێت‌و دەستەڵاتێك نەبێت ملکەچی بکات.

ب . هەژار کە مافی خۆی لە حکومەت‌و دەوڵەت وەربگریٚ نەك دەوڵەمەندەکە، کەرامەت‌و کەسایەتی پارێزراوەو کەس ناتوانێت "منەت" بکات بە سەریداو سەرکزی لای کەس نابێت.

ج . ئەم کارە ئەگەر بدرێتە دەست خەڵك خۆی، (فەوزاو بیٚ سەروبەری) دروست ئەبێت ڕێئەکەوێت هەژارێك چەندجار لە چەند کەسەوە یارمەتی بدرێت چەندین هەژاریش لەبیر بچێت‌و کەس پێی نەزانێت.

د. زەکات تەنها بە هەژاران نادرێت، بەڵکو زۆر شت هەیە بە (عەقلیەتی کۆمەڵ‌و دەوڵەت) نەبێت ناتوانرێت بەرنامەڕێژی بۆ بکرێت وەك پشکی "المؤلفة قلوبهم"، ئیعدادی ماددیو مەعنەوی، پڕ چەککردنی موجاهیدین بە "علم"و بە"چەك"و ناردنیان بۆ سنورەکان‌و بە وولاتاندا تا پەیامی پڕ دادی ئیسلام بلاوبکەنەوە، کردنەوەی قوتابخانەو نەخۆشخانەو پردو بەندەرو "عەقارات" بۆ هەژاران‌و پیرو پەککەوتەکان .. هتد.

هـ . زەکات بۆیە کارێکە حوکومیو دەوڵەتییە چونکە ئیدارەدانی (واتە وەرگرتن‌و دابەشکردنی) ووزەو توانایەکی زۆری ئەوێت لە ڕووی "بەشەری"و "دەزگا"و "بەڵگە نامە"و "موتابەعەی بەردەوام"ەوە، ئەمەش بۆ دەوڵەت ئاسانەو بۆ (تاکە کەس) کارێکی گرانەو وەك پێویست زەکات دان لەحاڵەتە شەخصیەکەیدا ئامانجەکانی نایەتەدی بەپێچەوانەی ئەوەی دەوڵەت پێی هەڵبسێت.

١٨. هەم دیسانەوە بە گومانەوە ئەپرسین: باشە زەکات کۆکردنەوە لەم ڕۆژانەدا چۆن ئیمکان ئەبێت‌و کەی کارێکی "عملی"یەو چۆن ئەتوانرێت کۆنترۆڵی پارەو پولی خەڵك‌و جۆرەکەی ئەو هەموو شتە بکرێت کەپێی ئەوترێت "ئەموالی زەکات"؟!

لە وەڵامدا ئەڵێین:

أ. بۆچی "عملی"یە ئەم دەوڵەتانەی ئێستا (بەتایبەت دەوڵەتە ئەوروپیەکان) ئەم هەموو "باج"و "گوومرگ"و "سالانە"و "موڵکانە".. هتد کۆ ئەکەنەوەو کۆنترۆڵی ئەکەن، ئەی بۆچی زەکات کە سەرچاوەو جۆرو بڕەکانی هەمووی دیارەو زانراوە کۆ ناکرێتەوە لەم چەرخی کۆمپیوتەرو ئینتەرنێتەدا..

ب . ئەتوانرێت لە ساڵدا بۆ نموونە ڕەمەزان دابنرێت بۆ زەکات کۆکردنەوەو ناوبنرێت (مانگی زەکات).

ج . بەرنامەیەکی وورد دابنرێت‌و هەموو دەوڵەمەندەکان ئامار بکرێن‌و بە سەر ناوچەکانی زەکاتدا دابەش بکرێت لەو مانگەدا حیساباتی زەکاتی لەگەڵدا بکرێت.

د . سوود لە ئەزموونی ڕێکخراوە خێرخوازیەکان‌و بانقە ئیسلامیەکانی دونیای ئەمڕۆ بە ئیسلامیو غەیرە ئیسلامیەوە وەربگیرێت، بە تایبەتی کە توانیویانە کۆنترۆڵی صندوقەکانی (زەکات)و (صدقات)و (کەففارات) .. بکەن‌و هەر یەکەیان لە شوێنی تایبەتی خۆیدا بەکاربهێنرێت‌و بیگەیەننە هەموو کون‌و قوژبنێکی دونیای ئەمڕۆ.

هـ . باشە لەکاتی پێغەمبەردا (ﷺ) هۆکارەکانی گواستنەوە لەوپەڕی سەرەتاییدا بوون ئامارکردن و پاراستنی دۆسیە شتێکی زەحمەت بووە کەچی بە جوانی ئەنجام دراوە! ئەی ئێستا ئەم کارە بۆ "ممکین" نەبێت کە سەردەمی عەقلی ئەلیکترۆنیو کۆمپیوتەرو دیسك‌و سیدیو میمۆری ... کە ئەتوانرێت بە هەموو شێوەیەك بەرو دوای ئەو کارە کۆنترۆڵ بکرێت لە ڕێگەی خەڵکانی ژمێریارەوە لە شوێنەکانی خۆیاندا.

و . لە ئیسلامدا بنەمای (ئیقتیباس) هەیە ئەتوانرێت سوود لە بەرهەمەکانی عەقلی هەموو کەسێك وەربگیرێت، بۆ بەهێزکردنی دەوڵەت‌و دامەزراوەکانی، لەبەرئەوە لەم بوارەشدا ئەتوانرێت سوود لەو هەنگاوە گەورەو ووردانە وەربگیرێت کە هونەری بەڕێوەبردن لە بواری کۆنترۆڵکردن و ئامارکردندا ناویەتی..

**١٩. زەکات دان واجبی هەموو موسڵمانێك نییە، بەڵکو تەنیا واجبی موسڵمانی دەوڵەمەندە، ئەو موسڵمانە دەوڵەمەندەی پارەکەی بگاتە "حد النصاب"و ساڵێك بە سەریدا بڕواتو کەم نەکات یان زیاد بکات..**

**"حد النصاب"یش بریتیە لە نرخی (بیست مسقاڵ) ئاڵتون کە لەم ڕۆژانەدا ئەکاتە نزیکەی (چواردە هەزار دیناری سویسری)، واتە کەسێك لەو پارە کەمتری هەبوو زەکاتی ناکەوێتە سەری با ساڵیشی بە سەردا بڕوات، بەڵام ئەگەر خۆی بیەوێ (صدقە)و (خێری) لێ بکات ئەوە خۆی ئەباتە ڕیزی (صەدەقەکەرانەوە)و خواش ئەفەرمووێت: "وتصدقوا ان الله یحب المتصدقین" چاکە بکەن خوای گەورە چاکەکارانی خۆش دەوێت! هەر کەسێکیش خوای گەورە خۆشی بوێت ئەوەشتی بۆ ئەکاتو کاری بۆ ئاسان ئەکات ...**

**٢٠. زەکاتو ئەموالی زەکات وەك زانایان ئەیفەرموون بریتییە لە زۆرشت کە ئەمانەن:**

**. هەردوو "نەقدەکە" واتە "ئاڵتونو زیو" یان ئەوەی ئەمڕۆ وەك (عوملە) بەکاردەهێنرێتو لەهەر وڵاتێکدا ناوێکی هەیە وەك (دینار، دۆلار، یۆرۆ، لیرە..هتد).**

**. مەڕو ماڵات چوار شت ئەگرێتەوە (مەڕ، بزن، مانگا، هوشتر).**

**. دەغڵو دان، واتە ئەوانەی قابیلیەتی وشك کردنەوە یان هەڵگرتنیان هەیە، وەك (گەنم، جۆ، زەڕات، کشمیش، برنج....هتد).**

**. ماڵی بازرگانی، واتە ئەو ئەشیاو کەرەسانەی کە مرۆڤ بۆ کڕینو فرۆشتنی دائەنێت وەك (کوتاڵ، کەلوپەلی دەزگا، . مواد احتیاطیە . کەلوپەلی کارەباو ئاوو شتی خواردنو....هتد).**

**. ریکازو کانزا..واتە ئەو ماڵ و شتەی مرۆڤ لە ژێر زەویدا دەری دەهێنێ، ئیتر زێڕو زیو بێت یان نەوتو گۆگرد یان کانەبەرد ...هتد بێت.**

**. باغ باغاتو میوەجات .. واتە بەرووبوومی باغ، ساڵانە ئەبێت زەکاتی لێبدرێت وەك دەغڵو دان جا ئەگەر بە مەسروفو خەرجی ئاوی ئەدرا ئەوە خەرجیو مەسرەفی لێ دەرئەکرێتو باقیەکەی زەکاتی لێ ئەدرێت (عوشری عوشر)و ئەگەر باران ئاوی ئەدا وەك ڕەزەدێم بۆ نمونە ئەوە (عوشرێکی) لێ ئەدات..**

**ئەو پێنج جۆرەی پێشەوە بە پێی مەزهەبی شافیعی زەکاتیان ئەکەوێتو ئەمەی دواشەوە بەپێی مەزهەبی ئەهلی (حەدیس) زەکاتیان ئەکەوێت"[٢١٤](*).**

**بڕی زەکاتیش لەهەر جۆرێکدا بە درێژی لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیدا باس کراونو هەموو ئەو "یاسا"و "ڕێنماییانە"ش لایەنی هەژار ئەگرێتو ئامانج لێی بەرپاکردنی دادی کۆمەڵایەتییە.**

**ئێمە زۆر بەکورتیو لە بیست خاڵدا ئەم باسی زەکاتەمان کرد تا بۆ خۆێنەرو فوئاد مەجیدیش دەربکەوێت کە زەکات نە باجی ناڕەوایەو نەشتێکی واشە جێگەی گاڵتەو مەسخەرە بێت، زەکات تاوانی نییە، بەڵکو ئەوانە تاوانبارن کە ناهێڵن ئیسلام ئاراستەکردنی (دەوڵەت)و (میللەت) بگرێتە ئەستۆ تاپێکەوە گرێیان بداتو هەردووکیان بەرەو (کەماڵ) بەرێت.**

**فوئاد مەجید میسری زۆر ناهەقی نییە کە لەم حەقیقەتانە حاڵی نەبێت، چونکە نەوەك پێویستو بێ "تەرەفدارانە" مێژووی دەستەڵاتی ئیسلامی خوێندۆتەوە لە سەرچاوە ڕەسەنەکانەوە، نە لە واقیعیشدا لەناو دەوڵەتێکی ئیسلامیشدا ژیاوە کە حوکم بە قورئان بکات، سەد ڕەحمەت لە هەژاری شاعیر کە باسی ئەو ڕۆژانە دەکات کە ئیسلام تێیدا بڕیار بەدەست بووە دەڵێت: "ڕۆژێ کە ئیسلام باوی بوو، لەناو گەلاندا ناوی بوو، زێڕی هەبوو، زۆری هەبوو، چی بگوتایە هەر ئەوە بوو..**

**مامۆستاکانی ڕۆژئاوا لە فێرگە، لە زانستگاکان، لەناو کۆڕی کەیخودایان، کاریان لاسای موسڵمان بوو، دابی ئەوانیان پێ جوان بوو.. کەوای شۆڕیان لەبەردەکرد، عەمامەیان لەسەر دەکرد ئەدای ڕازی ئەبوعەلیو دینەوەریان، غەزالیو کیو کێی**

---

[٢١٤] ـ الفقە المنهجی/ کتاب الزکاة، مصطفى أدیب البغا (٢١/٢) بە دواوە.

(*) زانایانی قوتابخانەی (حەدیس)، هەموو ئەو خانووبەرەو موڵکانەش کە بۆ کرێ تەرخان کراون ئەخەنە ناو ماڵی زەکاتو لە سوودەکەیدا زەکات دائەنێن، کتێبی مجموع الفتاوى ومقالات متنوعە: عبدالعزیز ابن باز (١٦٨/١٤).

دیکەیان دەردێنا... (چۆن ئێستا مامۆستاکانمان، کە نەدارین لاسای ئەوانە دەکەنەوە، قەرزی کۆنە دەدەنەوە. لەچێژنەدا کڵاوی لەنگەر لەسەر، جبەی قۆڵ فشو قۆڵ دەبەر، ئەدای ڕۆژئاوا دەردێنن، ئەوروپاییانە دەنوێنن) دەست ڕەنگینانی خاچ پەرست کە دەست کردێکیان ڕێك دەخست، فێڵیان دەکرد مۆری (الله)یان لێ دەدا، ڕەنگی ئیسلامیان پێ دەدا، تا وابزانن ئەو کارانە، هی وولاتی موسڵمانە، کاری شامو بوخارایە، کرگاری بەڵخو بەغدایە، ئەستەمبوڵە، تووسە، ڕەیە، کاری وەستای غەرنادەیە.....

تەنانەت خاچی گەردنبەند، (الله)یەکیان لێ هەڵدەکەند.

ئەوا ئێستاش لە ڕۆژهەلاتی بارکەوتوو، لەناو گوێچکەی گادا خەوتوو: ( مێدین)[٢١٥] لە دەستکاریان دەدەن، لاسای ڕۆژئاواییان دەکەن"[٢١٦]. هەروەها ئەڵێت:

(.."فەلە" زل بوون، "جوو" بوو بە شت .. بەشی ئێمەش هەر قت، هەر فت، هەر گزوفت، ئەوان بە پێتۆڵیو گزی، زۆریان هێنا، زێڕیان دزی، دژ دامایین بەلەڕیو کزی..

نامۆ بوو بە داگیرکەرمان، پارویان فڕاند لەبەرمان، بوونە کەیخودا لەسەرمان، ئەوان ئاغا ئێمە ژێر دەست، ئەوان دەستدار ئێمە بێدەست، بە عەزرەتەوە دەڕوانین، خۆمان زۆر بەکەم دەزانین، فەرەنگی[٢١٧] جوانە، زۆر زانە، کەی وەکو مەمامانە؟

ئێمە چین، چینی هەژارین، ئەوان ڕاستن ئێمە خوارین، نا لەبارین، هەژار زاناش بێ نەزانە، دارا شوورەیشی جوانە.

وابەرەی پێگەیشتومان، بەناخێر تێگەیشتومان، شتی خۆی لەلای دزێوە، هەر لەجێوە بەسەد شێوە، ئەدای فەرەنگی دەردێنێ، بۆتە مەیمون لاساکەرە، بەلاش گۆشتی سەرچەپەرە، ئاغاش هەر ئەوەندەی دەوێ: بازاڕی لەبرەو نەکەوێ.

گەرەکیە ئەدای دەربێنین، خۆی چی ئەکا وا بنوێنین. کارەکانمان، شارەکانمان، نووسەرانمان، خوێنەرانمان، پیاوی پیتۆڵو چازانمان، حاڵمان، باڵمان ژیانی ناومالو منالمان، ژنمان، پیاومان، گشتو خاومان.. تەنانەت لەقەمو ناومان، دەمە لاسکەیەك لەوان بێ، تا کلیلمان هەر بەوان بێت"[٢١٨]!!

لە لاپەڕەی (٣٥)یشدا فوئاد میسری چەند هەڵەیەکی گەورەی تر ئەکاتو ئەڵێت:

"باجی تری هەمەچەشنی لە بابەتی (نەورۆزانە)و (میهرەگان)[٢١٩] کە خەلیفە معاویە زیندووی کردنەوە.. وەردەگیرا، ئەمە بێجگە لە پێنج یەکی میتاڵە جۆر بەجۆرەکان (خماس المعادن)و باجی بازاڕو کەلوپەلی بۆ دەرەوە ڕەوانەکراوو باجی تاوان"ت. و.

نووسەر لێرەدا وەك شوێنەکانی تری سەری لە خۆشیو خوێنەریش تێك داوە، لە چەند لاوە:

١. باجی (نەورۆز)و (میهرەگان) باجێکی ساسانی بووە نەك ئیسلامی، هەر خۆت ئەڵێی لە پەراوێزدا "لەگەڵ هاتنی ئیسلامدا ئەم دوو باجە (الغا) کراوە"[٢٢٠]. بەلام هەر بۆ نەگبەتی خۆت بوختانێکی یەعقوبی شیعە مەزهەب نەقڵ ئەکەیتو ئەڵێیت: "بەلام لە سەردەمی خەلیفە عوسماندا زیندوو کرایەوە پاشان لە ژێر فشاری خەڵکدا ناچار بوو (الغا)ی بکاتەوە .." باشە کاکە کابرایەکی شیعە مەزهەب کە بڕوای بە مێژووی سەحابەو خولەفا هەر نییە چۆن ئەتوانێت بەرامبەر خەلیفەیەکی ڕاشیدی وەك عوسمان شتی باش بڵێت کە ئەو لەگەڵ شیریدا ڕق لە (صحابە)و (خەلیفەکانی ڕاشیدین )ی خواردوەتەوە! ئایا لە "منطق"دا ڕاستە "حەکەم"و "خەصم" یەك شت بن وەك شاعیر دەڵێ: وفیك الخصم والحكم

---

[٢١٥] واتە ڕستەی ئینگلیزیmadein

[٢١٦] یەك لەپەنای خاڵ وسیفری بێ برانەوە / هەژار، ل(٤-٥)

٢١٧ مەبەستی (ئیفەرەنج)ییە واتە ڕۆژئاوایی داگیرکەر.

٢١٨ یەك لە پەنای خاڵو سیفری بێ برانەوە، / هەژار ل (٤و٥).

٢١٩ لە کتێبە مێژووییەکاندا ئەوترێت (میهرەجان) نازانم نووسەر بۆ هەرچی (جیم) هەیە کردوویەتی بە (گ) ، زنجی کردووە بە زەنگ و میهرەجان بە میهرەگانو...

٢١٨ ـ کۆمەڵگا ل٣٥.

٢. پێنج یەکی میتاڵ بە "باج"و "سەرانە" ئەداتە قەڵەم لە کاتێکدا ئێمە لە پێشەوە ووتمان ئەو شتانە "ئەموالی زەکەوی"ین، واتە ئەو ماڵەی زەکات ڕوی تێ دەکات کە ناویان (ریکاز)و کانزایە پێنجیەکی زەکاتی لێ ئەدرێت و ئەوی تری ماڵی خۆیەتی و ئەو دەرکراوەش ئەچێتە صندوقی زەکات ، نەك حەزێنەی دەوڵەتو تەنیا بۆ ئەو شتانە سەرف ئەکرێت کە لە (هەشت) صینفەکەی زەکاتن.

٣. زەکاتی ئەموالی بازرگانیشی هەر لێبووە بە "باج"و "سەرانە"و نەیتوانیوە، یان توانیویەتی، بەڵام بە ئەنقەست نەیکردووە لە یەکتریان جیابکاتەوەو ئێمە لە پێشەوە باسی ئەوەشمان کردووە.

٤. باجی تاوان: ئەمەمان لە سەرچاوەکانی دارایی دەوڵەتی ئیسلامیدا باسکرد.. ئەمە لە فەرهەنگی ئیسلامیدا پێی ئەوترێت "تەعزیرات".. واتە: دەوڵەت بۆی هەیە سزا لەسەر ئەو تاوانانە دابنێت کە پێچەوانەی یاسای گشتی دەوڵەتەو لە ئیسلامدا سزایەکی دیاری کراوی بۆ دانەنراوە.. بۆ نموونە:

سزا بۆ دزی کردن دانراوە بە مەرجەکانیەوە، بەڵام بۆ ئەو پارە بردنانە دانەنراوە کە مەرجەکانی دزی کردنی تێدا نەیەتە دی..

. سزا بۆ ناموس شکاندن (زینا) دانراوە، بەڵام سزا بۆ پەلاماردانی ئافرەت یان دەستبازی یان ماچکردنیو باوەش پیاکردنی دانەنراوە.

. سزا بۆ "قەذف"[221] دانراوە بەڵام سزا بۆ لەوە خوار تر دانەنراوە..

. سزا بۆ (تەزویرکردنی عوملاتو موخالەفاتی هاتوچۆو تەزویری سەنەدات و...هتد دانەنراوە، حکومەتی ئیسلامی بۆی هەیە کە (یاسا) بۆ هەریەك لەو "سەرپێچی"یانە دابنێت، زانایان باسی ئەم "تەعزیرات"انە ئەکەنو ئەکرێ لەو جۆرە سزایانە دابنرێت بە دەستکاریەوە.

لە (اصول الدعوة)دا دکتۆر عبدالکریم زەیدان باسی جۆرەکانی تەعزیرات دەکات لەوانە:

١. تەریق کردنەوەو شکاندنی لەناو خەڵکدا.

٢. یان "غەرامەی مالی" بخرێتە سەر.

٣. یان لە وەزیفە دەربکرێت یان پلەی دابەزێنرێت و نقلْ بکرێت ...

٤. یان نەفی ئەکرێت بۆشارێکو وڵاتێکی تر.

٥. یان زیندانی ئەکرێت"[222].

٦. یان لەسەر تەلەفزیۆن پیشان ئەدرێتو ئەکرێتە دەرس بۆ خەڵکی.

بەهەرحاڵ، بوونی حکومەتو دەوڵەت یانی بنەبڕکردنی تاوانو پشێوی لەناو خەڵکدا، ئەوەش نەك هەر عەیب نییە وەك فوئاد میسری ئەیەوێت بیلکێنێت بە ئیسلامو مێژووی ئیسلامەوە، بەڵکو ئەوە عەیبەیە حکومەت هەبێتو ئەو هەموو بێ سەروبەریەش هەبێت لەناو خەڵکداو ئەوەی گزیبازو ساختە چییە بازاڕی لەپیاوی باشو خەڵکە بەناموسەکە گەرمتر بێت!و حکومەتیش لەئەشکەوتێکدا خەوتبێتو نەپرسێتەوە، یان وەك لەهەندێك شوێندا هەیە خۆی لەپشتیەوە بێت و برەوی پێ بدات!

فوئاد میسری وەك ئەوەی پێی ناخۆش بێت کە دەرامەتی دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوەندە زۆر بووە بەڕەخنەوە دەڵێ: "ناوچەیەك وەك خوارووی عێراق ساڵانە چۆن بیست و پێنج ملیۆن داهاتی هەبووە"[223] یان دەڵێ: "کەسێك وەك حەجاج فەرمانڕەوای عێراق دەیویست دەرامەتی ساڵانەی بگاتە سەد ملیۆن"[224] کاکە ئەوە بە زوڵمو عەجایب دەزانی، کەچی هەر

---

[221] ـ واتە تاوانی زیناکردن بدرێتە پاڵ کەسێك و بووترێت فلانە کەس زینای کردووە، بەبێ ئەوەی "چوار شایەتی عادل" شایەتی لەسەر دابێ.

[222] اصول الدعوة/ زیدان ص٢٤٩

[223] کۆمەڵگا ل٣٦.

[224] کۆمەڵگا ل٣٧.

خۆی ئەڵێت : "مەسلەمە برای خەلیفە وەلید سێ ملێون درهەمی لە زەوییە زۆنگاوەکانی عێراقدا خەرج کرد"[٢٢٥]یان دەڵێ: "خالید قیسری لە سەردەمی هیشامدا والی عێراق بوو لە ماوەی پانزە ساڵدا چەند ڕووباری وەك (الجامع)..(المبارك)و...و .. هەڵکەندو زەوی‌و زارێکی زۆریشی لە دەوروبەری ئەو ڕوبارانە بۆ خۆی چاك کرد کە دەرامەتی ساڵانەیان سیازدە ملێون درهەم بووە، هەندێکیش دەڵێن: بیست ملێون"[٢٢٦] لە لاپەڕە (٤٩)و (٥٠)شدا ئەڵێ: "بۆ برەودان بە بازرگانی، دەوڵەت هانی بازرگانەکانی ئەداو جار جارەش پارەو پولی دەدانێ"... هەروەها نووسەر زۆر لەو شتانە ئەگوازرێتەوەو بە چاوی ڕەخنەشەوە سەیری دەکات، بەڵام کاکە فوئاد! وورد بەرەوە:

١. ئەوە بیرکردنەوە دەوڵەتیانەیە نەك بیری تاکە کەس‌و جیاوازیش زۆرە لەنێوان بیری شەخسی‌و بیری دەوڵەتی یان (پیاوی دەوڵەت)و (پیاوی ژن‌و منداڵی خۆی بە تەنیا).

٢. ئەوانە بەڵگەن لەسەر گەورەیی عەقڵیەتی هەڵسوڕێنەرانی دەوڵەتی ئیسلامی لەو کاتەدا، هەروەك بەڵگەیە لەسەر مومارەسەی (شەفافیەت) بەهەموو ڕەهەندەکانیەوە. باهەر لە کۆمەڵگاکەی نووسەر خۆیەوە لە گوازراوەکانی خۆیەوە چەند ڕوویەکی ئەو "بیرکردنەوە دەوڵەتیانە"ی موسڵمانانی ئەو کاتە بگوازینەوە، تاوێنەو شێوەی ئەو حکومەت‌و دەستەڵاتە ئیسلامیانەمان هەندێ بێتە بەرچاو: فوئاد میسری خۆی ئەڵێت:

. دەرهێنانی میتاڵ ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەبووە، پرۆسەی دەرهێنانی بەرەو ڕووی چەند کەسێك کردۆتەوە) ل٥٠.

. "ئیبن مەسکەوەیە" دەڵێ: بازرگانەکان بۆ بەجێهێنانی ئیلتیزاماتیان لە ناوچە جیا جیاکاندا، لە بریتی پارەو پول (شیك) یان بەکار دەهێنا. ل٥١

. "بانك بە شێوەیەکی سەرەتایی دامەزرا". ل٤٩

. "ئیبنو ئەسیر ئەڵێت: لە موسڵ پێڵاو درووەکان بازاڕی تایبەتییان هەبووە". ل٥٧

. " لە سەردەمی موعتەصەمدا لە بەغداو سامەڕاو چەند شاری دیکەدا کارگەی سابوون‌و شوشە دروستکردن دامەزرێنران". ل٥٨

. "ئەو سنووورانەی پێشتر دەوڵەتی ساسانی‌و بێزەنتی لە نێوان خۆیاندا دروستیان کردبوو دوای دامەزراندنی دەوڵەتی (خەلافەت) (کە خیلافەت ڕاستە نەك خەلافەت وەك لە پێشەوە ڕوونمان کردەوە)و تێکشکانی ئەو دوو هێزە لە ئارادا نەمان". ل٥٦

. "ئەو کاتەی موقتەدیر لەسەر تەختی خەلافەت (خیلافەت) دانیشت، خەزێنەی دەوڵەت پازدە ملیۆن دیناری ئاڵتونی تێدا بوو". ل١٣٧

. "موقتەدیر هەموو کاروباری دەوڵەتی خستبووە ژێر دەستی ئافرەتێکەوە کە ناوی (أم موسی) بوو"ل١٣٧

. نووسەر دان بەوەشدا ئەنێت کە زانایانی ئیسلام هەڵسوڕێنەری دەوڵەت بوون، ئەوەتا ئەڵێ: "سیستەمی یاسایی دەوڵەت موجتەهیدان بەڕێوەی دەبەن لە دەوڵەتی خیلافەتدا" ل١٣٥

. بە گاڵتە پێکردنەوە ئەڵێ: "لە مەراسیمی زەماوەندی خەلیفە (مأمون)دا شتێکی پێچراوەی بۆن خۆش بەسەر ئامادەبوواندا دابەش دەکرا، کە دەیانکردەوە هەرکەسەو دیارییەکی بۆ دەردەچوو، .. کارمەندیش دانرابوون دەم‌و دەست دیارییەکانیان دەدا بە خاوەنەکانیان" ل١٣٦

. خۆی دەڵێت: بازرگانی گەورە گەورەی وا هەبووە کە قەرزی بە دەوڵەت داوە! ئەوەتا ئەڵێ: ئەم پرۆسەی قەرزدان بە دەوڵەتە هەم قەیرانی دارایی دەوڵەتی پێ چارەسەر ئەکراو هەم بازرگانی خاوەن پارەشی سودمەند ئەکرد"ل٥٢

. فوئاد میسری دان بەوەشدا ئەنێت کە لە "چەرخی زێڕینی ئیسلامدا پێشکەوتنی گەورە ڕوویداوە". ل٦٥

---

[٢٢٥] کۆمەڵگا ل٣٠.

[٢٢٦] کۆمەڵگا ل٢٠

. "ئیستەرخی دەڵێت: لەو سەردەمەدا ئەوەندە جۆگەی کۆن نوێکرانەوە، ئەوەندەش جۆگەی تازە هەڵکەندران، خوارووی عێراق یەکپارچە بوو بووە کشتوکاڵو لەیەك جیانە ئەکرانەوە". ل٢٤

. "لە شام بێجگە پیشەی چنینو ڕستن، دروستکردنی کاغەزیش پەرەی سەند". ل٥٩

لەم دەقە کورتو کەمانەوە کە فوئاد مەجید میسری هێناونی ڕووخساری ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەمان لێوە دەرئەکەوێت کە ئەم نیشانانەی هەیە:

یەکەم: خاوەنی سیستەمێکی سیاسی کەم وێنە بووە، کە "شەفافیەت" لەو پەڕیدا هەبووەو لە هەموو کەسێکەوە دیار بووە، دەرامەتی دەوڵەتو خەلیفەو بارزگانو.. هتد. چەند بووەو چەنێکە.

بەڵام ئەی ئێستاو لەم ڕۆژەدا کێ ئەزانێ دەرامەتی دەوڵەتو ماڵە مەسئولەکانو ژنو کوڕو خزمەکانیان چەندەو چەندە "موڵك"و "عەقار"و "نەسریە"و "بەر بە نیوەییان" هەیە..

. کێ دەزانێ دەرامەتی نەوت بەو زۆرو زەبەندییەی چەندەو چۆنەو بەکوێدا ئەڕواتو کێو کێ ئەیبات؟ کە دەرامەتی یەك مانگ نەوتی عێراق بۆ نموونە لەوە ئەچێ زیاتر بێت لە یەك ساڵی هەرچی هەبووە لەو کاتەدا.

. کێ ئەزانێ دەرامەتی کانزاو میتاڵو گۆگردو مسو ئاسن ....هتد چەندەو کێ ئەیباتو ئەچێتە کوێ؟

. کێ دەزانی کارگەو کۆمپانیاکانو دامەزراوە بەرهەم هێنەکانی چیمەنتۆو جگەرە ..هتد ئەچێتە کوێو چەندەو چۆنە؟ کە تەنها لە کوردستانی خۆماندا (ئیدارەیی سلێمانی) ئەم هەرێمە بچوکە لە تازەترین ئاماردا (١٥٠٠) کارگەی بەرهەمهێن هەیە جگە لە کارگە بچوکەکانی تر ...[٢٢٧]

. کێ دەزانێ دامەزراوەکانی (ئاو، کارەبا، گاز، غاز) چەندەو کێ دەیبا، بۆ دەیبات؟

. کێ دەزانێ شارەوانیەکان دەرامەتیان چەندە؟ کێ وەریان دەگرێو بەکوێدا ئەڕوات، دەرامەتی (ئەرزە، باجی خانووبەرە، تاپۆ، یانسیب .....هتد

. کێ دەزانێ گومرگو دەزگاکانی (ضریبە)و باجی موخالەفاتی مروریو تەزویراتو..... چیو چی کێ دەیباتو چەندەو چۆنە؟

. ئەمانە هەمووی لەکاتێکدا کە ئەوەندە باسی شەفافیەتو دیموکراتیەت کراوە پیرو لاو کاسو وەڕەس بوونو نیشانەکانیشی ئەو هەمووە گلەییو گازەندەو گوێنەدانەیە بە بانگەشەکانی هەڵبژاردنو پڕۆژە (بێخێرەکانی ئەمڕۆ)[٢٢٨]بە تایبەتی لە لایەن گەنجانەوە.

دووهەم: ئەو دەوڵەتە ئەمەندەی خزمەتگوزاریو کار کردووە بۆ پێشخستنی دەوڵەتو میللەت هەموو کەس چانسی ئیشکردنی لە بەردەمدا هەبووە بەبەڵگەی ئەوەی ئەو هەموو داهاتە بۆ دەوڵەت دروست بووە، خەڵکی واش هەبووە ئەوەندە دەوڵەمەند بووە لە کاتی پێویستدا قەرزی بە دەوڵەت داوە، لەو سەردەمە دوورەدا هەرچی پێویستی خەڵك بوو بێت کارگەو دامەزراوەی بۆ دانراوەو فوئاد میسری بۆ نموونە دەربارەی لق و پۆپەکانی کاری قوماش دروست کردن ئەڵێ:

"ئەم پیشەیە کە پێوستی بە چەند کاری جیا جیاو یەك لە دوای یەکی وەك (ڕستن)، (ڕەنگ کردن)، (چنین)، (دروون) هەیە، بە ڕادەیەك چووەیە پێشەوە چەند پیشەوەر کە هەریەکەیان شارەزایی لقێکی پیشەکە بوون، یەك لە دوای یەکدا کاری خۆیان ئەنجام دەدا"[٢٢٩] هەروەها دەربارەی سود وەرگرتن لە سەرەتاکانی زانیاری فیزكو کیمیاو بۆ پێشخستنی کارگەو دامەزراوەکان نووسەر ئەڵێ: "میژوونووسان قسە لە چەند جۆر ئاش دەکەن، کە بە ئاو یان بە هەوا خراونەتە گەڕ". نەك هەر ئەمە بەڵکو ئەڵێ: "لە سەرەتای سەردەمی چواردەیەمی کۆچیدا ئاشێ نەماوە بە دەست کاری کردبێ"[٢٣٠].

دەی باشە کەسانێك لەو سەردەمە دوورانەدا ئەوە عەقڵیەتیان بوو بێتو بەو شێوەیە (تمدن)و ڕەفاهییەتیان دروست

---

[٢٢٧] ئەم ئامارە لە ڕۆژی ٢٠٠٥/١٢/١٣ دا بەرپرسێکی باڵا بۆ پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن لەسەر شاشەی تەلەفزیۆن ڕایگەیاند.

[٢٢٨] لە بەرنامەی بەرنامەدا تەمسیلێکی خۆشی لەسەر (پڕۆژە بێخێرەکان) کرد مانگی (٢٠٠٦/٢).

[٢٢٩] کۆمەڵگا ل٥٨.

[٢٣٠] کۆمەڵگا ل٥٨.

**کردبێتو توانیبێتیان ئیمپراتۆریەتێك ئیدارە بدەن، فەزڵیان زیاتر نییە لە کەسانێك کەناتوانن هەرێمێكو شارێك ئیدارە بدەن وەك پێویست ئاوو کارەباو بەنزینو گازو غازی بۆ دابین بکەن لەگەڵ ئەو هەموو (داهاتە) زۆرەدا.**

**سێیەم: لەهەندێ لەو دەقانەدا دەردەکەوێت کە ئەو دەوڵەتە ئیسلامیانە توانیویانە لە زەویەکی ووشکی بێ ئاوی ووڵاتان یان زۆنگاوێکی جەنگەڵستانو بێشەڵان، ووڵاتێکی بەپیتو بە بەرهەمی وا دروست بکەن کەساڵ بە ساڵ (داهاتی) زیاد بکاتو نەخشەی ساڵانەی بۆ دابنرێت بەرەو ئەو ئاستە ببرێت وەك فوئاد مەجید میسری خۆی ئەڵێ.**

**چوارەم: وڵاتێکی وەکو عێراق کە لە چەند شارێکی کەم تێنەدەپەڕی کە هەیبوو، بەڵام لە ماوەی دەستەڵاتی ئیسلامیدا ئەو هەموو شارو ئاوەدانییەی تێدا دروست کراو کرا بە وڵات بە مانای ووشە بەڵکو کرا بە بەهەشتێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە ... "بەغداد" دروست کرا، سامەڕا دروست کرا، واسطو ..و ..و دروست کران .. سەیری ئەم سیاسەتە وورده بکە بۆ دروست کردنی شارو ئاوەدان کردنەوەی وڵاتانو ئاوەدانی دروست کردن کە نووسەر خۆی باسی ئەکات بێ ئەوەی سەرنج بداتو تیشکی بخاتە سەر.. نووسەر ئەڵێت: "یەك ملیۆن درهەم بەخشرا بەوانەی کە هاتنە ئەو شارەو شوێنی ڕابواردنیان[231] تیاکردەوە"[232].**

**دیارە دەوڵەت ئەبێت خۆی هەستێت بە دروستکردنی شارو لادێو نۆژەن کردنەوەیان یان ئەبێت (ئیمکانیات) بداتە خەڵکی تا بۆ خۆیان ئاوەدانی دروست بکەن .. لەوڵاتێکی وەك عێراقی ئەمڕۆدا بەگشتیو کوردستان بەتایبەتی ئەگەر وەها سیاسەتێك پەیڕەوی بکرێت چەند ساڵێك نابات خەڵکی هەموو وڵاتەکە ئاوەدان دەکەنەوەو ئاسەواری کاولکاری پێوەنامێنێت .. ئەوەتا هەڵەبجەی شەهید بۆ نمونە نە حکومەتی هەرێم خۆی ئاوەدانی ئەکاتەوەو نەپارەو (ئیمکانات)یش ئەدات بە خەڵکی خۆیان هەستن بە زیندووکردنەوەی شارەکەیان، ساڵی پار (٢٠٠٥) ئیمکاناتێکی کەم سەرف کرا بۆ هەندێك خێزان توانیان ئەوەندە خانووی تێدا دروست بکەن کە ئێستا بە شارەکەوە دیارە.**

**پێنجەم: لەمانە گەورەتر ئەوەیە ئەو دەوڵەتە ئیسلامییانە کە یەك لەدوای یەك هاتن لە جیاتی بێنەسەر کەلاوەو وڵاتێکی ژێر بارکەووتووی قەرزار، کەچی ئەم خەلیفە ئەمرد، ئەوی تر ئەبو بە خەلیفەوحوکمڕانی وڵاتێکی گەشەکردو ئاوەدانو پارەدار، نەك وەك ئێستا هەرچی دێت وڵات ئەکات بەژێر قەرزەوەو کاتێکیش ملی ئەشکێنێو ئەڕوات هەموو وڵاتو دەوڵەت ئەخاتە ژێرباری قەرزاریو هەژاریەوە[233]..**

**فوئاد میسری خۆی ئەڵێ: "کە خەلیفە مەنصور مرد خەزێنەی دەوڵەت خاوەنی شەش سەد ملیۆن درهەم و چوار ملیۆن دینار بووە"[234].**

**هەروەها ئەڵێت: "ئەو کاتەی موقتەدیر لەسەر تەختی خیلافەت (نەك خەلافەت) دانیشت، خەزێنەی دەوڵەت پازدە ملیۆن دیناری ئاڵتونی تێدا بوو"[235]. لە کاتێکدا خەلیفە مەنسور ساڵی(١٣٦کۆچی) بوو بە خەلیفەو ساڵی (١٥٨کۆچی) وەفاتی کرد، و موقتەدیر ساڵی (٢٩٥کۆچی) بوو بە خەلیفەو ساڵی (٣٢٠ کۆچی) وەفاتی کرد"[236]. واتە ئەو ماوە درێژە خەزێنەی دەوڵەت نەك قەرزاری بەسەردا نەهات بەڵکو بەو دەوڵەمەندییە هەر ماوەتەوە.**

**شەشەم: لەولاشەوە بابوەستێت کە پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤو جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لەو هەندە دەقەوە چۆن دەردەکەوێت کە نووسەر خۆی پەرشو بڵاوی کردونەتەوە لەناو کۆمەڵگاکەیدا.**

---

[231] وا دیارە مەبەستی نوسەر لە شوێنی ڕابواردن شوێنی حەوانەوەو کات بەسەربردنەو مەبەستیشی لەو شارە (ماحوزە)ی باکوری (سامەڕا) یە وەك لە شوێنی تردا باسی دەکات.

[232] کۆمەڵگا ل ١٣٧.

[233] عێراقی ئەمڕۆ لەگەڵ بوونی ئەو هەموو سامانە نەوتیو سروشتییەدا کە (سەددام) جێی هێشت بوو بە ژێر قەرزەوەو نزیکەی سێ سەد ملیارد دۆلار قەرزی بەسەرەوەیە. ئێستاش (٢٠٠٦) کە یابان بڕیار ئەدات قەرزی تازەی بداتێ (حکومەتی نوری مالیکی) ئاهەنگ ئەگێڕێت! !..

[234] ـ کۆمەڵگا ل٣٧.

[235] ـ کۆمەڵگا ل١٣٧.

[236] محاضرات في تأريخ الشعوب الاسلامية (٢/٥٣ و ٣٣٥).

. ئافرەت بە قەناعەتی ئەو لە پلەیەکدا بووە هەموو کاروباری دەوڵەتی لەژێر دەستدا بووە.

. زانایانو موجتەهیدان ڕاگری سیاسەتو یاسای دەوڵەت بوون، واتە پیاوانی قانون زانو زانایانی بواری (فیکر)و (سیاسەت).

. بازرگانەکان ئازاد بوونو دەوڵەت دەستی نەخستووەتە کاروباریان بۆ ڕاست کردنەوەی ناهاوسەنگی کۆمەڵگە نەبوو بێت.

دەی ئیتر نازانم فوئاد مەجید میسری بۆ ئەبێت ئەوەی نەشیٚو نەبا بیکات بەدەوڵەتی خیلافەت؟ ئایا ناهەقی ناکات! ئەو چی دەویٚ؟

. سیستەمێکی سیاسی شەفافو خزمەت گوزار.

. دونیایەکی گەشەسەندوو وڵاتێکی پێشکەوتوو، کارو بازرگانیو کشتوکاڵو ... هتد بەجۆرێك وا کە ساڵ بە ساڵ کە ماڵی زیاتری بەخۆیەوە بینیوە.

. کۆمەڵگەیەك کە پارەی لێبڕژێتو "ئەمنیەتی" لە هەموو شوێنێك زیاتر بوو بێت.

. کۆمەڵگەو سیستەمی حوکمڕانی وا کە "ئەهلی زیمەو کەمە نەتەوەکان" تێیدا ئاسودەبنو خۆیان داوا بکەن با (عدل)ی ئێوە حاکم بێت بە سەرمانەوە نەك (زوڵم)ی هاودینەکانی خۆمان!

نووسەر لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا تەفسیری ناڕەوا بۆ زۆر بڕیارو ڕووداو ئەکات کە لە مێژووی ئیسلامیدا ڕوویداوە، بۆ نمونە ئەڵێت: "خەلیفە مەنصور دەستی گرت بەسەر (٣) ملیۆن درهەم پارەی (خالیدی) بەرمەکیدا"[237].

هەروەها دەڵیٚ: "هارونە ڕەشیدیش کە دەستی بەسەر سامانی موحەممەدی کوڕی سلێمانی والی (بەسرە) دا گرت .. دەرکەوت پەنجا ملیۆن درهەمی هەبووە"[238].

لە وەڵامی ئەم ناحاڵی بوونەدا دەڵێین:

١. ئەم خەلیفانەی ئیسلام کە ئەو ڕەخنەیان لیٚ دەگریٚ هەرچەندە نوقسانیشان هەبوو بێت وەك هەموو ئینسانێك، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سەرۆکەکانی سەردەمی خۆیاندا لە (ڕۆم)و میللەتەکانی ترو بەبەراورد لەگەڵ سەرۆكو کاربەدەستانی ئەمڕۆشدا هەر دەرئەکەوێت کە ئەوان بەدینتر بوونو بەشعورترو عاقڵترو دڵسۆزترو بە خزمەتتر بوون ... بۆ نموونە مێژوو دەڵیٚ:

"مەنسور ڕۆژو شەوەکانی بەم شێوە دابەش کردوە: سەرەتای ڕۆژی دانابوو بۆ مەسەلەکانی: ئەمری ئیداریو ویلایەت دامەزراندنو عەزەلکردنو لێکۆڵینەوە لە سنورەکانو پڕکردنەوەیان بە موجاهیدینو ئەمان دروست کردن بۆ ڕێگەکانو دیراسەکردنی مەسەلەکانی خەراجو سەرف کردنیانو ڕاتبو موچەی خەڵکیو پشوودانیانو خانووبەرەیان.

کاتێك نوێژی عەسری ئەکرد لەگەڵ خاو خێزانی خۆیدا دائەنیشت بۆ دەمەتەقیٚو ڕاگۆڕینەوە ...

پاش نوێژی عیشا دەستی ئەکرد بە خوێندنەوەی ئەو نامەو پۆستانەی کە لە سنورو هەرێمەکانەوە بۆی هاتبوون، بەڕاوێژ لەگەڵ ئەوانەدا کە شەو لەلای ئەمانەوە مەسەلەکانیان چارەسەر ئەکرد. کە سێیەکی یەکەمی شەو ئەڕۆیشت، ئەچووە ناو جێگاکەیو ڕاوێژکارەکانی ئەچوونەوە بۆ ماڵی خۆیان.

کە سێیەکی دووەمی شەو ئەڕۆیشت لە جێگاگەی ڕاست ئەبوویەوە دەست نوێژێکی پاكو ڕێکی ئەگرتو ئەچووە ناو میحرابو نوێژی ئەکرد تا (شەبەق) دەرئەهاتو پاشان ئەڕۆیشت نوێژی بۆ خەڵك ئەکردو ئەچووە دیوانی ڕاوێژو دەستی بەکار ئەکردەوە"[239].

مەنصور ئەڵێت: "چەند پێویستە مرۆڤ چوار جۆر کەس هەمیشە وەك دیواری خانوو حوکمەکەی ڕابگرێت! ووتیان: قوربان کێن ئەوانە؟ ووتی: ئەوانە وەك کۆڵەکەی حوکم وان، هەرحوکمێك ئەو چوار کۆڵەکەی نەبێت ڕاناوەستێت. وەك چۆن

237 کۆمەڵگا ل ٣٨.

238 کۆمەڵگا ل٣٨.

239 محاضرات فی تاریخ الشعوب الاسلامیة (٢/٨١).

تەختێك بە چوار قاچ ڕائەوەستێتو ئەگەر یەکێکیان نەبێت ئەوە ئەڕمێتو تیائەچێت ... یەکەمیان: حاکمو قازیەکە کە لە ترسی خوا حیساب بۆ لۆمەو قسەی هیچ کەسێك نەکات، دووهەمیان: (ساحێب شورتە)یەك کە بە ویژدان بێت لەگەڵ لێقەوماواندا و نەیەڵێت هەقیان بفەوتێت، سێیەم: بەرپرسێکی خەراج کە وریاو ئاگاداری خەڵك بێتو ستەم لە خەڵك نەکات، چونکە ستەم خێرناداتەوە بۆ کەس. چوارەمیان: بەرپرسێکی پۆستە، کە چاودێر بێت بەسەر هەموو ئەمانەوەو هیچیان نەشارێتەوە لە ئەمیرەکەی"[240].

یەکێکی دانا بە "والی" لە (حضر موت)، (بەرید)ێکی بۆ هات کە فلانە والی زۆر خەریك ئەبێت بەڕاوکردنەوە، لەسەر کار لای ئەباتو پێی ئەڵێت: "خوا لە دایکتو لە عەشیرەکەت بسێنێ، ئەوە خەریکی چ بەزمێکی، ئێمە بۆ ڕاپەراندنی کاروباری موسڵمانان دامان ناوی یان بۆ گەمەکردن لەگەڵ پەلەوەرو ئاژەڵدا، وەرە کارەکەت تەسلیمی فلانی کوڕی فلان بکەو بڕۆ ناو ماڵو منداڵی خۆت و بە سەری کزەوە دانیشە لە ناویاندا"[241]

(ئیبراهیمی کوڕی موسا کوڕی عیسا) ئەڵێت: کاربەدەستانی پۆستە لە هەموو هەرێمو شارەکانەوە هەموو ڕۆژێك ڕاپۆرتێکی وردیان ئەنووسی بۆ (مەنسور) دەربارەی: نرخی گەنمو دانەوێڵەو پێستەو نرخی هەموو خواردەمەنیەكو هەموو ئەو حوکمانەی کە قازیەکان دەریان ئەکرد لە شوێنەکانی خۆیاندا، وە هەموو ئەو کارانەی کە (والی) ئەیکردن، کە نوێژی مەغریبیان ئەکرد، ڕووداو هەواڵی ئەو ڕۆژەیان بەگشتی ئەنوسی بۆی. بەیانیش زوو هەواڵو ڕووداوەکانی هەموو شەویان بۆ ئەنووسی، کە ئەو ڕاپۆرتو نامانەی پێ ئەگەیشتو ئەیبینی، نرخەکان لە شوێنی خۆیاندان، ئاسودە دەبوو، خۆ ئەگەر بیبینیایە کە بازاڕو نرخەکان گۆڕاوە خێرا نامەی بۆ "والی" ئەنوسی داوای هۆیەکانی لێ ئەکرد، کە وەڵامی بۆ ئەهاتەوەو هۆیەکەی ئەزانی هەستی ئەجوڵاوو بەرنامەی دائەنا بۆئەوەی بازاڕ گرانی تێ نەکەوێت، ئەگەر قەزاوەتی قازیەکیشی لاپەسەند نەبوایەو زوڵمی تێدا بووایە بۆی ئەنووسیو داوای ئەکرد کە پێیدا بچێتەوەو جار جارەش لۆمەی ئەناردە سەریان"[242]

مەنسور پیاوێکی زۆر ئەمەکدارو بە وەفاش بوو، ئەوەتا کاتێك کە ئەچێتە خوازبێنی (ئەروای کچی مەنسوری حومەیری) کە دایکی هەر دوو کوڕەکەی (محمدو جەعفەری گەورە بوو، "ئەروا" بە مەرجی ئەگرێت کە نە ژنی بەسەردا بهێنێت و نەلێشی دوور بکەوێتەوە، مەنسوریش ئەمەی بۆ ئەنووسیو شایەتیشی بۆ ئەگرێت، بیست ساڵی ڕێك تەنیا هەر ئەوی هەبووە لەو دەستەڵاتو سوڵتانەیشدا کە هەیبووە چەند جارێك مەنصور نامەی ئەنارد بۆ زانایان و ئەهلی فەتوا لە حیجازو ئەهلی عێراق کە ئایا دروستە ژنی تر بهێنێت، وەڵامی بۆ ئەهاتەوە، بەنەخێر... بەو شێوەیە مایەوە "تا ژنەکەی پاش بیست ساڵ مرد".[243] سەیرکە چەند خاوەنی پەیمانی خۆی بووە، هەرچەندە حەزی هەبووە بۆ ئەوەی ژنی تر بهێنێت، بەڵام شەرع ڕێگەی پێنەداوە، چۆن خۆی گرتووەو دەستی بە شەرع و پەیمانی خۆیەوە گرتووە ...

دەستگرتنیشی بەسەر ئەو هەموو سەروەتەی خالیدی بەرمەکیدا هەر لەبەرئەوە بووە کە ئەو ماڵ و سەروەتەی بەهەق نەزانیوە بە مافی خەڵکی زانیوەو گەڕاندوویەتیەوە بۆ (بيت المال).

"مەنصور تەنانەت چاودێری ماڵ و منداڵی خۆیشی ئەکرد بۆ ئەوەی ئیسراف نەکەن و مەیل بە زیادە ڕۆی نەدەن".[244] بەو شێوەیەی کرد بۆیە "کاتێك کە مرد خەزێنەی دەوڵەت خاوەنی شەش سەد ملیۆن دینار بوو" وەك فوئاد میسری لە لاپەڕە (٣٧)ی کتێبەکەیدا ئەیڵێت..

(هارونە ڕەشید)یش ئەو خەلیفە بەدینە عەقل گەورەیە بوو کە لە سەردەمی ئەودا شارستانیەت گەیشتە چەرخی (زێڕین) ... هەروەها ڕەشیدێك کە مێژوو دەڵێت: "پیاوێکی بەدین و موحافیز کار" بوو زۆر گەردن گیر بووە بە شەرعەوە هەموو ڕۆژێك (سەد ڕکات) نوێژی ئەکرد مەگەر دەرێکی ببوایە،.. هیچ ڕۆژێکی لێ نەئەڕۆی (صدقە)یەکی تێدا نەکردایە

---

٢٤٠ ـ هەمان سەرچاوە (٨٢/٢). ئەو پۆستانە ئەمرۆ بریتین لە (قاضي يان مفتى)، (ئاسایش)، (دارایی)، (دەزگای هەواڵگری).

٢٤١ ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[242] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[243] ـ هەمان سەرچاوە (٨٤/٢).

[244] ـ هەمان سەرچاوە (٨٥/٢).

لەماڵی حەلاڵی خۆی، بۆ حەجکردنیش هەموو ساڵێك ئەڕۆیشت مەگەر ڕۆیشتن بۆ (غەزا) سەرقاڵی بکردایە، حاڵی وابوو، ئەو ساڵە یان لە(حەج) بوو یان لە (غەزا) بوو، زۆر گوێی بۆ ئامۆژگاری زانایان و ئەهلی (وعظ) ئەگرت،... (ئیبنو سەمماك) وەعزخوێنێکی ناو موسڵمانان بوو، جارێکیان پەرداخێك ئاویان هێنا بۆ هاروونە ڕەشید "ئیبنو سەمماك" فەرمووی: تۆزێ بووەستە قوربان! ئەگەر ئەم ئاوەت پێویست بێت و بەپارە نەبێت دەستت نەکەوێت، چەندی پێ ئەدەیت، هاروون فەرمووی: نیوەی موڵکەکەمی پێ ئەدەم، (ئیبنو سەمماك) فەرمووی: بەشیفات بێت بیخۆرەوە ... کە خواردیەوە، پێی ووت: باشە قوربان ئەگەر ئەم پەرداخە ئاوە لە هەناوتا بگیرێت‌و نەیەتە دەرەوە، چی ئەدەی بەوەی ڕزگارت بکات لێی؟ فەرمووی: هەموو موڵکەکەم. (ئیبنو سەمماك) فەرمووی: "ان ملكا قيمته شربة ماء لجدير الا ينافس فيه"[*] هاروونە ڕەشید دڵی پڕبوو و دەستی کرد بەگریان"[245]. بەڕاستی ئەگەر کاربەدەست و مەسئولەکان گوێ بگرن بۆ ئامۆژگاریو قسەی پیاوی ساڵح، خەڵك ئاوەهای لێ نەدەهات و خۆشیان ئەوەندە گەندەڵ نەئەبوون.

٢. نووسەر هەر دوو زانیارییەکەی لەسەر (مەنصور )و (هاروونە ڕەشیدیش) لە (تاريخ اليعقوبي: ج٢/ل٣٤٨)و لە (مروج الذهب)ی مەسعودی (ج٣/٣٤٨) وەرگرتووە، کە یەعقوبی کابرایەکی ڕەگەزپەرست‌و (مەسعودی)یش بەهەمان شێوەیە ... ئیبن حەجەری عەسقەلانی ئەڵێت: "کتێبەکانی مەسعودی لێوان لێو شیعەگەرایی لێ ئەڕژێ، لە فقهدا شیعەیەو لە عەقیدەدا (موعتەزیلەیە)[246].

مەسعودی بڕوای وایە کە (وصيه) هەر لە ئادەمەوە هەبووە، هەموو پێغەمبەرێك وەسیەتی کردووەو دوای خۆی فلانە کەس ببێتە جێنشینی‌و محمد پێغەمبەریش (ﷺ) وەسیەتی کردووە کە عەلی ببێتە جێنشینی‌و سەحابەش زوڵمیان لێ کردووە (ئەبوبەکریان ) کردووە بە خەلیفە لە جیاتی عەلی!!"[247]..

مەسعودی لە (مروج الذهب)ەکەیدا ئەوەندەی گرنگی‌و شەرح و تەفسیر بە (عەلی) داوە ئەوەندەی گرنگی تەنانەت بە پێغەمبەر(ﷺ) نەداوە"[248]. دەی کەسێك ئەوە حاڵی بێت چۆن بە چاکی باسی خەلیفەکانی ئیسلام ئەکات چۆن دان بەسەروەری‌و مێژووییاندا ئەنێت؟ کە لەو مێژووە درێژەدا تەنیا یەك سەروەری چییە مایەی شانازی ئەم نییە!!

ئیتر ئەوە یەعقوبیش بابوەستێت‌و ئێمەش لە پێشەوە باسی یەعقوبی‌و مێژووەکەیمان کرد[249].

فوئاد میسری لە لاپەڕە (٣٨و ٣٩)دا باسێکی (موسادەرە کردنی) هێناوە گوایە "کە نەریتێکی باو بوو هەرکات دەربار پێویستی بە پارەو پول ببوایە دەستی بەسەر موڵك و ماڵی برێك لە دەستەلاتدارانا دەگرت".[250]

هەروەها دەڵێت (دامەزراندنی دام و دەزگایەکی تایبەتیش بۆ سەرپەرشتی کردنی ئەم جۆرە کارو بارانە بەناوی (ديوان المصادره)وە بەڵگەی پەسەندی زوڵم و ستەمی لە ئەندازە بەدەری فەرمانڕوایانی دەوڵەتی خەلافەت دەرهەق بە دانیشتوانە بەگشتی"[251].

بۆ وەڵامی ئەمە ئەڵێین:

١. ئەو تەعمیم و گشتاندنە ستەم‌و بوختان و نەزانینیشە، چونکە ئەوە نەریتێکی باو نەبووەو بەڵکو لە چەند حاڵەتێکی دیاریکراودا هەبووەو موصادەرە کردنی ماڵی دانیشتوان بەگشتیش نەبووەو بەڵکو هی کاربەدەستان و هی هەمووشیان نەبووە بەڵکو هی ئەوانە بووە کە لە غەفڵەتێکدا سەروەتێکیان پێکەوە ناوەو ئیسغلالی شوێن و پلەیەکیان کردووە

---

[*] واتە: موڵك‌و سامانێك بایی قومێك ئاوبێت شایانی ئەوە نییە ململانێی لەسەر بکرێت!!

[245] ـ تأريخ الأمم والشعوب الاسلامية (١٣٦/٢).

[246] ـ لسان الميزان (٢٢٥/٤) پەراوێزی اسمى المطالب في سيرة علي بن ابى طالب، الصلابي، (ص٦٠٩).

[247] ـ هەمان سەرچاوە (ص٦٠٩).

[248] ـ هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

[249] ـ بگەڕێوە بۆ بەشەکانی پێشتری ئەم کتێبە.

[250] ـ کۆمەڵگا ل٣٨.

[251] ـ کۆمەڵگا ل٣٩.

٢. ئەو سیاسەتە هەق وایە لەناو سەروەریەکانی دەستەڵاتی ئیسلامیدا باس بکرێن نەك لە سلبیاتدا .. ئەم سیاسەتی لێپێچینەوە لە کاربەدەست و بەرپرسان ئەبێت بەشانازیەوە باسی بکرێت، چونکە ئەگەر وانەکەیت کاربەدەستان هەر زوو "گەندەڵ" ئەبن و ئەبنە بار بەسەر خەڵکەوە...

. پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرموێت: "أما بعد، فانی استعمل الرجل منکم علی عمل مما ولانی الله، أفياتي فيقول: هذا مالکم، وهذا هدية أهدي لي، أفلا جلس فی بيت أبيه وأمّه حتی تاتيه هديته ان کان صادقاً". [252] واتە: لە پاشاندا، من کە پیاوێك بەکارئەهێنم بۆ ئیشێك لە ئێوە، لەو ئیشانەی خوای گەورە داویەتییە دەستم، ئەبێت بێت و بڵێ: ئەمە ماڵ و سامانی ئێوەیە و ئەمەشیان بە دیاری بۆ خۆمیان ناردوە، باشە بۆ ناڕوا لە ماڵی باوکیدا یان لە ماڵی دایکیدا دابنیشێ، بزانم کەس دیاری بۆ ئەبات ئەگەر ڕاست ئەکات...

. عومەر ئەفەرموێ: "ئەوە باشترە بۆم هەموو ڕۆژێك کاربەدەستێك بگۆڕم تا سەعاتێك لە ڕۆژێکدا بەستەمکاری بمێنمەوە".

. ڕۆژێکیان بە شوراکەی وت: بەڕای ئێوە ئەگەر کەسێك دابنێم بە بەرپرس بەڕای خۆم چاکترین کەس بێت و فەرمانی ئەوەشی پێ بکەم لەگەڵ خەڵکدا بەداد ڕەفتار بکات، بەوە ئەرکی سەرشانی خۆمم ئەنجامداوە، وتیان: بەڵێ، فەرموی: ـ بەڕای من ـ نەخێر ئەرکی سەرشانم ئەنجام نەداوە! ئەگەر بەردەوام چاودێری نەکەم بزانم ئایا وا ئەکات یان نا". (*)

نەك ئەمانە سەیرکە عومەری کوڕی خەتتاب چ نەخشەیەکی دانابوو بۆ لێپرسینەوە لە کاربەدەستان:

١. هەموو کاربەدەستێك کە دێتە مەدینە (واتە سەنتەری خیلافەت) پێویستە بەڕۆژدا بێتە ئەوێ تا هەموو خەڵکی بزانن چی پێیە.

٢. ساڵانە چەند جار ئەبێت نوێنەری هەرێمەکان بێنە "مەدینە" و عومەر بە درێژی پرسیاری ئەو هەرێم و خەڵك و والی و کاروبارانەیان لێبکات، ئەوەش ڕاپێچ بکات کە شکاتی لێ ئەکرێ.

٣. پۆستەچی عومەر کە ئەچوویە هەر شارو هەرێمێك بەناو خەڵکدا هاواری ئەکرد، فلانە ڕۆژ بۆ لای ـ ئەمیرولموئمینین ـ ئەگەڕێمەوە، کێ نامەیەکی هەیە، بۆم بهێنێ با ڕاستەوخۆ بیدەمە دەستی خۆی! کە ئەو نامانە نە (والی) و نە (پۆستەچی) نەیانئەزانی چی تێدایەو تەنیا لە لای عومەر خۆیدا ئەکرانەوە.

٤. موحەممەدی کوڕی مەسلەمەی دانابوو بە (پشکنەری گشتی) لە هەموو هەرێمەکاندا.

٥. ساڵانە لەکاتی حەجدا نوێنەری هەموو هەرێمەکانی ئەبینی و گوێی بۆ سکاڵاو داوای گشتی ئەگرت.

٦. جار جارە خۆشی بۆ پشکنین سەردانی مەیدانی هەرێمەکانی ئەکرد.

٧. ئەرشیفێکی گەورەی بۆ کاروباری خیلافەت دانابوو، بەردەوام بەداواداچوونی ئەکرد. (*)

. (عومەری کوڕی خەتتاب) ڕۆیشتە بازاڕ هوشترێکی قەڵەوی بینی ئەیان فرۆشت، پرسی ئەوە هوشتری کێیە؟ ووتیان: هی عەبدوڵڵای کوڕتە قوربان! فەرموی: بەچەندت کڕیوە؟ ووتی: بە ئەوەندە. فەرمووی: ئەسڵی پارەکەی خۆتی لێ هەڵگرەو قازانجەکەی بخەرەوە (بيت المال). عەرزیان کرد قوربان بۆچی؟ فەرمووی: ئەوە باش بۆیان لەوەڕاندووە چونکە کوڕی ئەمیرولموئمینینە. [253]

عومەر ئەو شتەی بە "ئیستغلالی سوڵتە"زانی نەیهێڵا خەڵك فێری شتی لەو بابەتە بن!

. عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانێکی حوکومی دەرئەکات و ئەبێتە (یاسا) لەو دەوڵەتەدا کە ئەڵێت: (ونری أن لايتجر امام ولا يحل لعامل تجارة فی سلطانه الذی هو عليه، فان الامير متی يتجّر يستأثر ويصيب أمورا فيها عنت و إن حرص". [254]

---

[252] مختصر صحیح مسلم / البغا، ص٣٧٠.

(*) بڕوانە: عمر بن الخطاب شخصيته وعصره، د. الصلابي، ص٤٢٦.

(*) تأريخ المدينة (٧٦١/٢) پەراوێزی (عمر بن الخطاب، شخصيته وعصره، الصلابي، ص٤٢٧).

[253] الاسلام/ سعيد حوی، ص٤٢٣.

[254] البدايەوالنهايه (٢٠٣/٩)، الاسلام سعيدحوی، ص١٥٧، ملامح الانقلاب، ص١٢١.

واتە: بڕیارمان وایە کە بەرپرسی موسڵمانان نابێت بازرگانی بکاتو حەڵاڵ نییە بۆ هیچ بەرپرسێکی تریش لە کاتی دەسەڵاتەکەیدا بازرگانی بکات، چونکە هەر میرێك دەستی دایە بازرگانی باوی خۆی ئەدات بەسەر خەڵکیداو ئەبێتە مایەی زەحمەت بۆ خەڵکی هەرچەندە خۆی بپارێزێ!!.

دەی باشە کاکە فواد! ئەو سیاسەتە باشەو ڕێگە لە تەماع و چاوبرسێتی مرۆڤ ئەگرێت یان ئەو سیاسەتی بەرەڵاکردنە کە هەرکەس پلە و پایەیەکی دەست کەوت خێرا چل پەنجا گوێنیٚ هەڵدروێت و پڕیان بکات لە (بەرتیل)و (دیاری)و (نەسریە)و (بەربەنیوەی )و (داگیرکاری )و.... کەس لە گوڵیٚ کاڵتریشی پیٚ نەڵێت .. ئەوە وەك پرەنسیبو مەبدەئی خەلیفەکان لە سیستەمی سیاسی حوکمڕانیدا، ئەمەش وەك پراکتیكو مومارەسە..

. عومەری کوڕی خەتتاب بیستی بەرپرسی (حمس) دەرگای بۆ حەوشیماڵەکەی کردوەو بەڕووی خەڵکدا دای ئەخات، نوێنەری تایبەتی خۆی نارد بە نامەیەکەوەو پێی ووت: هەر بەدیار چاویەوە دەرگای حەوشەکەی بیسوتێنەو لەگەڵ خۆت بیهێنە بۆ لام. لەسەر کەمتەرخەمی والیەکی تری بانگ کرد بۆ لێپرسینەوە، کاتێك کە هاتە مەدینە عومەر لە (پەچەی) ئاژەڵەکانی (بیت المال) مولاقاتی پێداو بینی وا عومەر (کەرەکێك)و گاڵۆکێکی بەدەستەوەیە، پاش ئەوەی بەخێرهاتنی کرد، فەرمووی هابگرە ئەو "کەرەکە" لەبەر بکەو ئەو گاڵۆکەش بگرە بەدەستەوەو بچۆ ئەو گاگەلەی (بیت المال) بلەوەڕێنە، ئەوە بزانە ئەو "کەرەکە" لە کەرەکەکەی باوکت جوانترەو ئەو گاڵۆکەش لە گاڵۆکەکەی باوکت چاکترە، چەند ڕۆژێك گاوانی پیٚ دەکات و پاشان بانگی ئەکات پێی ئەفەرمووێ: (جارێکی تر نەبیستم خۆت لە خەڵکی بە گەورە تر بزانیو خەریکی کای لابەلا بی، بڕۆرەوە سەر ئیشەکەت بتبینم باسی چاکەت بکریٚ"[٢٥٥].

. عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش هەواڵی ئەوەی پێگەیی لە والی (یەمەن)ەوە کە لە حیساباتدا چەندە دینارێك دیار نەماوە، عومەریش بۆی نوسیوەو فەرمووی: "انی لست أتهم دينك ولا أمانتك، ولكنى اتهم تضييعك وتفريطك وانما أنا حجيج المسلمين فى مالهم".[٢٥٦]

واتە: من گومانم لە دینو دەستپاکی تۆ نییە، بەڵام گومانم لەکەمتەرخەمی و خەمساردیت هەیەو منیش پارێزەری ماڵی موسڵمانانم و ئەبیٚ بپرسمەوە..

٣. ئەم چەمکی (موصادەرەکردنە) چەمکێکی هەستیارو پێویستە بۆ فوئاد میسریو خوێنەرانی ڕۆشن بکەینەوە...

أ . وەك ووتمان ئەمە موصادەرەی ماڵی ناڕەوای بەرپرسەکانە نەك ماڵی خەڵکی، ئەو بەرپرسانەی ماڵ ئەنێن بەیەکەوە لەسەر حیسابی خەڵکی نەدارو هەژار، نەك لەسەر حیسابی کاسبیو عارەقی ناوچەوانیان.

ب . دەوڵەتی ئیسلامی ڕاگری بەرژەوەندی گشتییە، بۆیە ئەگەر بەرژەوەندی گشتی کەوتە بەر مەترسی بۆ دەوڵەتی ئیسلامی هەیە لە بەرپرسەکانەوە تا ئەگاتە دەوڵەمەندەکان بڕێك پارە فەرز بکات لە سەریان ئەو مەترسیو قەیرانەی پیٚ نەهێڵێت ..

ئیمامی غەزالی ئەفەرمووێت: "اذا خلت ايدى الجنود من الاموال ولم يكن من مال المصالح (بيت المال) ما يكفى نفقات العسكر و خيف من ذلك دخول العدو الى بلاد الاسلام و ثوران الفتنة من قبل اهل الشر جاز للامام ان يوظف على الاغنياء كفاية الجند"[٢٥٧].

"عزی کوڕی عبدالسلام"یش ئەفەرموێت: "المصلحة العامة كالضرورة الخاصة، ولو دعت ضرورة واحد الى غصب أموال الناس لجاز له ذلك، بل يجب عليه اذا خاف الهلال لجوع أو حَر أو برد، فاذا وجب هذا لاحياء نفس واحدة، فما الظن بأحياء النفوس"[٢٥٨]. (شاطبی)یش لە (الاعتصام)دا (٢-١٢) بە درێژی باس لەم حاڵەتە ئەکات و کورتەکەی ئەمەیە : (ئەگەر دەوڵەتی ئیسلامی توشی قەیرانیٚ بوو ئەوە بۆ ئیمام دروستە (ئەگەر دادپەروەر بێت) دەوڵەمەندەکان بانگ بکات

---

[٢٥٥] فریشتەکانی سەر زەوی طه بابان، ل٢٦، بۆ هەندیٚ تر لەو هەڵوێستانەی سەیری (عمر بن الخطاب، الصلابی، ص١٥٤، ١٦٠) بکە.

[٢٥٦] ملامح الانقلاب، (ص١٢١).

[٢٥٧] المستصفى/ الغزالى، (٣٠٣/١).

[٢٥٨] القواعد / عز بن عبدالسلام (١٦٢/٢).

شتێك فەرز بكات لەسەر هەریەكەیان تا (بیت المال) پارەی تێدێتەوە.. ئەگەر كاتی خۆشی وانەكراوە لەبەرئەوە بوو (بیت المال ) لە زەمانی ئەواندا هەژار نەكەوتووە چونكە ئەگەر وانەكرێت ئەوە شەوكەتی ئیسلام ئەشكێت و وولات ئەكەوێتە ژێر ئەگەری تیاچوون و داگیركردنەوە)..

لەم دەقانەوە بۆمان دەردەكەوێت كەئەم جۆرەكارانە دوو مەرجی هەیە:

١. (بیت المال)ی موسڵمانان مەساریفی تێدا نەمێنێت یان بەش نەكات و بكەوێتە بەر ئەگەری ڕمان و تیاچوون.

٢. ئەبێت بۆ لابردنی زیانێكی گشتی یان دروستكردنی سودێكی گشتی بێت ئەگەر هەریەك لەو دوو مەرجەی تێدا نەمێنێت، ئەمیش نامێنێت.

. نووسەر لە خانە گومانی خۆی ناكەوێت دڵ پیس ئەكات لەو هەموو دەوڵەمەندیو پارەیەی كاتی خۆی هەبووە لە دەوڵەتی خیلافەت داو بە خراپی تەفسیری ئەكات، پاش ئەوە لیستێكی گەورەو دوورو درێژی لەسەر داهاتی خیلافەتی ئیسلامی (كابینەی مەنسور) گواستۆتەوە، ئەڵێت: "ئەمەی خوارەوە بەشێكی بچوكی ئەو باج و خەراجەیە كە بەخەزێنەی دەوڵەت گەیشتووە....

. خواروویی عێراق: بایی ٨,٧٨٠,٠٠٠ كەلوپەل‌و ١٤,٨٠٠,٠٠٠بە نەختی

. كسكر: ١١,٦٠٠,٠٠٠ درهەم بەنەختی

. ناوچەی دیجلە: ٢٠,٨٠٠,٠٠٠ درهەم

. حەلوان: ٤,٨٠٠,٠٠٠ درهەم

. ئەهواز: ٢٥,٠٠٠,٠٠٠ درهەم بە نەختی‌و هەزار ڕەتڵ شەكر . فارس: ٢٧,٠٠٠,٠٠٠ درهەم بەنەختی ٢٠,٠٠٠ ڕەتڵ ئاوی تری‌و ٥٠,٠٠٠ ڕتڵ ئاوی هەرمێ‌و هەنارو هەزار شوشە گوڵاو (١٥٠٠٠) ڕەتڵ ئەنبەر (٥٠٠٠٠) ڕەتڵ سیرافی، سێ بار مێوژ.

. كرمان: (٤,٢٠٠,٠٠٠) درهەم بەنەختی و (پێنج سەد) تۆپ قوماشی یەمەنی‌و (٢٠٠٠٠) ڕەتڵ خورماو سەد ڕەتڵ زێر.

. مەكران: (٤٠٠,٠٠٠) درهەم بە نەختی.

. سند: (١١,٥٠٠,٠٠٠) درهەم بە نەختی (١,٠٠٠,٠٠٠) پەیمانە دەغڵ ودان‌و سێ فیل و هەزار تۆپ قوماشی حەبەشی چوار هەزار پەشتە ماڵ‌و دوو سەدو پەنجا مەن بۆن و بیست هەزار جووت پێڵاو.

. سیستان: (٤,٦٠٠,٠٠٠) درهەم بە نەختی‌و شەش سەد تۆپ قوماش‌و بیست هەزار ڕەتڵ شەكر.

. خۆراسان: (٢٨,٠٠٠,٠٠٠) درهەم بەنەختی‌و چوار هەزار ئەسپ و هەزار كۆیلەو حەوت هەزار تۆپ قۆماش‌و سێ سەد ڕەتڵ هەلیلە.

ئەمە جگە لە باج و خەراجی (قوم)و (تەبەرستان)و (ڕەی )و (ئەصفهان )و (هەمەدان) و (بەصرە)و (شارەزوور)و (موسڵ) و (جەزیرە)و (ئازەربایجان) و (گەیلان) و (كەرەج) و (ئەرمەنستان) و (شام) و (میسر)و (باكوری ئەفەریقا)و (نیمچە دوورگەی عەرەبستان)یش!!"[259]. دوای ئەمە نووسەر لە خۆیەوە ئەڵێ (دیارە خەزێنەی دەوڵەت شتێكی ئەوتۆی بۆ كاروباری كۆمەڵایەتی خەرج نەكردووە.(!!) لە بواری ئاوەدان كردنەوەشدا ناوەندی دەستەلات گەر هەنگاوێكیشی نابێت تەنیا هەر دوو شاری (مەككە و مەدینە)ی گرتووەتەوەو بڕێكی كەمیش پارەو پوڵی لەبوجەی ساڵانە بۆچاكردنی ڕێگای حەج و مووچەی كارمەندو قازیەكان و دام و دەزگای دەوڵەت تەرخان دەكرد، بەڵام بەشی هەرە زۆری دەرامەتی دەوڵەت بۆ دەرباری خەلیفەو دەزگای سەربازی بووە"[260].

ئەم چەند قسەیەی نووسەر كە تێبینی زۆر هەڵدەگرێت، حەز دەكەم بە چەند خاڵێك لەخوارەوە هەندێكیان بنووسم:

١. بەدەر لەڕادەی ڕاستی‌و ناڕاستی زانیاریەكانی، نووسەر زانیارییەكانی لەكتێبی (تاريخ سياسي الإسلام)ی حەسەن

[259] كۆمەڵگا ل٤١و ٤٢، بە هەندێ كورتكردنەوەوە.

[260] كۆمەڵگا ل٤٤و ٤٥.

**ئیبراهیم وەرگرتووە لەگەڵ کتێبی "تاریخ الشعوب الاسلامیه"ی برۆکلمان. ئەوەی حسن ابراهیم لەو کتێبانەیە کە سەرچاوەی سەرەکی زانیاریەکانی کتێبی "تاریخ الیعقوبي"یە[٢٦١]. وە ئەوەی کارل برۆکلمانیش بەسە ئەوەندەی کە کابرایەکی ڕۆژهەلاتناسی نەسرانی مەزهەبەو نەیتوانیوە لەو باکگراوندەو قەناعەتانەی مەزهەبەکەی، خۆی ڕزگار بکات[٢٦٢]..(دکتۆر مصطفی السباعی) لە کتێبی (السنة ومکانتها في التشریع الإسلامي)دا باسی ئەوە ئەکات کە ڕۆژهەلاتناسان بە بڕیاری پێش وەخت لەسەر ئیسلام و مێژووی ئیسلامیی ئەنووسن و هێرشی ناڕەوا ئەکەنە سەر مێژووی ئێمە، هەندێك قسەی (گۆستاڤ لۆبۆن) ئەهێنێت کە نهێنی ئەو بوختانو هێرشانەی ڕۆژهەلاتناسان دەردەخات ... گۆستاڤ لۆبۆن ئەڵێت: "وەهم و گومانی تۆ پەڵە بوو کە بەدرێژای چەند سەدەیەك لە باوو باپیرانەوە بۆمان بە جێماوە دژ بە موسڵمانان وای لێهاتووە ئەو ڕق و گومانە بووەتە بەشێك لە میزاج و بیرکردنەوەمان، بەئاشکرا ڕەگی داکوتاوە لە شەخصیەتماندا و تەریبە بە ورق و (حیقدە)ی کە جولەکە هەیەتی بەرامبەر بە (نەسارا) کە جاری واهەیە ئەو ڕقە شاراوەیەو کەس دەری نابڕێ، بەڵام بەردەوام لە قوڵایی ناخماندا ئەجوڵێت.**

**خۆ ئەگەر ئەم وەهم و ڕقەمان دژ بە موسڵمانان کە لە باوباپیرانمانەوە بۆمان ماوەتەوە ئەو وەهمەی تری بۆ زیاد بکەی کە لە کەلتوری (ئاخنراو بەڕق)ی ناو قوتابخانەکانەوە بۆمان ماوەتەوە ئەویش ئەوەیە ئەڵێت: (تەنیا یۆنان و لاتین) سەرچاوەی ئەو هەموو ئەدەب و زانیاریەیە لە مێژوودا هەیە، جا بەزانینی ئەم کەلەپورە بەئاسانی لەوە حاڵی ئەبین بۆچی ئێمە نکوڵی لە ئەو هەموو فەزڵەی موسڵمانان ئەکەین بەسەر شارستانیەتی ئەوروپاوە لە مێژوودا"[٢٦٣]. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وەك (میسیۆ رینان) دانی پێدا ئەنێت و ئەڵێ "نەچوومەتە هیچ مزگەوتێك و لەناخمەوە حەشۆکەم پێ نەکەوتبێت یان لەناخی دڵمەوە خەفەتم بەوە نەخواردبێت کە منیش موسڵمانێك نیم"[٢٦٤]. کەچی هەر ناتوانن لەو کەلتورەو میراتەی وەریان گرتووە خۆیان ڕزگار بکەن.**

**٢. وەك چەند جارێکی تر ووتمان: ئەو ئامارەووردانەی داهاتو خەرجی دەوڵەتی خیلافەت بەڵگەیە لە سەر بوونی شەفافیەت لەناو ئەو دەسەلاتەدا، ئەگینا چۆن خەڵکی ئاوەها ئاگاداری تەفاسیلی داهاتی دەوڵەت ئەبوون.**

**٣. ئەگەر ئەوە تەنیا "خەراج"و بابڵێن زەکاتی دەوڵەتی ئیسلامی ئەو کاتە بوویێت، کەواتە ئەبێت "دەخلی فەرد = داهاتی تاکەکەس" چەند بوویێت، کە دیارە ئەبێت لانی کەم ئەوە زەکاتو خەراجی دەرکراوی "١٠٪"ی ئەو دەخلە بووە.**

**٤. ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەو بڕە پارەو شتومەکە دیارە لە هەرێمەکانی خۆیان زیاتر بووەو لە پێشدا پێویستی ئەو هەرێمانەی پێ تەواو کراوە پاشان بەرەو سەنتەری دەستەڵات براوە، چونکە وەك فەتوا (دروست نییە زەکات نەقڵ بکرێت لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ئەگەر خەڵکی موستەحەققی خۆی لەو شوێنەدا بێت).**

**نابێ فوئاد میسری بڵێ: جاکێ گوێی بە فەتوا داوە، چونکە هەر خۆی ئەڵێ (سیستەمی یاسای دەوڵەت موجتەهیدان بەڕێوەی دەبەن لە دەوڵەتی خیلافەتدا)[٢٦٥].**

**بە ڕای من شتێك فوئاد مەجید میسری‌و زۆری تری بە هەڵەدا بردووە ئەوەیە قەناعەتیان وایە کە ئەو هەموو داهاتە دیارە بەرهەمی زوڵم و داگیرکاری بووە!! بەڵام ئایا مەرجە داهاتی زۆر نیشانەی زوڵم بێت؟ یان گریمانی ئەوەش هەیە کە (ئەمنیەت)و (نەخشەی ئابووری وورد) ڕۆڵی سەرەکی ببینێ ... بۆ وەڵامی ئەم گومانە (دکتۆر عماالدین خلیل) ئەڵێ:".. (ئەگەر ئەوە وایە) ئەی ئەبێ تەفسیری ئەوە چۆن بکەین کە داهاتی زەوی "سەواد" (بۆ نموونە) لە سەردەمی (حەجاج)دا هاتە چل ملیۆن درهەم، کەچی لە سەردەمی عومەری کوری خەتتابدا سەد ملیۆن داهاتی هەبووە لە خەراج؟ کێ دەڵێ**

[٢٦١] اسمی المطالب / الصلابي (ص٦٠٩).

[٢٦٢] پێشتر بە درێژی کتێبەکەی فوئاد مەجید میسری هەڵسەنگێنراوە.

[٢٦٣] السنة ومکانتها / ص٢٦.

[٢٦٤] هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

[٢٦٥] ل ١٣٥. لە پێشەوەش باسمانکرد کە خەلیفە مەنسور (٢٠) ساڵ ئەیویست ژنی تر بهێنێ ، بەڵام زانایان فەتوایان بۆ نەداو هەر مایەوە، چونکە "ئەروای کچی مەنسوری حومەیری" بەو مەرجە شووی پێکرد کە ژنی بەسەردا نەهێنێ.

دەوڵەتی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش هەمان نەهجی عومەری کوڕی خەتتابی نەگرتوەتە بەر؟... دەی بە (مەنطیق)ەکەی (فلوتن)و (دوزی)و (موللر)و هەموو ڕۆژهەڵاتناسان بێت ئەبوایە لە سەردەمی حەجاجدا ئاڵتون لافاوی هەستایەو لە سەردەمی ئەو دوو عومەرەدا خەزێنەی دەوڵەت پارەی تێدا نەمایەو گسکی لێ بدرایەو ئاوڕشێنیان بکردایە!!

کەواتە نهێنی ئەم ئەنجامە گەورەیەی کە پێچەوانەی لێکۆڵینەوەکانی ئەو زانانەن لە سەردەمی دوو کەسی وەك عومەری کوڕی خەتتاب و عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا چی ترە ئەوە نەبێت "داد" و "نەخشەی ورد" و "ئیجابیەت" کاری گەورە دەکەن لە زۆر کردنی داهاتدا"[٢٦٦].

٥. .نووسەر ئەڵێ: "دیارە خەزێنەی دەوڵەت شتێکی ئەوتۆی بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی خەرج نەکردووە"!! ئەم قسەیە جگە لەوەی قسەی گیرفانی خۆیەتی‌و لە خۆیەوە ووتویەتی‌و سەرچاوەکەی باس نەکردوە لەهەمان کاتدا درۆیەکی شاخ دارو گەورەشە هەر نووسەر چەند دەقی مێژووی تری هێناوە کە ئەمە بە درۆ ئەخاتەوە..

. باشە ئەی ئەو هەموو شارە گەورە کە (بەغداد)و (سامەڕا)و... هتد، لەو شارانەن، بەچی دروست کراون؟

. باشە ئەی ئەو هەموو جۆگەو ڕووباروو زۆنگاوانە نۆژەن کرانەوەو بە قسەی (ئەستەخری) ئەوەندە کشتوکاڵ لە خوارووی عێراقدا ئەکرا کە زەوی بە دەرەوە نەبوو، ئەمانە لەچی مەسرەفیان ئەکرا؟

. باشە ئەی ئەوەی ئیبن کەسیر باسی ئەکات بانگدەر بەناو خەڵکدا هاواری ئەکرد: کوا قەرزاران؟ کوا بێ ژنەکان؟ کوا بێ باوکەکان؟... تا هەموو ئەو توێژانە دەوڵەمەند کران و باری سەرشانیانیان سوك کرا..[٢٦٧] ئەم کارانە بەچی ئەکران‌و کام خەزێنە مەسرەفی بۆ ئەکردن؟!

. باشە ئەی (سلفە)و قەرزدان بە بازرگانەکان‌و هاوکاری کردنیان، مانای چییە کە نووسەر خۆی باسیان ئەکات؟

. باشە ئەی دروست کردنی کەشتیگەلی ئیسلامی کە خۆت باسی ئەکەیت (ل٥٥) هەر لە سەردەمی (مەعاویە)وە ئەوە بەچی ئەکرا؟

. یان پارەدان بەو کەسەی کە لەشارەکاندا ئاوەدانی‌و شوێنی حەوانەوە دروست ئەکات ئەوە چی پێ ئەوترێت؟

. ئەی ئەوە چییە خۆت ئەڵێی: "ڕاستە دەوڵەتی ئیسلامی ڕووبەرێکی فراوانی زەوییە شۆرەکانی چاك کردو کردنیە زەوی کشتوکاڵی...و خەڵکی شارەزای ئەهێناو سودی لە شارەزاییان وەردەگرت"[٢٦٨].

. ئەی ئەمەی کە (محمد خضر بەگ) باسی ئەکات کە لە سەردەمی (مەنصور)دا لە ڕێگەو بانەکاندا ئیشارەتیان دائەنا لە نێوان شارەکانداو ئەهاتن زەویەکانیان گەز ئەکرد بەگەزی هاشمی لە کۆتایی هەموو میلێکدا ووشەیەکیان ئەنووسی، لە یەکەم میلیدا ئەیانووسی (یەك)و لە دوو هەمدا (دوو) وە هەروەها.. بە دێژایی ئەو ڕێگایانە منارەیان دروست ئەکرد بۆ ئەوەی خەڵك لەو دەشت‌و بیابانەدا ڕێگە وون نەکات"[٢٦٩] ئەو مەسروفانە لە کوێ کراون‌و ناویان چییە؟

. ئەی باشە ئەو هەموو خزمەتگوزاریەی تر، دەربارەی (مووچە)و دەرماڵەی هاوڵاتیان چین؟ کەس نەبووە لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا مووچەی نەبوو بێت .. کە لە سەردەمی ئەبوبەکرو عومەرەوە دامەزراو بەم شێوەیە بوو بە نەریتێکی باو لە ناو دەوڵەتی خیلافەتدا:

• ١٢,٠٠٠ درهەم بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و عەباسی مامی.

• ٥,٠٠٠ درهەم بۆ ئەهلی (بەدر) لە کۆچەران و پشتیوانان‌و (حسن)و (حسێن)یشیان خراوەتە سەر.

• ٤,٠٠٠ درهەم بۆ ئەوانەی کە ئیسلامبوونیان وەك ئەهلی "بەدر" وایە کە ئوسامەی کوڕی زەید یەکێکە لەوان.

• ٣,٠٠٠ درهەم بۆ عەبدوڵڵای کوڕی عومەرو هەندێ لە مناڵەکانی کۆچەران و پشتیوانان وەك عومەری کوڕی ئەبی سەلەمە.

---

[٢٦٦] ملامح الأنقلاب الأسلامی (ص١٤٤) زانیارییەکەی لە (البلاذري) وەرگرتووە لە (فتوح البلدان ص٣٣٢).

[٢٦٧] سەیری ل ٩٩ بکە

[٢٦٨] ل٦٢. نووسەر تەنیا لێرەدا "زەوی شۆری" بەڕاستی بەکاربردووە.

[٢٦٩] محاضرات في تأريخ الشعوب (٥٢/٢).

۲,۰۰۰ درهەم بۆمنالآنی کۆچەران و پشتیوانان بە گشتی.

۸۰۰ درهەم بۆ خەڵکی مەککە.

۳۰۰ و٤۰۰ بۆ هەموو هاوولاتییەك.

٦۰۰و ٤۰۰و ۳۰۰و ۲۰۰ درهەم بۆ خێزانی کۆچەران و پشتیوانان.

فەرماندەی سوپاو کارمەندی تر مووچەی (۹,۰۰۰ –۸,۰۰۰ –۷,۰۰۰)ی ئەدرایەو هەر منالێکیش کە لە دایك ئەبوو خێرا (۱۰) درهەمی [۲۷۰] بۆ ئەبڕایەوەو کە پێی ئەگرت ئەبوو بە (۲۰۰) درهەمو تا گەورەتر ئەبوو بۆی زیاد ئەکرا" [۲۷۱].

باشە کاکە فوئاد! ئەی ئەم مەسروف و خەرجیانە ناو ئەنێی چیو کێ ئەیکردن؟!

. ئەی باشە خۆ هەر خۆت ئەڵێی: "ئەوەندە ئاش دروستکراوە ئەوەندە بازاڕ دروست کراو ئەوەندە دەزگاو دوکان .. چیو چی .. ئایا ئەمانە خزمەتگوزاریو کاروباری کۆمەلآیەتی نین؟ ئەی چین؟

. ئەبو یوسف ئەڵێت: "ئەگەر ئەهلی "سەواد" پێویستیان بەوە ببێت کە ڕووباریان بۆ بهێنرێتەوەو کارێزی گەورەیان بۆ هەڵبکەندرێت لە دیجلەو فوراتەوە ئەوە ئەبێت (بیت المال) بۆیان بکات [۲۷۲].. هەر ئەبو یوسف باسی زۆر شتی تر دەکات کە مەسروفیان لە (بیت المال)ەوە بۆکراوە.. وەك (. بەندکراو زیندانەکان، . ڕاتبی قازیو والیو فەرمانبەران. . چاك کردنی زەویو ڕووبارەکان) [۲۷۳].

نازانم ئەمانە هەر بەخوایشو دوعا بە تەنیا ڕۆیشتوون بەڕێوە یان نا؟

. ئیتر با ئەوە بوەستێ ئەو سوپا بەهێزەی دەوڵەتی خیلافەت چۆن ئیدارە دراوەو سوپای ئیمپراتۆریەتێك نەك میلیشیای هەرێمێك یان شارێك یان حیزبێك؟.. زۆر خۆشە مرۆڤ کە قەڵەمی گرت بەدەستەوە بڕیار بدات بەویژدان بێت، ئەگەر سلبیاتی شتێکیشی نووسی چاو دانەخات لەئاست سەروەریو ئیجابیاتەکانی!

٦. نووسەر ئەڵێ: "تەنیا مەسروفات بۆ مەککەو مەدینەو ڕێگەی حەج کراوە"! ئاخر کەی وایە؟ ڕاستە مەسەلەی (حەج) شیعارێکی گەورەی ئیسلامەو گرنگی پێدانی جێگەی خۆیەتی لە سەری لیستەوە بێت، بەلآم ئەوە یانی ناگرنگی هەر بە ئەو درابێت .. ئەگەر بمانەوێت وەلآم بۆ ئەم بڕگەیەش بنوسین ئەبێت ئەوەی پێشوو دووبارە بکەینەوە، بەلآم باخوێنەر خۆی دووبارە ئەوەی پێشوو بخوێنێتەوەو نووسەریش بەخۆیدا بچێتەوە وەبا هیچ نەبێت تەنیا پێشکەوتنی (فیکر)و (علم)و (ئاوەدانی)و (ئەدەب و هونەر)و (تەقنین) لە زەمانی هاروونە ڕەشیددا بخوێنێتەوە وەك کەسێکی بێ پەیوەندی بە ئیسلامو مێژووی ئیسلامەوەو بەلآم بە ویژدانەوە، چونکە ئەوە مایەی ڕێز ئەبێت نەك مایەی عارو شەرمەزاری .. "گوستاف لوبون" ئەڵێ: "هەندێ کەسی بەڕێزی ئێمە وادەزانێ ئەوە "عار"ە ئەگەر دان بەوەدا بنێت کە ئەورووپای نەصرانی زۆر قەرزاری کافرە موسڵمانەکانە، کە دەستی ئەورووپایان گرتو لەقۆناغی تاریکیدا دەریان هێنان" [۲۷٤] دیارە لای نەصرانیەکانی ڕۆژئاوا موسڵمانەکان کافرو بێ دینن!!

نووسەر دیسان ئەڵێ: "دەوڵەمەندان و خاوەن سامانەکان بەتایبەتی دەستەلآتدارانی دەربار زەویو زاری خۆیان بە ڕەسمی دەکردە وەقفی شوێنە پیرۆزەکان، بەو جۆرە فڕوفێڵە خۆیان لە باجی دەوڵەت ئەدزیەوەومەترسی دەست بەسەراگرتن (مصادرە)شیان لەخۆیان دوور ئەخستەوە" [۲۷٥]... ئەم زانیاریە جگە لەوەی لە "برۆکلمان" وەری گرتووە، ناحاڵی بوونێکی زۆری تێدایە دەربارەی ماڵی "وەقف"، ئەو ئەڵێ: ئەم کارەیان بۆیە ئەکرد تا لە باج ڕزگاریان ببێت، لەکاتێکدا هەر موولکێك کە بووە ماڵی (وەقف) ئیتر بەهیچ شێوەیەك هەقی خاوەنەکەی بەسەریەوە نامێنێتو ئەچێتە

---

[۲۷۰] پێنج درهەمی ئەو کاتەحەیوانێکی چاکی کردووە، (الأسلام / سعید حوی، ص١٣٥).

[۲۷۱] هەمان سەرچاوەی پێشوو (محاضرات: ١٥٣/٢و ١٥٤).

[۲۷۲] هەمان سەرچاوە (١٥٤/٢).

[۲۷۳] لاپەڕەکانی (١٥٤،١٥٣، ١٥٥، ١٥٦) ی هەمان سەرچاوە.

[۲۷٤] السنة ومكانتها ص٢٧.

[۲۷٥] کۆمەڵگا ل٤٤.

(دیوانی ئەوقاف)و دەوڵەت سەرپەرشتی ئەکات، جا ئەگەر کابرا مەبەستی بە وەقف کردنی موڵکێکی خۆی خێرو چاکەو (صدقە) نەبێت چ ئامانجێکی تری دەست ئەکەوێت لەبەر باج هەموو موڵکەکەی دەست پێوە بنێ ... ئەمە وەك ئەوە وایە بڵێی کابرایەك کارگەیەکی هەیە ساڵانە چەند میلۆن دینار بەرهەم ئەهێنێ بۆ خاوەنەکەی، بەڵام کابرا لەبەر باجێکی ساڵانەی یەك دوو هەزار دیناریك هەموو کارگەکە ئەداتە دەوڵەت بۆ ئەوەی ڕزگاری بێت لەو باجە؟! مرۆڤی عاقڵ شتی وائەکات؟! جا یا نووسەر لە مەسەلەی (وەقف) حاڵی نەبووە، یان ئەو زانیارییانەی وانین؟ یان مەسەلەکە هەر لەبناغەدا ڕووی نەداوە...

فوئاد میسری کۆتایی بەم بەشی یەکەمە ئەهێنێت لە کتێبەکەیدا بەڕیزێك بوختانی لەقوتونراو و ئەیکاتە قوفڵی باسەکە ئەڵێت: "سیاسەتی ڕووتاندنەوەو زوڵمو ستەمی کۆیلایەتی بەدرێژای چەندین سەدە دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگری سیستەمی ئابووریو کۆمەڵایەتی دەوڵەتی خەلافەت بووە، ئەم دیاردەیەش کە تەعبیری لە جەوهەری سیستەمە سیاسیەکەی دەکرد، بووە فاکتەری سەرهەڵدانی چەندین ڕاپەرینو شۆڕشی کۆمەڵایەتی ..."[276].

لە وەڵامی ئەو بوختانەدا ئەڵێین:

١. لە پێشەوە زۆر باسی ئەوەمان کردو سەلماندمان کە ئەوە بوختانێکی گەورەیە بوترێت خەڵکی زوڵمیان لێ کراوە یان مەحروم بوون، بەڵکو بە پێچەوانەوە خەڵك ئەوکاتە دڵخۆشترو پارەدارترو ئەمینترو بەڕێزتر بووە تا ئەم ڕۆژانە.. چ موسڵمان و چ غەیرە موسڵمان، چ گەورەو چ بچوك ...

٢. زوڵم زۆر ناخایەنێت و وەك عەرەب ئەڵێ "الظلم لايدوم وان دام دمّر"، بەردەوامی دەوڵەتی خیلافەت بۆ زیاتر لە چواردە سەدە، بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو دەوڵەتە یەك لەدوای یەکانەی خیلافەت "داد"و "یەکسانی"و "یاسا" زیاتر باڵا دەست تر بووە نەك زوڵم و زۆر.

٣. ئەوەش کەی وایە نووسەر ئەڵێ (زوڵم و زۆری کۆمەڵایەتی دیاردەیەکی حاشا هەڵنەگرە..."!!

٤. ئێمە لە بەشەکانی داهاتوودا ئەیسەلمێنین بەبەڵگەی مێژوویی کە ئەو یاخیبوونانەی نووسەر ناوی شۆڕشی کۆمەڵایەتیو ڕاپەڕینی لێ ناوە!! نەڕاپەڕین بووەو نەشۆڕش، بەڵکو فیتنەو ئاژاوەو چەتەگەریو ڕاو ڕوت بووەو ئەوانەشی هەڵیان سوڕاندووە خەڵکانی بەرەڵاو بێ دین و فریو دراو بوون....

جا با خوێنەر خۆی سەرپشك بێت لەوەودوا بزانێ ئەگەر لەو چەتەو ڕێگرانە لەم ڕۆژانەدا بوونایە چ حوکمێکیان بەسەردا ئەدرا.

---

[276] کۆمەڵگا ل٤٥.

نووسەر ژێرخانی ئابووری کۆمەڵگەی ئیسلامیی ئەکاتە سێ لق: بازرگانی ....کاریی پیشەیی ....کشتوکاڵ .... پاشان هەریەکەیان ڕاڤە ئەکات، خوا هەڵناگرێ شتی باشی زۆر باس ئەکات و جار جارەش داخی ناو دڵی سەر ئەکات و شتی خراپەش ئەڵێت: بۆ نمونە کە باسی چاکسازی زەوی و زار ئەکات کە چۆن زەویە شۆرەکان چاککراونەتەوەو کراونەتە زەوی کشتوکاڵو بەرهەمهێن و چۆن سوود لە (شارەزایی)ی خەڵکی وەرگیراوە کەچی لەخۆیەوە ئەڵێ (فراوان کردنی ڕووبەری کشتوکاڵ لەپێناو خۆشگوزەرانی خەڵکدا نەبووە)، ئەی لەپێناو چی بووە؟

نووسەر ئەڵێ: (لە پێناوی زیادکردنی باجی زەویدا بووەو بەمەش خەزێنەی دەوڵەت ئاوەدانتر کراوەتەوە)!!...

یان بەهەمان شێوە بێویژدانی بەخەرج ئەدات و لەوێدا کە باس لەوە ئەکات سیاسەتی دەوڵەتی خیلافەت ئەوە بووە کۆچ لە لادێکانەوە بۆ شار ڕوونەدات ، ئەڵێت: "تەنانەت کارمەندانی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی ڕێگەشیان پێ نەداون مەڕو ماڵاتی خۆشیان بفرۆشن"[277].

هەر چەند کون و قوژبنی ئەم کۆمەڵگای فوئاد مەجید میسریە ئەگەڕێم شوێنێکم دەست ناکەوێت تیێدا "بیرکردنەوەیەکی حوکمەتیانە"ی کردبێتەوە یان لە (بیرکردنەوەیەکی دەوڵەتیانە) تێگەیشتبێت و سەلماندبێتی، نووسەر بە هیچ کلۆجێك بیرکردنەوەی دەوڵەتیانەی لا پەسەند نییە، ئەو بیرکردنەوەو بەرنامە ڕێژیە بۆ هەرچی بێت ئەگەر وانیە ئەی ئەمە چییە؟

ئایا بەرنامەدانان بۆ ئەوەی لادێکان چۆڵ نەبن کۆچی لادێکان بۆ شار ڕوو نەدات شتێکی ئیجابی نییە! ئەی بۆ تۆ نایسەلمێنی.. ئاخر، لادێیەك وەك خۆت وتووتەو لە کتێبی مێژوو نەقڵت کردووە، دەوڵەتی خیلافەت ئەمانەی بۆ کردبن:

. زەویە شۆرەکانی بۆ چاکردبن و کردبێتییە زەوی کشتوکاڵو بەرهەمهێن ...ل٦٢

. لە سەر موسڵمان تەنیا (٢,٥٪) زەکات و لە سەر خاوەن کتێبەکان تەنیا جزیەی دانا بێ[278]، کە دینارێك بووە لە ساڵێکدا.

. زۆنگاوەکان هەمووی چاککرابنەوەو کرابنە زەوی و زاری بەرهەمهێن. ل٢٤

. ڕێگاو بانەکانیان بۆ چاك کرابێت و هەر(میلێك)ومنارەیەکی گەورەیان تێدا دانابێت.

. ئاو بۆ مەزراکانیان و ڕووبار بۆ زەویە شۆرەکانیان و... هتد برابێتەوە.

. جۆرەها کارگە دروست کرابێت بۆ ساغ کردنەوەی بەرهەمی جوتیاران .. کارگەی ڕستن‌و شوشەو کاغەز ... هتد بە باشترین سیاسەت بەرهەمی جوتیاران کڕاونەتەوە.. (ل٥٦و ل٥٧و ل٥٨).

. لەوەڕگاو شوێنی تایبەت بۆ مەڕو ماڵات دانرابێت‌و کرابێتە "قەدەغە = حمي".

. بزاڤی (هەناردن و هاووردن) بەشێوەیەکی بەرچاو و دیار دەستی پێ کردبێت ..ل٥٩..هتد...

ئەمانە هەمووی کرابێت، ئیتر بۆچی دەوڵەت ڕێگە بدات لادێکان چۆڵ بکرێن؟! ئەو هەموو هاندان‌و تەشجیعەی دەوڵەت بۆ لادێکان هۆکەی ئەوەیە کە "خود کەفائی" دروست ببێت، بوونی لادێ لە ڕاستیداو تایبەتی لەو چەرخ‌و زەمانەدا شادەماری ژیان و هۆی سەرەکی خود کەفائی بووە، ئیتر چۆن دەوڵەت کەمتەرخەمی ئەکات ...

باشە کاکە فوئاد! لە هەرێمی کوردستانەکەی من‌و تۆدا بۆچی تا ئێستا ناتوانرێت لادێکان ئاوەدان بکرێتەوە، بۆچی خەریکە کوردستان لادێی نامێنێ؟ ئەو لادێیانەش هەن هەر لادێیەی پێنج شەش ماڵێکی تێدایە، ئەوانیش لەتاو بێ وەزعی خەریکە دیق‌و سیل دەکەن نەئاویان هەیە نەکارەبا نەڕێگەوبان‌و نەجۆگەو بیرو ڕووبار.. نەبەرهەمیان پارە ئەکات‌و نەزەویان بۆ چاك ئەکرێت.. ئەترسم فوئاد میسری بڕوای وابێت ئەگەر لە تەلەفزیۆنەوە یەك دوو بەرنامەی وەك (سۆزی

---

[277] کۆمەڵگا ل٦٣.

[278] نووسەر ئەڵی: (جوتیاری ناموسڵمان بێجگە لە خەراج ئەبوو جزیەش بدات". ل٦٢. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە وانییەو (فەراء) لە (ألأحكام السلطانية) (ص٦٤)دا ئەڵێت: "فهذا الخراج جزية" واتە ئەم خەراجە جزیەکە بووەو جێگەی ئەوی گرتۆتەوە، "عمادالدين خليل"یش لە (ملامح الانقلاب الاسلامی)دا ئەڵێ: زۆربەی نووسەرانی غەیری ئیسلامی (خەراج)و (جزیە) تێکەڵ ئەکەن، لە کاتێکدا لە هەر شوێنێکدا باسی خەراجی (ئەهلی ذیمە) کرابێت، مەبەست پێی (جزیە) بووە، نەك هەردوکیان . سەیری سەرچاوەی ناوبراو (ل٨٥و ١٥٩) بکە..

**هەورامان)و (کوردستان ئاوەدان).. هەبێت ئیتر ئەوە ئەبنە کارەباو ئاوو بیروو جۆگەو ڕووبارو پارەو پول بۆ جوتیاران و خاوەنی ئاژەڵەکان و کوردستانیش بەرەو خود کەفائی ئەڕوات و ئیتر نابێ خەڵك لادێکان بەجێ بهێڵێ!!**

**کاکە! بیرکردنەوەی دەوڵەتیانە ئەوەیە کە (شارو لادێکان) هەبن، شار قەڵای قایمی لادێ بێت و لادێش قەڵای قایمی شار بێت، ناکرێت دەوڵەت دەست شل بکات و بەرەڵایی و پشێوی ڕوو بدات، کە هەرچی خەڵکی لادێ هەیە هەموو بێنە شار ئەو کاتە (بەرنامەی بەرنامە) واتەنی فیلیش هەڵیان نەکەنێ جارێکی تر بچنەوە لادێ!.. ئەم ڕاستییە (وڵات پێویستە شاریشی ببێت و لادێشی ببێت) پاش هەشت سەدە کۆمەڵناسێکی گەورەی وەك ( ئیبن خەلدون) پەی پێ دەبات و ئەڵێ: هەرچی شارستانیەتی دونیا هەیە لە شارو لادێ دروست ئەبێت و گەشە ئەکات[279] .**

**لەباسەکانی داهاتوودا ئەم مەسەلەیە زیاتر ڕوون دەکەینەوە[*]**

**بەڵام گەورەترین زەحمەت دواندنی مرۆڤی خانەگومان و ڕاڕایە، قەناعەت پێ کردنی بەشتێك کە لەوەو پێش قەناعەتی تری هەبوو بێت و بشفرێت هەر بزن بێت، زۆر ئەستەمە، خوای گەورە ئەفەرمووێت "وجحدوا بها واستيقنتها انفسهم ظلما و علوا".**

**واتە: لە ناخەوە بڕوایان بە ڕاستی دینی خوا هەیە، بەڵام ستەم و لوتبەرزی نکوڵییان لە دین پێ ئەکات.**

**بۆ کۆکردنەوەی ئەم بەشە حەز ئەکەم کورتەیەکی ئەوەی فوئاد میسری خۆی نووسیویەتی دەربارەی ژێرخانی ئابووری دەوڵەتی خیلافەت. هەر وا بەو ڕەهاییەی خۆی ئەیڵێی. بخەمە بەردەستی خوێنەران و ناوی (بڕگەیی یەکەم)ی لێ بنێین وەك لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، پاشان لە "بڕگەی دووەم"دا ئەو ڕواڵەتانەی تری کۆمەڵگەی ئیسلامیی باس بکەین کە نووسەری ناوبراو باسی نەکردووە.**

**فوئاد میسری ئەڵێت: ژێر خانی ئابووری دەوڵەتی خیلافەت سێ بەشە:**

**یەکەم: بازرگانی**

**دووەم: کاری پیشەیی**

**سێیەم: کشتوکاڵ**

**نووسەر دەربارەی بازرگانی دەڵێت: "لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئاینی نوێدا قەڵەمڕەوی ئیسلام سنووری نیمچە دوورگەی عەرەبستانی بەزاندوو پەلو پۆی بە چواردەوردا هاویشت.**

---

[279] "ئەنوەر جوندی" لە کتێبی "نوابع الفکر الاسلام ل(٣٩٥ ـ ٣٩٦)"دا کورتەی ڕاوبۆچوونی (ابن خلدون) لەسەر مەدەنییەت باسدەکات و ئەڵێ: ئیبن خەلدون لە (المقدمه)دا باس لەوە دەکا کە ـ مەدەنییەت ـ لەسەر چەند بنەمایەك ئەوەستێ:

١ـ ئەبێت (شارو لادێ) هەبێت. ٢ـ لادێ بناغەی مەدەنییەت دائەنێت. ٣ـ لادێ هەمیشە دەرمارگیرن. ٤ـ دەرمارگیری هەمیشە سەربەخۆیی لەگەڵدایەو کە ئەو نەما ئەمیش نامێنێ. ٥ـ لادێ سەرچاوەی جووڵەو چالاکییە ئەوەش سەرکەوتن و داگیرکردن ئەخوازێ. ٦ـ دروستبوونی مەدەنییەت لانی کەم (چل) ساڵی ئەوێ. ٧ـ فاکتەری دین یان (سیاسەت) مەدەنییەت دروست ئەکات. ٨ـ هەر میللەتێ کە ئەکەوێ (بێگومان) ئەوە هێزی (مەعنەوی) یان دەمارگیری بێهێز بووە تیایاندا. ٩ـ خەڵکی "ژێر دەست" هەمیشە تینووی ئەوەیە چاو لە داگیرکەرەکەی بکات لە (جلوبەرگ)و (بەها)و (عادەتەکانیان)دا. ١٠ـ هەر میللەتێك بوو بە موڵکی غەیری خۆی زۆر نابا ئەتوێتەوە. ١١ـ ئەو شوێنانەی کە "فرەدین"و "فرە نەتەوەن" زۆر دەگمەن دەوڵەتیان تێدا دروست ئەبێت. ١٢ـ مەدەنییەت لەسەر دەسەڵاتی حکومەتەکان نەوەستێ، تا دەوڵەت بەهێزتربێ مەدەنییەتەکە زیاتر دەمێنێتەوە. ١٣ـ سەرکەوتنی (مەدەنییەت) بەسەر میللەتی زۆرترو بەهێزتردا بە (دەستڕۆیشتوویی) ئەبێت نەك بە (زۆرانبازی).

[*] لە ساڵەکانی (١٩٧٨)ەوە بە دواوە حزبی بەعس بڕیاری ئەوەیدا کە لادێکانی کوردستان ڕابگوازرێتە شارو کۆمەڵگەی زۆرە ملێ، ئەمە بوو بە بڕیارو بەرنامەڕێژی بۆ گواستنەوەی لادێکان کراو، بە بەرانبەرییەوە قەرەبوویەکی (موغریی)شیان دا بە خەڵکەکە، بەڵام زانایانی ئابوریی و کۆمەڵناسی عێراقی دیراسەیەکی ئەو زیانانەیان کرد کە لە نەمانی لادێوە ئەکەوێتەوە، بۆیە خێرا (سەدلم حسەین) یان ئاگادارکردەوەو پێیان وت: "ئەو بڕیارە زیانی زۆر بەحوکمەت و وڵات ئەگەیەنێت بەتایبەتی لەڕووی ئابوریەوە .. سەدامیش قەناعەتی کرد بە لێکۆڵینەوەکەیان، بەڵام بە حوکمە ملهوڕیەکەی ووتی: مادامێك مەسەلەکە بووەتە بڕیار ئەبێ جێبەجێ بکرێت ئەگەر زیانەکانی لەوە گەورەتریش بێت کەئێوە باسی دەکەن چونکە پەشیمان بوونەوە لەبڕیاری خۆت زیانێکی گەورەیە !...ئەوە بوو عێراق بوو بە (قوربانی) ئەو سیاسەتە فاشیلانەی سەدلم و داروودەستەکەی و هەر عێراقیش بوو بەپردێك بۆ گواستنەوەی هەرچی پلانی جەهەنەمی هەیە لەئیسلام و ئوممەتی ئیسلامیی و سەروەت وسامانی وڵاتانی ئیسلام .. بەدوایدا شەڕی عێراق ئێران، پاشان شەڕی عێراق کوەیت، پاشان شەڕی عێراق ئەمریکا و خواش ئەزانێ شەڕی عێراق و کوێی تریش کەی ڕوو ئەدات .

**. له ڕۆژهه‌ڵاته‌وه گه‌یشته هندستان.**

**. له باكورو ڕۆژئاواوه گه‌یشته ئاسیای بچوك‌و ئه‌رمه‌نستان‌و ئازه‌ر بایجان‌و ده‌ریای ناوه‌ڕاست.**

**. له‌ولایشه‌وه (دیاره مه‌به‌ستی باشووره)، میسرو ولاَتانی سه‌رووی ئه‌فریقیا كه‌وتنه ژێر كۆنترۆڵی ده‌وڵه‌تی خه‌لافه‌ته‌وه"[٢٨٠] (واته خیلافه‌ته‌وه).**

**ئابووری كۆمه‌ڵگای ئیسلام (واته كۆمه‌ڵگه‌ی ئیسلامی): "سوودی زۆری له شارستانێتی هه‌مه‌چه‌شنه‌ی گه‌لان وه‌رگرت‌و بووه خاوه‌نی سه‌روه‌ت‌و سامانی گه‌وره"[٢٨١].**

**. "فرانبونی قه‌ڵه‌مڕه‌وی ئیسلام له سه‌رده‌می ئه‌مه‌وییه‌كانداو پاشان عه‌باسییه‌كاندا ده‌وڵه‌تی ناچار كرد بایه‌خێكی زۆر به‌ڕێگای بازرگانی بدا، یانی هه‌م چاكی بكاو هه‌م بیپارێزێ"[٢٨٢].**

**. "ئه‌مه‌وییه‌كان له‌مه‌ڕ پرۆسه‌ی بازرگانی سیاسه‌تێكی ئاوه‌ڵایان گرته به‌ر، ده‌وڵه‌ت نه‌یده‌ویست ده‌ست له كاروباری بازرگانی وه‌ربدات، كڕین‌و فرۆشتنی كالای هه‌مه چه‌شن‌و ئاڵوگۆڕی كه‌لوپه‌ل پرۆسه‌یه‌كی بازرگانی بووه‌و په‌یوه‌ندی به بازرگانانه‌وه بووه‌و به‌س"[٢٨٣].**

**. "مێژوونوسێكی ئیسلام (مه‌به‌ستی مێژوونووسێكی ئیسلامییه) ده‌ڵێت: كه داوایان له خه‌لیفه كرد نرخی كه‌لوپه‌ل دابنێ، وتی: ئه‌وه كاری ئێمه نییه، نرخی شتومه‌ك لای خوایه"[٢٨٤].**

**. "ده‌وڵه‌تی ئه‌مه‌وی ڕێژه‌ی (١٠٪)ی قیمه‌تی كه‌لوپه‌لی له بازرگانی بیانی وه‌رده‌گرت‌و (٥٪)ی له "ئه‌هلی زیمه"و له بازرگانی موسڵمانان"[٢٨٥]. هه‌رچه‌نده ئه‌مه گومرگه‌و ته‌نیا له كه‌سێك سه‌نراوه كه سه‌رمایه‌كه‌ی نزیكه‌ی(٥٠ – ٦٠) هه‌زار دیناری سویسری بووبێت وه‌ك له پێشه‌وه باسمان كرد.**

**. "دامه‌زراندنی دام‌و ده‌زگای ئیدارییو به عه‌ره‌بی كردنی نووسین‌و تۆماره‌كان، ئه‌وانه وه‌ڵامدانه‌وه‌ی پێویستییه‌كی مێژوویی بوون له واقیعی كۆمه‌ڵگای نوێدا"[٢٨٦].**

**. "ده‌وڵه‌ت ناچار بوو كه بیر له دراوی سه‌ربه‌خۆی ئیسلام بكاته‌وه"[٢٨٧]، چونكه وه‌ك نووسه‌ر ئه‌ڵێت: "نه‌بوونی دراوی سه‌ربه‌خۆ یانی نه‌بوونی سه‌ربه‌خۆیی سیاسی"[٢٨٨].**

**. "بانك.. به شێوه‌یه‌كی سه‌ره‌تایی دامه‌زرا"[٢٨٩].**

---

[٢٨٠] كۆمه‌ڵگا، ل٤٦.

[٢٨١] كۆمه‌ڵگا، ل٤٧.

[٢٨٢] كۆمه‌ڵگا، ل٤٨.

[٢٨٣] كۆمه‌ڵگا، ل٤٨.

[٢٨٤] كۆمه‌ڵگا، ل٤٨. له فه‌رهه‌نگی سیاسیدا زاراوه‌یه‌ك هه‌یه به‌ناوی (حرب الأسعار) واته: شه‌ڕی نرخه‌كان، بریتییه له هه‌ڵبه‌زو دابه‌زی نرخه‌كانی ناو بازاڕ به شێوه‌یه‌كی خێراو نا جێگیر، له‌و ده‌وڵه‌تانه‌دا كه خاوه‌نی سیسته‌مێكی ئازادن له بازرگانیدا، ده‌وڵه‌ت بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و نرخه بخاته‌وه باری جێگیر به چوار ڕێگه ئه‌و كاره‌ی بۆ ئه‌كرێت: نرخی ئیلزامی دابنێت بۆ شتومه‌كه‌كانی بازاڕ دووه‌م: به ڕاسته‌وخۆ بچێته ناو (عرض) و (طلب)و كاریگه‌ری دابنێت له سه‌ری (بۆ نموونه كالاّ زۆر بكات تا داوا له سه‌ری كه‌م بێته‌وه). سێیه‌م: به ناڕاسته‌وخۆ كاریگه‌ری دابنێت به‌وه‌ی سزا بخاته سه‌ر ئه‌وانه‌ی كه یاری به نرخه‌كان ئه‌كه‌ن. چواره‌م: به ڕاسته‌وخۆ كاریگه‌ری دابنێت به‌وه‌ی نرخی (پاره) دیاری بكات‌و عومله‌ی تازه بخاته ناو خه‌ڵك، له ئیسلامدا دووڕا هه‌یه" له باری سروشتیدا بازاڕ ئازاده، به‌ڵام ئه‌گه‌ر خه‌ڵكی به‌رچاوته‌نگ له بازاڕه‌كاندا زۆر بوون، ئه‌وه ده‌وڵه‌ت بۆی هه‌یه نرخ بۆ شتومه‌ك دیاری بكات، بۆ درێژه‌ی ئه‌ویان سه‌یری (الموسوعة السياسة، ل ٢١٦). بكه . بۆ ئه‌مه‌یان سه‌یری (مدخل الى دراسة الشريعة الأسلامية، د. عبدالكريم زيدان).

[٢٨٥] كۆمه‌ڵگا ل٤٨.

[٢٨٦] كۆمه‌ڵگا، ل ٤٩.

[٢٨٧] كۆمه‌ڵگا، ل ٤٩.

[٢٨٨] كۆمه‌ڵگا، ل ٤٩.

[٢٨٩] كۆمه‌ڵگا، ل ٤٩.

. کڕین‌و فرۆشتنی (بە حازر)و (بە قەرز) لە بازاڕەکاندا هەبوو، بەڵام نووسەری ناوبراو ئەو مەسەلە خراپ ئەکات‌و ئەڵێت: "جیاوازی نێوان نرخی بازاڕو نرخی فرۆشتن، سودێك بوو لە بریتی ماوەی قەرزەکە، لە کڕیار وەردەگیرا"[٢٩٠].

. "دەوڵەت.. هانی بازرگانیشی ئەدا برەو بە کارەکەی بدات‌و جار جاریش پارەو پووڵی دەدانێ"[٢٩١].

. "دەرهێنانی میتاڵ ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەبووە"[٢٩٢].

. "لە بنیاتنان‌و ڕێکخستنی شاری تازەشدا نە ئەکرا دیاردەی بازرگانی‌و ئاکامەکانی فەرامۆش بکرێ"[٢٩٣]. بۆیە لە هەموو شارێکدا شوێنی تایبەت بۆ پێڵاو دروەکان هەبووە، بۆ مزگەرەکان، بۆ خومفرۆشەکان‌و بۆ.. بۆ.. هەبووە، بە زاراوەی تازە ئەوترێ (بازاڕی دۆلار، ناوچەی پیشەسازی، (المنطقة الصناعية).. هتد)، نووسەر دەڵێ: "ڕۆژێکی تایبەت هەبووە بۆ کردنەوەی بازاڕێکی تایبەت، بە کاڵایەکی تایبەتەوە"[٢٩٤].

. بەکارهێنانی "شیك" داهات: لە بری پارەوپوول "شیك" بەکار دەهێنراو.. موچەی کارمەندو فەرمانبەرو سوپای دەوڵەتیش هەر بە (شیك) خەرج دەکرا"[٢٩٥].

داهێنانی سیاسەتی قەرزدان بە دەوڵەت لەلایەن سەرمایەدارو پیاوە دەوڵەمەندەکانەوە "پرۆسەی قەرزدان بە دەوڵەت هەم قەیرانی دارایی دەوڵەتی پێ چارەسەر ئەکراو هەم بازرگانی خاوەن پارەشی سوودمەند ئەکرد"[٢٩٦]. فوئاد میسری ئەمەش خراپ ئەکات‌و ئەڵێت: "گوایە کە بازرگانەکان (سوو)یان ئەخستە سەر پارە قەرزەکە!"، نازانم کێ لەو کاتەدا توانیویەتی (سوو) بخوات بەو ئاشکرایەی لەگەڵ بوونی ئەو دەسەڵاتە زۆرەی زانایان‌و موجتەهیدان هەیانبووە هاوکات لەگەڵ ئەو سەربەخۆییەی کە "قەزا" هەیبووە لەو هەلومەرج‌و سەردەمەدا کە خەلیفە بەو هەموو دەسەڵاتەی هەیبووە نەیتوانیوە باز بەسەر فەتوایەکدا بدات کە ژنهێنانە بەسەر ژنەکەی تریدا هەر لەبەر ئەوەی بەوەعدی ئەوەی دابووی ژنی بەسەردا نەهێنێت، لە کاتێکدا بە ئاسانی ئەیتوانی ڕێگە بۆ ئەو حەزە غەریزییەی خۆی بکاتەوە.. بەڵام دیارە (فەتوا) دەسەلأتێکی گەورەی هەبووە لەو کاتەداو ئاسان نەبووە باز بدرێت بەسەریدا، ئەی چۆن ئەم سوو خواردنە کە گوناهێکی گەورەو ئاشکرایە بازی بەسەردادراوە؟ دیارە ئەمە گوازراوەیەکی کۆڵەوارو سەقەتە..

. "پەیوەندی پتەوی بازرگانی‌و پەرەسەندنی پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردنی کاڵای هەمەچەشن لەگەڵ وڵاتێکی گەورەی وەك "چین" بازرگانی مسوڵمانی والێکرد هەوڵ بدەن شوێن‌و ڕێ‌و جێی تایبەتی دەستنیشان بکەن"[٢٩٧]. "چوون‌و گەڕانەوە بۆ (چین) ساڵو نیوێکی خایاندووە"[٢٩٨]. "نەك ئەمە بەڵکو هەموو سەرزەمینی ئەو کاتە بە بازرگانی بەسرانەوە بەیەکەوەو کاڵا و شمەك لەنێوانیاندا ئاڵوگۆڕی ئەکرد"[٢٩٩].

. بازرگانی لە دونیای ئیسلامدا ئەوەندە گەشەی کرد توانی لە ماوەیەکی کەمدا کۆنترۆڵی بازاڕەکانی نێودەوڵەتی بکات بە دوو ڕێگە" یەکەمیان: بەدراوەکەی، دووهەمیان: بە ئسلوبی ئیشکردنەکەی.. فوئاد میسری ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: "دراو.. لە بازاڕی ناوخۆو دەرەوەدا متمانەی وای پەیدا کرد لە ناوەڕاستی سەدەی دەیەمی زایینیدا بووە دراوێکی نێودەوڵەتی‌و هیچ دراوێکی دی بەربەرەکانی ئەوی پێ نەئەکرا"[٣٠٠].

---

[٢٩٠] کۆمەڵگا، ل ٤٩.

[٢٩١] کۆمەڵگا، ل ٥٠.

[٢٩٢] کۆمەڵگا، ل ٥٠.

[٢٩٣] کۆمەڵگا، ل ٥٠.

[٢٩٤] کۆمەڵگا، ل ٥٠.

[٢٩٥] کۆمەڵگا، ل ٥١.

[٢٩٦] کۆمەڵگا، ل ٥٢.

[٢٩٧] کۆمەڵگا، ل ٥٣.

[٢٩٨] کۆمەڵگا، ل ٥٣.

[٢٩٩] کۆمەڵگا، ل ٥٣.

[٣٠٠] کۆمەڵگا، ل٥٢.

. "گۆڕینەوەی کەلوپەل بە کەولوپەلی تر (المقایضة).. ئەم شێوە بازرگانییە زۆر تر لەگەڵ دانیشتوانی ئەفریقادا کراوەو ئەوانە نەدرهەمو نە دیناریان لە بازرگانان وەرنەگرتووە"[301].

لەم چەند دەقە کەمەوە کە لە کۆمەڵگەی (فوئاد میسری)یەوە دەق بەدەق وەرمانگرتووە چەند حەقیقەتێکی تێدا بەرجەستە ئەبێت:

یەکەم: دەوڵەتی ئیسلامیی ئەوکاتە – لەبواری ئابووریداو تایبەت لە بازرگانیدا – خاوەنی چوار پایەی بەرزو قایم بووە:

١. بوونی دراوی بەهێزو سەربەخۆ.

٢. بوونی بازاڕی ئازاد.

٣. بوونی "بانك"و "شیك".

٤. سیاسەتی قەرزدان بە بازرگانەکان لەلایەن دەوڵەتەوەو بە پێچەوانەشەوە.

دووهەم: پتەوکردنی پەیوەندی لە ڕێی بازرگانییەوە بە "دەوڵەتان"و "میللەتانی" تری دنیاوە.. کە ئەوە بوو لە پاشاندا زۆرێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵات لەڕێگەی بازرگانە مسوڵمانەکانەوە هاتنە ناو ئاینی ئیسلام بەبێ ئەوەی سوپای فتوحات چوبنە ناویانەوە، دیارە دوو شت زۆر کاریگەری هەبووە لەسەر ئەم مسوڵمانبوونە:

أ. ڕەوشت بەرزیو دەستپاکی ئەو بازرگانە مسوڵمانانە لە مامەڵەو کڕینو فرۆشتندا.

ب. گەشتی زۆری ئەو بازرگانانەو مانەوەیان بۆ ماوەی زۆر لە ناویاندا.

سێیەم: هەڵسوڕێنەرانی دەوڵەتی خیلافەت خاوەنی چەند بیرکردنەوەی گەورەی دەوڵەتی بوون، بەو "بیرکردنەوە"و ""عەقڵیەتە دەوڵەتیانەوە" توانیویانە ئیدارەی ئەو ئیمپراتۆریەتە فراوانە بدەن، لەو سیاسەتانە:

. دروستکردنی شاری تازەو دانانی شوێنی تایبەت بۆ بازاڕو دەزگاو دوکان..

. دروستکردنی دەزگای ئابووری وەك "بانك"و دانانی "شیك"ی بانکی.

. داهێنانی شێوازی قەرزدان بە دەوڵەتو قەرزکردن لە دەوڵەت، کە لەلایەك هێزە ئابورییەکە چالاکتر دەکاتو لە لایەکیش پەیوەندنی نێوان (دەوڵەت)و (میللەت) بەهێز ئەکات، نەك ئەمیان لە کەمیندا بێت بۆ ئەویان!

. پێڕەوکردنی سیاسەتە ئابوورییەکان لە بازرگانیدا وەك "شێوازی (موقایضە)"و بەکارهێنانی "شیك"و "سەنەد"..

فوئاد میسری دەڵێ: "مێژوو نووسێك ئەڵێ: بە چاوی خۆم شیکێکم دیوە لە شێوەی قەرزا، بەناوی موحەممەدی کوڕی سەعدونی باودەغشت –ەوە کە بازرگانێکی مەراکیشی بوو، چلو دوو هەزار دیناری تێدا تۆمار کردبوو، بۆ دڵنیاییش چەند شاهید مۆریان کردبوو"[302].

. پەیوەندکردنی بازرگانی میتاڵو کانزاکان ڕاستەوخۆ بە دەوڵەتەوە، هەرچەندە مافی "تەنقیب کردنی ئەدرا بە چەند کەسێك کە نووسەری کۆمەڵگە لە (ل ٥٠)دا باسی ئەکات".

فوئاد میسری دەربارەی کاری پیشەیی لە دەوڵەتی خیلافەتدا ئەڵێ:

. "هێشتا (موعاویە) میری شام بوو نەبوو بووە خەلیفەی مسوڵمانان هەوڵیدا یەکەم گەشتیگەلی ئیسلام دروست بکاتو بۆ ئەو مەبەستە پشتی بە پیشەوەرانی ناوخۆ بەست لەسەر ڕێو شوێنی فینیقییەکان کەڵکی لە تەختەی داری "ئورز"ی لوبنانی وەرگرت"[303]. هەر فوئاد میسری دەڵێ: "بەردەوام چەکی نوێ بەکار ئەهێنراو پیشەسازی چەك بەرەو پێشەوە ئەچوو"[304].

---

[301] کۆمەڵگا، ل٥٢.

[302] کۆمەڵگا، ل٥١ ـ ٥٢.

[303] کۆمەڵگا، ل ٥٦.

[304] کۆمەڵگا، ل٥٦.

دیسان دەربارەی سنووری نێوان دەوڵەتە ئیسلامییەکان ئەڵێت: "سنوور لە نێوانیاندا نەماو هەر "سێ" کاری گەورەی ئابووری: پرۆسەی بازرگانی، کشتوکاڵ، کاری پیشەیی، گوڕو گوژمێکی بە تینیان وەرگرت"[٣٠٥].

. "هەر گوزەرێکی تایبەت لە "بەغداد" تایبەت بووە بە پیشەیەك"[٣٠٦].

. "هەر شارو وڵاتێك پیشەیەکی تایبەتی تێدا گەشەی زیاتری هەبوو، بۆ نموونە: لە تەورێز مەڕمەڕ، لە باکوری ئێران خوێو گۆگرد، لە کەرەج نەوتو قیر، دەردەهێنرا"[٣٠٧]، "لە بەغداو سامەڕاو چەند شارێکی دیکە کارگەی سابوونو شووشە دروستکردن دامەزرێنران"[٣٠٨].

. سوود لە هەموو زانیارییەکانی (فیزیك)و (کیمیا)و .. هتد، وەرگیرا وە بۆ پێشخستنی کاری پیشەیی، بۆ نموونە نووسەر خۆی باس لەوە ئەکات کە "لە سەرەتای سەدەی چوارەمی کۆچیدا ئاشتێك نەماوە بە دەست کاری کردبێت"[٣٠٩]. واتە بە (ئاو) یان بە (هەوا) یان بە (دەزگا) کاری کردووە.

. "لە شام بێجگە لە پیشەی چنینو ڕستن، دروستکردنی کاغەزیش پەرەی سەند"[٣١٠].

فوئاد میسری باس لەوەش ئەکات کە لەنێوان هەرێمەکاندا کێبەرکێو مونافەسە هەبووە بۆ دروستکردنی چاکترین کاغەز بەتایبەتی لەنێوان "کاغەزی شام"و "کاغەزی سەمەرقەند"دا.

. هەروەها باس لە دەستڕەنگینی پیشەوەرانی ئەوکاتە دوورە ئەکات-. بەتایبەتی پیشەی چینین - ئەڵێت: "ئەوەندە دەستڕەنگین بوون، دراوی ئاڵتونیان تێکەڵکردووەو بەرهەمەکانیان لە جوانیدا هاوتای نەبووە"[٣١١].

فوئاد میسری لە باسەکە لا ئەداتو ئەڵێت پێشڕەوتی گەورەیی دونیای "پیشە" وای کرد دیاردەی "کۆمەڵەی ڕۆشنبیر"یش بێتە مەیدانو هەنگاوی گەورە بنێن لەوانە، ڕێبازی "قەدەرییە"و "موعتەزلە"و "قەرمەتی"و "ئیسماعیلی"و ئیخوان صەفا[٣١٢].

لەڕاستیدا ئەمانەی فوئاد مەجید ئەیڵێ، دەربارەی ئەو کۆمەڵانە هەندێکی وایەو هەندێکی وا نییەو ئێمە (ان شاء الله) لە بەشەکانی داهاتوودا باس لە هەریەك لەو ڕێبازانە ئەکەینو ئەیسەلمێنین ئەوە چەندی ڕاستەو چەندی ناڕاستە..

ئەمەندە بەس بێت بۆ بەرجەستەبوونی هەندێ لە ڕواڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامییو ئەو ڕواڵەتانەی کە مێژوو نووسەکان باسی دەکەنو فوئاد میسری حەز ناکات خەڵکی بیزانن، چونکە ڕووی گەشی دەوڵەتی خیلافەتو دەوڵەتی ئەفکاری ئیسلامییو مێژووی موسڵمانان دەرئەخات[٣١٣]. بۆیە ئێمە بە چاکی ئەزانین لێرەدا بە کورتی باسی بکەین..

بڕگەی دووهەم: ئەو ڕواڵەتانەی کۆمەڵگەی ئیسلامیی کە فوئاد مەجید میسری باسی نەکردوون لەبەر هۆیەك یان زیاتر

یەکەم: لە بواری مرۆڤایەتیو مافەکانی مرۆڤدا.

دووهەم: لە بواری زانستیو ڕۆشنبیریدا.

سێهەم: لەبواری دیاردە شارستانییەکاندا.

یەکەم: لە بواری مرۆڤایەتیو مافەکانی مرۆڤدا.

---

[٣٠٥] کۆمەڵگا، ل٥٦.

[٣٠٦] کۆمەڵگا، ل٥٧.

[٣٠٧] کۆمەڵگا، ل٥٨.

[٣٠٨] کۆمەڵگا، ل٥٨.

[٣٠٩] کۆمەڵگا، ل٥٨.

[٣١٠] کۆمەڵگا، ل٥٩.

[٣١١] کۆمەڵگا، ل٥٩.

[٣١٢] کۆمەڵگا، ل٥٩.

[٣١٣] سەیری بەشی یەکەمی ئەم کتێبە بکە.

هەرکەس بەویژدانو خوێندەوار بێت کە لێکۆڵینەوە دەربارەی ئیسلام ئەکاتو بەراوردی ئەکات بە سیستەمە سیاسییەکانی ئێستاو مێژووش، ناتوانێت دان بەوەدا نەنێت کە باشترین دەستوورێك کە مافەکانی مرۆڤی هەموار کردبێتو کەرەستەو ئالیەتیشی بۆ دەستەبەرکردنیان فەراهەم هێنابێت تەنیا ئیسلامە!

دکتۆر "سەیران" مامۆستای زانکۆ لە زانکۆی سلێمانی لە ماددەی بڕیاردراودا بۆ پۆلی یەکەمی کۆلێژی "زانستە سیاییەکان"دا ئەڵێت: ".. ئیسلام کە هاتووە بۆ تەواوکردنو کۆتایی هێنان بە شەریعەتە ئاسمانییەکان هاتووە، کۆمەڵێکی زۆریش ڕێنمایی یاسای گرتۆتە خۆی بۆ ڕێکسختنی هەموو کاروبارێکی ژیان لە پێناو دەستەبەرکردنی کامەرانی ڕۆحیو کامەرانی ماددی بۆ مرۆڤ، ئیسلام بەرنامەیەکی تێروتەسەلە بۆ ژیان، لە بناغەدا لەسەر ئەوە ڕائەوەستێت کە ئاکارو هەڵسوکەوتی مرۆڤ ڕاست بکاتەوەو چالاکییەکانی (بیر)و (کۆمەڵایەتی)و (ئابووری) مرۆڤ ڕزگار بکات لە عەبدایەتی کردن بۆ غەیری خوا، تێڕوانینی ئیسلام بۆ ئایینە ئاسمانییەکانی تر زۆر ڕۆشنو گونجاوەو لە سەر ئەوە بینا ئەبێت کە ئەو ئایینانە ڕێزی تایبەتی خۆیان هەیەو دەرگای حیوارو گفتوگۆ ئەکاتەوە لەنێوانیاندا".

(مافەکانی مرۆڤ)و (ئازادییە بنەڕەتییەکان) کە ئیسلام دابینی کردووە، بە هەموو شێوەیەکیش پەرژینی کردووە لە رووی چەند بنەمایەکی ڕۆشنو بەڕاشکاوی کردوونییەتە (واجب)و ئەرکی سەرشانی خەڵکی، ئەمەش چ لە قورئانی پیرۆزو چ لە فەرمودەی شەریفی پێغەمبەردا ﷺ بە ئاشکرا باس کراون، با هەندێکیان باس بکەین:

١. مافی ژیان: ژیان مافێکی پیرۆزە لە ئیسلامدا دروست نییە کەس دەستی بۆ بەرێت بە هەقێکی شەرعی نەبێت، پاراستنی ئەم مافەش لە هەموو قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤدا چوون یەکە، ئەو کاتەی (کۆرپە)ەیەکەو لە سکی دایکیدایە تا ئەو کاتەی کە ئەمرێت، ئیسلام حەرامی کردووە ئەزێتی "کۆرپە" لەسکی دایکیدا بدرێت، یان برسی بکرێت یان لە بارببرێت، خوای گەورە ئەفەرموێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلاَّ أَن تَكُونَ تِجَارَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ وَلاَ تَقْتُلُواْ أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيماً) (النساء: ٢٩).

٢. مافی یەکسانی: ئامانجی بەرزی ئیسلام ئەوەیە کە کۆمەڵگەیەکی دادپەروەر دروست ببێتو ئەمنیەتی خەڵکی تێدا پارێزراو بێتو دابمەزرێتو دڵەڕاوکە نەمێنێ، بێگوێدانە ڕەنگ یان شێوە یان ڕەگەز یان نەسەب یان ئەسڵو فەسڵی ئەو مرۆڤە.

لە ئیسلامدا هەموو خەڵکی یەکسانن لە بەهای مرۆڤایەتییاندا هەروەك چۆن لە مافە مەدەنییەکانو باری بەرپرسیارێتیو پاداشتو.. هتد، یەکسانن.

ئیسلام هەوڵێکی زۆری داوە لە پێناو لابردنو نەهێڵانی ئیمتیازی چینایەتیدا، هەوڵی زۆری داوە کە ئاسەواری ئەو (جیاوازی)یە کەم بکاتەوە، خەڵك زۆر هان ئەدات بۆ ئەوەی کۆیلەبە هەموو شێوەیەك ڕزگاری ببێت، لە جیاتی کەففارەتی هەر گوناهێك مرۆڤ ئەیکات، مامەڵەی جوانو شیرینی بەرانبەریان فەرز کردووە، ڕێزو کەرامەتی پاراستوون.. تەنانەت بەرپاکردنی یەکسانی لە ناو مرۆڤەکاندا ئیسلام بە یەکێك لە کۆڵەکانی ئیمانی داناوە، بەدەر لەوەی کاربەدەستان پابەند ئەبن بەو ڕێنماییانەی ئیسلامەوە یان نا!!

٣. مافی ئەمنیەتی شەخصی..

٤. مافی ئازادی..[٣١٤] دکتۆرە سەیران تێبینییەکی جوان باس ئەکات لەو نووسینەداو بەکورتی ئەڵێ: "گەورەترین کێشەیەك تووشی فیکری ئیسلامیی بووە لەو ڕۆژەوەی هاتووە، مەسەلەی (خیلافەتە) کە بەشێوەیەکی سەرەکیو ڕاستەوخۆ کاریگەری لەسەر ژیانی سیاسییو مەسەلەکانی ئازادییە بنەڕەتییەکانو مافەکانی مرۆڤەوە داناوە.. لەگەڵ ئەوەی کە ئەو ڕووداوە خوێناوییە زۆرەی لەمێژوودا ڕوویداوەو ئازادی مرۆڤو مافی بیرکردنەوەو ڕادەبڕینی تووشی تەنگژە ئەکرد (جارە جارە)و لەمپەرو گرێو پێشێلکاری دروست ئەکرد، بەڵام ئەو هەموو پێشکەوتنە شارستانییەو دەرکەوتنی ناسنامەی ئیسلامیو ڕزگارکردنی فکری ئیسلامی لەو هەموو کۆتو زنجیرەو کردنەوەی دەرگای "ئیجتهاد"و

[٣١٤] مەلزەمەی (مبادئ حقوق الانسان) كلية القانون/ المرحلة الاولى/ ص ٧ ـ ٩.

"قياس" كه له هه‌موو فتوحاتێكدا حزوريان هه‌بووه‌، ئه‌مانه هه‌مووی پێچه‌وانه‌ی ئه‌و چه‌وساندنه‌وه‌و نه‌هامه‌تیانه‌ن كه له‌مێژووی ئیسلامی ڕوویانداوه‌[315].

به‌ڵێ، ئیسلام مافه‌كانی مرۆڤی دیاریكردووه به‌ڵام دیاره به‌و كورتییه نا كه دكتۆره سه‌یران باسی كردووه‌، چونكه ئه‌وه مادده‌یه‌كه بۆ خوێندن و له‌سه‌ر ڕۆیشتن نوسراوه‌و دكتۆره ناچاره به‌كورتی باسی بكات و پاشان مامۆستای وانه پشت به ستوو به سه‌رچاوه‌ی تریش ڕاڤه‌و شه‌رحی له‌سه‌ر بكات و باسه‌كه تێر بكات، ئه‌گینا ئیسلام كه مافه‌كانی مرۆڤ دیاری ئه‌كات له هه‌موو قۆناغه‌كانی (له‌به‌رچاوبوون) یان (له‌به‌رچاونه‌بوون)ی ئه‌م مرۆڤه‌دا ڕێنمایی داناوه‌و له پله‌كانی (فه‌رز)و (سوننه‌ت)دا دای ناون.

١. كاتێك كه هه‌ر نییه‌و نه‌بووه‌، ئیسلام ته‌علیمات دائه‌نێت بۆ كوڕو كچێك كه ئه‌یانه‌وێ ببنه بناغه‌ی ژیان بۆ مرۆڤی تر كه ئه‌بێت "گونجاو بن به‌یه‌كتر، ڕازی بن به یه‌كتر، هاوشان بن به یه‌كتر.. هتد"، چونكه بۆ دوایی ڕه‌چاو نه‌كردنی ئه‌و شتانه ژیانی خۆشیان و منداڵه‌كانیشیان ئه‌خاته مه‌ترسییه‌وه‌و دامه‌زراوه‌ی (خێزان) له‌رزۆك و نائارام ئه‌كات و ئه‌و مرۆڤانه‌ی له‌و لانكه‌دا په‌روه‌رده ئه‌بن، وه‌ك پێویست نابن و خاوه‌ن گرێی ده‌روونی ئه‌بن.

٢. كه ژن و پیاو به‌یه‌ك ده‌گه‌ن پێویسته پێڕه‌وی له هه‌ندێ یاساو ڕێنمایی هه‌یه بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و منداڵه‌ی كه له نێوانیاندا دروست ئه‌بێت به‌شی شه‌یتان و هێزی شه‌ڕی تێدا نه‌بێت یان به‌شێكی كزو بێ كاریگه‌ری بێت و له دوا ڕۆژدا نه‌بێته دڕه‌نده‌یه‌ك له‌ناو كۆمه‌ڵدا، ئیسلام ئه‌ڵێ:

أ. كوڕ با ده‌ست بخاته سه‌ر سه‌ری ژنه‌كه‌ی (ئه‌گه‌ر شه‌وی زاوایه‌تی بێت باشترو باشتره‌)و ئه‌م دوعایه بخوێنێ: "اللهم انی أعیذها بك وذریتها من الشیطان الرجیم" خوایه ئه‌ی په‌رستراوو خۆشه‌ویستی من، ئه‌م ژنه ئه‌خه‌مه په‌ناگای تۆ، تۆش خۆی و منداڵه‌كانی كه پێی ده‌به‌خشی له شه‌یتانی نه‌فرینلێكراو بپارێزه‌.

ب. پێغه‌مبه‌ر ﷺ ئه‌فه‌رموێ: (من اتی امرأته فقال "بسم الله" لم یمسه الشیطان حتی یموت) (رواه البخاري)[316].

٣. پاراستنی كۆرپه‌له له هه‌موو شتێك كه مایه‌ی لاوازكردن یان له باربردنی ئه‌وكۆرپه‌له بێت وه‌ك (برسی كردن، خواردنی مادده‌ی زیانبه‌خش وه‌ك جگه‌ره‌و ده‌رمان و چی و چی..) بۆیه دایك نابێت ڕۆژوی ڕه‌مه‌زان بگرێت كاتێك بزانێ زیان به "حه‌مله‌كه‌ی" ئه‌گات یان نابێت كاری وا بكات كه "حه‌مله‌كه‌ی" له بار بباتو هه‌روه‌ها .

٤. كه له‌دایك ئه‌بێت ئیسلام هه‌موو مافه‌كانی "شیرپێدان، به‌خێوكردن (حضانة)، میراتی بۆ دانان، مووچه‌ی ده‌وڵه‌تی.. هتد" بۆ دیاری ئه‌كات كه ئه‌مانه به‌درێژی له كتێبه‌كانی فیقهی ئیسلامیدا باسی یاساكانیان كراوه‌و پله‌ی "واجبی" یان "سووننه‌تبونیان" دیاری كراوه‌.

٥. بوونی منداڵ ڕووداوێكی ئه‌وه‌نده گه‌وره‌و گرنگه له ئیسلامدا ڕێگه نادرێت كه ئاهه‌نگی بۆ ئه‌نجام نه‌درێت، به‌ڵكو ئه‌بێت "حه‌وتم = عقیقه"ی بۆ بكرێت و ئه‌و ڕێساو یاسایانه پێڕه‌و بكرێت كه ئیسلام دایناوه وه‌ك "سه‌ربڕینی حه‌یوانێك یان دوان، ده‌عوه‌تكردنی ده‌رو دراوسێ، ناونان، سه‌رتاشین، به‌كێشی مووه‌كه‌ی سه‌ری "صدقه" كردن.. هتد"، كه له مێژووی ئیسلامدا جاری وا بووه ئه‌م ئاهه‌نگ گێڕانه گه‌یشتووه‌ته ئه‌وه‌ی كابرا بۆ منداڵێكی لایه‌كی شار یان هه‌موو شاری ده‌عوه‌ت كردووه‌، بۆ نموونه "عبدالرحمن ابن أبي بكرة"ه كه خوا منداڵێی پێدا هه‌موو شاری "به‌سره"ی ئه‌و كاته‌ی ده‌عوه‌ت كردو ڕانێكی گه‌وره‌ی بۆ سه‌ربڕین[317].

---

[315] ده‌قه عه‌ره‌بییه‌كه‌ی مه‌لزه‌مه‌كه ماناكه‌ی وا دێت، به‌ڵام مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه كه‌: "گه‌شه‌ی شارستانی و ده‌ركه‌وتنی ناسنامه‌ی ئیسلامیی و ڕزگاركردنی فیكری ئیسلامی له كۆت و زنجیرو كردنه‌وه‌ی ده‌رگای ئیجتهادو قیاسو به‌رده‌وامبوونی فتوحاتی ئیسلامی.. هتد، ئه‌مانه هه‌موو به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ئه‌و نه‌هامه‌تیانه به‌و شێوه‌یه نه‌بوون كه له مێژوودا باس ئه‌كرێن، چونكه ئه‌وانه ئه‌گه‌ر وابوایه‌، ئه‌بوو ڕه‌وتی شارستانی ئیسلامیان ڕابگرتایه ! كه ڕانه‌وه‌ستاوه دیاره ئه‌و شتانه ئه‌وه‌نده گه‌وره‌نه‌بوون !".

[316] بۆ درێژه‌ی ئه‌و ڕێنماییانه سه‌یری ئه‌م كتێبانه بكرێت: "اداب الزفاف الالباني"، "تربیة الأولاد في الاسلام/ ناصح علوان"، "الطب النبوي/ ابن القیم".

[317] سه‌یری (تربیة الاولاد في الاسلام/ ناصح علوان) بكه‌.

**٦. پاشان لە ئیسلامدا هەموو ئەندامێکی لەشی ئەم مرۆڤە نرخی تایبەتی خۆی هەیەو ناکرێ بە سووک تەماشا بکرێت، بەڵکو لە ئیسلامدا نرخ دانراوە بۆ هەموو پارچەیەکی لەشی ئەم مرۆڤەو "قیصاص"ی بۆ داناوە وەك چۆن قیصاص بۆ "ژیان"ی دانراوە.. قیصاص بۆ "ددان"و بۆ "پەنجە"و بۆ "چاوو قاچو دەستو.. هتد" دانراوەو ئەمەش بە درێژی لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیدا باسکراون و ئایاتو فەرموودەو ئیجتیهادیان لەسەر هێنراوەتەوە.**

**٧. نەك باسی مافەکانی مرۆڤ لە ژیاندا باسکراوە، بەڵکو لە ئیسلامدا باسی "مافەکانی مرۆڤ لە کاتی مردن و پاش مردنیش" کراوە، هەر لە "کفن"و "دفن"و بەرێزەوە بەڕێکردنی و سەرە خۆشی کردن لە کەسوکارەکەی و هاوکاریکردنیان لە بەڕێکردنی میوانەکانیان و نان دروستکردن بۆیان.. هتد.**

**دوای ئەمانەش لە ئیسلامدا باسی چەند شتی تر کراوە کە مافی مرۆڤی مردوون و ئەبێت بەرقەرار بکرێن و نەفەوتێن لەوانە:**

**١. جێبەجێکردنی وەسێتەکانی.**

**٢. دانەوەی قەرزەکانی.**

**٣. باسکردنی چاکەکانی لە ناو خەڵکیدا، تا ڕۆحی ئاسوودە تر بێت. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت (اذکروا محاسن موتاکم فأنهم افضوا الی عملوا)، (الترغیب والترهیب: الامام المنذري).**

**٤. پاراستنی پەیوەندی لەگەڵ دۆستو خۆشەویستەکانی[٣١٨]، پێغەمبەر ﷺ خۆی تا لەژیاندا بوو هەموو دۆستەکانی "خەدیجەی خێزانی" بەسەر ئەکردەوەو لە کاتی خێرکردنیشدا ئەیفەرموو، هاوڕێکانی خەدیجەتان لەبیر نەچێت!!**

**٨. ئیسلام بەدرێژیو بە جیا باس لە مافەکانی "منداڵ" ئەکات، باسی مافەکانی کچ، ژن، دایك بێوەژن ئەکات هەروەها باسی کوڕ، پیاو، پەککەوتە، باوك.. ئەکاتو هەریەکەیان بڕێکی زۆر ڕێنمایی لەسەر هاتووە وەك "ئایەت"و "فەرموودە"و "وتەی زانایان"و.. هتد، کە ئێمە لە کتێبێکی بچووکی وادا ناتوانین درێژەیان بدەینێ، هەروەها لایەنەکانی تری "ئازادی"و "ئەمنیەت"و "یەکسانی" هەر بە هەمان شێوە..**

**بەڵێ ڕاستە ئەو مەلزەمەیەی دکتۆرە سەیران هەقو ڕاستی جوان و زۆری تێدایە، بەڵام وەك وتمان ئەوانە هەموو مەسەلەکان نین لە لایەكو بڕگەو ماددەکانی ئەو مەسەلانەش نین کە باسکراون لە لایەکی ترەوە، بەڵکو لە ماددەکانیشدا زۆرترن و لە بڕگە بڕگەی هەرماددەیەکیشدا زیاترن، بۆ نموونە ئەوەی سەرەوە ئەمەی خوارەوەش ڕاستی ئەم قسەیە دەردەخەن..**

**. مافەکانی موڵکایەتی شەخصی.**

**. مافەکانی نەیاریکردن.**

**. مافەکانی نیشتەجێبوون کە بۆ هەموو کەس هەبووە لەکوێی دونیای ئیسلامدا حەزی کردبێت ماڵی کردووەو نیشتەجێ بووە.**

**. مافەکانی گیانەوەرانی تر (چ بۆ جوانی، یان بۆ سواری، یان بۆ خواردن) بەکار بهێنرێن[٣١٩].**

**ئەمانە وەك تیۆرو پرەنسیپی فیکری، وەك مومارەسەش لە ناو دەوڵەتی خیلافەتدا بە باشترین شێوە مومارەسە کراون، وەك دکتۆرە سەیران بۆی چووە: "ئەگەر لە قۆناغێکی تایبەتی مێژوویشدا کاربەدەستان پێڕەویان لەو پرەنسیپانە نەکردبێت ئەوە (زانایان)و (میللەت) پێڕەوییان لێکردووەو پاراستوویانەو هەر ئەوەش گەورەترین هۆ بووە بۆ ئەوەی ڕەوتی شارستانی ئیسلامی ڕانەوەستێتو بەردەوام هەر بەرەو پێشەوە بڕوات".**

**دووهەم: لەبواری ڕۆشنبیریو زانستیدا**

[٣١٨] بۆ نموونە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (احفظ ود ابيك لا يطفأ الله نورك) پەیوەندی بە خۆشەویستانی باوکتەوە بپارێزە با خوا نورت نەکوژێنێتەوە.

[٣١٩] خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَالْخَيْلَ وَالْبِغَالَ وَالْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لاَ تَعْلَمُون وَعَلَى اللّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ وَلَوْ شَاء لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِين).

کەس نکولی لەوە ناکات کە ئیسلام لە یەکەم ئایەتیدا کە دەستی پێکردووە بە "اقرأ" دەستی پێکردووە، ذکولی لەوەش ناکرێت کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا باشترین ڕێبەرێك بووە پێڕەوی لەو دەستوورە کردبێت، خێزانەکانی فێری خوێندنەوەو نووسین کردووە، ئەسحابی بۆ ئەو مەبەستە هانداوە، لەسەردەمی خۆیدا "نۆ" مزگەوت بووە لە "مەدینە"دا، هەر نۆکەی جمەی هاتووە لە دەرس و دەورو قورئان خوێندندا[320]، هەر سەحابەو ئیشێکی هەبووە لە مزگەوتدا، یەکێك تایبەت بووە بە خەتخۆشی و نووسین و فێرکردنەوەو یەکێك تایبەت بە قورئان وتنەوەو پێ لەبەرکردنەوەو یەکێ ئەحکامی حەڵاڵ و حەرام و یەکێ دەرس وتن بە غەریبی تازە هاتووی نێو مسوڵمانان.. وە هەروەها.

لەناو تابعینیشدا بزاڤی زانست و زانیاری لە بزووت و گەشەی بەردەوامدا بووە (عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاس)ئەچێتە شارێك و سەیر ئەکات گەنجان دووریان گرتووە پیرەکان سەریان کردووە بەیەکداو باسی زانست و زانیاری و حیکمەت دەکەن، ئەفەرموێ: ئەی ئەو گەنجانە بۆ نزیك ناکەنەوە لە خۆتان؟ ئەڵێن: ئەوانە جاری منالْن! ئەویش ئەفەرموێ: "(كَذَلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ اللَّهُ عَلَيْكُم)[321]. ئێوەش پێشتر وەك ئەوان بوون خوا منەتی کرد بەسەرتاندا، لە پێغەمبەرم بیستووە کە ئەیفەرموو: (لايزال الله يغرس لهذا الدين غرسا) خوای گەورە بەردەوام نەمام ئەنێژێت بۆ ئەم دینە، نزیکیان بکەنەوە لە خۆتان، ئێمەش منالی ناو سەحابە بووین ئەوەتا ئێستا ڕیشسپی ناو ئێوەین"[322].

پاش (تابعین)یش کە شاگردو قوتابی قوتابیانی سەحابە بوون ڕەوتی زانست و زانیاری هەر بەگوڕ ئەڕۆیشت، ئەوەتا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (رب حامل فقه الى من هوافقه منه) لەوانەیە یەکێك فقهو زانیارییەك هەڵبگرێ و بیگەیەنێتە یەکێکی تر ئەو لە ئەم باشتر لێی حالی ببێ، بۆیە زانایان ئەڵێن: ڕەوتی زانست و زانیاری چ (دینی) چ (دونیایی) بەردەوام لە گەشە کردندایەو نەوەی داهاتوو لە ڕابردوو شارەزاتر ئەبن . بەشێوەیەکی گشتی .، هەر زانایان ئەڵێن: پێویستە دەقەکانی ئیسلام چ (ئایەت) چ (حەدیس) وەك خۆیان بگەیەنرێتە خەڵکی بێ "تأويل"کردن یان (تەحریف) کردن و زۆرکردن لە خۆ بۆ دەرهێنانی ماناو مەبەستیان، چونکە مەرج نییە ماناو مەبەستی ئەو ئایەتە یان ئەو فەرموودەیە لەناو ئەو (بەرەیە)دا بێتە دی، چونکە بەرەی داهاتوو مومکینە جوانترو باشتر لە ماناو مەبەستی ئەو ئایەت و فەرموودانە حالی بن لە بەرەی ڕابردوو.

هەرواش بوو لە دەورانێکی خیلافەتی ئیسلامیدا گەشەی زانست گەیشتە لوتکە لە هەموو ڕەهەندەکانیدا، چ زانستە فەلسەفییەکان و چ زانستە تەجریبییەکان و چ زانستە ئاینییەکان[323].

لەو دەورانەدا کە فیکرەی دانانی "بيت الحكمة"و "حیوای ئەدیان"و "وەرگێڕانی هەموو ئەو کەلتوورانە لە میللەتانی دونیا"وە ماونەتەوە".. هاتە کایەوە، هەر چەندە ئەو زۆر ڕۆچوونەش لە وەرگێڕاندا هەندێکی باش زیانی بە "فیکری ئیسلامیی" و "ئاکاری" کۆمەڵگەی ئیسلام گەیاند، ئەو گەرم و گوڕی و کاریگەرییەی ئیسلام و بیرو عەقیدەی ئیسلامی هەیبوو وەك جاران نەماو کزی ڕووی تێکرد.

"ئیبن روشد"باسی کاریگەری فەلسەفەو ئەفکاری وەرگێڕاو ئەکات و بەراوردێك لە نێوان بەرەی سەحابەو بەرەی دوای تابعین ئەکات و ئەڵێ: "ان الصدر الاول صار الى الفضيلة الكاملة والتقوى باستعمال هذه الاقاويل دون تأويلات فيها.. اما من اتى بعدهم فانهم لما استعملوا التأويل قل تقواهم وكثر اختلافهم وارتفعت محبتهم وتفرقوا فرقا"[324].

---

[320] مباحث في علوم الحديث/ صبحي صالح ـ ص ٣٤.

[321] ئەمە ئایەتێکی قورئانە لە سورەتی (النساء) ئایەتی (٩٤).

[322] الموضوعات الكبرى/ على القارى بتحقيق عبدالفتاح ابو غده، ص ٧٨.

[323] سەیری "تأصيل مناهج العلوم"، أنور الجندي یان (المنهزمون/ يوسف العظم) بکە.

[324] دراسات في الفرق والعقائد الاسلامية/ د. عرفان عبدالحميد. (ص ٦٣) لە "فصل المقال/ ابن رشد ـ ص ٢٣" وەریگرتووە.

واته: بەرەی یەکەمی ئیسلامیی بەرەو ڕەوشت بەرزی تەواوو خواناسینی ڕاستەقینە ئەڕۆیشتن چونکە کاریان بەو دەقانە ئەکردو (تەئویل)یان نەئەکرد، بەڵام ئەوانەی دوای ئەوان هاتن کە دەستیان دایە (تەئویلکردن)، لە خوا ترسانیان بەرەو کزی ڕۆیشتو جیاوازی کەوتە ناویانو خۆشەویستییان بۆ یەکتر نەماو گروپ گروپ لێی وەستانەوە.

مێژوونووسێکی گەورەی وەك (شێخ محمد خضری بگ) لە کتێبی (محاضرات في تاريخ الامم الاسلامية) بەرگی دووهەم (الدولة العباسية)دا ئەڵێ: "لەم مێژووەدا باسی بزاڤی زانستیم نەکردووە. لە دەورانی خیلافەتدا. چونکە بە نیازم ئەوە لە چەند وانەو موحازەرەیەکی تایبەتدا بەناوی مێژووی ئیسلامیی زانستی (تأريخ الاسلام العلمي) گشتی باس بکەم، لەبەر دوو هۆ: یەکەم: بوونی پەیوەندی پتەویان بەیەکەوە. دووهەم: هێزی ئەو بزاڤە زانستییە پەیوەندی نەبووە بە هێزی دەوڵەتی عەباسییەوە، چونکە لە سەردەمی "ئالی سەلجوق"دا دەوڵەتی عەبباسی ئەوەندەش بێهێز بوو بوو هەر بەناو مابوو، کەچی بزاڤی زانستی لەوپەڕی هێزو گەشەکردندا بوو"[٣٢٥]، ئەمەش ڕاستی قسەکەی سەرەوە دەردەخات کە شارستانی ئیسلامیی ڕانەوەستاوە لەبەر هەندێ شەڕو شۆڕی لابەلا کە زۆرجار دەستی ناحەز هەڵیگیرساندووە.

سێهەم: لەبواری دیاردە شارستانییەتەکاندا

ئەو کێشە گەورانەی ئەمڕۆ مرۆڤایەتی پێوەیان ئەناڵێنێ، ئیسلام لە دەورانی خۆیدا هەموویانی چارەسەر کرد، چ ڕوانین بۆ دینەکانی تر "دانراو بێت یان ئاسمانی" چ کێشەی کەمە نەتەوەکانو چ کێشەی کۆیلە کە لە پاشاندا باسی ئەکەین چ کێشەی دابەشکردنی سەروەتو سامانو چ کێشە زۆرەکانی دونیای ئافرەتو منداڵو پیرو پەککەوتەو منداڵی دۆزراوەو گیانلەبەری بێخاوەنو .. هتد، جا با بەچەند بڕگەیەك ئەمانە باس بکەین وەك نموونە:

. یاساو ڕێنمایی دانراوە بۆ چۆنێتی دروستکردنی خانووبەرە بەو شێوەیەی کە ئازادی لە دەرو دراوسێ نەگرێ، ئەگەر کەسێکیش خانووی بەرزتری کرد بەسەر دراوسێکەیدا ئەیڕوانیی ئەوە پێویستە "ستارە"ی بۆ بکات، تا دراوسێکانی بە ئازادی دەرو ماڵ بکەن.

. یا لەو ڕۆژانەدا "هوتێل"و میوانخانە نەبووە، بەڵام ئیسلامو دەوڵەتی ئیسلامی یاسای داناوە بۆ میوانداریو شەوو ڕۆژێکی بە (واجب)و "سێ شەڕوو ڕۆژی بە (سوننەت) داناوە"، بۆ ئەوەی لەلایەك پەیوەندی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە پتەو بکاتو لەلایەکیش کەس ئیشی ڕانەوستێو ناچاری ئەوە ببێت یان خۆی بخواتەوە لە بێڕەحمی خەڵك یان ناچاری مانەوە بێت لە دەشتو چۆڵەوانیداو بکەوێتەوە بەر گریمانی ڕووتکردنەوەی لەلایەن چەتەو ڕێگرەوە.

. فیکرەی "حیواری ئەدیانو شارستانێتییەکان"و "حیواری مەزهەبەکانی ناویەك دین" دروست کرا تا بتوانرێت ئولفەتو شەرعییەت بۆ یەکتری دروست ببێت نەك لە کەمین وەستاندا بۆ یەکتری، کە خەلیفە مەئمونی کوڕی هاروونە ڕەشید بە ڕێبەرو خاوەنی ئەم بیرۆکەیە دائەنرێت.

. شەفافیەت لە "حوکم"دا "عەدل" لە قەزاوەتداو "ئازادی" لە فتوحاتداو "ڕەفاهیەت" لە وڵاتداو "ئاوەدانی تەمەدون" لە تەواوی هەرێمەکاندا، گەورەترین سیمای دیاری دەوڵەتی خیلافەتن..

. دروستکردنی خەستەخانەو وەزارەت بۆ کاروبارە جیاجیاکان: دیوانی جوند، دیوانی مەزاڵمو داد، دیوانی ئاو، دیوانی کۆیلە.. هتد، کە هەریەکەیان تەواوی ئەو کاروبارانەیان پێ ئەسپێردراو ئەبوو "داد"و "یەکسانی" تێدا بەرپا بێت.

. لەناو دەوڵەتی ئیسلامیدا یاساو ڕێنمایی دانراوە، (کاریشی پێکراوە) بۆ چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو وڵاخانەدا کە خەڵکی بۆ (بار) بەکاری دەهێنێ، نابێ لەبەر تەماعی خۆی زۆری لێ بکاتو زیاد لە توانای خۆی باری لێ بنێ، بەڵکو ڕێژەو کێشی تایبەتی دانراوە بۆ بارو سزاش دانراوە بۆ هەرکەسێك ئەزیەتی وڵاخەکەی ژێری بدات[٣٢٦].

. لەماڵی زەکات "پارەو خزمەت" تایبەتکراوە بەو ئاژەڵو گیانەوەرانەی کە بەرەڵڵا ئەکرێنو کەسیان نییە خزمەتیان بکاتو تەنانەت "وەقفی" تایبەتیان بۆ دانراوە، وەك وەقفی تایبەت دانراوە بۆ کڕینی خواردن بۆ ماسی ناو دەریاکان!!.

---

[٣٢٥] محاضرات في التأريخ الشعوب الاسلامية (٣/٢).

[٣٢٦] بۆ شارەزایی زیاتر سەیری (تأريخنا المفترى عليه) (د. يوسف القرضاوي) بکە.

**. بەسە بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی کە لە منالّی سەر بێشکەوە (مووچە)ی هەبووە تا پیری ناو جێگا، هەر یەکەو بەپێی ژیان و گوزەرانی خۆی، ئەوەبوو "ئەبوبەکر" ئیجتیهادی وابوو کە هەموو هاوولاّتییەك بە یەکسانی (مووچە)ی بدرێتێ، بەلاّم "عومەر" ئیجتیهادی وابوو کە جیاوازی خاوەن فەزڵ و "خاوەن خەبات و سابقە" بکرێت لە خەڵکی تر، چونکە "داد" لەوەدایە!!.**

**. سەربەخۆیی قەزاو مەحکەمەکان و گوێگرتن بۆ هەموو خاوەن هەقێك با دەعوای لەسەر خەلیفەو خەڵکی نزیکی ئەویش تۆمارکردبێت! وەستانی حەزرەتی "عەلی" کە خەلیفەیە لە دادگادا بەرامبەر کابرایەکی "جولەکە"و دانی هەق پێی لەبەر ئەوەی کە "عەلی" کەس شایەتی نەبوو "حەسەن"ی کوڕی نەبێت، قازیش شایەتی کوڕ بۆ باوك وەرناگرێ، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێ : (وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ)، هەروەها دانانی بنەماکانی "مورافەعات"و چۆنێتیی تۆمارکردنی "دەعوا"و هێنانی بەڵگەو شایەت و ئیشکردن بە "قرائن"و پاراستنی مافەکان ئەگەر هی بێهێزترین تاکیش بوو بێت، وەرگرتنەوەی ماف لە گەورەترین بەرپرس ئەگەر داگیری کردبێت لە غەفڵەتێکدا[٣٢٧]. ئەمانە هەمووی ئەو دیاردە شارستانیانە بوون کە لە دەورانی خیلافەتدا داهێنراون و هەرکەس بۆ نموونە کتێبی "من روائع حضارتنا"ی دکتۆر مستەفا سباعی بخوێنێتەوە بۆی دەرئەکەوێت ئەو شارستانییەتەی کە ئیسلام لە مێژوودا دروستیکرد ئەگەر بێ وێنە نەبێت ئەوە زۆر کەم وێنەیە!**

**شارستانییەتێك کە "سەماحەتی ئایینی"و "ئەخلاقی ئینسانی"و "هاوسەنگی و میانڕەوی"و "گەشەی عەقڵی و ڕۆحی" باڵ بکێشێت بەسەریدا ئەبێ چەندە مرۆڤەکان تێیدا ئاسوودە بووبن، "ئەبو حەسەنی نەدەوی" نووسەری گەورەی هیند کتێبێکی بەناوی "ماذا خسر العالم بأنحطاط المسلمين" هەیە باس لەو زیانە گەورانە ئەکات کە "مرۆڤایەتی" لێی کەوت کاتێك ئیسلام دوورخرایەوە لە ئاراستەکردنی خەڵك.**

**بە هەرحاڵ ڕواڵەتەکانی کۆمەڵگەی ئیسلامی تەنیا ئەو چەند شتە نییە کە فوئاد مەجید میسری باسی کردوون، ئەویش بەگاڵتەو توانجەوە، بەڵکو مرۆڤی بەویژدان پێویستە لە هەموو ڕووەکانەوە سەیری ئەو شارستانیەتەو کۆمەڵگای ئیسلامی بکات کە ئێمە لە سەرەتای ئەم بەشەدا چەند وێنەیەکمان بە کامێرەکەی فوئاد میسری خۆی لێگرت و پاشان ئەم وێنانەی تریشمان خستە ڕوو بۆ ئەوەی خوێنەری بەڕێز سەیریان بکات و لێیان وورد بێتەوەو خۆی حوکم بدات، ئایا فوئاد مەجید میسری هەقیەتی کە ئەوەندە بەسووکی سەیری ئیسلام و شارستانێتی ئیسلام و مێژووی ئیسلام بکات یان ناهەقیەتی؟ ئایا ئەو بەویژانە یان (گۆستاڤ لوبۆن)و (فەمبەری)و کێ و کیێی ڕۆژهەلاّتناس و غەیرە دین؟! فوئاد مەجید میسری نەوەك ماڵ وایە نەوەك دەریش وایە، نەوەك ڕۆڵەیەکی مسوڵمان و ئوممەتی ئیسلامیی وایە شانازی بە ئیسلامەوە بکات و بڵێ:ها! ئێمەش هەین و خاوەنی شارستانێتین، نە وەك غەیرە دینەکانیش وایە کە پیاوێکی بەویژدان بێت و بڵێ : ئەوە خاڵی گەشی مێژووی ئیسلامی و ئەوەش خاڵی ڕەش، ئەوە بنەمای مەسەلە ئینسانییەکان لە ئیسلامداو ئەوەش لایەنی "عەمەلی" یان "پێشێلکاری" بۆ ئەو بنەمانە لەمێژوودا.. بەڕاستی خوای گەورە جوان ئەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُونُواْ قَوَّامِينَ لِلّهِ شُهَدَاء بِالْقِسْطِ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلاَّ تَعْدِلُواْ اعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُواْ اللّهَ إِنَّ اللّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ) (المائدة: ٨).**

---

[٣٢٧] نووسینی ئەو هەموو کتێبە لەسەر (حاکم)و (قازییەکان)و مەرجەکانی قەزاوەتکردن.. هتد، شایەتی ئەم باسەن، بۆ نموونە سەیری "تبصرة الحكام في اصول الاقضية ومناهج الاحكام"ی (برهان الدين ابراهيم بن فرحون) بکە، ئەوەشی وای کرد کە "محاکم"و "قەزاوەت" ئەو هەموو گەشەو پێشکەوتن و سەربەخۆیە لە خۆی بگرێت، بوونی ئەو هەموو دەقە ئیسلامییە زۆرەیە لە قورئان و فەرموودەدا کە هانی زانایان ئەدات بۆ کارکردن لەو بوارەدا. بۆ نموونە (إِنَّ اللّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤدُّواْ الأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللّهَ كَانَ سَمِيعاً بَصِيراً) (النساء: ٥٨).

(إِنَّا أَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ النَّاسِ بِمَا أَرَاكَ اللّهُ وَلاَ تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيماً) (النساء: ١٠٥).

(..وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات: ٩)... چ پلەیەك لەوە گەورەترە کە مرۆڤ ببێتە خۆشەویستی خواو لە خزمەت پاراستنی یاساکانی ئەودا بێت و تەرازووی داد ڕابگرێ.

پێغەمبەریش ﷺ لە دەیان فەرموودەدا باسی قەزاوەتی باش و قازی دادپەروەر ئەکات، بۆ نموونە ئەفەرموێ: "اتدرون من السابقون الى ظل الله (عز وجل) يوم القيامة؟ قالوا: الله ورسوله اعلم! قال الذين اذا اعطوا الحق قبلوه، واذا سئلوا بذلوه، و حكموا الناس كحكمهم لأنفسهم" رواه أحمد (المسند: ١٥/٢١١).

ئێوە وەرنە مەیدان‌و ڕاوەستن‌و بۆ خوا شایەتی بە هەق‌و بە داد بدەن.. با ڕقبونتان لە میللەتێك ڕاتان نەكێشێ بۆ ئەوەی بێ ویژدان بن‌و لە "داد" لابدەن، دادپەروەربن، چونكە ئەوە بەرەو لەخواترسانتان ئەبات. دیارە بەهەشتی خواش جێگەی خەڵكی بەویژدان‌و لەخوا ترسە..

فوئاد میسری لەوە ئەچێت بترسێت لەوەی نەوەك یەكێك ئەوە سەرنجی ڕابكێشێت كە چۆن لەو چەرخە سەرەتاییانەدا توانراوە "كاغەزو شووشەو قیرو.. هتد" بەرهەم بهێنرێت، یان چۆن توانراوە ئەو تۆڕە فراوانە لەو ڕۆژەدا لە پیشەو پیشەسازی لە هەموو دنیادا دروست بكەن! یان چۆن توانراوە ئەو كارگە گرنگانە دروست بكرێت كە هەر خاوەن پیشەیەك جۆرێك لە پسپۆڕی تێدا جێبەجێبكات.. بۆیە بە پەلە بەدوای ئەوانەدا ئەڵێ: "بەشێكی زۆری پیشەوەران لەو كارگە دەستیانەدا كاریان ئەكرد كەموڵكی خەلیفە بوون.. ئەو كارگانە ناوی (بیت الطراز)یان لێ نرابوو، كارمەندێكی دەوڵەتی بەڕێوەی ئەبرد پێی ئەوترا (صاحب الطراز)، بەرهەمی ئەم كارگانە ئەوەندەی دەربار پێویستی بوایە وەری دەگرت‌و ئەوەشی دەمایەوە لە بازاڕدا دەفرۆشران‌و قازانجەكەی دەدرا بە خەلیفە"[٣٢٨]. هەرچەندە فوئاد میسری باس لە دوو جۆر كەرت ئەكات: كەرتی گشتی و كەرتی تایبەتی‌و ئەو جۆرە كارگانە بە كەرتی گشتی ناوزەند ئەكات[٣٢٩]، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو فریاكەوتن‌و پەلاماردانەی سێ چوار ناحەقی تێدایە:

١. ئەو گەشەسەندنەی كاری پیشەیی ناگونجێ لەگەڵ ئەو زوڵم‌و ناهەقییەی كە ئەو ئەیەوێت بیداتە پاڵ دەسەڵاتدارو هەڵسوڕێنەرانی ئەو كاتەی دەوڵەت.. ئەوە واقعیش باشترین بەڵگەیە، كام دەوڵەت دەستی دابێتە ستەم‌و ناڕەوایی‌و وڵاتەكەی گەشەی كردبێت!

٢. ئەگەر لە وڵاتدا كەرتی گشتی‌و كەرتی تایبەتی هەبێت، عەیبی چییە كە دەوڵەتی خیلافەت ئەو كەرتە گشتییانەی هەبێت كە لە كۆتاییدا بە قازانجی گشتی تەواو دەبێت‌و لە دەرەنجامیشدا ڕەونەقێكی زیاتر بەو مێژووە ئەبەخشێت‌و بە سەرسامییەوە، نەوەی داهاتوو باسی ئەو گەشە ئابووری‌و مەدەنییە ئەكەن.

٣. ئەوە كەی شایانی ڕەخنەیە؟ فوئاد میسری بڵێ: "ئەوەندە دەربار پێویستی بوایە وەری دەگرت؟!" باشە كابرای پیشەوەر هەقی چییە كە بەرهەمی ئەو كارە كێ ئەیكڕێت‌و لە كوێدا ئەفرۆشرێت.. گرنگ ئەوەیە ئەو مافی ئیشكردنەكەی خۆی وەربگرێت‌و دڵسۆزانە كارەكەی ئەنجام بدات، ئیتر وەكو كورد ئەڵێ: تۆ كاڵەك خۆری یان بێستان ڕن! كەچی فوئاد میسری ئەوە ئەكاتە ڕەخنەیەكی گەورە، وەك ئەوە وایە بڵێی: بەرهەمی كارگەی چیمەنتۆ ـ كە كەرتێكی حكومییە ـ حكومەت ئەوەندەی پێویست بێت بۆ پرۆژە خزمەتگوزارییەكانی یان دەزگاكانی دەوڵەت هەڵی ئەگرتەوەو باقییەكەی تری لە بازاڕدا ئەفرۆشت!!

٤. فوئاد میسری ئەڵێ: "قازانجەكەی بۆ خەلیفە ئەبوو"، نازانم ئەمە كێ وتی وایە؟ نووسەر ئەم قسەیەی لە كتێبی (حەللاج: ل٥٢) ـ بە قسەی خۆی ـ وەردەگرێت!! كتێبی "حەللاج"ی میرفترۆس خاوەنی كتێبی پڕ غەڵەت‌و پەڵەتی "ئیسلام ناسی" كە هەرچی شتی لارو وێری ئەدەبیاتی "شیعە غولاتەكان" هەیە كە لای هەندێك لە خۆشیان بێزراوە، ئەم هێناویێتی‌و بە دەزوویەكی ناسكی بۆن ناخۆش هۆنیویەتییەوە..

ئاخر باسێكی مێژووی ئاوەها پێویست بوو كە تۆ لە سەرچاوەی بنەڕەتی وەری بگریت، واتە لە كتێبی وەك (مێژووی تەبەری) یان (الكامل) یان (البدایة والنهایة).. وەرت بگرتایە نەك "حەللاج: میرفترۆس!" كە ئەگەر خوا یاربێت لە لێكۆڵینەوەیەكی تایبەتدا هەموو كتێبەكانی ئەو زاتە گوماناوییە هەڵدەسەنگێنین‌و نرخی زانستیان دەرئەخەین بۆ تۆو بۆ هەموو خوێنەرێكی ئەم میللەتە، بەڵام هەر ئەوەندە بەسە، ئێستا خوێنەر ئەوە بزانێت "میرفترۆس" زۆربەی سەرچاوە بەكارهاتووەكانی بۆ گشت نووسینەكانی بریتین لە كتێبیی "شیعە توندڕەوەكان" كە بەڕاستی ئەو جۆرە كتێبانە بەتایبەتی بۆ ڕاستكردنەوەی شتی مێژوویی هیچ نرخێكی زانستییان نییەو ئەوانە خۆشیان نایشارنەوە كە بڕوایان بە

---

[٣٢٨] كۆمەڵگا (ل ٦٠ ـ ٦١).

[٣٢٩] كۆمەڵگا (ل ٦١).

**مێژووی ئیسلامی هەر نییەو بەمێژووی خۆیانی نازانن، بەڵكو بەمێژووی دوژمنان و ڕەقیبانی خۆیانی ئەزانن، لەبەر ئەوە، ئەوەی لەو مێژووەدا خزمەت بە هەواو مەزهەبیان بكات ئەیگوازنەوەو ئەوەشی لە مەزهەب و ئارەزوویان بدات باڕیوایاتی مێژووی ڕاستەقینەش بێت، ئەوان نەقڵی ناكەن و چاوی لە ئاستدا دائەخەن و تەفسیری ناڕەوایانەی بۆ ئەكەن، فوئاد مەجید میسری ئاسا بۆ ئەوەی كەس پێی سەرسام نەبێت و پەندی لێ وەرنەگرێت[330].**

**نووسەر دەربارەی كشتوكاڵ لە دەوڵەتی خیلافەتدا ئەڵێت: "دەوڵەتی ئیسلام (ڕاستر ئەوەیە بڵێت دەوڵەتی ئیسلامیی) ڕووبەرێكی فراوانی زەوییە شۆرەكانی چاككردو كردنییە زەوی كشتوكاڵی و جۆگەی هەڵدەبەست و عەمباری ئاوو بەستو سیستەمی ئاودێری دەستكردی بنیات ئەناو ڕاستەوخۆ سەر پەرشتی دابەشكردنی ئاوی دەكردو خەڵكی شارەزایی لەبواری كشتوكاڵدا دەهێناو سوودی لە شارەزاییان وەردەگرت"[331]، كەچی تەفسیری ناڕەوا بۆ وەها كارێك ئەكات و ئەڵێ ئەو كارە بۆیە كراوە تا خەزێنەی دەوڵەت ئاوەدانتربێت! جا باشە كاكە! ئەوەش بوو بە ڕەخنە؟! ئەی باشە خۆ ئەمە "عەبەسییەت" و منالبازاڕ نییە؟ دەوڵەت نەزانێ خەریكی چییە؟ ئێ دیارە ئەو كارە لە چەند ڕووەوە سوود بە "میللەت" و "دەوڵەت" ئەگەیەنێت و ئەبێ هەرواش بێت:**

**. لەلایەكەوە هەزاران خێزان چانسی ئیشكردن لەبەردەمیاندا دروست ئەبێت و لە بێكاری ڕزگاریان ئەبێت، ئیتر وەك "كرێكاری" یان وەك "گواستنەوە" یان وەك "ساغكردنەوەو فرۆشتنی لە بازاڕدا".**

**. لە لایەكیشەوە "تەمەدوون" گەشە ئەكات و ئاوەدانی زۆر ئەبێت.**

**. لەلایەكی تریشەوە دەوڵەت هەنگاو بەهەنگاو بەرەو "خودكەفائی" ئەڕوات و پێویستی بە "هاوردن" نامێنێ، وەك فوئاد میسری باسی ئەكات و ئەڵێ: "ناردن = تصدیر" باوێكی ئەو سەردەمە بووە لە وڵاتێكەوە بۆ وڵاتێكی تر.**

**. هەروەها نووسەر ئەڵێ: "نەورۆزانەو میهرەگانیش كە ئەمەوییەكان سەر لەنوێ زیندوویان كردەوە دەبوو بە دەوڵەت بدرێ"[332]، لە لاپەڕەكانی پێشوودا ئەوەمان باسكرد كە ئەمە ڕاست نییەو بوختانە، هەر فوئاد میسری خۆشی چەند دەقێك ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: "كە ئیسلام هات ئەو باجە ناڕەواییانەی هەڵگرت كە ساسانییەكان لەسەر خەڵكیان دانابوو"، بەڵام لەسەر مەزهەبی "یەعقوبی" هەر بەردێك ئەگرێتە حەزرەتی عوسمان و ئەڵێ: "ئەو زیندووی كردەوەو لە ژێر فشاری خەڵكدا ناچار بوو جارێكی تر ئیلغای بكاتەوە"[333].**

**فوئاد مەجید بە ناڕەوا ئەڵێ: "لە وڵاتانی بە ئیسلامكراودا، ئەگەر جوتیار ببوایەتە موسڵمان لەسەر زەوی یەكەی خۆی بمایەتەوەو بەرهەمی بهێنایە، دەبوو خەراج بدا.."[334].**

**بەڕاستی ئەم ڕستەیەی فوئاد مەجید سێ چوار هەڵەو بوختانی تێدایە:**

---

[330] بۆ نمونە شیعە توندڕەوەكان دوودڵیو گومان دروست ئەكەن لەسەر هاوڕێیەتی ئەبوبەكر بۆ پێغەمبەر ﷺ لە سەفەری هیجرەتدا بۆ مەدینە، چونكە ئەوان قەناعەتیان وایە ئەبوبەكر كافرو مورتەددە، كە هەستیش ئەكەن ئەوە ڕیوایاتی ڕاستەقینەی مێژوو باسی ئەكات و قورئانیش ئاماژەی بۆ ئەكات، "ثاني الأثنين اذهما في الغار" پەنا ئەبەنە بەر تەفسیری ناڕەوا، بۆ نمونە ئەڵێن پێغەمبەر ﷺ بۆیە ئەبوبەكری لەگەڵ خۆیدا برد، چونكە پیاوێكی زۆرترسنۆك بوو ترسا لەوەی لە مەدینەدا جێی بهێڵێ خەبەری لێ بدات!! تەنانەت ئەڵێن كە مێژوو ئەڵێت: لە ڕێگەی هیجرەتدا ئەبوبەكر جارێك لە پێشەوەی پێغەمبەرەوەو جارێك لەدواوەی و جارێك لەڕاست و جارێ لە چەپیەوە ئەڕۆیی ئەوە بۆ پاراستنی پێغەمبەر ﷺ نەبووە! بەڵكو ئەڵێن: ئەگەر ئەو ڕیوایەتە ڕاستیش بێت ئەوە لەبەر ئەوە بووە كە زۆر ترساوەو ڕەوتی لێ تێكچووە، زۆر پێش كەوتووە تا ئەگەر یەكێك بەدوایانەوە بێت پێغەمبەر بگرێت و ئەم فریای هەڵاتن بكەوێ! پاشان بیری كردۆتەوە نەك لە پێشەوە بۆیان بێن، خێرا گەڕاوەتەوەو پێغەمبەری پێش خستووە!! (سیرة المصطفى هاشم معروف الحسيني الشيعي ـ ص ٢٥٦).

[331] كۆمەڵگا (٦٣).

[332] كۆمەڵگا (ل ٦٣).

[333] كۆمەڵگا (ل ٣٥).

[334] كۆمەڵگا (ل ٦٣).

**١. وشەی "بەئیسلامکراودا" هەڵەیەو ڕاستییەکەی "بە موسڵمانکراو" دایەو لەوەش ڕاستتر ئەوەیە بوترێ "لەو وڵاتانەدا کە ئیسلامیان قەبوڵکردووە"، چونکە خەڵك ئەگەر خۆی ئیسلامی قەبوڵ نەکردبێت، ئەوە بەزۆر نەدراوە بەسەریاندا، ئەمەش لە پێشەوە بە درێژی باسمانکردو سەیرە فوئاد مەجید میسری ئەوەندە ئەم هەڵەیە دووبارە بکاتەوە.**

**٢. "ئەگەر جوتیارێك مسوڵمان ببوایە دەبوو خەراج بدات" ئەمە هەقێكو ناهەقییەکی تێدایە هەقەکەی ئەوەیە: خەڵك خاوەنی زەوی‌و زاری خۆی بووەو زەوی هەبووە، کەچی فوئاد میسری لە هەندێ شوێنی کتێبەکەیدا وا وێنەی ئەو ڕۆژانە ئەکێشێت گوایە کەس خاوەنی هیچ نەبووەو زەوی‌و زاری وڵات گشتی هی خەلیفەو کاربەدەستان‌و قەوم‌و قیلەی خۆیان بووە.**

**ناهەقییەکەشی ئەوەیە: کە خەڵك خاوەنی زەوی خۆی بوو بێت، کەواتە زەوییەکەی زەوی "خەراج" نەبووە بەڵکو زەوی "موڵك" بووە، ئیتر خەراجی چی؟! موسڵمان تەنیا دەیەکی زەکاتی دەغڵ‌و دانی داوەو تەواو.**

**٣. کەسێك کە موسڵمان نەبووبێت "جزیە"یەی داوەو لە پێشەوە باسمان کرد، خەراج‌و جزیە شوێنی یەکتریان بۆ "ئەهلی زیممە" گرتۆتەوە، واتە ئەگەر خەراجی دابێت ئەوە لەبری "جزیە"ەکە دانراوە، خۆ ئەگەر موسڵمان بووبێت ئەوە "جزیە"ەکەی لەسەر نەماوەوەو ئەوکاتە ئەگەر خاوەنی "موڵکی خۆی" بوو بێت ئەوە "عوشر"ی داوە وەك زەکات‌و ئەگەر "زەوی خەراج" واتە: "زەوی دەوڵەتی" بەرهەمهێنابێت ئەوە "خەراج" واتە "ساڵانە"ی داوە..**

**٤. شتێکی تر هەیە با بۆ فوئاد میسری ڕاست بکەینەوە "ماوردی شافعی مەزهەب" ئەڵێت: "زەوی خەراج لە دوو ڕووەوە لە زەوی "عوشر" جیا دەبێتەوە: لە ڕووی موڵکییەت‌و لە ڕووی حوکمەوە.."**

**زەوی بە گشتی ئەبێتە چوار جۆر:**

**یەکەمیان: ئەو زەویانەی کە مسوڵمان خۆیان زیندوویان ئەکەنەوەو ئەیکەنە زەوی کشتوکاڵی، ئەمانە زەوی "عوشر"ن‌و بە هیچ شێوەیەك "خەراج"ی ناخرێتە سەر..**

**دووەمیان: ئەو زەویانەی خاوەنیان هەیەو خاوەنەکانیان مسوڵمان ئەبن، ئەمانەش زەوی "عوشر"ن‌و دروست نییە "خەراج"یان بکەوێتە سەر..**

**سێیەمیان: ئەو زەویانەی کە کافر بەجێیان دەهێڵێت‌و ئەکەونە دەست مسوڵمانان ئەوە سێ "ڕا"ی لەسەرە: (شافیعی) ئەفەرموێت: "دەوڵەت دابەشی ئەکات بەسەر موسڵماناندا‌و ئەبنە زەوی "عوشر"و دروست نییە "خەراج"یا بخرێتە سەر، "مالك" ئەفەرموێت: ئەبێتە موڵکی دەوڵەت‌و ئەبنە "زەوی خەراج"و دروست نییە "عوشر"یان بخرێتە سەر"، "ئەبو حەنیفە" ئەفەرموێت: دەوڵەت‌و سەرۆکی وڵات بۆی هەیە کام باریان بە "مەسڵەحەت" ئەزانێ ئەوە بکات..**

**چوارەمیان: ئەو زەویانەی کە بە "سولح‌و پەیماننامە ئەکەوێتە ژێر ئیدارەی دەوڵەتی ئیسلامییەوە ئەوانە زەوی تایبەت بە "خەراج"ن‌و بە پێی پەیماننامەکە مامەڵەیان لەگەڵدا ئەکرێت"[٣٣٥].**

**خوێنەری بەڕێز: ئەوە حاڵی زەوی بوو کە باسمانکرد لە کتێبی متمانەپێکراوو ڕەسەنەوە ئیتر نازانم فوئاد میسری ئەو قسانەی تری لەکوێوە هێناوە، ڕاستە نووسەری کۆمەڵگا بۆ "ئاهی سوێند" ئەوەش ئەڵێت: "هەندێ جار (خەراج) بەو شێوەیە وەردەگیرا کە پێشتر لە کاتی داگیرکردندا هەردوو لا– خاوەن زەوی‌و دەسەڵاتدارانی ئیسلام – لە سەری ڕێدەکەوێت"[٣٣٦]، بەڵام ئەمەیان باسی جۆری چوارەمە نەك هەموو جۆرەکانی زەوی، بۆیە هەق نییە فوئاد میسری "کەشك"و "مەشك"ی لێ ببێتە یەك هەر لەبەر ئەوەی پیتەکانیان لەیەك ئەچن‌و کەشکیش قۆناغێك بەناوی "مەشکە"دا تێپەڕئەبێت..**

**٥. خاڵێکی تر هەیە، فوئاد مەجیدو خوێنەرانیش بیزانن، مەسەلەی زەوی‌و ئیدارەدانی زەوی کارێکە ملکەچە بۆ دوو شت:**

---

٣٣٥ الاحكام السلطانية الماوردى الشافعي، ص١٤٧، قازی فەرائی حەنبەلی"یش لە "الاحكام السلطانية"داو لە (ل ١٤٦)دا بە هەمان شێوە زەوییەکان دابەش ئەکات لەگەڵ هەندێ جیاوازیدا کە ملکەچی ئیجتیهادە.

٣٣٦ کۆمەڵگا (ل ٦٣).

یەکەم: بۆ ئەو "ڕیوایاتو ئیجتیهادانە"ی لەو بارەیەوە هاتوون.

دووهەم: بۆ بەرژەوەندی "دەوڵەت"و "میللەت"ی ئیسلامی وەك تۆزێك لە مەوپێش قسەکەی ئەبوحەنیفەمان هێنا، جا بۆیە هەموو چەرخو سەردەمێك "یاسا"و "ڕێنمایی"ی تایبەتی خۆی هەیە، پێدەچێ ئەو کاتە بەرژەوەندی لەوەدا بوویێت کە بە ئەو جۆرە "سیاسەتە شەرعییە"[٣٣٧] دەوڵەتو کاروبارەکانی بەڕێوەببرێتو ئێستا پێویست بە سیاسەتێکی شەرعی تر بکات، بۆیە دەرگای "ئیجتهاد" لەبەردەم شورای ئیسلامییو دەوڵەتدا کراوەیەو ئەتوانرێت سوودیش لەو "ئیجتهادو ئەحکامە حکومەتیانەی" ئەو کاتە وەربگیرێت.. زانایانیش ئەفەرموون: "كل احد يؤخذ من كلامه ويترك الا المعصومﷺ"، واتە هەموو کەسێك قسەو بیروڕای قابیلە بەوەی وەربگیرێتو بشدرێتەوە بەسەریدا، تەنیا پێغەمبەر ﷺنەبێت"، کەواتە نە ئەو سیاسەتانە هەموویان دینن دروست نەبێت ئیجتهادی تریان بخرێتە جێگە! نە ئەم هەلومەرجەی ئێستای وڵاتانو میللەتانیش وەك ئەوکاتە وان کە بەهەمان سیاسەتو یاساو ڕێسا ببرێن بەڕێوە، زیاد لەسەر ئەمەش بەبێ هودە ئیسلام ڕێگای "ئیقتیباس"و "ئیجتیهاد"ی دانەناوە بۆ مسوڵمانان، بەڵکو بۆ ئەوەیە عەقڵە ئیسلامییەکان لەگەشەکردنی بەردەوامدابن..

* مەگەر هەر لە چۆنێتیی دانانی سەرۆکی وڵاتدا "عەقڵی ئیسلامی" چەند شێوازی دانەهێناوە، بۆ نموونە:

. پێغەمبەری خوا ﷺهەڵبژاردنی نەکرد. نەیەك نوێنەرو نە چەند نوێنەر. بەڵام ئاماژەی دا بە (سەحابە) کە ئەبوبەکر پیاوێکی شیاوە بۆ ڕاوێژپێکردن..

. ئەبوبەکر یەك "کاندید"ی داناو پاشان میللەت هەڵیبژارد.

. عومەر شەش کەسی کاندید کردو پاشان میللەت یەکێکیانی هەڵبژارد.

. حەسەن مەبدەئی "امامة المفضول مع وجود الفاضل"ی داهێناو "موعاویە"ی بۆ کارەکە بە شیاوترین کەس زانیو سەرۆکایەتییەکەی بۆ جێهێڵا.

. هەر عەقڵی ئیسلامی ئەو هەموو ئەفکارەی دەبارەی "خەلیفە"و "چۆنیەتی دانانی"و "مەرجە لازمو مومکینەکانی"و چۆنێتیی عەزلکردنیو ئەرکەکانیو مافەکانیو.. هتد، بەرهەمهێناو ئیجتیهادی کرد.

* هەروەها عەقڵی ئیسلامیی لە دامەزراندنی دامو دەزگاکانی دەوڵەتدا چەند ئیجتیهادی کردووە:

. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺبە جۆرێك بوون.

. لە سەردەمی ئەبوبەکردا جۆرێکی تربوون.

. لە سەردەمی عومەرو پاش عومەردا گۆڕانی زۆریان بەسەردا هاتو دیوانی جوندو دیوانی مەزاڵمو دیوانی چیو.. چی، داهات.

* لە مەسەلەی "مووچە" داندا چەند ئیجتیهادی تازە کرا..

. ئەبوبەکر مووچەی بە یەکسانی بە هاووڵاتیان ئەدا.

. عومەر بنەمای "مفاضلة"و "مێژووی خەبات"و ئەوانەی ڕەچاو ئەکرد.. هتد. ئەمەشمان بۆیە وت. تا لە ڕاستیدا ڕۆشن بێت، ئیسلام ئەوەندە دۆگما نییە. وەك فوئاد میسریو هاوبیرانی ئەو ئەیانەوێت بیلکێنن بە ئیسلامەوە. نەتوانێت کۆمەڵگە ئینسانییەکان بباتە پێشەوەو شارستانییەتیان پێ دروست بکات..

هەر فوئاد میسری دەربارەی کشتوکاڵ ئەڵێت: "بەشی هەرەزۆری زەوی موڵکی دەوڵەتو ئەوی تریشی موڵکی خەلیفەو دەسەڵاتداران بوو"[٣٣٨].

---

[٣٣٧] وشەی "سیاسەتی شەرعی" زاراوەیەکی ئیسلامییە بۆ هەموو ئەو "لوائح"و "تەعلیماتانە" بەکارهێنراوە کە باس لە ئیدارەدانی دەوڵەت ئەکات، هەبووە کتێبی بەو ناوەوە داناوە بۆ ئیدارەدانی دەوڵەت وەك کتێبی "السياسة الشرعية في اصلاح الراعي والرعية ابن تيمية" یان بەناوی "الاحكام السلطانية"ەوە، وەك "ماوردی شافعیو ئیبن فەرائی حەنبەلی" هەشە ناوی تری لێناوە وەك "الطرق الحكمية/ ابن القيم" یان "التراتيب الادارية في الحكومة النبوية الكتاني" بە زاراوەی هاوچەرخ بەو جۆرە نوسینانە ئەوترێ "دساتیر" یان "قوانین".

[٣٣٨] کۆمەڵگا (ل ٦٥).

نازانم ئەم تەقسیمبەندییەی فوئاد میسری لە کوێوە هێناویێتیی، ئاخر مەعقولە زەوی دووبەش بووبێت: بەشێکی هی دەوڵەتو بەشەکەی تری هیی خەلیفەو کاربەدەستان! ئەی خەڵکی؟ ئەی یانی چی زەوی "موڵك"و "عوشر"؟.. ئەی باشە ئەو هەموو گەشە کشتوکاڵیو ئابوورییە چۆن دروست کرا؟.. ئەی ئیتر ئەو هەموو تەقسیمبەندییەی "ماوردی شافعی"و "ئیبن فەرائی حەنبەلی"و "ئیبن ئەبی ئادەم"و "ئەبو یوسف" لەسەر "هەولو فەزا" کراوە یان لەسەر زەوی مەوجودو حازر؟ ئاخر ئەگەر لات گوناه نەبێت ئەوە ئەبێ عەیب بێت بۆ نووسەر هەرچی هات بە خەیاڵیدا بینووسێ، بەبێ ئەوەی گوێ بەڕاستیو ناڕاستییەکەی بداتو تەنیا هەر بۆ وەزنی شیعر بیڵێت..

باشە هەر خۆت ئەڵێی: "کەسێك زەوییەکی مردووی زیندوو کردبێتەوە بووەتە موڵکی" هەر خۆت ئەڵێی: "بازرگانەکان دەستیان دایە کڕینی زەویو زار بۆ پێکەوەنانی سەروەتو سامان"، تۆ هەر خۆت ئەڵێی: "خەلیفە بۆی هەبووە زەوی بداتە هەرکەس"، ئەی باشە ئەمانە هەموویان ڕێگە نین بۆ "موڵکداری؟"، دەی ئەبوو ئەوانەشت بخستایەتە ناو تەقسیمبەندییەکەی خۆتو لە جیاتی "دووان" بۆ نموونە: "سیان" بوایە!، ئەی باشە خۆ "ماوردی" ئەیکاتە چواربەش.. بە هەرحاڵ خوای گەورە ئەفەرموێت (وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا بِهِ فَسَيَقُولُونَ هَذَا إِفْكٌ قَدِيمٌ)، عەرەبیش جوان ئەڵێت: "الانسان عدو لما جهل".

فوئاد میسری ئەڵێت: "بستێکی سەرزەمینی ئیسلام نەمان دانیشتوانی لە دژی هەڵوێستی چەوسێنەرانەی دەسەڵاتداران ڕانەوەستن"[٣٣٩]، باشە ئەمە کەی وایە؟! خۆ هەرچەندە فوئاد میسری ئەم زانیارییە مێژووییە لە کتێبەوە ناگوازێتەوە بەڵکو هەر لە گیرفانی خۆیەوە دەری دێنێ؟ بەڵام ئاوا بەو خەستییەش؟ "بستێك لە سەرزەمینی ئیسلام نەما.. هتد".

فوئاد میسری بۆ سەلماندنی ئەو قسەی خۆی باسی "حەججاج"ئەکات لە عێراقدا لە کاتێکدا کە بە درێژایی مێژوو تەنانەت ئێستاشی لەسەر بێت عێراق ناوچەیەکی نائارام بووە، بەڵام من دوو تێبینی بە پێویست ئەزانم لێرەدا بیڵێمو درێژەی وەڵامەکان بۆ بەشەکانی دواوە هەڵدەگرم..

تێبینی یەکەم: عێراق بە درێژایی مێژوو هەلو مەرجو حاڵەتێکی تایبەتی هەبووە.

تێبینی دووەم: ئێرانیش بەدرێژایی مێژوو هەڵوێستی تایبەتی هەبووە لە دەسەڵاتی ئیسلامیی!

جا بۆ مەسەلەی یەکەم: عێراق هەر لە سەردەمی عومەرەوە کە فتوحات دەستی پێکرد جۆرێك لە فیتنەو ئاژاوەگێڕی تێدابوو، ئەوە بوو عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) چەند والیو کاربەدەستی بۆ گۆڕین لەوانە (سەعدی کوڕی ئەبی وەققاس)و (خالیدی کوڕی وەلید)..

میللەتی ئەوسای عێراق بە هیچ ڕازی نەئەبوون، بە والییەکانی عومەر ڕازی نەئەبوون، پاشان بە والییەکانی عوسمانو تەنانەت بە عوسمان خۆشی! "عەلی"یان برد بۆ ناوخۆیانو پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامییان بە "عەلی" لە "مەدینە"وە گواستەوە بۆ "کوفە"و کەچی تاڵاوی دنیاشیان کرد بە قوڕگی داو بەداخو حەسرەتەوە سەریان پێ نایەوەو لە کۆتایشدا شەهیدیان کرد! هەرکەس "نهج البلاغة" بخوێنێتەوە تێئەگات ئەهلی عێراق، "کوفە"و "بەسرە" بەتایبەت چ زوخاوێکیان بردۆتە دڵی ئەو خەلیفە ڕاشیدە کە لە کۆتاییەکانی ژیانیدا ئەفەرموێت: ".. جاران میللەتان لە زوڵمی کاربەدەستەکانیان ئەترسان، من ئێستا لە زوڵمی ئێوە ئەترسم.. بەیانیان هیلاك ئەبم لەگەڵتانداو ڕاستتان ئەکەمەوە، کەچی ئێوارە وەك "پشتی کەوان" خوار ئەبنەوە، بەڕاستی ئەوەی خەریك بێت بەڕاستکردنەوەی ئێوەوە ئەبێ فەشەلی خۆی ڕابگەیەنێت..! وەڵڵاهی زۆر حەزدەکەم (مەعاویە) ئاڵوگۆڕێکم لەگەڵ بکات، وەك چۆن دینار بە درهەم ئەگۆڕێتەوە، تا (یەك بە دە)ی لەگەڵدا بکەم، یەکێ لە پیاوانی خۆیم بداتێ من (دە) لە ئێوەی بدەمێ! کۆڵەواربووم، بەدەست سێ شتی دوفاقانەی ئێوەوە، "کەڕ"و بەڵام زۆر گوێ

---

[٣٣٩] کۆمەڵگا (٦٤).

قولاَخیش.. "لاڵ"و بەلاَم زۆر چەنەباز، "کوێر"و بەلاَم زۆر چاو باشقەڵیش، نەمەردی ڕاستگۆن لە شەڕدلو نەبرای بەڕاستن لە لێقەوماندا.. لە خزمەت ئەسحابی موحەممەددا ﷺژیاوم! وەڵلاهی یەکێکتان نییە بچێتەوە سەر ئەوان"[340].

موعاویە بۆیە وەسێتی بۆ یەزیدی کوڕی کردو وتی: ئەگەر ئەهلی عێراق داوایان لێکردی هەموو ڕۆژێك "والی"یان بۆ بگۆڕی بۆیان بگۆڕە[341].

ئەهلی عێراق لە دەوڵەتی ئەمەوی ڕازی نەبوونو کە هاتە سەرەی دەوڵەتی عەبباسیش ئەیانوت:

یالیت جوربنی مروان عادلنا یالیت عدل بنی عباس في النار[342]

واتە: خۆزگە ستەمی (کوڕانی مەروان) ئەگەڕایەوە بۆ مانو خۆزگە دادی کوڕانی عەبباسیش ئەچووە ناو ئاگر!

ئێستاش . سبحان الله . ئەو ڕەوشتو سورشتە هەندێکی باشی هەر ماوەو ئەوەتا بە ڕژێمی پاشایەتی ڕازی نەبوونو لە جمهوریشیان هەڵتەکاندوو هەزارو یەك عەیبو عاریشیان لە دیموکراتییەت دۆزیوەتەوەو دژایەتی ئەکەن.

بۆ مەسەلەی دووهەمیشیان: ئەو فیتنەو ئاژاوانەی ئێرانو ئێرانییەکان ئەیاننایەوە بۆ دەوڵەتی ئیسلامیی، ئەوە وەك کورد ئەڵێ: "ئەو کاسەیە بێ ژێر کاسە نەبوو"، ئێرانییەکانو بەتایبەتی ئەوانەیان کە لەسەر خوێنی خەڵك ئەژیان، ئەیانزانی ئیسلامو ئەهلی ئیسلام چ بەرژەوەندییەکی گەورەی ئەوانی دا بە ئاوی هەژارانو مەزڵوماندا، داخی ئەوەبوو هەر بەینی نابەینێ ئاژاوەیەکیان دروست ئەکرد.. تۆ هەر خۆت ئاڵێی دەربارەی بابەکی خورەمی کە فیتنەی بابەکی دروست کرد: "هەندی توێژەرەوەی ئێرانی (بابەك) دەکەنە شۆڕشگێڕی نەتەوەیی‌و گوایە ئاڵای ڕزگارکردنی ئێرانی لە دژی خەلافەتی عەبباسیو دەسەلاَتی عەرەب بەرز کردۆتەوە"[343]، کەواتە ئەو ڕاپەڕینو فیتنەو ئاژاوانەی لە ئێرانەوە پەیوەندییان بە گێڕانەوەی "مەجدێکی سەرنگومکراو"ەوە هەبووە کە لەسەر کەللە سەری خەڵك بنیات نرابوو، مەجدێکی نەتەوە پەرستی زاڵمانە کە کەمترین مافیان بە میللەتێکی گەورەی وەك کورد . بۆنمونە . بە ڕەوا نەبینیوە، ئەوەی لەو چەرخە دوورەدا ڕوویداوە قەناعەتو واقیعی ئەمڕۆش پشتی ئەگرێت، ئەرێ فارس لە ئەمڕۆشداو لەم چەرخی ئازادی گەلانو مافی کەمە نەتەواییانەدا مافی کورد نەسەلمێنێ ئەبێ لەو چەرخە داخراوانەدا چی دەرهەق بەکورد کردبێت؟! (مالکم کیف تحکمون)؟!

کەواتە کاکی نووسەر ئەگەر بەزەییت بە خۆتدا نایەتەوە، ئەوە بەزەییت بە خەڵکدا بێتەوەو چەواشەیان مەکەو نەتەوە پەرستییان لێ مەکە بە فریادڕەسو ئەنتەرناسیۆنالست! ئاژاوەیەکی بچووك لە شوێنێکداو لەسەر مەسەلەیەکی "ناڕەوا" تەعمیم مەکەو مەڵێ: بستێك لەسەر زەمینی ئیسلام نەما شۆڕشی تێدا بەرپا نەبێت دژ بە ئیسلام.. هتد!!.

ئێمە (پشت بەخوا) لە دواوە ڕوونترو زانستیانەتر ناڕەوایی ئەو جۆرە قسانە بە بەڵگەوە دەرئەخەینو لەوێدا قسەی تەواوی لەسەر دەکەین.

[340] نهج البلاغة ص ١١٦ ـ ١١٧.

[341] معاوية الرجل الذي اقام دولة، ص ١٢٣، ابراهيم الابياري.

[342] کۆمەڵگا (ل٧٥).

[343] کۆمەڵگا (ل١٥١).

فوئاد مەجید لەم بەشەدا تەنیا باسی چوار چین ئەکات لە کۆمەڵگەی ئیسلامدا:

چینی سەروو، کەناویان ئەنێ "دەرەبەگی ئەرستۆکرات"

چینی جوتیاران

چینی کۆیلەکان

چینی پیشەوەران

ڕاستر وایە کە کۆمەڵگەی ئەو ڕۆژە بەم شێوەیە پۆلێن بکرێت:

یەکەم: پیاوانی دەوڵەتو سیاسەت.

دووەم: زانایانو شەرعزانو قانونزانەکان.

سێیەم: دەوڵەمەندو بازرگانەکان.

چوارەم: جوتیارو پیشەوەران.

پێنجەم: کۆیلەو خزمەتکارەکان.

ئەمەش بۆئەوە ئەڵێین، چونکە هەریەك لەو چینانە جۆرێك لە کاریگەریو ڕۆڵیان هەبووە لەسەر کۆمەڵگەو جێدەستیان دیار بووە:

. پیاوانی دەوڵەتو سیاسەت لایەنی سەربازیو ئابووریو ئیداری کۆمەڵگایان بەڕێوە بردووە.

. پیاوانی زاناو شەرعزانەکان لایەنی سیاسییو کۆمەلاَیەتی کۆمەڵگەیان بەڕێوە بردووە.

. پیاوانی جوتیارو پیشەوەرانیش هەڵقەی نێوان چینی یەکەمو سێیەم بوون.

. ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو ڕۆژەش بەشێوەیەکی فراوانو بەرچاو خزمەتکارو کۆیلە باو بووە تێیدا..

پیاوانی دەوڵەت بەبێ فەتوای زانایان نەیانتوانیوە میللەتو وڵات بەڕێوە بەرن، پیاوانی دەوڵەمەند بەبێ پیشەوەرانو جوتیاران شتێکی وەها نەبوون، کۆیلەو خزمەتکاریش چەکمەیان لە دیوانی هەموو لایەکدا هەبووە، بەڵام فوئاد میسری ئەیەوێت تیۆرە ئێکسپایەرەکانی مارکسیزم بهێنێتو جووڵەو ڕووداوەکانی مێژووی ئیسلامی پێ تەفسیر بکات.. بۆنمونە، وا ئەزانێت پەیوەندی نێوان ئەو چینانە تەنیا پەیوەندی سیراعو ململانێی چینایەتی بووە، چونکە مارکسیزم ئەڵێ: "توخمی سەرەکیو بنچینە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا بەدرێژایی مێژوو بریتی بووە لە بەرژەوەندی ئابووری"[٣٤٤]، واتە: "بەرژەوەندی مرۆڤ ئەجووڵێنێت نەك ئەفکارو بیروباوەڕ"[٣٤٥]. نەك هەر ئەمە بەڵکو بنچینەی ئەم تیۆرە ئەڵێت: "هەلو مەرجە ماددەییەکان بەشوێن ئەفکارو لۆجیکدا نایەت، بەڵکو ئەفکارو لۆجیك شوێن مەسڵەحەتو هەلو مەرجە ماددیەکان ئەکەون، لەبەر ئەوە دژایەتیو سیراع لە نێوان دوو فیکرەدا بوونی نییە، بەڵکو سیراعو دژایەتی لە نێوان دوو سیستەمی کۆمەلاَیەتییدایەو سێیەمیان لێ دروست ئەبێت"، بۆ نموونە: "سیراعی نێوان خاوەن ئیشو کرێکار کۆمەڵگەیەکی بێ چینایەتی بەرهەم ئەهێنێت"[٣٤٦]، ئەم مەزهەبی مارکسییەتەی فوئاد میسری لە ژێر ئەو لافیتە مارکسییەدایە کە ناوی "تەفسیری ماددی بۆ مێژوو"ە کە: "لە سەر دوو دینگە ڕاوەستاوە"، هێزە بەرهەمهێنەکان (کەرەسەو دەزگاکان)، پەیوەندییە ئابورییەکان (سیستەمی موڵکایەتیو چۆنێتیی دابەشکردنی سەروەتو ئاڵوگۆڕکردنی)[٣٤٧].

ڕاستە نکۆڵی لەوە ناکرێت کە مەسڵەحەتو بەرژەوەندیی فاکتەرێکی گرنگە لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا، بەڵام ئایا ئەوە فاکتەری یەکەمو کۆتاییە؟! باشە با ئێمە چەند نموونەیەك بۆ تۆ بهێنینەوە تا پێکەوە لەگەڵ خوێنەرانی بەڕێزدا تەفسیریان بۆ بدۆزینەوە:

---

[٣٤٤] الموسوعة السياسية (ل ٤٧٤).

[٣٤٥] هەمان سەرچاوەو لاپەڕە، بڕگەی "المادية التأريخية".

[٣٤٦] هەمان سەرچاوە (ص٤٧٤) بڕگەی "المادية الجدلية".

[٣٤٧] هەمان سەرچاوە (ل٦٠) بڕگەی "التفسير الاقتصادي للتأريخ".

**. ئەو ئەصحابانەی کەماڵو منداڵو وڵاتی خۆیان بەجێ ئەهێشتو ئەهاتن بۆ فتوحاتو دینیان بڵاو ئەکردەوە بەدونیاداو نەیانئەزانی لە دەریادا، لە وشکانیدا، لە ئاوەدانیدا یان لە چۆڵەوانیدا، لە شەڕدا یان لە ئاشتیدا، تیا ئەچن، فاکتەرو پاڵنەریان چی بووە؟ چ بەرژەوەندییەکی ماددی هەبووە لەو هەمووە خۆڕەنجاندنەیاندا؟! باشە چ کێشەیەکی هەبووە لە ناو ماڵو منداڵو شارو بازاڕی خۆیدا بمایەتەوەو بژێوی خۆی بەزیادەوە دەربهێنایە (ئەوە فاکتەری دینو خۆشەویستی دین نەبێت چییە؟).**

**. باشە ئەو زانایەی کە شەو ئەداتە دەم ڕۆژ لە حوجرەیەکدا یان لە دانیشتگایەکدا یان لە تاقیگەیەکدا ئەیەوێت بگاتە حەقیقەتێكو خزمەتێك بە وڵات یان دین یان میللەت بکات.. ئەوانە پاڵنەری ماددییان لەکوێدایە؟ (ئەوە فاکتەری ئینسانییەتو مرۆڤدۆستیو خۆشەویستی گەیشتن بە حەقیقەت نەبێت چییە؟).**

**. کوڕێك یان کچێك، بە (دڵ) خۆی ئەتوێنێتەوە بۆ دڵدارەکەی، پێم ناڵێی بەرژەوەندی ماددی لە کوێدا ئەبینی؟ (ئەوە فاکتەری (جنس)یو خۆشەویستی نەبێت چییە؟).**

**. دایکێك بە دڵو بە گیان ئەسوتێت بۆ منداڵەکانی، ئایا چ پاڵنەرێکی ئابووری لە پشتەوەیە (ئەوە فاکتەری عاتیفەو سۆزو بەزەیی نییە ئەی چییە؟).**

**. ئایا فوئاد مەجید میسری قەناعەتی وایە کە لەناو کۆمەڵگەدا کەس نییە بە "بێ بەرامبەر کار بکات؟" ئایا لە ڕاستیدا ئەمە وایە یان نا؟ ئایا نووسینەکەی فوئاد میسری ئەکرێ لە کام خانەدا دابنرێ؟ هەوڵێك بەرامبەر شتێکە[٣٤٨] یان بۆ خزمەتێکی بە بەرانبەر، مەبەست بەرانبەری "ماددی" بە لۆژیکەکەی فوئاد میسری خۆی.**

**کەواتە مێژوو بە فاکتەری ئابووریو بە فاکتەری غەیری ئابووریش دروست ئەبێت.. ئەوە با ناو بنێین "یەك".**

**دوو: مێژوو ئەکرێ خاڵی بێت لە ململانێ وەك تۆش بڕوات وایە پاش ماوەیەك کۆمەڵگەی ناچینایەتی دروست ئەبێت.**

**لە ڕاستیدا گرفتی ئەم برادەرە مارکسی مەزهەبانە ئەوەیە کەوا ئەزانن تەنیا خۆیان ئەتوانن تەفسیری مێژوو هەموو شتێکی تریش بکەن، هەر ئەو تەفسیرەی ئەوانیش ڕاستەو زانستیانەیە، هەر ئەوانیش ئەتوانن کۆمەڵگەی بێ ململانێ دروست بکەن!! کە پەیڕەوی لە مەزهەبو دینی ئەوان بکات!! بەڵام ئەمە وانییە، ئەوەش مێژووی زیاتر لە هەفتا ساڵی یەکێتیی سۆڤییەت کە تەرسانەیەکی فیکریو تەرسانەیەکی سەربازیشی لە پشت ئەو سیستەمە سیاسییەدا دانابوو، کە بە تەمابوو "کۆمەڵگەی زێڕینو یەکسانو یەك ڕەنگو یەك نەفەس" دروست بکەن..**

**جا فوئاد میسری بەم قەناعەتەوە هاتووەو شتی ڕاستو ناڕاستی لە مێژووی ئیسلامیدا هێناوەو بەم "تەفسیرە تاقانە"یە کەوتووەتە تەفسیرکردنیان[٣٤٩]، با تۆزێك لەگەڵیدا بڕۆین:**

**. "لەو ڕۆژەیشەوە بنەماڵەی "بەنی ئومەییە" دەستیان بە سەر هەموو لایەنەکانی ژیاندا گرت وردە وردە چینێکی ئەرستۆکراتی دەرەبەگ لە منداڵدانی کۆمەڵگای ئیسلامدا نەشونمای کردو هاتە مەیدانی ململانێی کۆمەڵایەتییەوە"[٣٥٠].**

**لەم دەقەدا ئەکرێت چەند شتێك دەربهێنی:**

**١. ئەگەر ململانێکە لە بنەماڵەی (بەنی ئومەییە)و (موعاویە)ەوە دەستی پێکردبێت، کەواتە بە "مەفهومی موخالەفە" کۆمەڵگەی پێش موعاویەو بەنی ئومەییە، ململانێی تێدا نەبووە، چونکە چینی ئەرستۆکرات بوونی نەبووە، چونکە نووسەر**

---

[٣٤٨] نووسەرێکی بەڕێز بۆمی گێڕایەوە کە "زەردەشتی" نووسەری "خوێننامە" دانی بەوەدا ناوە کە دوای ئەو نووسینەی بووەتە خاوەنی سەیارەو خانووی خۆیەو ئێستا مووچەیەکی باشیشی هەیە.. "زەردەشتی"یش لە خوێننامەکەیداو لە لاپەڕە (٥٩)ی (چاپی یەکەم)دا ئەڵێ: "کاتی خۆی کە نووسەر فوئاد مەجید میسری، کتێبی "کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا"ی نووسی، ئاینزانەکان بەپێی دەق یان لۆژیکانە نەیانتوانی وەڵامی بدەنەوە، لە بری وەڵام هێرشێکی توندیان کردە سەرو پڕوپاگەندەی ئەوەیان بۆ کرد: کە گوایە لە پێناوی پەنابەری سیاسییدا ئەو کتێبەی نووسیوە!! هەرچەندە سەرەتا ئەم پاساوەیان بۆ چووە سەر، بەڵام پاشتر بۆ خۆشیان ڕوون بووەوە کە ناتوانن وەڵامێکی بەپێزی بدەنەوە"ت. و.

هەرچەندە من ئەو قسەیەم تەنیا لە زەردەشتی بیستووەو لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە یانی ئەوە نا کە تەنیا فاکتەری یەکەمو کۆتایی فوئاد میسری بووبێت بۆ ئەو نووسینە..

[٣٤٩] بۆ نموونە لە لاپەڕە (٨٧)ی کۆمەڵگایدا ئەڵێ: ".. دیالێکتێکی مێژوو ئەم دیاردەیە بەگەشەکردنی چۆنایەتی دادەنێ".

[٣٥٠] کۆمەڵگا (ل ٦٧).

خۆی ئەڵێ: ئەم چینە لایەنی یەکەمی ململانێکە بووەو لایەنەکەی تریان "چین‌و توێژی تری کۆمەلایەتی لە بەرهەمهێنانی سامانی ماددی"[351]دا بوو.

٢. وشەی "بنەماڵەی بەنی ئومەییە" تەعبیرێکی ناحەزانەیە نووسەر بۆ هۆیەك یان زیاتر بەدرێژی نووسینەکەی پابەند بووە پێوەی.

. دەربارەی "موعاویە"ش ئەڵێ: "لە ماوەی بیست ساڵ حکومڕانیدا پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ خاوەن سامان‌و موڵکدارەکانی ئەو وڵاتەدا بەست‌و بە هەموو تواناوە هەوڵیدا بەرژەوەندیی چینایەتییان بپارێزێ"[352].

زۆر سەیرە ئەم کابرایە کە ئەیەوێ تەفسیرە ماددییەکەی خۆی جێ بکاتەوە دان بەوەدا ئەنێ کە خاوەن موڵك (غەیری خەلیفەو کاربەدەستان) زۆر هەبوون، کەچی کە ئەو ئەیەوێ باسی باج‌و خەراج‌و ئەو شتانە بکات، ئەڵێ: "بەشی هەرەزۆری زەوی موڵکی دەوڵەت‌و ئەوی تریشی موڵکی خەلیفەو دەسەلاتداران بووە"[353]، ئیتر من بەخێرو ئێوەش بەسەلامەتی..

ئێ باشە کاکە! کەسێك وەك "معاویە" بتوانێت لە "شام"دا بۆ ماوەی زیاترلە بیست ساڵ حوکمڕانی بکات‌و خەڵك بەدڵ‌و بەگیان لە گەڵیدا بوون‌و شەڕی سەروماڵیشیان لە ژێر ڕێبەرایەتی ئەودا کردبێت یەکێکی وەك "عەلی" مەدحی خۆی‌و سەربازو دۆستانی بکات، ئەگەر ستەمکارو خراپ بووبێت چۆن ڕەقیبەکەی مەدحی دەکات.. ئەوەتا "عەلی" ئەفەرموێت: "وكان بدء امرنا انا التقينا والقوم من اهل الشام، والظاهر ان ربنا واحد ونبينا واحد ودعوتنا في الأسلام واحدة، لا نستزيدهم في الايمان بالله، والتصديق برسوله ﷺ ولا يستزيدوننا، الامر واحد الا ما اختلفنا فيه من دم عثمان ونحن منه براء"[354].

تەنانەت هەر (عەلی) ئەفەرموێت: "زۆر سەیرە خەڵکی بەبی (مەعونەت) شوێن موعاویە ئەکەون‌و کەچی من لەگەڵ ئەو هەموو (مەعونەشدا) ئێوەم هەیەو ئەوەش ئێوە"[355].

خۆ حیلم‌و سیاسەتی موعاویەش لە مێژوودا، لای هەموو کەس ئاشکرایە تاڵە مووەکەی موعاویە پەندێکەو بەسەر زمانی خەڵکەوەیە، ئیتر نازانم فوئاد میسری بۆ هەرچی ڕەوشتی موعاویە هەیە قەتیسی ئەکات لە ئەوەدا گوایە بە هەموو توانایەوە هەوڵی داوە بەرژەوەندی خاوەن سامان‌و موڵکدارەکان بپارێزێ.

. دیسان ئەڵێت: "هەر لە سەردەمی خەلیفە عوسمانەوە ئەو پارەو پوولەی لە شێوەی خەراج‌و باجی تردا کۆدەکرانەوە، نەدەچوونە (بیتولمال)ەوە، بەڵکو دەچوونە گیرفانی ئەوانەوە خەلیفە کردبوونی بە والی‌و هەموویشیان لە بنەماڵەی (بەنی ئومەییە)و خزم‌و کەسوکاری خۆی بوون"[356].. نازانم ئەگەر ئەو پارانە نەچووبنە (بيت المال) ئەی ئیتر ئەم (بیتوالمال)ە چی تێدا بووە؟ ئەی مەسروف‌و خەرجی ئەو ئیمپراتۆریەتە گەورەیە بەچی کراوە؟ فوئاد میسری یان ئەبێ بڵێ: ئەوانەی پارەیان وەرگرتووە سەرفیان کردووەتەوە بۆ دەوڵەت‌و کاروباری دەوڵەت‌و خەڵك، یان ئەبێ بڵێ: شۆخیم کرد ئەو پارەو پوولانە بۆ دەوڵەت بووە، هەر ئەبی شۆخیش بێت، چونکە خۆی لە زۆر شوێندا ئەڵێ کە فلانە خەلیفە مرد . بەیتولمال . ئەوەندەو ئەوەندە ملیۆن دینارو درهەمی ئاڵتونی تێدابوو[357]، بەلام خۆ هەرچۆن بێت "شۆخی" بێت یان درۆو بوختان بێت هەر ناخۆشەو شایەن نییە، بە نووسەرێك کە ڕێز لە خۆی بگرێت، پەنای بۆ بەرێت.

---

[351] کۆمەڵگا (ل ٦٧).

[352] کۆمەڵگا (ل ٦٧).

[353] کۆمەڵگا (ل ٦٥).

[354] (نهج البلاغه) ص٦٠٠.

[355] "مەعونە" واتە: ئەو یارمەتی‌و هاوکارییە زیادەیەی ئەدرێت بە خەڵکی بۆ وڵاخ‌و خەرجی خۆی لەسەروو مووچەو ڕاتبەکەی خۆیەوە کە بۆی براوەتەوە. نهج البلاغة (ص٣٦٢).

[356] کۆمەڵگا (ل ٦٨).

[357] کۆمەڵگا (ل٣٧).

. هەر فوئاد میسری دەڵێ: "شتێکی شاراوە نییە کە بێزاریو نارەوایی ئەو خەڵکە لە دەست زوڵمو ستەمی کۆمەلایەتی چۆن گەیشتە بەردەمی خەلیفەو ئەویش بە چ شێوەیەك وەلاّمی دانەوە..! تا بە کوشتنی خۆی کۆتایی هات، بەلاّم کۆتایی یەك بەردی بناغەی بۆ ململانێیەکی سیاسیی کۆمەلاّیەتی دارشت تا ئێستاش درێژەی هەیە"[358].

بۆ ئەم خراپ حاڵی بوونەش با چەند خاڵێك بڵێین:

. ئێمە پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە کابرایەك هەبوو بەناوی "عەبدوڵلای کوڕی سەبەء" کە کەسێکی یەهودی بوو، بۆ تۆڵەسەندنەوە لە ئیسلامو ئەهلی ئیسلام هات دەستی کردە چاندنی تۆوی دووبەرەکیو فیتنە لە ناو خەڵکدا بە تایبەتی ئەوانەی کە دوور بوون لە کۆمەڵگەی سەحابەوە، هەندێ بیروباوەڕی نامۆی بلاّوکردەوە لەوانە "فیکرەی وەصیە"و "فیکرەی رەجعە"و "فیکرەی هەقی ئیلاهی"و.. دەستی دایە بانگەشە بۆ یەکێك لە خزمانی پێغەمبەر ﷺ گوایە زوڵمو غەدری لێکراوەو ئەبوایە دوای پێغەمبەر ئەو بکرایە بە خەلیفەو خەلیفایەتی نابێت لە پێغەمبەرو بنەماڵەی ئەو تێبپەڕێت.. ئەم کابرا "دووڕووە" هەندێ هەوادارو هاوڕای بۆ خۆی دروست کرد تا یەکێك لە خەڵکی ئاگاو پەروەردەکراو رەدی ئەدایەوەو بیروڕاکانی پووچ ئەکردەوە، چەند کەسێك لە خەڵکی ناحاڵیو ناشارەزا لە ئیسلام ئەبوون بە تۆرەکەیەوەو بڕوایان پێ دەکرد، ئەوەبوو تۆوی فیتنەی لە "کوفە"و "بەسرە"و "فستات"دا چاند، سەرەتا بەوە دەستی پێکرد رەخنەی لە هەندێ لە بەرپرسەکانی کابینەی عوسمانی ئەگرت، پاشان رەخنەی لە هەموویان ئەگرتو کە ئەمەشی بۆ ڕۆیشتە سەر رەخنەی لە هەندێ ئیشوکارو فەرمانی عوسمان ئەگرتو کە ئەمەشی بۆ ڕۆیشە سەر رەخنەی لە خودی عوسمان خۆشی ئەگرتو ئەوەبوو لیستێکی لە رەخنەو گازندە دروست کردو ڕووبەڕووی حەزرەتی عوسمان بوونەوەو ئەویش یەك بەیەك وەلاّمی دانەوەو قەناعەتی بەو "هەڵخەڵەتاوو نوێ موسڵمانانە" کردو بە رەزامەندییەوە گەڕانەوە، بەلاّم "ئیبن سەودائی مەلعونو فیتنەگێڕ" بەردەوام بوو لە بەهێزکردنی تۆڕە سیخوڕەییەکەیو کارەکەی گەیاندە ئەوەی کە خەڵکێکی بەسەرزمانو ناحاڵی لە "مەدینە" کۆکردەوە بەناوی ئەوەی ئەیانەوێت لە حەقیقەتی ئەو رەخنەو گلەییانە بگەن، بەلاّم ئیبن سەودائو هەڵسوڕێنەرانی ئاژاوەکە بەنیازی شەهیدکردنی خەلیفەوە هاتبوونو خەڵکیان بەناوی ترەوە هێنابوو.. مێژووی ڕاستەقینە وا دەڵێو قسەش قسەی مێژووە، ئیبن عەرەبی مێژوونووسی چەرخی عەبباسی لە کتێبی "العواصم من القواصم"دا ئەڵێت: "هەموو ئەوانەی کە دژ بە عوسمان وەستان ناویان لە مێژوودا هەیەو کە وردی ئەکەیتەوە ئەبینی هەریەکەیان غەرەزوو مەبەستێکی خراپی خۆی هەبووەو ڕێگەی لێ گیراوەو پیاوی باشیش زۆر ئامۆژگاریانی کردوونو هەڵشاخاون پێیاندان لەوانە عەبدورلرەحمانی کوڕی خالدی کوڕی وەلیدو تەنانەت هەڕەشەی زۆریشی لێ کردوون، لای ئەو وتیان: تۆبەمان کردووەو وازمان لەو شتانە هێناوە، ئەویش رەوانەی کردن بۆ لای عوسمانو لەلای ئەویش وتیان: لەو شتانە پەشیمان بووینەتەوەو وازمان هێناوە، عوسمانیش سەرپشکی کردن خۆیان کوێ هەڵدەبژێرن تیایدا بژین، ئەوان وایان پێ باشبوو هەریەکەیان بچێتە ولاّتێكو عوسمانیش ناردنی، کە هەریەکەیان کەوتنە شوێنێك دەستیاندایەوە فیتنەگێڕیو خەڵك کۆکردنەوەو بە قەرەباڵغییەکی زۆرەوە پاش ماوەیەك هاتنەوە بۆلای عوسمان، کە عوسمان لە پەنجەرەی ماڵەکەیەوە سەیریکردن ناسینیەوەو دەستی کردە ئامۆژگاری کردنیانو باسی حورمەتی خوێنی مسوڵمانی بۆ کردن، (تەلحە) هاتە دەرەوەو دڵی پڕبوو، دەستیکرد بە گریانو بە هەرکەس ئەگەیی ئامۆژگاری ئەکرد کە لەخوا بترسێتو ئاگای لەخۆی بێت نەکەوێتە ناو گوناهەوە، (عەلی)یش هەردوو کوڕەکەی (حەسەنو حوسەین)ی نارد بۆ پاسەوانی ماڵەکەی عوسمانو بەرگری لێکردنی، ئەو خەڵکەی هاتبوون ڕوویان کردە (طلحە و علیو زوبیر)و ئەیانوت: باشە مەگەر ئێوە نامەتان بۆ نەنووسیوینو ناڵێن: "وەرنە سەر ئەو کەسەی کە خەریکە دین ئەگۆڕێت؟! کەچی کاتێك دێین، ئەمەیان چووە لە ماڵدا پان بووەتەوە"[359]و تۆش چاوت زڵتەی دێت لە فرمێسکدا کە دێیتە لامان! وەڵلاهی ئەم شارە بەجێ ناهێڵین تا خوێنی نەرێژین"[360]".

---

[358] کۆمەڵگا (ل٦٨).

[359] ئەڵێن: فلما جئنا قعد هذا في بيته وخرجت انت تفيض عيناك.

[360] العواصم من القواصم (ص٥٩).

قازی ئیبنولعەرەبی هەروەها ئەڵێت: "عوسمان ئەگەر بیویستایە، هەموو سەحابە شەڕی سەرو ماڵییان ئەکرد لە سەری‌و هەر لە یەکەم ساتی هاتنە ژوورەوەیاندا بۆ مەدینە تێکیان ئەشکاندن، بەڵام ئەو خەڵکە بەناوی ئەوەوە هاتبوون گوایە مافیان خوراوەو داوا ئەکەن بۆیان بسەنرێتەوە، بۆیە دەستی کردە ئامۆژگارییان، کەچی ئەوان هارتربوون، کە سەحابەش ویستیان سنورێکیان بۆ دابنێن، عوسمان ئەمری پێکردن کەس لەبەر ئەم دەست نەکات بەخوێنی کەسداو سەحابە ناچار تەسلیمی قسەی عوسمان بوون"[٣٦١].

(محب الدين الخطيب) ئەڵێ: "ئەوانەی ئەو جینایەتە گەورەیان کرد لە ماڵی عوسماندا، چەند کەسێکن‌و هەریەکەیان لە پلەیەکدایە، هەیانبوو توندڕەو لە دینپەرستیداو شتی بچووکیشی لا هەرگەورە بوو، بۆ نکوڵی کردن لە ئەو شتە بچوکانە خۆیان ئەخستە ناو گوناهی گەورەوە!! هەیانبوو ڕەگەزپەرستی یەمەنی هەبوو حەسوودیان بە شیوخی سەحابە ئەبرد، خۆیان مێژوویەکی وایان نەبوو لە ئیسلامداو قەناعەتیان وابوو ئەبێ بەبێ سابقەو خەبات ئەمانیش هەر هەمان قەدرو حورمەتیان لێ بگیرێ، هەیانبوو لە داخی ئەوە خزمێکی (سزا) درابوو لەسەر بێ شەرعییەك ڕقی لە عوسمان هەڵگرتبوو هەیانبوو کەسێکی گێل‌و داماو بوو (سەبەئییەکان) بە هەموو شێوەیەك هەڵیانئەسوڕاندو بیروباوەڕی خۆیانیان تێدا ئەناشت‌و ئاژاوەیان پێ ئەنایەوە، هەشیانبوو خێرو بێری عوسمان خووی شەڕ کردبوو، نیازی بە پلەی زیاتر هەبوو لە کاتێکدا نەئەشیا بۆ ئەو پلەیەی هەیانبوو.. ئومێد ئەکەم خوای گەورە هەلم بۆ بڕەخسێنێ لێکۆڵینەوەیەکی وردی (باری سایکۆلۆژی) هەموو ئەوانە بکەم کە ئەم فیتنەیان هەڵگیرساند، هەروەها هەموو ئەو زانیارییە دروستانە کە ماونەتەوە بۆمان سەرلەنوێ ڕێکخەمەوە تا ببێتە پەندو دەرسێکی گەورە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە ئەیانەوێت لێکۆڵینەوە دەربارەی مێژووی ئیسلام بکەن"[٣٦٢].

هەروەها لە پەراوێزی لاپەڕە (١٠٩)ی (العواصم)دا ئەڵێ:

"مێژوو نووسان ئەڵێن: موحەممەدی کوڕی حوزەیفە ـ کۆڵەوەسی عوسمان ـ کە خێرو بێری عوسمان بەدخوی کردبوو لەوکاتەدا لە میسر مابوویەوەو سەرپەرشتی فیتنەکەی ئەکرد، واتە: خەڵکی پڕ ئەکرد لە عوسمان ـ پێشەوای مسوڵمانان ـ نامەی بەناوی خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنووسی‌و بەم لاولادا ئەیناردن، ئەهات هوشتری ئەبەستەوەو خواردنی نەئەدانێ تا لاوازو لەڕ ئەبوون‌و پیاوانی خۆشی لە (فوسطاط)دا لەسەر بانەکان ڕووبە خۆر دائەنا تا تەواو ڕەش ئەبوونەوەو ڕەنگی سەفەرکەریان لێ ئەنیشت‌و ئەوجا ئەو نامانەی ئەدایە هەریەکەیان‌و سواری ئەو هوشترە لەڕو لاوازانەی ئەکردن‌و پێی ئەوتن: بچن بۆ ڕێگەی حیجاز، هەر کاروانێکیان ئەبینی نامەیەك لەو نامانەیان ئەدانێ‌و ئەیانوت: ئەمانە نامەی خێزانەکانی پێغەمبەرن ﷺ هانایان بۆ خەڵك هێناوە لە حوکمی ستەمکارانەی عوسمان، ڕزگاریان بکەن! ئەهاتن ئەم نامانەیان لە مزگەوتی "عەمر" لە میسردا ئەخوێندەوە گوایە ڕێبواری حیجاز هێناونی لەکاتێکدا کە نووسەرەکانی‌و هێنەرەکانیشی لەناو میسردا بوون، هەمووی درۆو هەڵبەستراوبوو.. ئەم نامە هەڵبەستراوانە شێوازی ئەو کۆمەڵە یاخییە بوو کە لە هەموو کاتێکدا پەنایان بۆ ئەبرد".

مەسروق ئەڵێت: "بە عائیشەم وت: باشە هەرتۆ نامەت نەئەنووسی بە هەرێمەکانداو ئەمرت پێئەکردن لە عوسمان یاخی بن؟! عائیشە فەرمووی: سوێند بەو خوایەی کە ئیمانداران بڕوایان پێی هەیەو بێباوەڕان پێی کافرن ڕەشم نەخستۆتە سەر سپی! (ئەعمەش) ئەڵێت: ئەسحابی پێغەمبەر ﷺ ڕیوایەت ئەکەن کە (سەبەئییەکان) نامەی زۆریان بەدەم عائیشەوە ناردووە بە هەرێمەکاندا"[٣٦٣].

---

[٣٦١] هەمان سەرچاوە (ل٦٠).

[٣٦٢] محب الدين الخطيب: نووسەرێکی گەورەی میسرییەوەو چەند لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر مێژووی ئیسلام هەیە لەوانە "حملة الاسلام الاولون وما هم عليه من المحبة والالفة" پرۆژەیەکە پێشکەشی زانکۆی کردووە بۆ ئەوەی ببێتە بنەمایەك بۆ دیراسەکردنی مێژوو لە بەشەکانی مێژووی زانکۆکاندا، نووسەر ژمارەیەکی زۆر پەراوێزی بۆ کتێبی "العواصم" نووسیوە کە بە قەبارە لە کتێبەکەی "ئیبنولعەرەبی" گەورەترەو بە ئسلوبێکی زۆر زانستی‌و ئەکادیمی هەموو ئەو حەقیقەتانەی دەرخستووە کە یەکێکی وەکو فوئاد میسری زۆر بەمەبەستەوە کردوونی بەژێر نووسینەکانییەوە، بەو هیوایەی کە کەس نەیزانێت‌و پێی تەحریك نەبێت.

[٣٦٣] محب الدين الخطيب ئەڵێت: نامەیان بەدەم عەلی‌و (تەلحە)و (زوبەیر)و (عائیشە)و خێزانەکانی تری پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنووسی‌و بەوڵاتاندا بڵاویان ئەکردەوە، العواصم: (ل ١٣٦).

هەروەها محب الدين الخطيب ئەڵێ: ئەوانەی یاخیبوون لە خەلیفە عوسمان، دوو توێژبوون: توێژێکی سەرکردەو هەڵسوڕێنەری گزیبازو تێکدەر، توێژێکی داماوی خەڵەتاو، ئەوەبوو کە بە (عەلی)یان وت: دەی فەرموو پێشمان کەوە با بچین بەگژی عوسماندا! عەلی فەرمووی: وەڵڵاهی من ناچم بەگژیدا، وتیان: ئەی باشە ئەو هەموو نامەیە چییە بۆت نووسیوین؟! فەرمووی: نامەی چی؟! وەڵڵاهی هیچ شتێکم بۆ نەنووسیون! هەروەها ئەڵێ: "نیشانەی گیلێتیی ئەو توێژەی تر ئەوەیە کە (عەلی) سوێندی خوارد بۆیان کە ئەو هیچ نامەیەکی نەنووسیوە بۆیان، نەیانوت، باشە ئەی ئەبێ کێ ئەو نامانەی نووسیبێت کە ئێمە لە عوسمان یاخی ببین!

ئەی مسوڵمانان ئەوەی لەم زەمانەدان و ئەوانەش کە لەمەودوادێن! بزانن هەر ئەو دەستە پیسە جینایەتکارەی ئەو نامە درۆیانەی بەدەم عائیشەو عەلی و تەلحەو زووبەیرەوە هەڵدەبەست، هەر ئەو دەستەبوو کە نامەی بەناوی (عوسمان)ی خەلیفەوە نووسی، گوایە عوسمان بۆ والی میسری نووسیوە کە هەموو ئەوانەی هاتوونەتە مەدینەو گلەییان کردووە بیانکوژن! لەبەر ئەوە چ خەلیفە عوسمان و چ ئیسلام و چ نەوە ئیسلامییەکان ئەو پەڕی ستەمیان لێکراوە کە ئەو هەموو لادان و درۆو دەلەسەیە لەلایەن ئەو دەستە پیسەوە ئاخنراوەتە ناو مێژووی ئیسلامییەوە، لە ڕاستیدا سەری مارەکە ئەو پیاوە جوولەکە پیسە بوو کە بە دووڕوویی هاتە کۆمەڵگەی ئیسلامی و ئەوانە کە دوای هەواو ئارەزووی کەوتبوون، کەوتنە داوەکەیەوە"[364].

٢. ئەو ململانێیە کە فوئاد میسری ناوی (ململانێی سیاسیی کۆمەڵایەتی) لێئەنێ حەقیقەتەکەی ئەوەبوو کە وتمان و بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتریش ئەڵێین: عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئی جوولەکە مەزهەب بە دووڕووییانە چی بیروباوەڕی یەهودی خۆی هەیە، زۆر شەیتانانە بەرگی ئایینی ئیسلامیی کردە بەریان و ڕووی کردە ئەو شوێنانەی کە سادەو داماون و زیهنیان خاڵییە لە "ڕێنماییە ئیسلامییەکان" بۆیە بە ماوەیەك توانی هەوادارێکی زۆر پێکەوە بنێ و بیروڕاکانی خۆی تێیاندا بچێنێت و بیانبات بۆ مەدینە و موناقەشەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ خەلیفە عوسماندا بکەن، ئەوەبوو کە بە عوسمانیان وت: ئەم نامانە چییە نووسیوتن؟ ئەو فەرمووی من نەمنووسیون، ئێوەش یان "بینة"و بەڵگەی ڕاست بهێننەوە، یان با من سوێندی شەرعیتان بۆ بخۆم[365].

ئەوەبوو عوسمان (ڕەزای خوای لێبێت) بە دیالۆگ و موناقەشەی مەنتقی قەناعەتی پێکردن کە ئەو شتانە هەمووی درۆو هەڵبەستراون و حەقیقەتەکانیان لەمان شاردۆتەوە، بەڵام "سەبەئییەکان" کۆڵیان نەدلو هەستان بە چڕکردنەوەی هەوڵەکانیان و ئەو کاتەش بە حوکمی ئەوەی کە هۆکاری گواستنەوە تەنیا ئەسپ و ماین و ئەو شتانە بووەو وەك ئێستا (سەیارە)و (فڕۆکە)و (تەلەفۆن)و (بێتەل) نەبووە، تا خێرا مرۆڤ بگاتە شوێنە دوورەکان و بەرچاوڕوونی بدات لە مەسەلەکاندا بۆیە ئەو پێڕە فیتنەگێڕە ئەچوونە هەر شوێنێك ئاگرێکیان هەڵدەگیرساندو تۆوی فیتنەیەکیان ئەچاند هەر ئەو کۆمەڵەش بوو لە پاشاندا ئاگری فیتنەی نێوان (عەلی و مەعاویە)شیان داگیرساندو نەیانهێڵا هیچ چانسێکی سوڵح و ئاشتی سەربگرێت، کاتێك کە بۆیان دەرکەوت (عەلی) مەیلی بەلای ئاشتیدا هەیەو خەریکە لەگەڵ (مەعاویە)دا ئەگاتە ڕێککەوتنی تەواو، ئەوەبوو بڕیاری شەهیدکردنی سێ ڕەمزی گەورەی ئیسلامییان دا کە (عەلی)و (عەمر)و (مەعاویە) بوون، بەو هیوایەی کە ئیتر ڕەمزێکی ئیسلامی وا نەمێنێت خەڵك لە دەوری کۆببێتەوەو پاشاگەردانی لەناو ئوممەتی ئیسلامدا ڕووبدات و چرای ئیسلام بۆ هەتا هەتایە بکوژێتەوە! ئەوەبوو (عەلی) بەرکەوتو (مەعاویە) بریندار بوون بەڵام عەمر بەقەدەری خوا ئەو ڕۆژە نەچووە مزگەوت و موسڵمانێکی تر پێوە بوو کە پێشنوێژی ئەو بەیانییەی لە باتی (عەمر) ئەکرد، بەڵام خوا کردی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب دوای عەلی بوو بە خەلیفەو ئیختیاری موسڵمانانی کەوتە سەرو ئەویش پەیمان و بەیعەتی لە خەڵکی وەرگرت کە چی بە مەسڵەحەت بزانێ بیکات و ئەوانیش گوێڕایەڵی بکەن، ئەویش هەستا نەوی لە داری فیتنەو لە بێخ و بن

---

[364] العواصم من القواصم ل ١٢٨ ـ ١٢٩. پەراوێزی ژمارە یەك.

[365] بنەما شەرعیو یاساییەکەش ئەڵێ: "البينة على من ادعي واليمين على من انكر" ئەرکی ئەو کەسەی دەعوا تۆمار دەکات ئەوەیە (بەڵگە) بهێنێت و ئەرکی ئەوەش نکۆڵی ئەکات ئەوەیە سوێند بخوات.

دەریهێناو سوڵحی ڕاگەیاندوو بە یعەتی دا بە (موعاویە)و موسڵمانان لە هەموو هەرێمەکاندا بوونەوە بەیەكو ئەو ساڵە ناو نرا ساڵی کۆبوونەوەی موسڵمانان (عام الجماعة)و فیتنەو فیتنەبازەکان بازاڕیان شکاو گلۆڵەیان کەوتە لێژیو لە ژێر لێوەوە باسی (حەسەن)یان ئەکردو ناویان نابوو (ئەمیری سەرکزو سەرکزکەری موسڵمانان!!) لە کاتێکدا پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت دەربارەی (حەسەن): (ان ابني هذا سيد ولعل الله ان يصلح به بين فئتين عظميتين من المسلمين) بوخاری ڕیوایەتی ئەکات، حەزرەتی (عەلی)یش ئەفەرموێت: (حەسەن پارچەیەکە لە من، بەڵکو هەموو منە، ئەوەی ڕوو لە ئەو بکات، ڕاستەوخۆ بەر من ئەکەوێت)"[٣٦٦].

. فوئاد میسری دەڵێت: "ئێرانییە زەردەشتییەکان کە لە سەردەمی ئەمەوییەکاندا هاتنە ڕیزی ئیسلامەوە، دەسەڵاتداران وەك عەرەبی مسوڵمان تەماشایان نەدەکردن"[٣٦٧].

بۆ وەڵامیی ئەم ڕەخنەیەش ئەڵێین:

١. لە تێبینییە گشتییەکاندا باسێکی ئەوەمان کرد کە ئەوە بوختانە بووترێت: کەسێك کە مسوڵمان بوو بێت لە یەهودی یان لە نەصرانیی یان مەجووسی یان هەر تائیفەو دینێکی تری ئەرزی یان ئاسمانی وەك مسوڵمانێکی تر سەیر نەکرابێت، بەڵکو لە زۆربەی هەرێمە ئیسلامییەکاندا خەڵکانی غەیرە عەرەب هەڵسوڕێنەری سیاسەتو دادگاکانی هەرێمەکە بوون.

٢. ئەم هێرشکردنە سەر "بەنی ئومەییە" شێوازی "جۆرجی زەیدان"ە لە کتێبی "التمدن الاسلامي"یەکەیداو ئەوەشمان هەر باس کرد، دیارە کتێبەکەی بەردەستی ئەم نووسەرەش هەر بەدوای ئەودا ڕۆیشتووە.

. فوئاد میسری ئەڵێ: "سیستەمی خاوەنداریێتیی کە بناغەی چەو ساندنەوەی مرۆڤە، ئەو مافەی ئەداتێ چۆنی بوێ سەروەتو سامان کەڵەکە بکات"[٣٦٨].

من زۆر سەیرم دێت لەوەی تا ئێستا هەبێت هەر لەسەرە ئەو عەقڵیەتە مابێت کە ئەبێ "موڵکیەتی فەردی" نەمێنێت! زۆر سەیرە پیاوی عاقڵ بەدوای شتی موستەحیلدا بڕوات.. هەرچۆن بێت با چەند بەرچاوو ڕوونییەك بدەین:

١. سەرەتا با زۆر بەکورتی ئەوە بڵێینەوە کە جیاوازی سیستەمی ئابوری ئیسلامییو سەرمایەداریو سوسیالیزمی یەك ڕستەیە، سەرمایەداری چۆنێتییو چەندێتیی موڵکایەتی دیاری ناکاتو سۆسیالیزمیش چۆنێتیی موڵکداریی دیاری ناکاتو چەندێتییەکەی دیاری ئەکات، بەڵام ئیسلام چۆنێتییەکەی دیاری ئەکاتو چەندێتییەکەی نا! واتە ئیسلام ڕێگە حەڵاڵەکانی کاسبیو کەسابەتو موڵك پێکەوەنان دیاری ئەکات وەك: وەزیفە، جوتیاری، بازرگانی، کڕینو فرۆشتن، دیاری، میراتی بۆمانەوە.. هتد، هەروەها ڕێگە حەرامەکانیش دیاری ئەکات وەك: قومار، گزیبازی، مادە بێهۆشکەرەکان، لەشفرۆشی، داگیرکردن، حیلەو حەواڵە، سووخواردن.. هتد، ڕێگەکانی یەکەمین حەڵاڵو فەرز ئەکاتو ڕێگەکانی دووهەمین حەرامو قەدەغە ئەکات، جا هەرکەس توانی بە ڕێگە حەڵاڵەکان سەروەتو سامان بنێت بەیەکەوەو لە ڕێگە حەرامەکان خۆی پاراست، ئیسلام موبارەکبایی لێ ئەکاتو زەکاتی شەرعی ـ کە بەشی هەژارانو کەمدەستانە ـ ئەخاتە سەری ئەگەر سەروەتو سامانی گەیشتە سنووری "نیصاب"، جا تا ئەو دەوڵەمەند تر بێت زیاتر زەکات ئەداتو هەژارو کەمدەستانو قەرزارو بێ باوکان سوودمەند تر ئەبن.. بۆیە پەیوەندی نێوان (دەوڵەمەند)و (هەژار) لە کۆمەڵگەی ئیسلامیدا پەیوەندی خۆشەویستیو دوعای خێر بۆکردنە، نەك ململانێیەو چەوسانەوە! هەژار حەزدەکات دەوڵەمەندی زەکاتدەر تا دێت زیاتر بێتو دەوڵەمەندتر بێت! بەڵام لە سیستەمی سەرمایەداریو سۆسیالیزمیدا، پەیوەندی هەژارو دەوڵەمەند پەیوەندیی ڕقو خۆ خواردنەوەو چەوساندنەوەی یەکترییە..

٢. لە ئیسلامدا سێ "بنەما" بۆ مەسەلەی موڵکداری دانراوەو کە عەقڵی هەموو کەسێکیش ئەیانسەلمێنێت.

یەکەم: یەکسانی لە موڵکداریدا موستەحیلەو "تەفازول" واقعە.

---

[٣٦٦] نهج البلاغ (ص ٥٢٦).

[٣٦٧] کۆمەڵگا (ل ٧٢).

[٣٦٨] کۆمەڵگا (٧١).

**دووەم: موڵکداری بێ قەیدو شەرتیش بەرەڵڵاییە.**

**سێیەم: میللەت هەمووی کرێکاری دەوڵەت نییە.**

**با شەرحێکی کورتی ئەم سێ بنەمایە بکەین و بیانسەلمێنین.. (سەعید حوی) بیریارێکی ئیسلامیی گەورەیە، ئەڵێت:**

**یەکەم: ئیسلام یەکسانی تەواو لە موڵکداریدا بە "موستەحیل" ئەزانێت بۆیە نایسەلمێنێت و داواشی ناکات، (بۆ نموونە با بیرکردنەوەکەی فوئاد مەجید میسری بخەینە تاقیگەوە، هەروەك لە دەقەکەی پێشوویەو دەرئەکەوێت کە ڕازی نییە خەڵك بە سیستەمی خاوەنداریێتیی ببرێت بەڕێوە).**

**با وا دابنێین ئەمانەوێت لە شارێکدا یەکسانی تەواو دروست بکەین و لە سەرەتاوە بڕیار بدەین بە یەکسانی بڕێك پارەو سەروەت و سامان بەسەر خەڵکی ئەو شارەدا دابەش بکەین، ئەمە هەرچەندە ناعەدالەتییە، چونکە ئەو شارە گەورەی تێدایەو منداڵی تێدایە ئەگەر وەك یەك شتیان پێ بدرێت نا دادییەو ناڕاستە لە ڕاستیدا.. (بەڵام با لەبەر خاتری نووسەر تا تێ بگات ئەو فیکرەیە چەندە ناواقیعییە). ئەو ناعەدالەتییەو ستەمە قەبوڵ بکەین بۆ ئەوەی یەکسانی تەواو دروست ببێت لە شارەکەدا، پاش یەك ساڵ لێگەڕاین و هەریەکە بەو بڕە موڵکە حەڵاڵ و زەڵاڵەی خۆی کە یەکسانە بە هاوڕێ و دراوسێکەی کەوتە کۆشش و بەرهەمهێنان و هێزە عەقڵی و جەستەیی و دەروونییەکانی خۆی بەکار هێنا، ئایا ئەنجامەکەی چی ئەبێت؟ ئایا ئەو یەکسانییە هەر ئەمێنێت؟ یان بۆ جارێکی تر تێك دەچێتەوە؟**

**دیارە ئەوەی کۆشش و هەوڵی زیاتری داوە، موڵکی زیادی کردووەو ئەوەشی تەمەڵی و بێ موبالاتی کردووە بەرەو ئیفلاسی ڕۆشتووە، ئایا چارمان چییە؟ تەسلیمی "ئەمری واقیع" ببین یان جارێکی تر هاوکێشەکە هاوسەنگ بکەینەوە؟ با بڵێین سەر لەنوێ بڕیار ئەدەینەوە کە جارێکی تر موڵکەکان بە یەکسانی دابەش ئەکەینەوەو ئەوەی زیادی پەیدا کردووە لێی ئەسەنینەوەو ئەیدەنە ئەوەی کە بێ موبالات بووەو سەر لەنوێ یەکسانییەکە دروست ئەکەینەوەو "تفاضل" ناهێڵین..**

**پاش ساڵێکی تر چی دەبینین؟ بێگومان دەبینین کابرای بێ موبالات و تەمەڵ زیاتر تەمەڵی و بێ موبالاتی دەست ئەداتێ و کابرای ڕەنجدەرو تێکۆشەریش خاو دەبێتەوەو پاڵی لێ ئەداتەوەو هێزی دڵی نامێنی خۆی بڕەنجێنێ و خۆی ماندوو بکات بۆ خەڵکی، چونکە هەست ئەکات هەوڵدان سوودی نییە بۆی و هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئەوەدا نییە کە پاڵی لێداوەتەوەو "بێ موبالاتە"، لەبەر ئەمانە پاش ماوەیەك ژیان و کۆشش کردن کز ئەبێت و بەرهەم کەم ئەکات و ژیان ڕائەوەستێت و زۆرنابا ئەو کۆمەڵگەیە ئەڕوخێت و دائەڕمێت.. کەواتە زەرەروزیانی ئەم بیرکردنەوەیە لەوەدا نییە باس بکرێت:**

**. ئەوەی تۆزێك پێش ئێستا وتمان زیاتی هەرە گەورەی ئەو بیرکردنەوەیە.**

**. زیانێکی تری ئەو بیرکردنەوەیە ئەوەیە، پەیوەندی کۆمەلایەتیی ئەو شارە ئەبێتە پەیوەندی ڕق و کینەو خۆخواردنەوە بۆ یەکتری.**

**. زیانێکی تری ئەم بیروڕایە ئەوەیە ئەم بیرو بۆچوونە شەڕ لەگەڵ سروشت و فیترەتی مرۆڤدا ئەکات و لەگەڵ ناخیدا دژو دوژمنە، چونکە "خاوەنداریێتیی" غەریزەیە لە مرۆڤدا وەك هەموو غەریزەکانی تری، وەك "غەریزەی جنس" غەریزەی خواردن، غەریزەی تەدیین، .. هتد، هەرکەس هەوڵی خەفەکردنی بدات ئەوەیان ئەو مرۆڤە وشك ئەکاتەوەو لە کاری ئەخات یان تووشی یاخیبوونی ئەکات یان ئەیکاتە کەسێکی "حولحولی مەزهەب"و هەر ڕۆژەو هەر سەعاتەی لەسەر عەقڵ و ڕایەکە[٣٦٩] و چوارەمی نییە.**

**. زیانێکی تری ئەو بیرکردنەوەیە ئەوەیە کە خەڵکی لە ئەنجامی پیادەکردنی ئەو سیاسەتە ناچار ئەبن دەست بدەنە فرت و فێڵ و ماڵ شاردنەوەو درۆکردن و حیلەو حەواڵە..**

---

[٣٦٩] سید قوتب بەرەحمەت بێت، لە کتێبی (السلام العالمي والاسلام)دا بە درێژی باسی ئەم خاڵانە ئەکات لە ڕووی "زانستی سایکۆلۆژی"و واقعییەوە، باسی ئەوە ئەکات دژایەتی کردنی "فیترەت" چ زیانێکی گەورە لە مرۆڤو مرۆڤایەتی ئەدات، هەرکەس زانیاری زیاتری ئەوێ با ئەو کتێبە بخوێنێتەوە.

لەبەر ئەمانەیە قورئان بنەمای "تفاضل" لە موڵكداریو ڕزقدا ئەسەلمێنێت، وەك ئەفەرموێت: (وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُم بَعْضاً سُخْرِيّاً)[٣٧٠]، ئەمەش لەبەر ئەوەیە "تفاضل" شتێكی واقعیەو هەركەسو تاقمێكیش سەر بكێشن بە بەردی واقعیدا ئەوە سەری ئەوان نەرم ئەبێت نەك بەردەكە!

دووهەم: "موڵكداری بێ قەیدو شەرت"یش بەرەڵڵاییەو ئیسلام پێی ڕەفزە، واتە: ئیسلام لێ ناگەڕێت خەڵك هەرچۆن حەز بكاتو بیەوێت ماڵ پەیدا بكاتو دەوڵەتی ئیسلامیی لێی نەپرسێتەوەو وازی لێ بێنێت تا دەستڕۆیشتوو بەهێزەكان، هەژارو دەستكورتەكان بخۆنو تەرازووی داد (نەك یەكسانی) لارەسەنگ ببێتو بەرەڵڵایی لە موڵكدارێتییدا دروست بێت وەك لە یاسای سەرمایەداریدا هەیەو جێبەجێ ئەكرێت..

لەبەر ئەوە لە ئیسلامدا موڵكدارێتیی ڕێكدەخرێتو ڕێگەكانی پەیداكردنی موڵكو فەرزكردنی بەشی هەژاران لەو موڵكەدا دیاری ئەكات تاوای لێ نەیەت پارەو موڵك تەنیا لای هەندێك بێتو چۆنی ویست وا لێ بخوڕێتو هەندەكەی تر لەتاو هەژاریو دەستكورتیو لێ نەپرسینەوە هەموو سەعاتێك ئاوات بە مەرگی خۆیان بخوازن.. ئەمە ئەوەیە كە خوای گەورە ئەفەرموێت: (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ)، نابێت سەروەتو سامان تەنیا لە نێوان دەوڵەمەندەكاندا دەستەو دەست بكات.

سێیەم: ئیسلام ئەو بنەمایەشی پێ ڕەفزە كە دەوڵەت خاوەنی هەموو شتێك بێتو میللەت بەگشتی (كرێكاری) دەوڵەت بن، چونكە ئەوە لە سێ چوار ڕووەوە زیان بە پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان ئەگەیەنێت..

. لەلایەك ئەمە لە تایبەتمەندیو ئەركەكانی دەوڵەت نییە، بەڵكو دەوڵەت ئەركی ڕاگرتنی (داد)ی هەیەو ئێمەش لە پێشەوە باسی ئەوەمان كرد نابێت كاربەدەستو بەرپرسەكان خەریكی "بازرگانی"و "ناردنو هاوردن" بن لە حكومەتداو زیانە گەورەكانیمان باس كردو فەلسەفەی ئەم یاساغكردنەمان لە سیستەمی سیاسیی ئیسلامدا باس كرد.

. لەلایەكی تریش تواناو وزەیەكی زۆر لە كیس ئەچێت، لەبەرئەوە ئەو كەسەی هەوڵ بۆ خۆی ئەدات زیاتر خۆی ئەڕەنجێنێتو بەرهەم ئەهێنێت لەوەی (كرێكارو كرێگرتەی) یەكێكی تر بێت.

. لە لایەكی تریشەوە گیانی (بەرهەڵستكار)و موعارەزەش لە "گەل"دا ئەمرێتو ئیتر ناتوانێت ڕاپەڕێتو نانی خۆی ببڕێت، بۆیە لە هەموو شتێكدا هەر "بەڵێ"ی لەسەرە.

. لەلایەكی تریشەوە حكومەتو دەوڵەت بە مەیلی خۆی لائەداتو ئەوەی كاربەدەستو بەرپرسەكان ئەیانەوێت بۆیان ئەچێتە سەرو كەس لێیان بە جواب نایەت، چونكە كارەكەی لە دەست ئەداتو "نان بڕاو" ئەبێت لە دواییدا!!

كەواتە ئیسلام ئەم سێ "بنەمایە" ئەسەلمێنێتو دژەكانی بە ناواقیعیو زیان ئەزانێت، كێش قەناعەتی وانییە با خۆی تاقی بكاتەوە، ئەگەر لە تاقیكردنەوەی خەڵك سوود وەرناگرێت..

لەم شەرحە كورتەدا گەیشتینە ئەوەی لە ئیسلامدا موڵكداریی هەروا بەرەڵا نەكراوەو موڵكداریش سەرچاوەی خێرو بێرو بەرهەمیشە، پەیوەندییەكانیش لە نێوان دەوڵەمەندو هەژاردا پەیوەندی سۆزو دوعای خێركردنە بۆ یەكتری لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، نەك ڕقو كینەو خۆخواردنەوەو دوعا لەیەكتر كردن، چونكە لە ئیسلامدا "پارەو موڵك" بە ڕەهایی هی دەوڵەمەند نییە بە تەنیا بەڵكو هی "خوایە"و بەشی هەژارانیشی تێدایەو دەوڵەت بۆی هەیە بە بنەمای (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ) نا هاوسەنگییە بێتامەكانی كۆمەڵگە ڕاست بكاتەوە جا با خوێنەرو با فوئاد مەجید میسریش ئەمە بزانن.

. فوئاد مەجید بەردەوام خەریكی ناهەقی وتنەو ئەڵێ: "ئەبولعەتای شاعیری ئەو سەردەمە وێنەیەكی كتو متی باری ناهەمواری ژیانو شێوەی هەڵسوكەوتی دەسەڵاتدارانی عەبباسی لە بەرانبەر جوتیارانو جەماوەری خەڵكدا بەگشتی، بەم جۆرە دەكێشێو دەڵێ:

يا ليت جور بني مروان عاد لنا     يا ليت عدل بني عباس في النار"[٣٧١].

---

[٣٧٠] لە پێشەوە باسمان كرد كە فوئاد مەجید میسری بە هەڵە ئەم ئایەتەی تەفسیر كردووەو "بەكارهێنانی" لێ بووە بە "چەوساندنەوە".

[٣٧١] كۆمەڵگا ل (٧٥).

**نووسەر ئەیەوێ بڵێ: نە دەوڵەتی "بەنی ئومەییە"و نە دەوڵەتی "بەنی عەبباس" هیچیان جێگەی قەبووڵی خەڵك نەبوون، نە ئەو "داد"ی هەبووەو نە "داد"ی ئەم بە کەڵکی خەڵك هاتووە! بەڵام با شتێك لەسەر ئەم بێ ویژدانییە بڵێیین:**

**دەوڵەتی "بەنی ئومەییە" لە ساڵی (٤٠)ی کۆچییەوە دەست پێ دەکاتو تا ساڵی (١٣٢)ی کۆچیو دەوڵەتی "بەنی عەبباس"یش لە ساڵی (١٣٢)ی کۆچییەوە دەست پێدەکات تا (٦٥٦)ی کۆچی کە سوپای "تەتار" پەلاماری دونیای ئیسلامیاندا، کەچی فوئاد مەجید میسری زیاتر لە شەش سەد ساڵ هەروا بە نووکە قەڵەمێك کەرەتی سیفر ئەکاتو بە هەموو عەقڵێکەوە ئەڵێ: "بزووتنەوەی عەبباسییەکانیش. هەر هەمان سیاسەتی پێشووی ئەمەوییەکانیان پەیڕەو کردو بگرە ستەمی کۆمەلایەتییان گەیاندە ئاستێك هەموو سنوورێکی بەزاند"[٣٧٢].**

**بەڵام کاکە فوئاد! خۆ مێژوو وا ناڵێ! خۆشت لە شوێنی تردا وا ناڵێی! مێژوو ئەڵێ:**

**. موعاویە کە یەکەم خەلیفەی "بەنی ئومەوییە"یە لە "حیلم"و "سیاسەت"و "بەڕێوەبەرایەتی"دا هاووێنەی بە دەگمەن هەبووە، ئەبێ واش بووبێت ئەگینا بەڕێوەبردنی هەرێمێکی گەورەی وەك شام بیست ساڵ بە ئەمیریو بیست ساڵی تر بە خەلیفایەتی بێ ئەوەی گەشەی مەدەنییەت بوەستێ چۆن بە دوعاو خوایش کردن ئەکرێت.. ئەوە بەسە کە بووەتە پەندی سەر زمانی خەڵکی کە با بە "تەڵە مووەکەی موعاویە"[٣٧٣] کار بکەین.**

**. عومەری کوڕی عەبدولعەزیز یەکێکی ترە لە خەلیفەکانی "بەنی ئومەییە" کە مێژووی هەموو مرۆڤایەتی پیاوێکی بەدینو بە ویژدانو جەرگ قاییمو ژیرو سیاسیی وای لەوە ناچێ تێدا هەڵکەوتبێت، کەسێك ئالای "ڕیفۆرم"ی لە کاتێکدا هەڵگرت کە هەندێ ئینتهازیو نەفس نزم خەریکبوون دەوڵەتی خیلافەت ناشیرینو لاواز بکەن لەبەردەم دۆستو دوژمندا.**

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز کە مێژوو نووسان ئەڵێن: "خولەفای ڕاشیدین پێنج کەسن، ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو عومەری کوڕی عەبدولعەزیز"[٣٧٤]. دیسان مێژوو ئەڵێ:**

**. لەو چەند ساڵەدا شارستانێتێکی گەورە لە ڕۆژهەلاتدا دروست بوو کە بوو بە هۆی ڕۆشنکردنەوەی ئەورووپاش، خوێندەوارو بە ویژدانەکانیان دان بەو قەرزدارییەدا ئەنێن وەك لە پێشەوە باسمان کرد.**

**. مێژوو ئەڵێ: لەو چەند سەد ساڵەدا زانستو زانیاری هەنگاوی گەورە گەورەی نا:**

**. سەرەتای هەموو زانستە مرۆڤایەتییەکان دامەزران، وەك "طب"و "هندسة"و "کیمیا"و "فیزك"و "جەبر"و "زیندەوەرزانی".. هتد.**

**. زانای گەورە گەورەی وا پەیدا بوو لە ڕۆژهەلاتدا کە ڕۆژئاوا تا ئێستاش سوود لە زانیارییەکانیان وەردەگرن، وەك "غەزالی"و "ئیبن خلدون"و "بێرونی"و "ئیبن سینا"و "ئیبن حزم"و "فارابی"و "ئیبن تەیمیە".. هتد.**

**فوئاد میسری ئەڵێ: ".. لە سیستەمی ئابوری کۆمەڵایەتی ئیسلامدا کۆیلەیەتی حەرام نەکراوەو بەڵکو برەویشی پێدراوە"[٣٧٥].**

**هەروەها ئەڵێ: "ئاینی نوێ (مەبەستی ئیسلامە) هیچ سنورێکی بۆ کۆیلەیەتی دانەناوەو تەنانەت شەخصی پەیامبەر خۆی خاوەنی کۆیلە بووە"[٣٧٦]. فوئاد مەجید میسری لەم مەسەلەی "کۆیلەو کۆیلەیەتیدا" زۆر شتی سەیرو سەمەرەی تێکەڵ کردووە، دان بە زۆر شتی چاکدا ئەنێتو لە زۆرشتیش خۆی لائەداتو تەفسیری خراپ بۆ شتەکانی تریش ئەکات،**

---

[٣٧٢] کۆمەڵگا ل (٧٥).

[٣٧٣] "شعرة معاوية" پەندێکە بۆ کەسێك بەکار دێت کە پەیوەندی لەگەڵ هەموو کەسێکدا بپارێزێت، موعاویە ئەڵێت: "هەمیشە لە نێوان خۆمو خەڵکیدا تەڵەموویەك پەیوەندی ئەهێڵمەوە، کەی ویستم ڕایئەکێشمو نایەڵم بپچڕێو کەی ئەو ڕایکێشا من شلی ئەکەمەوە تا نەبچڕێو کەی ئەو بەریدا من ڕای ئەکێشمو نایەڵم بەربێت"، سەیری (حسن البنا وحكمة معاوية) محمد عبدالله السمان بکە.

[٣٧٤] البداية والنهاية (٩\٢٠٣).

[٣٧٥] کۆمەڵگا ل (٨٢).

[٣٧٦] کۆمەڵگا، ل (٧٨).

هەر دەورو خولی برینێکییە بەسەریەوە بنیشێتەوە[٣٧٧]، بە بڕوای من ئەگەر فوئاد میسری ئەو شتە چاکانەی دانی پێداناون ئەوانەشی خۆی لێ لاداون ڕیزبەندی بکردایە، بینشێکی تەواوی لە مەسەلەکەدا بۆ دروست ئەبوو ئەوەندەش شیلەی پێ ئەدا پێویستی بەوە نەدەبوو بەسەر هەندێ برینەوە بنیشێتەوە!

با جارێ هەر لە گوازراوەکانی خۆی بینشێك دەربارەی ئەو سنوورانە دروست بکەین کە ئیسلام بۆ نەهێشتنی کۆیلە دایناوە، پاشان بینشەکە بە ئەو شتانەی تر تەواو دەکەین کە فوئاد میسری باسی نەکردوون و شاردوونیەتیەوە.. نووسەر ئەڵێ: "ڕاستەو نکولی لەوە ناکرێت ئاینی ئیسلام باسی چاککردنی حاڵی کۆیلەی کردووە، بەڵام ئەم چاککردنە مانای ئازادی کردنی نییە.. هەڵوێستی ئاینی ئیسلام لە ئاست سیستەمی کۆیلەیەتیدا هەڵوێستێکی ئەخلاقییە نەك یاسایی"[٣٧٨].

. دیسان دەڵێ: "هەرکەسێ سوێندێکی درۆی خوارد دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات"[٣٧٩].

. دیسان دەڵێ: "هەرکەسی بە هەڵە کەسێکی کوشت دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات"[٣٨٠].

. دیسان دەڵێ: ".. ئەو کەسەی کە گوناهێك دەکاو دەزانێ سەرپێچی لە فەرمانی خوا کردووە دەبێ کۆیلەیەك ئازاد بکات"[٣٨١].

. دیسانەوە دەڵێ: "شێوەکانی دیکەی ئازادکردنی کۆیلە لە ئاینی ئیسلامدا ڕێوشوێنی بۆ داناوە، یەکێکیان شێوەی ئازادکردنی بە قەواڵە (سەنەد).. لە فەرهەنگی ئیسلامدا پێی ئەوترێ (المكاتبه)، هەردوولا واتە: (کۆیلەو خاوەنەکەی) لەسەر بڕێك پارە ڕێکدەکەون و دەبێ کۆیلەکە لە ماوەیەکی دیاریکراودا ئەو بڕە پارەیە بدا بە خاوەنەکەی"[٣٨٢].

. هەر خۆی دەڵێ: "شێوەیەکی تری ئازادکردنی کۆیلە (التدبير)ە کە خاوەن کۆیلە بەر لەوەی بمرێ وەسیەت دەکات دوای مردنی، کۆیلەکەی ئازاد بکرێ"[٣٨٣].

نووسەر خۆی لا ئەدات لە وەی کە کۆیلەی ژن ئەگەر منالی بووبێت ئەوە ئۆتۆماتیکی ئازاد کراوە، بۆیە لە ژێر لێوەوەو بە فێڵەوە ئەڵێ: "کۆیلە کەسکی پڕ بووە خاوەنەکەی مافی فرۆشتنەوەی لەدەست ئەدات!!"[٣٨٤]. جا بۆ ئەوەی خوێنەر ئەمە وەك ئیمتیاز سەیر نەکات خێرا ئەڵێ: "ئەو منالەش لە کەنیزەك بوایە وەك ئەو منالە تەماشا نەئەکرا کە دایکی ئازاد بووە"[٣٨٥]، ئەمە ئەوانەی فوئاد مەجید میسری باسی کردوون لە ڕێ و شوێنی ئیسلام بۆ ئازادکردنی کۆیلە، جا با هەندێکی تر لەو ڕێ و شوێنانە باس بکەین کە نووسەر باسی نەکردووەو شاردونیەتیەوە.

"تقي الدين الحسني الحصني الشافعي الدمشقي لە کتێبی (كفاية الأخيار في شرح غاية الاختصار)دا کە کتێبێکی فقهییە لە مەزهەبی شافعیدا، ئەو حاڵەتانە باس ئەکات کە ئیسلام دایناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلە:

. "واذا اعتق بعض عبد عتق جميعه"[٣٨٦]، واتە: ئەگەر کابرا بەشێکی عەبدی ئازاد کرد ئەوە هەر بەو قسەیە هەمووی ئازاد ئەبێ.

---

[٣٧٧] فوئاد مەجید میسری لە یەعقوبی شیعە مەزهەبەوە چەند قسەی ناقولا ئەگوازێتەوە، گوایە لە سەردەمی خیلافەتدا مومارەسەی سێکسی لەگەڵ کۆیلەی نێرینەدا کراوە، ئەڵێ: "قازییەك ئەم کارەی لەگەڵ پێنج سەد کۆیلەی نێرینەی خۆیدا کردووە" (کۆمەڵگا، ل (٨٦)). ئاخر کەس هەیە عەقڵی جێگەی شتی وای تێدا ببێتەوە! دانەو دوانیش نا (٥٠٠) کەس!! لە دەوڵەتی عەلمانیشدا نا لە دەوڵەتی خیلافەتدا!!

[٣٧٨] کۆمەڵگا، ل (٧٨).

[٣٧٩] کۆمەڵگا، ل (٧٩).

[٣٨٠] کۆمەڵگا، ل (٧٩).

[٣٨١] کۆمەڵگا، ل (٧٩).

[٣٨٢] کۆمەڵگا، ل (٨١).

[٣٨٣] کۆمەڵگا، ل (٨٢).

[٣٨٤] کۆمەڵگا، ل (٨٣).

[٣٨٥] کۆمەڵگا، ل (٨٣).

[٣٨٦] كفايه الاخيار (١٧٦/٢).

**. "فان اعتق شركا له في عبد وهو موسر سرى العتق الى باقيه وعليه قيمة نصيب شريكه"[٣٨٧]، واته: ئەگەر دوو كەس له كۆيلەيەكدا شەريك بوونو يەكێكيان بە شەكەى خۆى ئازاد كرد، ئەوە كۆيلەكە بە تەواوەتى ئازاد ئەبىٚ و فەرزە لەسەر ئەميان كە حاڵى باشە، بەشەكەى ترى شەريكەكەى بكڕێتەوە..**

**. "ومن ملك واحدا من والديه، أو مولوديه، عتق عليه"[٣٨٨]، واته: هەركەسێك موڵكايەتى بۆ دروست بوو لە كۆيلەيەكدا كە يەكێك بێت لە دايكو باوكى يان كوڕو كچى ئەوە ئازاد ئەكرێن.**

**. "والكتابة مستحبة اذا سالها العبد وكان مأمونا مكتسبا"[٣٨٩]، خۆ كڕينەوە كارێكى پەسەندو چاكە ئەگەر كۆيلە خۆى داواى بكات بەو مەرجەى جێگەى متمانەو كاسبكاريش بێت.**

**. "والكتابة لازمة من جهة السيد ومن جهة العبد جائزة"[٣٩٠]، واته: خۆ كڕينەوەو موكاتەبە، ئەگەر كۆيلە داواى كرد ئەبێتە شتێكى ئيلزامى لەسەر خاوەنەكەى هەرچەندە كارێكى جائيزە، بە نيسبەت عەبدەكەوەو فەرز نابێت لەسەرى، جا فەلسەفەى ئەم ئيلزامبوونەى لەسەر خاوەن كۆيلەو جائيزبوونەى بۆ كۆيلە ئەوەيە كە بوار بۆ پەشيمانبوونەوەى خاوەن كۆيلە لەو ئازاد كردنە ناهێڵێ، زانايانيش دەڵێن: "چونكە ئەم ئازادبوونە شەنسى كۆيلەيە نەك خاوەنەكەى، ئەگەر وانش نەبووايە كۆيلە لەوە دڵنيا نەدەبوو كە خاوەنەكەى پەشيمان نابێتەوە، بۆيە هێزى دڵى نەئەماو تواناى كاسبى كردنى لاواز ئەبوو"[٣٩١].**

**. "وعلى المكاتب التصرف بما فيه تنمية المال.. المكاتب يملك بعقد الكتابة منافعه واكسابه الا انه محجوز عليه استهلاكها بغير حق"[٣٩٢]. واته: ئەو كۆيلەيەى قەواڵە ئەنووسىٚ مافى ئەوەى ئەكەوێتە دەست ئەو پارەى هەيەتى گەشەى پىٚ بدات..و لەو كاتەوەى قەواڵەكە ئەنووسىٚ هەموو كارو سوودێكى بۆ خۆيەتى نەك خاوەنەكەى[٣٩٣]، تەنيا ئەوەندە نەبێت . حيجرى . ئەوەى لەسەر ئەبێت نابىٚ ئەو ماڵەى پەيداى ئەكات هەر وا بە فيڕۆ سەرفى بكات.**

**. "وعلى السيد ان يضع عنه من مال الكتابة مايستعين به"[٣٩٤]. واته: واجبى شەرعى خاوەن كۆيلەيە كە پاش ئەوەى ڕێئەكەون لەسەر بڕىٚ پارە بۆ خۆكڕينەوە هەندىٚ لەو پارەيەش دابشكێنىٚ تا هاوكارى كۆيلەكە بكاتو يارمەتى بدات.**

**. "ئەگەر خاوەن كۆيلەيەك خاترى كۆيلەيەكى نەگرتو لە هەندێكى خۆش نەبوو كاتێك كۆيلە پارەكەى پەيدا ئەكات بەو شێوەيەى لە قەواڵەكەدا هاتووە، واجبى شەرعى خاوەنەكەيەتى ئەوەندەى پارە بداتىٚ كە خۆى پىٚ بنێتە يەكو كاروبارى خۆى پىٚ ڕێك بخات"[٣٩٥]، هەندى لە زانايان ئەفەرموون: "پێويستە چواريەكى بداتىٚ، هەندێكى تر ئەفەرموون: سێيەك، هەندێكيش ئەفەرموون: بە پێى تواناى خاوەن كۆيلەكەيە ئەگەر دەستكورت بوو بڕێكو ئەگەر دەستڕۆيشتووش بوو ئەوە بڕێكى زياتر"[٣٩٦].**

**پاش ئەم دوو كۆمەڵە گوازراوانە با ڕيزبەندييەك بكەين بۆ ئەو "ياساو ڕێسايانەى ئيسلام" كە گرتوويەتيەبەر بۆ ئازادكردنى كۆيلە:**

---

[٣٨٧] كفايه الاخيار (١٧٦/٢)، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموىٚ: (من اعتق شقصا له في عبد فخلاصه في ماله ان كان له مال، فان لم يكن له مال استسعي العبد غير مشقوق عليه). (مختصر صحيح مسلم: ص٢٦٢)، غير مشقوق عليه، واته: ئيلزام ناكرىٚ ئەگەر نەيتوانى.

[٣٨٨] كفاية الاخيار (١٧٧/٢)، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموىٚ: (لايحزي ولد والدا، الا ان يجده مملوكا فيشتريه فيعتقه)، واته: مافى دايكو باوكى نادات كەسێك كە بە كۆيلەيى بيانبينێت ئەو كاتە نەبىٚ ئازاديان ئەكات (مختصر صحيح مسلم (ص٢٦٢) ژمارەى فەرمودە (٨٩٢)).

[٣٨٩] الكفاية (١٧٩/٢).

[٣٩٠] الكفاية (١٨٠/٢).

[٣٩١] الكفاية (١٨٠/٢).

[٣٩٢] الكفاية (١٨٢/٢).

[٣٩٣] تەنانەت "قازى عياض" ئەفەرموىٚ: "هەندىٚ لە پياوانى سەلەف ئەفەرمون: هەر ئەو كاتەى كە (قەواڵەكە) ئەنووسىٚ يەكسەر ئازاد ئەبىٚو پارەكە ئەبێتە قەرز لە گەردنيداو جارێكى تر هەرگيز ناكرێتەوە بە عەبدو كۆيلە". (ارشاد الساري شرح صحيح البخاري، بهامش صحيح مسلم (٣٤٢/٦).

[٣٩٤] كفاية الاخيار (١٨٠/٢).

[٣٩٥] كفاية الاخيار (١٨٠/٢).

[٣٩٦] كفاية الاخيار (١٨٠/٢).

١. ئیسلام حەرامی کردووە کە بە "کۆیلە" بووترێت، "فلآنی عەبدم" بەڵکو ئەبێ بووترێت "فتایی وفتاتی"، واتە: کوڕە گەنجەکەم‌و کچەکە گەنجەکەم، ئەمەش جۆرە ڕێزێك بوو ئیسلام داینا بۆ کۆیلە، نەك هەر ئەمە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: "خزمەتکارو کۆیلەکانتان برای ئێوەن..!!"[٣٩٧].

٢. ئیسلام هات کێشەی "کۆیلەی"، "سنووردارکرد لە "شەڕ"دا، ڕێگەکانی تری بە عەبدکردنی یاساغ کرد، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو شەڕ پەیوەندی بەلایەنی بەرانبەرەوە هەبوو، نەئەبوو یەك لایەنە بڕیاری بە کۆیلەکردن ڕابگرێت، چونکە لەو ڕۆژەدا شکستی گەورەی لە لایەنی یەکەمدا دروست ئەکردو مەعنەویاتی شەڕەنگێزی زیاتری بۆ لایەنی دووهەم دروست ئەکرد، لایەنی دووهەم پەلاماری ئەداو هەرچی بگرتایە ئەیکردە "عەبد"، نەئەبوو لایەنی بەرانبەر وانەکات، چونکە ئەوە شەڕەو شەڕیش یاساو ڕێنمایی تایبەتی خۆی هەیەو وەك ئەڵێت: "للضرورة احکام".. د. محمد عبدالله دراز ئەڵێ: حاڵەتی کۆیلە وەك ئەوە وابوو، ماڵێك ئاگری تێ بەر بووبێت‌و پێویست بێت مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ، بۆیە یەکەمجار ئاگر بڕی بۆ ئەکرێت، تا ماڵەکانی تریش نەسووتێن‌و پاشان هەوڵ ئەدرێ ئەوەی مرۆڤ‌و گیانداره ڕزگار دەکرێت‌و دەرگاو پەنجەرەکان ئەکرێنەوە تا ئەوانە ڕزگاریان ببێت‌و پاشان شتی بەنرخ‌و نەختینە ڕزگار ئەکرێت‌و لەوەودوا کوژاندنەوەی تەواوی ئاگرەکە دەست پێ ئەکرێ.."[٣٩٨].

ئیسلامیش بۆ ئازادکردنی کۆیلە بە هەمان شێوە:

. سەرەتا ئاگری بڕی‌و نەیهێڵا مەسەلەی کۆیلەکردن هەموو شوێنەکان‌و بوارەکانی ژیان بگرێتەوە[٣٩٩]، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ هەڕەشەی گەورەی هەیە لەسەر ئەو کەسەی مرۆڤی ئازاد ئەفرۆشێت‌و پارەکەی ئەخوات[٤٠٠].

. پاشان دەستی کردە ڕزگارکردنی کۆیلە بە زۆر ڕێگە:

* هەرکەس "ظهار"[٤٠١]ی کرد ئەبێت کۆیلە ڕزگار بکات.

* هەرکەس "سوێندی خۆی شکاند" ئەبێت کۆیلە ڕزگار بکات.

* هەرکەس دەستی چوو بە خوێنی کەسێکدا بە هەڵە، ئەبێت کۆیلە ڕزگار بکات.

* هەرکەس لە ڕەمەزانداو بە ڕۆژەکەی "جماع" لەگەڵ خێزانیدا بکات ئەبێت کۆیلە ڕزگار بکات.

* کەففارەتی هەموو "نەزرێك" وەك کەففارەتی هەموو سوێنێك وایە، کۆیلە ڕزگارکردنی تێدایە[٤٠٢].

* هەرکەسێك دای لە کۆیلەکەی ئەبێت ڕزگاری بکات.

* هەرکەس (لە موحاسەبەی قیامەت ئەترسێت، یان خێری بۆ قیامەت ئەوێت باشترین چاکە ڕزگارکردنی کۆیلەیە بیکات).

* هەر کۆیلەیەك داوای ئازادکردنی خۆی بکات لە خاوەنەکەی بە "موکاتەبە" واجبە بە گوێی بکرێت.

* هەر کۆیلەیەك داوای ئازادکردنی خۆی بکات ئەبێ هاوکاری "ماددی"یش بکرێت.

* هەموو ئەو ڕێگەیانەش کە لە پێشەوە باسمانکرد چ ئەوانەی فوئاد میسری لە کتێب گواستونیەتییەوەو چ ئەوانەش ئێمە لە کتێبە فقهییەکان گواستمانەوە کە کردیە نزیکەی (١٦) ڕێگەو بەمانەی ئێرەشەوە ئەگەنە بیست‌و پێنج خاڵێك.

. پاش ئەو دوو هەنگاوە ئیسلام هات یەك لیستی گەورەی لە یاساو ڕێنمایی‌و "واجبات" دانا بۆ چونێتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەوانەدا کە بە کۆیلەیەتی ئەمێننەوە لەبەر هۆیەك یان زیاتر، لەو یاساو ڕێنماییانە:

---

[٣٩٧] رواه مسلم (مختصر صحيح سلم: ص٢٦٣، ژمارەی فەرمووده/ ٩٠٤).

[٣٩٨] دستور الاخلاق في الاسلام/ محمد عبدالله دراز، بەداخەوە لە کاتی نووسینەوەکەدا ئەو سەرچاوەیەم چنگ نەکەوت تا دەقەکەی خۆی‌و لاپەڕەکانی بنووسم.

[٣٩٩] وەك کۆیلەکردن لەبەر نەداری یان لەبەر قەرزاری یان لەبری خوێن.. کە لە جاهیلییەتدا بوونیان هەیە.

[٤٠٠] پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت:: (ثلاثة انا خصمهم يوم القيامة: رجل اعطى بي (أي عهدا) ثم غدر، ورجل باع حرا فأكل ثمنه، ورجل استأجرأ جيرأ، فأستوفى منه، ولم يعطه اجره) (رواه البخاري).

[٤٠١] (ظهار) واتە: کەسێك بە خێزانەکەی بڵێ تۆ وەك دایکم وایت، یان وەك خوشکم وایت، بەم وتەیە لێی یاساغ دەبێت تا ئەو کاتەی (فدیە)کەی ئەدات.

[٤٠٢] شرح صحيح مسلم، النووي/ شرح حديث (كفارة النذر كفارة اليمين).

**. ئەبێت بە ناوی "براکەم" یان "کوڕە گەنجەکەمو کچە گەنجەکەمەوە" بانگ بکرێت نەك عەبدەکەم.**

**. ئەبێ لەو خواردنەی خۆتان بخۆن نەك کەمتر لەوەی خۆتان.**

**. نابێ ئەرکی قورسیان پێ بسپێردرێتو ئەگەر کاری گەورەشیان پێ سپێردرا ئەوە ئەبێت خۆتان یارمەتییان بدەن.**

**. ئەبێ لەو جلو بەرگەیان بکەنە بەرکە ئەیکەنە بەر ماڵو منداڵی خۆتان.**

**. هەرکەسێك جوێن بە کۆیلەکەی بدات، مەحکەمە ئەکرێتو هەرکەسیش لێی بدات ئەوە کۆیلەکە ئازاد ئەکرێ.**

**. کۆیلەیەك گوناهێك بکات، نیوەی ئەو سزایە ئەدرێت کە کەسێکی ئازاد ئەیکات.**

**. لە شەڕدا کە کۆیلە ئەگیرێت ناکوژرێت، لەبەر ئەوەی ئەشێ بەزۆر هێنرابێت بۆ شەڕو بە قەناعەتەوە نەهاتبێت.**

**هەموو ئەو شتانەو زیاتریش لە ڕێنمایی ئیسلامییدا بە وردیو ڕاشکاوی ناوبراون، بۆ نموونە سەیری ئەم فەرموودانە بکە:**

**. ئیبن عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) ئەڵێ گوێم لە پێغەمبەر بوو ئەیفەرموو: (من ضرب غلاما له حدا لم يأته أو لطمه، فأن كفارته أن يعتقه) رواه مسلم، واتە: هەرکەسێك لە غوڵامەکەی خۆی بدات لەسەر "حد"ێك کە نەیکردبێ یان زللەی لێ بدات، کەففارەتی ئەو گوناهەی تەنیا ئازاد کردنییەتی"[403].**

**. ئەبو زەڕ ئەڵێ: جارێکیان منو کابرایەکی برام قسەیەك کەوتە نێوانمان، دایکی ئەو "عەجەم" بوو، قسەیەکم وت بە دایکی، لای پێغەمبەر ﷺ شکاتی لێکردم، کە گەیشتمە پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ئەبوزەڕ ئەزانی تۆ هێشتا "جاهلیەت"ت تێدا ماوە، عەرزم کرد قوربان: هەرکەس قسە بە زەلامێك بڵێ، قسە بە باوكو دایکی ئەوترێ، فەرمووی: يا ابا ذر انك امرء فيك جاهلية هم اخوانكم، جعلهم الله تحت ايديكم، فأطعموهم مما تأكلون، والبسوهم مما تلبسون، ولا تكلفوهم مايغلبهم، فأن كلفتموهم فاعينوهم" رواه مسلم (مختصر صحيح مسلم/ ص٢٦٥ رقم الحديث: ٩٠٤)، واتە: ئەی ئەبو زەڕ، تۆ پیاوێکی هێشتا جاهلیەتت تێدایە، ئەمانە برای ئێوەن، خوای گەورە ئەمڕۆ کردونیەتە خزمەتکاری ئێوە، کەواتە لەو شتەی خۆتان ئەیخۆن دەرخواردی ئەوانیشی بدەن، لەو جلەش خۆتان لەبەری ئەکەن بیکەنە بەر ئەوانیش، کارێکیان پێدا مەدەن بۆیان نەکرێت، ئەگەر کاری واشتان پێ سپاردن خۆشتان هاوکاریان بکەن!!**

**. کۆیلەو خزمەتکار ئەمەندە پارێزگاری لە قەدرو حورمەتیان کراوەو یاسا بۆ ئازادکردنیان دانراوە، سەحابەیەکی بەڕێزی وەك ئەبو هورەیرە ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (کۆیلەیەك خاوەنی هەبێ‌و چاکەکاربێت دووقات ئەجری دەست ئەکەوێت، جا ئەبو هورەیرە دوای ئەوە فەرمووی سوێند بەو کەسەی نەفسی منی بەدەستە لەبەر جیهادو تێکۆشان لە پێناوی خوادا نەبوایەو لەبەر حەجو گوێڕایەڵی دایکم نەبوایە حەزم ئەکرد ئەو ڕۆژەی ئەمرم غوڵامو مەملوکی کەسێك بومایە)[404].**

**ئەم یاساو ڕێنماییانەی ئیسلام دایناوە بۆ ئازادکردنی کۆیلە وای کردووە لە زانایان بڵێن: "شەریعەتی ئیسلام ئەیەوێت هەر لە ئەساسەوە پلە پلە کۆیلەیەتی نەهێڵێت"[405]، لە ڕاستیشدا "هدف"و ئامانج لەو هەموو "یاساو ڕێنماییانە" چیترە ئەوە نەبێت؟!**

**لێرەدا حەقیقەتێك هەیە حەز ئەکەم فوئاد میسری لێکۆڵینەوەی بۆ بکات ئەویش ئەوەیە بەرهەمی ئەو ڕێساو یاساو تەعلیماتانەی ئیسلام داینان بۆ ئازادکردنی کۆیلە ئەوەیە ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا کۆیلەیەتی نەماوەو کۆتایی پێهاتووە کەچی لە دونیای میللەتانی تردا تا ئێستاش بازرگانیکردن بە کۆیلەوە لە ناویاندا هەر ماوەو کاری پێدەکەن، سەرمایەدارو دەستڕۆیشتووەکانی دونیای مەسیحیەتو ڕۆژئاوا تا ئێستاش بازرگانی بە کۆیلەوە ئەکەن، جاران تەنیا بازرگانیان بە**

---

[403] لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە سوەیدی کوڕی موقرن ئەڵێ: جارێکیان کابرایەك زللەیەکی دا لە کەنیزەکێکی خۆی منیش پێم وت: مەگەر نازانێ ئەوە حەرامە، حەز ئەکەم ئەوە بزانی ئێمە حەوت برابووین لە خزمەتی پێغەمبەردا بووینو هیچیشمان شك نەئەبرد خزمەتکارێك نەبێت، ڕۆژێکیان یەکێکمان زللەیەکی لێدا، پێغەمبەر ﷺ ئەمری پێکردین ئەبێ ئازادی بکەن. (مختصر صحيح مسلم/ ص٢٦٤، رقم الحديث ٩٠٢).

[404] مختصر صحيح مسلم (ص٢٦٥) رقم الحديث (٩٠٧).

[405] تجارة الرقيق واحكامه في الاسلام/ عبدالرحمن الكواكبي الاعمال الكاملة (محمد عمارة) ص٣٧٨.

ڕەشپێستەکانەوە ئەکرد ئێستا بە سپیپێستەکانیشەوە ئەکرێت، هەرکەس ئاگای لەوە بێت کە چۆن دەوڵەمەندەکانی ڕۆژئاوا دوای کارەساتە گەورەکەی "تسونامی" لە ئەندەنووسیا لە جیاتی ئەوەی هەستی ئینسانیان بجولێت و بچن بە هانای ئەو لێقەوماوانەوە، کەچی دەستیان دایە بازرگانیکردن بە منداڵە بێ باوک و بێ دەرەتانەکانەوەو کردنیانە کاڵای بازرگانی و کڕین و فرۆشتنیان پێوە ئەکردن، لە خۆت بپرسە بۆ لەناو ئەواندا هەر ماوەو تۆش هیچی لەسەر ناڵێی، کەچی لەناو دونیای ئیسلامدا نەماوەو تۆ هەر لە بوختان گواستنەوەی خەڵکی ناکەوی[406].

. نووسەر هەندێ هەڵەی تری کردووە لەم باسی کۆیلەیەتییەدا و ڕاستکردنەوەیان بە پێویست ئەزانین، بۆ نمونە ئەڵێ: "پێغەمبەر ﷺ[407]، خۆی خاوەنی کۆیلەبووە". لە وەڵامدا ئەڵێین:

١. پێغەمبەر ﷺ کە خەدیجەی هێنا، خەدیجە زەیدی بە دیاریدا بە پێغەمبەر کە کۆیلەیەکی خۆی بوو، پێغەمبەر ﷺ نەك هەر زەیدی ئازاد کرد، بەڵکو بردیە "دار الندوە" و لەوێدا ڕایگەیاند کە "زەید" کەسێکی ئازادەو لەمەودوا ش کوڕی منە، بۆیە دوای ئەوە هەر ئەوترا، "زەیدی کوڕی موحەممەد"، ئەمە لە کاتێکدا بوو کە موحەممەد هێشتا نەبوو بوو بە پێغەمبەرو بەڵکو تەمەنی نەگەیشتبووە (٣٠) ساڵی، کە لە چل ساڵاندا بوو بە پێغەمبەر ﷺ.

نەك هەر ئەمە بەڵکو پێغەمبەر ﷺ، هەستا کچێکی لە ئەشرافی مەککە بۆ خواست کە پورزای خۆشیبوو، ناوی "زەینەب" بوو، کە ئەو کارەی موحەممەد ﷺ لەو ڕۆژەدا لە گۆڕانی باوێکی زۆر پیرۆزو حساب بۆ کراو بوو لە ناو خەڵکداو وەك "کوفر" سەیر ئەکرا کە ئەشراف لە کۆیلە مارە بکرێت!، ئیتر نازانم تۆ چۆن ڕووت دێت سەر لە بەردەم پێغەمبەر ﷺ بەرز بکەیتەوەو ڕەچاوی ئەدەب ناکەیت، ناترسی ژیانت لێ بشێوێ[408].

٢. کاتێکیش کە چوویە مەدەینەو پاش ساڵی (٨)ی کۆچیش کە نامەی نارد بەملاولادا، ئەوەبوو لە پاداشتی نامەیەکیدا کە ناردی بۆ "مقوقس"ی پاشای قیبتییەکانی میسر "موقەوقەس" پاش ڕێزگرتنی نامەکە چەند دیارییەکیشی نارد بۆ پێغەمبەر ﷺ کە لەناویاندا "ماریەی قطبی" بوو کە پاشان بۆیە دایکی ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ.. ئەو ڕێزی لە پێغەمبەر گرت و کیسراش بێ ڕێزی نواند بەرانبەریی[409].

. هەروەها نووسەر ئەڵێ: "کۆیلە.. شەهادەی قەبووڵ نەبوو"، هەرچەندە ئەمە بوختانی خەڵکەو ئەم ئەیگوازێتەوەو لە کتێبی (المساهمة ل١٢٨)، وەریگرتووە، بەڵام هەر هەڵەیەو وا نییە! بەڵکو فقهی ئیسلامی بە ئاشکرا ئەڵێ: "هەموو کەسێکی دادپەروەری مسوڵمان شایەتی وەردەگیرێ، کوڕ نەبێت بۆ باوکی یان باوك بۆ کوڕی یان دوژمن لەسەر دوژمنی"، ئەوەش هۆیەکەی ئەوەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: (ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْومُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ) وا باشترە بۆتان لای خواو شایەتییەکەش ڕاستترو قایمتر ئەبێ و کەمترین گومانیش چییە ڕووتان تێ ناکات، ئێ خۆ ئەمە تەنیا لە هەقی کۆیلەدا نییە بۆ خاوەنەکەی بەڵکو لە هەقی باوك بۆ کوڕو کوڕ بۆ باوکیشدایە، چونکە خاوەن هەق کە دەعوای تۆمارکردووە گومانی ئەوە ئەبات کە مەیل و خۆشەویستی شایەتی ناهەقی پێ بدات[410].

. دیسان ئەڵێت: "لە حەرەمسەرای خەلیفە "موقتەدیر"دا یازدە هەزار کۆیلەی خەساوی تێدا بووە، ئەمە بێجگە لە کۆیلەی ژن کە هەم کاری بەرهەمهێنانی پێ سپێردراوەو هەم.. کەنیزەك و کارەکەر بوون"[411]. لە وەڵامدا ئەڵێت:

---

[406] برایەك ئەم زانیارییەی پێدام وتی: سایتی "الجزیرە" درێژەی کاری بازرگانیکردنی کۆیلەی لە ئێستادا تێدا هەیە چ وەك "ڕاپۆرتە هەواڵ" و چ وەك ""کتێب و نووسین و ئامار هەرکەس بیەوێ با سەردانی سایتی "ئەلجەزیرە" بکات، پاشان بچێتە ئەو باسەی ئەیەوێت..

[407] نووسەر لە هیچ شوێنێکی کتێبەکەیدا "سەڵەوات"ی لە دوای ناوی پێغەمبەرەوە دانەناوە، ئەوەش هیچ لە قەدری پێغەمبەر کەم ناکاتەوە، بەڵام نووسەر خۆیی پێ ئەشکێ.

[408] مەحوی شاعیر ئەڵێ: خودا بیدا ئەدەب "حیرزولئەمانێکە عەتییەی ڕەب چ بوو جەرگی بڕی غەیری ئەمەی نامەی دڕی خوسرەو.

واتە: خوسرەو کە کیسرای فارسەکان بوو لەبەر ئەوەی بێ ئەدەبی کردو نامەی پێغەمبەری ﷺ، دڕاند خواش جەرگی ئەوی بڕی!

[409] ئیبن حەجەری عەسقەلانی لە "فتح الباری" (٣٥/١)دا باس لەوە ئەکات کە بۆ چەند نەوە لەناو مەسیحییەکاندا ئەو نامەی پێغەمبەریان ﷺ پاراستووەو بەهۆی بەرەکەتیان زانیوە بۆ خۆیان و مەملەکەتەکەیان.

[410] کفایة الاخیار (١٦٢/٢).

[411] کۆمەڵگا (ل٨٣).

**١. ئەو ژمارەیە ئەوەندە زۆرە عەقل ناتوانێ قبوڵی بکات، چونکە ئەبێت ماڵو حەرەمسەرای خەلیفە چەندێ گەورە بووبێت، تا جێگەی ئەو هەموو کۆیلەو کەنیزەکەی تێدا ببێتەوە؟ کاکە فوئاد زۆرە! ئەگەر وردی بکەینەوە ئاماری ژمارەکەی فوئاد میسری بە نزیکی ئەکاتە ئەمانە:**

**أ . یازدە هەزار کۆیلەی پیاو– ب – خۆ هیچ نەبێت نیوەی ئەوەش کەنیزەك هەبووە، کە ئەگەر لەگەڵ قسەکەی فوئاد میسریدا بڕۆین ئەبێ بیکەنە چەند ئەوەندە، چونکە کۆیلەی ژن "سێ" تاقم بوون: (بەرهەمهێن)و (کارەکەر)و (کەنیزەك).**

**جا ئەمانە ئەگەر هەرواش دانێی هەر (٥) کەسیان لە ژوورێکدا بوون ئەوە لە کەمترین ئاماردا نزیکەی (٤) هەزار ژوور ئەکات، تەنیا بۆ کۆیلەو کەنیزەك (بەلایەنی کەمەوە)، ئەی باشە ئەبی ژووری خەلیفەو شوێنی ژنو منداڵو ماڵی خەلیفە خۆی چەند بووبێت، کە بێگومان ئەبی ژووری خەوتنو چێشتخانەو هۆڵی ئاهەنگو میوان.. هتد، تێدا بێت، خۆ ئەگەر ژووری کۆیلە هەر (٥) کەس بۆ ژوورێك دانرابێو قیروسیا چۆن تێیدا ئەخەوتنو هەڵدەستن! خۆ دیارە ژوورەکانی ماڵو منداڵی خەلیفە وانابن! دەی توخوا ئەمەی فوئاد میسری ئەیڵێ لە شارێکیشدا جێی ئەبێتەوە؟ نەك لە ماڵیکدا با هی خەلیفەش بێت؟!**

**٢. ئەو ژمارەیە مەرجی قەبوڵکردنی ڕیوایەتی مێژوویی تێدا نییە.. لە پێشەوە وتمان: فوئاد میسری بە هیچ شێوەیەك ڕەچاوی مەرجەکانی "مێژوو نووس" یان "مێژوو گواستنەوە"ی نەکردووە.. ئیبن خەلدون مێژوونووسی گەورەی دنیا ئەڵێت: "باشترین ڕێگەو دڵنیاترینیان بۆ لە بێژنگدانی ڕیوایاتی مێژوویی تابزانین کامیان ڕاستەو کامیان درۆیە، ئەوەیە "ڕاویەکان" هەڵسەنگێنین، ئەمەش ناکەین تا ئەو هەواڵە لە زاتی خۆیدا مومکین نەبێت کە ڕوویدابێت یان مومکین بێت کە ڕووی نەدابێت، بەڵام ئەگەر هەواڵەکە لەزاتی خۆیدا "موستەحیل" بێت ئەوە هیچ پێویست ناکات "جەرح"و "تەعدیل"ی ڕاوییەکان بکرێت"[٤١٢].**

**ئیبن خەلدوون هەندێ ڕووداوی مێژوویی مەسعودییەکەی لای فوئاد میسری ڕەت ئەکاتەوە، هەر لەبەر ئەوەی موبالەغەی تێدایە، یان جۆری ئاوەدانی ئەو سەردەمە هەڵی نەگرتووە.. بۆ نمونە: ئەو هەواڵەی گوایە لە بیابانی "سجلماسە"دا شاری "مس = نحاس" دروستکراوە، یان ئەو هەواڵەی کە دەڵێ: کاتێك موسا بەنی ئیسرائیلییەکانی ژمارد لە زەوی سەرگەرداندا، ئەیانکردە (شەش سەد هەزار) کەس. ئیبن خەلدون ئەڵێ: "مومکین نییە بەنی ئیسرائیل لە چەند کەسێکی کەمەوەو بە چوار نەوە ئەوەندە زیاد بکەن"[٤١٣]. ئەگەر ئەم ترازووەی ئیبن خەلدون هەڵگرینو نووسینەکەی فوئاد میسری بخەینە سەری ئەوە ئەبێ زۆربەی نووسینەکەی بدەینەوە بە سەرداو خۆی چی لێ دەکات لێی بکات.**

**. لەو هەڵەو موبالەغەتانەی تری فوئاد میسری کە لەم بابەتەدا ئەیڵێت ئەوەیە:**

**١. "(ئەمین) لە سەردەمی دەسەڵاتداریێتیی خۆیدا ڕەسمییەتی دا بە نێربازیو بە پێی یاسایەك کە ئەو دەریهێنا خاوەن کۆیلە بۆیان هەبوو مومارەسەی سێکسی لەگەڵ کۆیلەی نێرینە بکەن.. یەحیای کوڕی ئەکسەم کە قازی شەرعی بەسرە بووە مومارەسەی سێکسی لەگەڵ پێنج سەد کۆیلەی خۆیدا کردووە"[٤١٤].**

**ئاخر کاکی نووسەر "مەسعودی" شیعە مەزهەب هەواڵێکی وا بنووسێتو درۆیەکی وا بکات بەدەم مێژووەوە، تۆ بۆ ئەچیتە سەر عەقلی ئەو، "تبدیل مەزهەب" ئەکەیو ئەو"..."انەی ئەو ئەگوازیتەوە؟! ئاخر کێ بڕوا بە شتی وا دەکات؟ لە کاتێکدا خۆت ئەڵێی زاناو موجتەهیدان دەوڵەتیان بەڕێوە بردووە، هەر خۆت ئەڵێی فەتوا کاریگەری زۆری هەبووە لەسەر خەڵکی، ئاخر باشە کێ هەیە بتوانێ مومارەسەی سێکسی لەگەڵ پێنج سەد کەسدا بکات؟! باشە لەم سەردەمو زەمانەدا کە دین زاتو زۆریشی نییە کێ ئەوێرێ یاسای وا دەربهێنێ لە هەرکوێی هەرەمی حکومەتدا بێت نەخوازەڵلا لەو ڕۆژەدا کە "دین" زاتیشو زۆریشی هەبووە، بە دەردی مامۆستا هەژار لە کتێبی "یەك لە پەنای خالو سفری بێ بڕوانەوە" کەیدا ئەیڵێت..**

---

[٤١٢] المقدمة، ابن خلدون ص٣٧.

[٤١٣] المقدمة، ابن خلدون ص١٠.

[٤١٤] کۆمەڵگا (ل٨٦) لە "مروج الذهب"ی مەسعودی شیعە مەزهەبی وەرگرتووە.

**٢. هەمدیسان ئەڵێت: "لە هیچ ئایەتێکی قورئاندا کە سەرچاوەی شەریعەتە باس لە حەرامکردنی کۆیلە نەکراوە، بە پێچەوانەوە داوا لە مسوڵمانان ئەکرێ ئەوەی سامانی زۆری هەیە بەشی کۆیلەو ژێردەستەکانی خۆیان نەدەن"[٤١٥]، لەمە سەقەتترو نارەواتر ئەوەیە بۆ ئەم بوختانە ئایەتێکی لە پەراوێزدا نووسیوە گوایە بەڵگەیە بۆ قسەکەی! ئایەتەکە ئەمەیە: (وَاللّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الْرِّزْقِ فَمَا الَّذِينَ فُضِّلُواْ بِرَآدِّي رِزْقِهِمْ عَلَى مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَاء أَفَبِنِعْمَةِ اللّهِ يَجْحَدُونَ) (النحل: ٧١). بۆ وەڵامی ئەم شتە زۆر سەقەتە ناچارین لە وەڵامدا دوو برگە بڵێین:**

**برگەی یەکەم: خراپ حاڵی بوونی لە ماناو مەبەستی ئایەتەکە.**

**برگەی دووەم: حوکمە نارەواکەی کە لەمانا سەقەتەکەی خۆی بۆ ئایەتەکە وەریگرتووە..**

**برگەی یەکەم: مانای ئایەتەکە: خوای گەورە ئەفەرموێت: "خوا فەزڵی هەندێکتانی داوە بەسەر هەندێکی ترتاندا لە بواری رزقو رۆزییەوە[٤١٦]، ئایا ئەوانەی خوا فەزڵی زۆری پێداون دێن لەگەڵ خزمەتکارەکانی خۆیاندا ببنە شەریكو لەو فەزڵو ماڵەدا یەکسان ببن؟! ئایا نکوڵی لە فەزڵو نیعمەتی خوا ئەکەن".**

**. مەبەستی ئایەتەکە: موشریکانی مەککە شەریکیان بۆ خوا بڕیار ئەداو خوای گەورەش عەقڵیەتی ئەوان ئەدوێنێتو بە زمانی خۆیان قسەیان لەگەڵدا ئەکاتو ئەوەیان بۆ ڕوون ئەکاتەوە کە عەقڵ نایبڕێ، خوایك کە خاوەنی هەموو (دروستکراوێکە) یەکێك بێت دروستکراوێکی لێ ڕاست بکاتەوەو (دەسەڵات)و (موڵکی) خوا بە یەکسانی بەش بکات لە نێوانیاندان باشە ئەمە ئەگەر خۆتان بیکەن یان یەکێك بۆتانی بکات بە زوڵمو بێ عەقڵی نازانن، واتە ئەگەر یەکێك بێت موڵكو صەلاحیەتو دەسەڵاتی ئێوە دابەش بکات بە شێوەیەکی یەکسان لە نێوان ئێوەو خزمەتکارەکانتاندا، هەڵوێستتان چی دەبێ بێجگە لەوەی گاڵتەتان بە عەقڵی بێت، ئەی باشە لە شتێکدا کە ئێوەو ئەو خزمەتکارانە کۆڵکەی هاوبەشیش هەیە لە نێوانتاندا، ئێوە مرۆڤو ئەوانیش هەر مرۆڤ، ئێوە دروستکراوو ئەوانیش هەر دوستکراو، ئەوان خوا ئەیان ژێنێت وەك ئێوەش ئەژێنێت.. ئەوە بە زوڵمو بێ عەقڵی ئەزانن ئەی ئەوە چەند بێ عەقڵیو زوڵمە کە "خوایەکی دروستکەر" بکەی بەشەریکی "دروستکراوێکی مردوو"؟! کەواتە ئەمەی ئێوە ئەیکەن کە دروستکراوێك ئەکەنە شەریکی خوا وەك ئەوە وایە (سید)ێك بێت چی (سەروەتو سامان)و (سوڵتەو دەسەڵاتی) هەیە بیکاتە دووبەش لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا، ئەگەر ئەمە بێ عەقڵی بێت ئەوە ئەوەی تریان لە ئەم بێ عەقڵی ترە.. ئایا هیچ بەرپرسو کاربەدەستێك لە ئەمڕۆدا دێت موچەکەی (نثرية)کەیو مۆرو سەلاحیەتو دەسەڵاتەکەی خۆی لەگەڵ پاسەوان یان فەراش یان شۆفێرەکەیدا بە یەکسانی دابەش بکات، ئایا عەقڵی کەس شتی وا ئەبڕێ.. لە کاتێکدا ڕێی تێ ئەچێت شتی وا ببێ، چونکە هەردووکیان مرۆڤنو دروستکراونو لە یەك شت دروستکراون.**

**هەر خوای گەورە بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەو مەبەستە پاش ئەو چەند ئایەتە یەکسەر ئەفەرموێ: (وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَاجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ أَفَبِالْبَاطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ اللّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللّهِ مَا لاَ يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقاً مِّنَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ شَيْئاً وَلاَ يَسْتَطِيعُونَ *فَلاَ تَضْرِبُواْ لِلّهِ الأَمْثَالَ إِنَّ اللّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لاَ تَعْلَمُونَ *ضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً عَبْداً مَّمْلُوكاً لاَّ يَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَاهُ مِنَّا رِزْقاً حَسَناً فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرّاً وَجَهْراً هَلْ يَسْتَوُونَ الْحَمْدُ لِلّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لاَ يَعْلَمُونَ) (النحل : ٧٢ . ٧٥).**

---

[٤١٥] کۆمەڵگا ل (٧٩ ـ ٨٠).

[٤١٦] برگەی (لە بواری ڕزقو ڕۆزییەوە) ڕستەیەکە بۆ کەسانی وەك فوئاد مەجید میسری وتراوە تا نەڵێن: خوا فەزڵی هەندێکی داوە بەسەر هەندێکی تردا لە ـ دروستکردن ـ داو ئەو شەریفترە لەمو ئەو ماددەی ئەمی لێ دروست بووە لە ماددەی ئەو چاکترو بەڕێزترە.. شیعە مەزهەبەکان ئەڵێن: ئەو قوڕەی شیعەی لێ دروست بووە جیاوازی زۆرە لەگەل ئەو قوڕەی غەیری شیعەی لێ دروست بووە، "کلینی" لە "الكافي"دا کە گەورەترین کتێبی فەرموودەیە لای شیعەکان ئەڵێ: ئەبی حەمزەی شەمالی ئەڵێت: لە ئەبو جەعفەری سادقم بیستووە (ع) ئەڵێت: "ان الله عز وجل، خلقنا من اعلى عليين وخلق قلوب شيعتنا من ما خلقنا منه، وخلق ابدانهم من دون ذلك وقلوبهم تهوى الينا لأنها خلقت مما خلقنا منه، وخلق عدونا من سجين وخلق قلوب شيعتهم مما خلق منه وابدانهم من دون ذلك، فقلوبهم تهوى اليهم لأنها خلقت مما خلقوا منه" (الكافي ٤/٣) لە کاتێکدا خوای گەورە تەنانەت بە پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێ (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ..)، نەك (بشر غيركم).

دەی کەواتە شەریکدانان بۆ خوا بە ڕوونی دیارە لەم ئایەتانەوە بەشتێکی ناعاقڵانە دائەنرێتو بە ڕوونی مەبەستی ئایەتەکە دەرئەکەوێت کە: (بێ عەقڵییە بۆ مرۆڤ شەریك بۆ خوا بڕیار بدات لە کاتێکدا ئەو کە مرۆڤێکە ڕازی نییە شەریك بۆ خۆی بڕیار بدات لەو (دەسەلاَت)و (موڵکە)ی هەیەتی لەگەڵ مرۆڤێکی تری وەك خۆیدا)[٤١٧].

بڕگەی دووەم: حوکمە ناڕەواکەی فوئاد میسری ئەوەیە (درۆ بە دەم خواوە ئەکات)و ئەڵێ: (خوا داوا لە موسڵمانان ئەکات ئەوەی سامانی زۆری هەیە بەشی کۆیلەو ژێردەستەکانی خۆیان نەدەن). لە وەلاَمدا ئەڵێین:

أ. ئەمە وەك بینیت درۆو بوختانە، بەدەم کێشەوە؟ بەدەم خواوە..

ب. بە پێچەوانەشەوە خوا ئەفەرموێت: (وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ)، واتە: لەو ماڵەی خوا داوێتی بە ئێوە بەشی ئەوانە بدەن کە کۆیلەو خزمەتکارتانن، هەروەها ئەفەرموێت: (وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا الْفَضْلِ مِنكُمْ وَالسَّعَةِ أَن يُؤْتُوا أُوْلِي الْقُرْبَى وَالْمَسَاكِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلْيَعْفُوا وَلْيَصْفَحُوا أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ) (النور: ٢٢).

هەر بۆ زیادە ڕۆشنکردنەوەی ئەم باسە، فەرموون بزانن زانایانی ئیسلامی چییان لەو ئایەتەی سەرەوە وەرگرتووە کە ئەفەرموێت (وَآتُوهُم مِّن مَّالِ اللَّهِ الَّذِي آتَاكُمْ). زانایان ئەڵێن: "وشەی (آتُوهُم) سیغەی ئەمرە، ئەمریش بۆ خوا، واجبکرنی شتە، واتە: واجبی سەرتانە وەك نوێژو ڕۆژوو.. کە لەوەی خوای گەورە پێیداون بەشی ئەوانەی لێ بدەن، کە خزمەتکارو کۆیلەی لای ئێوەن"[٤١٨]. حەزرەتی (عەلی)ش لە پێغەمبەرەوە ﷺ ئەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (چواریەکیان بدەنێ)[٤١٩].. دەی ئیتر کوا ئەم حوکمە ناڕەوایەی فوئاد میسری؟ لەکوێی هێنا؟! ئایا هەق نییە باش بە خۆیدا بچێتەوەو واز لە بێ ویژدانی بهێنێ؟!

نووسەر دیسان هەڵە ئەکاتو ئەڵێت: "ڕاپەڕینی کۆیلەی خواروی عێراق کە لە مێژوودا بە (شۆڕشی زەنگ)[٤٢٠] ناودەبرێ، هەزاران هەزار کۆیلەی زەوی لە ڕیزی بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕانەدا یەك خستو لە ماوەی چواردە ساڵدا تەختو بەختی دەوڵەتی خەلافەتی هێنایە لەرزە!!".

فوئاد میسری لەمەشدا هەر موبالەغە ئەکاتو بە ئارەزووی خۆی ژمارە لێ ئەدا! .. هەزاران هەزار! یانی (چەند ملیۆن کەس!!) (تەختو بەختی خەلافەتیان هێنایە لەرزە) کە ئەکاتە ئەوەی دەسەلاَتیان گرتووەتە دەست .. کەچی خۆی لە ژێر لێوەوە ئەڵێ: "هەرچەندە ئەو ڕاپەڕینە سەرکەوتنیشی بەدەست نەهێنا"[٤٢١]. ئێ کاکە! یان ئەو مەڵێ.. یان ئەمە مەڵێ!

. نووسەر بەبێ ئەوەی ئاگای لە دیدو وەزعی (خەوارج) بێت، دێت بە شانو باڵیاندا هەڵدەداتو ئەڵێ: "زوڵمو ستەمی لەڕادە بەدەری (دەرەبەگایەتی) وای لە پیشەوەران کرد بچنە ڕیزی (خەوارج)ەوە لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی بجەنگن"[٤٢٢]. دوایش لە پەراوێزدا ئەڵێ: "(خەوارج) ئەوانەن باوەڕیان بە هیچ حوکمێك نەبوو حوکمی قورئان نەبێ.."، بۆ وەلاَمی ئەم نەزانیییەش با قسەی تەواو بکەین:

١. خەوارج پێش ئەوەی لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی بجەنگن لە دژی دەوڵەتی عەلی کوری ئەبی تالیب جەنگان، واتە خەوارج لە ساڵەکانی (٣٧و ٣٨)ی کۆچییەوە دەستیان دایە شەڕ دژ بە دەوڵەتی ئیسلامیی نەك دەوڵەتی ئەمەوی کە لەدوای ساڵی (٤١)ی هیجرییەوە دامەزرا، حەزرەتی (عەلی)یش لە کاتی خیلافەتی خۆیدا کارێکی بەسەر (خەوارج)دا هێنا تا سەردەمی

---

[٤١٧] خوای گەورە لە قورئاندا ئەفەرموێت: (الا له الخلق والامر) هۆشیاربن! موڵكو دەسەلاَت بە تەنیا هی خوایە، هەرکەسیش وا نازانێو قەناعەتی وایە ئەویش خاوەنی شتێکە یان شتێکی بە دەستە، ئەوە با نەیەڵێت خوا نەخۆشی بخات، یان هەژاری بخات، یان پیری بکات، یان با نەیەڵێت خوا بڕیاری مردنی بۆ دەربکات.. (..وَاللَّهُ يَحْكُمُ لاَ مُعَقِّبَ لِحُكْمِهِ وَهُوَ سَرِيعُ الْحِسَابِ) (الرعد: ٤١).

[٤١٨] كفاية الاخيار (١٨٠/٢).

[٤١٩] رواه النسائي وقال الصواب وقفه وقال الحاكم: رواية الربع صحيح الاسناد، الكفاية (١٨٠/٢).

[٤٢٠] لە مێژوودا بە شۆڕشی (زنج) نەك (زەنگ) ناودەبرێ.

[٤٢١] كۆمەڵگا ل (٨٧).

[٤٢٢] كۆمەڵگا ل (٨٨).

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز تواناى خۆ ڕێکخستنەوەیان نەما، کە ئەکاتە ساڵی (٩٩و ١٠٠)[٤٢٣]ی کۆچی، عومەریش (ڕەزای خوای لێبێت) زیاتر ڕێگەی حیوارو گفتوگۆی لە گەڵیاندا گرتە بەرو ئەو ڕێگەیەش کاریگەری ئیجابی لەسەریان زۆربوو.

دکتۆر عیمادەدین خەلیل لە کتێبی "ملامح الإنقلاب الاسلامي في خلافة عمر بن عبدالعزيز"دا ئەڵێت: "خەواریج (حەروری)یەکان لە عێراقدا شۆڕشێکی تازەیان دژ بە بەنی ئومەییە ڕاگەیاند، چونکە تا ئەوکاتە ئاگایان لە پرۆژەی ئیصلاحی عومەر نەبوو، ڕەهەندەکانی ئەو پرۆژەیان نەئەزانی کە عومەر بۆی تێ ئەکۆشا، کە لەڕاستیدا بەرنامەی ئەوانیش بوو، کە شۆڕش ڕادەگەیەنن عومەر یەکسەر پەنا بۆ شمشێر نابات، بەڵکو پەنا بۆ حیوارو مەنتیق ئەبات، بەتایبەتی کە ئەبینێ ئەم جیاوازییەی لە نێوان خەلیفەو ئەواندا هەیە جیاوازە لەو جیاوازییەی لە نێوان کوفرو ئیماندا یان لە نێوان (دار الحرب)و (دارالاسلام)دا هەیە، جیاوازی نێوان ئەمانو ئەو جیاوازییە لە نێوان دوو کۆمەڵ مسوڵماندا لەناو ئوممەتی ئیسلامیداو حەڵاڵ نییە دڵۆپێك خوێنی مسوڵمان بە دەستی مسوڵمانێکی تر لەسەری بڕێژرێت، دوای ئەوەی شایەتمان ئەهێنێت، بۆیە عومەر یەکسەر نامەیەك ئەنووسێت بۆ عەبدولحەمید کە والی بووە لە عێراقدا، ئەمری پێ ئەکات کە بانگیان بکات بۆ ئەوەی چی قورئانو فەرموودە ئەمری پێ ئەکەن هەردوو تەسلیمی بن، ئەم بانگەشەیە دوا قسەیەو شتەکە ئەبڕێتەوە، بەڵام خەواریج گوێیان بە قسەکە نەداو عەبدولحەمید-یش ناچار بوو سوپای ناردنە سەر خەواریج توانییان سوپاکە بشکێنن.. کە عومەر ئەمەی بیست. ئالەم کاتەداو بەس. جارێکی تر مەنتیقی ئیجابی لە سیاسەتو شەڕدا خستە کارو بۆ مێژوو نمونەیەکی وای پێشکەش کرد کە بیسەلمێنێ (هەر لەبەر ئەوەی ئاشتی هەبێ ئیتر قەیناکات با هەقو بەها بالاکانی هەق تیا بچن) مەنتیقێکی ساغ نییە، بۆیە مەسلەمەی کوڕی عەبدولمەلیك-ی بە سوپایەکەوە ناردە سەر خەواریجو بۆ عەبدولحەمیدی نووسی: هەواڵی ئەوەم پێ گەیشتووە، سوپا بەدناوەکەت چییان کردووە، ئەوە مەسلەمەم ناردووە، هەقت نەبێ بەسەرەوە چی ئەکات لەگەڵیاندا!".

مەسلەمەش بە هێزەکەیەوە پەلاماری سەر بازگەی خەوارجەکان ئەداتو تێکیان ئەشکێنێت، بەڵام ئەم ناچار بوونەی عومەر لە بەکارهێنانی (هێز)دا بەرانبەر خەواریج وای لێ نەکرد (هێز) بکاتە ڕێگەیەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو خەواریجدا، چونکە قەناعەتی وابوو ئەگەر بەرانبەر ئامادەیی گفتوگۆکردنی هەبێت هیچ پاساوێك نییە بۆ بەکارهێنانی هێز!

(ئیبن جەوزی) ئەگێڕێتەوە کە جارێکیان کۆمەڵێك خەواریج موناقەشەی هەندێ پرس ئەکەن لەگەڵ عومەردا، هەندێ لە هاوڕێکانی پێشنیار ئەکەن کە عومەر غیرەتێ بنوێنێ بەرانبەریانو قسەیان لێ قەبوڵ نەکات! عومەر ئەو مەنتیقەی ڕەفز کردوو بە پێچەوانەوە ئەوەندە نەرمو نیانو بە بەڵگەوە قسەی لەگەڵ ئەکردن، خەواریجەکانی قەناعەت پێکرد تا عومەر خەلیفە بێت، بە موچەو جلوبەرگی دەوڵەت ڕازیبنو بەم ڕێککەوتنەوە چوونە دەرەوە، کە شوێنەکەیان بەجێ هێڵا، عومەر لای کردەوە بەلای هاوڕێکانیداو فەرمووی: "ئەگەر دەرمانێك دەست ئەکەوت هاوەڵەکەتی (بەرانبەرەکەتی) پێ چارەسەر بکەی هەرگیز پەنا مەبە بۆ سوتاندن"[٤٢٤]، عیمادەدین خەلیل بەردەوامەو ئەڵێ: "لە ساڵی (١٠٠)ی کۆچیدا تاقمێکی تری خەواریج لەناوچەی دورگەی فوراتدا بەسەرکردایەتی (بەستام یەشکەری کە نازناوی "شەوذەب"ی هەبوو)، شۆڕشێکیان ڕاگەیاند، عومەر نامەیەکی بۆ والی عێراق نووسیو تێیدا ئەفەرموێت: (دەستیان بۆ مەبەو مەیان ورژێنە مەگەر دەست بدەنە خوێنڕشتنو کاولکاری لەزەویدا)، سەیر ئەو سووربوونەی عومەر لەسەر ئاشتیو ئاوەدانیو نەجوڵاندنی خەڵك بۆ ئەوەی نەکەونە ئاژاوەنانەوەو خوێن ڕشتن".

عەبدولحەمید ئالایەکی دا بە دەست (موحەممەدی کوڕی جەریری بەجەلی)وەو هەزارکەسی لە خەڵکی (کوفە) لەگەڵدا ناردو هەموو ئەو ڕێنماییو بەرچاوڕوونیانەی لە عومەر وەریگرتبوو داییەزاند بۆیانن عومەر هەر ئەمەی نەکرد بەڵکو نامەیەکیشی نارد بۆ (شەوذەب)و بانگەشەی کردبوو بۆ ئاشتیو داوای لێ ئەکات هۆی یاخیبوونەکەی ڕوون بکاتەوە.. پاش چەند ڕۆژێك (شەوذەب) نامەکەی پێ ئەگاتو کە ئەیکاتەوە سەیر ئەکات نووسراوە: ".. انه بلغني انك خرجت غضبا لله

---

[٤٢٣] تأريخ ابن خلدون (٩٨/٣).

[٤٢٤] لەناو عەرەبدا مەشهورە کە ئەڵێت: (وآخر الدواء الكي).

**ولنبيه، ولست بأولى ذلك مني هلم اناظرك فان كان الحق بايدينا دخلت فيما دخل فيه الناس، وان كان في يدك نظرنا في أمرنا"، ئەم نامەیە وەك لقە زەیتونێك وابوو كە (شەوذەب) چاوەڕوانی هاتنی دەكرد، بۆیە فەرمانیدا كە سوپاكەی هەموو چالاكییەك ڕابگرن‌و نامەیەكی لە وەڵامی نامەكەی عومەردا نووسی‌و تێیدا ئەڵێ: "وقد أنصفت! وقد بعثت اليك رجلين يدارسانك ويناظرانك" بەڕاستی ویژدانت بە خەرج داوە! ئەوە دوو پیاوم نارد تا مونازەرەو لێكۆڵینەوەت لەگەڵ بكەن..**

**دوو پیاوەكە گەیشتنە دیمەشق‌و چوونە خزمەتی عومەری كوڕی عەبدولعەزیزو كەوتنە موناقەشەیەكی هێمنانەی زانستی.. یەكێك لەو دوو پیاوە قەناعەتی كردو بە عومەری وت: "بەڕاستی تا ئەمڕۆ قسەی لەمە ڕۆشنترو بەڵگەدارترم نەبینیوە، بۆیە من وەك شەخصی خۆم شایەتی ئەدەم تۆ لەسەر هەقی‌و من لەو كەسەش بەریم كە خۆی لە تۆ بەری ئەكات!"، عومەر ڕووی كردە ئەویتریان‌و فەرمووی: "ئەی جەنابت چی ئەڵێی؟"، كابرا وتی: خوا هەقە قسەكانت زۆر جوان‌و زۆر ڕۆشنن! بەڵام من بڕیار نادەم بەبێ مسوڵمانان‌و ئەم قسانەی تۆیان بۆ نەقڵ ئەكەم‌و بزانم ئەوان بڕیاریان چییە؟ ئەم موناقەشە هێمن‌و زانستیانە بەردەوام ئەبێت لە نێوانیاندا تا ئەگاتە ئەوەی پرسیارێكی زۆر موحریج لە عومەر ئەكەن، ئەویش ئەوەیە: باشە تۆ دوای خۆت (یەزید) ئەكەی بە خەلیفە؟! عومەر ئەفەرموێ: غەیری من دایناوە. وتیان: باشە ئەگەر یەكێك ماڵێكت لەلا دابنێت بە ئەمانەت‌و تۆش بیدەیتە دەست كەسێكی نائەمین ئەوە پێی ئەوترێت ئەمانەت پارێزی؟! كەواتە كێشەكە لێرەدایە.. بوونی (وەلی عەهد)و جێگری خەلیفە[425] ئەویش كە بەنی ئومەییە لە دوای موعاویەوە لەسەری ڕاهاتبوون‌و تەنیا عومەر لەو قاعیدەیە ڕیزپەڕ بوو! بۆ حیكمەتێك بوو كە خوا ئەیزانی.. ئەی ئەبێ عومەر وەڵامی چی بێ؟ لە ڕاستیدا ئەوەی ئەم دووپیاوە ئەیڵێن ڕاستەو قورئانیش پشتی ئەگرێت، ئەویش ئەوەیە كاروباری مسوڵمانان ئەبێت بە شورا بڕیاری لەسەر بدرێت‌و بە هەڵبژاردنی ئازاد بێت.. ئیتر ئەم كە خەلیفەیە چۆن ئەبێ ڕازی بێت بەوەی بەبێ (موشاوەرەو ڕای مسوڵمانان) كەسێكی تر بكرێت بە خەلیفە؟ عومەر نەكەوتە موناوەرەكردن‌و بەڵكو داوایكرد كە سێ ڕۆژ مۆڵەتی بدەن تا بڕیاری خۆی لەو بارەیەوە بدات، نوێنەری (شەوزەب) ئەم قسەیەی عومەری بردەوەو عومەریش كەوتە مشاوەرە دەربارەی مەسەلەی جێگرو وەلی عەهد، بەڵام سێ ڕۆژەكەی تەواو نەبوو عومەر دەرمانخوارد كرا"[426].**

**٢. خەواریج تاقمێك بوون زۆر ناحاڵی بوون لە مەسەلە دینییەكاندا‌و (سطحي)و توندڕەو لەدیدو مومارەسەدا، لەلایەك زۆر عاشقی دین بوون، لەلایەكیش زۆر مەسەلەی دینی هەبوو گوێیان هەر پێ نەئەدا، ئەیانوت: (لا حكم الا لله) كەچی ئەمیرەكەیان بە فەتواو بڕیارێك ماڵ‌و نەفسی هەركەسێكیان بویستایە بۆی حەڵاڵ ئەكردن، ئەم تاقمە بریتی بوون لە كۆمەڵێك "نوێ مسوڵمان"و تازە هاتبوونە ناو ئیسلامەوەو هەر لەسەردەمی عەلی كوڕی ئەبو تالیب–یشدا هیچ سەحابەیەكیان لەناودا نەبووە[427]، خۆیان نیشتوونەتە مل تەفسیرو ماناكردنی قورئان‌و زۆر حسابیان بۆ فەرموودە نەئەكرد.. دەوری گەورەشیان هەبوو لە شەهیدكردنی عوسماندا‌و ڕۆڵی سەرەكیشیان هەبووە لە هەڵگیرساندنی شەڕی نێوان (عەلی)و (مەعاویە)دا، ئەوەبوو پاش ئەو چەند شەڕەشی كە ڕوویدا وەك شەڕی (جەمەل‌و صففین)، چ عەلی‌و ئەهلی عێراق‌و چ موعاویەو ئەهلی شام قەناعەتیان هەبوو كە سوڵح بكرێت‌و كۆتایی بەم كوشت‌و كوشتارە بهێنرێت‌و لەلای (عەلی)یەوە ئەبو موسای ئەشعەری كرایە نوێنەرو دەسەڵاتی تەواوی درایە هەر بڕیارێك بدات‌و لەلایی (مەعاویە)شەوە عەمری كوڕی عاس كرایە نوێنەرو تەواوی**

---

[425] سولەیمانی كوڕی عەبدولمەلیك كە عومەری كوڕی عەبدولعەزیزی كاندید كرد بۆ خیلافەت، وای بە باش زانی كە (یەزیدی كوری عەبدولمەلیك) دوای خۆی كاندید بكات بۆ خیلافەت، واتە یەزید وەلی عەهدو جێگری عومەر بێت، چونكە (ڕەجای كوڕی حەیوە) كە زانایەكی گەورەی ئەو كاتە بوو پێشنیاری كرد بۆ سولەیمان كە عومەر بكاتە خەلیفە دوای خۆی، سولەیمان وتی: سوێند بەخوا خەڵكی خراپ لێی ناگەڕێن‌و تووشی فیتنەیەكی ئەكەن‌و نایەڵن ئیسراحەت بكات ئەگەر یەكێك لەبەنی مەروان نەكەمە وەلی عەهدو جێگری (بۆ ئەوەی بە پێی یاسا پاش مردنی عومەر كاری خیلافەتی بدرێتی) ئەوەبوو یەزیدی كوڕی عەبدولمەلیكی كاندید كرد بە جێگری وەلی عەهدی عومەر. (تأريخ ابن خلدون: ٨٩/٣).

[426] ملامح الانقلاب الاسلامي (٩٥ ـ ٩٧)، كە لە (تأريخ الطبري): ٥٥٦/٦)ی وەرگرتووە.

[427] خاوەنی كتێبی "اسمي المطالب في سيرة علي ابن ابي طالب: الصلابي" لە (٢٢٢/٢)دا ئەڵێ: زانایان تەحقیقی ئەوەیان كردووە كە خەواریج هیچ سەحابەیەكیان لەناودا نەبووەو كۆمەڵێكی (نوێ مسوڵمان)ی توندڕەوی ناحاڵی بوون)، ئیبن تەیمییەش ئەڵێ: خەوارج جەهلو وەرعی درۆزنانەیان پێكەوە كۆكردبوویەوەو خواپەرستییان تەنیا بە (ترس) لەخوا ئەزانی‌و (ئومێد)یان لەگەڵیدا كۆنەئەكردەوە.

**دەسەڵاتی درایە بۆ هەر بڕیارێك ئەیدات، ئەبو موساو عەمر پەیماننامەیەکیان ئیمزاکرد کە ئەمەی خوارەوە کورتەی بڕگەکانیەتی:**

**. ئەم بڕیارنامەیە ئیلزامییە بۆ (عەلی)و ئەوانەی لەگەڵیدان و ئیلزامیشە بۆ (مەعاویە)و ئەوانەی لەگەڵیدان.**

**. عەبدوڵڵای کوڕی قەیس (واتە ئەبوموسای ئەشعەری) مافی بڕیاردانی هەیە لە جیاتی (عەلی)و ئەوانەی لەگەڵیدان، هەروەها (عەمری کوڕی عاص)یش مافی بڕیاردانی هەیە لە جیاتی موعاویەو ئەوانەی لە گەڵیدان.**

**. هەردوولا لە هەردوو هەرێمەکەیاندا (ئەمان)یان بۆ دابینکراوەو ماڵو خوێن و ئەهلو منداڵیان پارێزراوە. .و میللەتیش لە پشتیانەوەیە.**

**. ئەگەر لەو ماوەیەی کە دانراوە[٤٢٨]، ئەم کێشەیەی تێدا یەکلا بکرێتەوەو بڕیاری کۆتایی تێدا بدرێت، یەکێك لە نوێنەرەکان مرد، ئەوە لایەنەکەی خۆی کەسێکی تری ساڵح و دادپەروەرو ئەخاتە جێگەی بەو مەرجەی لەسەر هەمان پەیمان بڕوات کە نوێنەری پێش ئەو لەسەری بووە.**

**. ئەگەر یەکێکیش لەم دوو "ئەمیر"ە پێش تەواوبوونی ماوەی دیاریکراو مرد، ئەوە لایەنەکەی خۆی ئەمیرێکی تر هەڵدەبژێرن کە لە "داد"ی ڕازی بن.**

**. هەردوو نوێنەرەکە بۆیان هەیە لە ناوچەیەکدا کە بکەوێتە نێوان هەردوو هەرێمەکە جێگەو شوێن بۆ کارەکەیان دابمەزرێنن و بۆ کەسیش نییە لە نزیکیانەوە نیشتەجێی ببێ ئەگەر هەردووکیان پێی ڕازی نەبن[٤٢٩].**

**ئەوەبوو ساڵێك دانرا بۆ ئەم سوڵحە (بە زاراوەی هاوچەرخ ئەم ئاگربەستە)و دەسەڵات درا بەو دوو نوێنەرە، ڕاوێژ بە هەموو پیاوێکی ژیرو مسوڵمان بکەن لە سەحابەو غەیری سەحابە تا بزانن چی بکەن باشەو چی نەکەن باشە.**

**ئەوەبوو مەعاویەو ئەهلی شام گەڕانەوە بۆ شام و (عەلی)و خەڵکی عێراقیش گەڕانەوە بۆ عێراق.. بەڵام وەك مێژوونووسان ئەڵێن: "لە ڕێگەداو بەر لەوەی بگەنەوە کوفە، بە چەند قۆناغێك (هەشت هەزار) کەس لە سوپاکەی (عەلی) جیابوونەوەو نارەزابوونی خۆیان بەو پەیماننامەیە ڕاگەیاند[٤٣٠]، عەلی کە ڕۆیشتەوە کوفە، عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی نارد بۆ لایان تا موناقەشەی مەسەلەکەیان لەگەڵدا بکات، ئەوەبوو پاش موناقەشەکردن لەگەڵیاندا (دوو هەزار) کەسیان لێ گەڕایەوە بۆ (کوفە).. پاش ماوەیەك (عەلی) خۆشی چوو بۆ ناویان و موناقەشەیەکی دوورو درێژی لەگەڵدا کردن و کە زانی قسەکردن لە گەڵیاندا بێ سودەو سواری سەری خۆیان بوون، هات لەگەڵیاندا لەسەر چەند خاڵێك ڕێککەوت، لەوانە:**

**١. ئێمە ڕێگەی مزگەوت و دەرس و دەورتان لێ ناگرین و ئازادن.**

**٢. مافی خۆتان هەیە لە (بیت المال)دا تا دەستمان بەیەکەوە بێت.**

**٣. مافی شەڕکردن لەگەڵتاندا بە خۆمان نادەین ئەگەر ئێوە شەڕمان پێ نەفرۆشن[٤٣١].**

**ئەوەبوو پاش ساڵەکە هەردوو حەکەمەکە (ئەبو موسا)و (عەمر) لە شوێنی دیاریکراودا کۆبوونەوەو پرۆژە بڕیارێکیان گەڵاڵە کردبوو، ئەویش ئەوەبوو کە "لەو چەند کەسەی کە کاتێك پێغەمبەر ﷺ مرد لێیان ڕازی بوو، خەلیفەیەك هەڵبژێردرێت، بە بڕیاری هەموو موسڵمانان"[٤٣٢]. سوپای عەلی بەم بڕیارە ڕازی نەبوون ناردیانەوە بە شوێن خەواریجەکاندا بۆ ئەوەی بێنەوە ناویان، بەڵام ئەوان وتیان: (عەلی) بەو صوڵحکردنە خۆی کافر کردووەو تا تۆبەی خۆی لەو کافربوونەی ڕانەگەیەنێت نایەینەوە ناو سوپاکەی، (عەلی) فەرمووی: "خەڵکینە ئەمانە هەن و ئەوە حاڵیانە کەچی ئێوە داوای شەڕی**

---

[٤٢٨] ماوەی ساڵێك دانرا بۆ ئەوەی (موشاوەرەی تەواو)ی تێدا بکرێت بۆ چارەسەری کێشەی بکوژانی عوسمان و مەسەلەی یەکخستنەوەی هەردوو هەرێمی عێراق و هەرێمی شام.

[٤٢٩] اسنى المطالب (٢/١٧٣و ١٧٤).

[٤٣٠] لە هەندێك ریوایەتدا ئەڵێت: "چواردە هەزار کەس"و لە هەندێك لە ریوایەتی تردا ئەڵێ: "بیست هەزار کەس". (اسنى المطالب: ٢/٧٤٢).

[٤٣١] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەو بۆ زیاتریش سەیری (الام الشافعي: ٤/١٣٦) والطبري: (٥/٦٦٨) بکە.

[٤٣٢] العواصم من القواصم (١٧٤و ١٧٥).

ئەهلی شامم لێدەکەن؟!"، ئەوەبوو (لە ڕۆژی (٣٨/٢/٩)ی کۆچیدا وەك "صەللابی" ئەیلێت[٤٣٣])، سوپای عەلی بەرەو نەهرەوان ڕۆیشت، بۆ سنوردانان بۆ خەواریجەکانو لە ئەنجامدا وەك مێژوو دەڵێ: تەنیا (١٠) کەسیان ڕزگاری بوو کە یەکێکیان (ابن ملجم)[٤٣٤] بوو کە بڕیاریدا عەلی لە تۆڵەی هاوڕێکانیدا بکوژێتو ئەوەبوو لە شەوی هەینی ڕەمەزانی ساڵی (٤٠)ی کۆچیدا، (ابن ملجم) بڕیارەکەی خۆی هێنایە جێو لە نوێژی بەیانیدا حەزرەتی (عەلی) دایە بەر خەنجەرو شەهیدی کردو ئەوەندەش بە حیرسەوە خەنجەرەکانی لێدابوو تەنیا سێ ڕۆژ مایەوەو لە (٢٠/ ڕەمەزان/٤٠)ی کۆچیدا وەفاتی کرد".

٣. ئەو قەناعەتە دینییانەی (خەواریج) هەیانبوو کە بەرهەمی بێ عیلمیو ناحاڵی بوونیان بوون لە زۆربەی بڕگەکانیدا پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلام بوون.

. بڕوایان وابوو هەرکەس "گوناهێکی کەبیرە" بکات ئیتر ئەوە کافرەو هەرگیز خوا لێی خۆش نابێتو بە هەمیشەیی لە ئاگردا ئەمێنێتەوە.

. بڕوایان وابوو "عەلی" کافرەو "عوسمانو مەعاویە" کافرن، ئەوەی سوڵحی ڕێك خستو ئەوەشی پێی ڕازی بوو هەموویان کافرنو بۆنی بەهەشت ناکەن.

. بڕوایان وایە لە هەر میللەتو ڕەگەزێك بێت دروستە خەلیفە دابنرێو ئەو خەلیفەیە کەمترین زوڵم بکات واجبە لێی قەبووڵ نەکرێتو لاببرێت، ئیتر چی ئەبێت با ببێت[٤٣٥].

٤. فوئاد میسری ئەڵێ: خەواریج ئەوانەن باوەڕیان بە هیچ حوکمێك نەبووە حوکمی قورئان نەبێت! ئاخر بڵێ تۆ ئەم قسەیەت لەکوێ هێنا؟ کام حوکمی قورئان؟

. خوای گەورە ئەفەرموێت: (إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ..)، خوا تەنیا لە گوناهی (شیرك) خۆش نابێتو لە هەموو گوناهێکی تر خۆش ئەبێت، بەڵام خەواریج وا ناڵێتو بەڵکو ئەڵێن: خوا لە گوناهی کەبیرەش خۆش نابێت، واتە خوا لە عارەق خۆرو زیناکەرو پیاو کوژ هەرگیز خۆش نابێت هەرچەندە ئیمانیشی هەبێت.

. خوای گەورە ئەفەرموێ: (وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا..)، ئەگەر دوو کۆمەڵی مسوڵمان شەڕ کەوتە نێوانیان ئێوە سوڵحیان بکەن.. خوای گەورە هەر بە مسوڵمانیان ئەزانێت، با بە شەڕیش بێن، کەچی خەواریج بە کافریان ئەزانن، خوای گەورە ئەفەرموێت سوڵحیان بکەن، خەواریج ئەڵێن: ئەوەی سوڵحی کردن کافرەو ناچێتە بەهەشت.

. خوای گەورە دەربارەی سەحابەی پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ..)، ئێوە باشترین ئوممەتێکن کە پەروەردە کراون، بۆ خزمەتی خەڵکی، کەچی خەواریج ئەوبەرە ناوازە جوانو نەجیبزادانە بە کافرو لادەرو جەهەننەمی ئەزانن..

. تاقمێك لە خەواریج گەیشتنە ئەوەی ئەیان وت: "پێنج فەرزەی نوێژ نییەو تەنیا دوو نوێژ بەسە یەکێکیان لە بەیانیداو ئەوی تریان لە ئێوارانداﹱ"[٤٣٦].

ئەوە حاڵی (خەواریج)ە وەك قەناعەتو ئەفکار، وەك مومارەسەش تا توانییان بەربوونە گیانی ئوممەتی ئیسلامیو ئەو قەوارە ئیسلامییەیان هەڵدەکۆڵیو هەوڵی لەرزۆککردنیان ئەداو ئەوەی پێیان بکرایە ئەیانکرد، ئیتر نازانم فوئاد مەجید میسری دڵی بە کوێیاندا چووە، خەواریج ئەگەر (عەلی)و (عوسمان)و (سەحابە) بە کافر بزانن، ئەوە ئەبێ کەسێکی وەکو تۆ بەچی بزانن، وا دڵت پێیاندا چووە؟!! خەواریج کەسانێکن وەك مێژوونووسان ئەڵێن: "خەواریج بەچکەی سەبەئیە توندەڕەوەکانن"، چونکە ئەوان دژ بە خیلافەتی عوسمان بوونو هەموویان بەشداربوون لە شەهیدکردنەکەیداو بەڵکو شانازییان پێوە ئەکرد، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە زۆر ئەترسان شەڕ لە نێوان (عەلی)و (مەعاویە)دا بوەستێتو صوڵح بەرقەرار

---

[٤٣٣] اسمى المطالب (٢/٢٢٢).

[٤٣٤] دراسات في الفرق والعقائد الاسلامية (ص٩٣).

[٤٣٥] دراسات في الفرق (٩٥و ٩٦).

٤٣٦ ارشاد الساري (١٠/٨٤).

بێت، چونكە ئەیانزانی كە لە تۆڵەی ئەو بەشداریكردنەیاندا ئەكوژرێنەوە، بۆیە هەمیشە ئاگری شەڕیان خۆش ئەكردو نەیان ئەهێڵا هەرگیز بكوژێتەوە[٤٣٧].

دوای ئەمانە نازانم ئیتر خەواریجو حوكمی قورئان كوجا مەرحەبا، خەواریجو ویژدان كوجا مەرحەبا، خەواریجو دینی ڕاستەقینە كوجا مەرحەبا! هەرچەندە بەرەی سەرەتای خەواریج جیاوازی هەیە لە بەرەكانی تری دوای خۆیان وەك فەرموودەیش ئەفەرموێت: (یمرقون من الدین كما یمرق السهم من الرمیة)[٤٣٨].

بەڵام هەرچۆن بێت فوئاد میسری لە شتێكی تریشدا هەر بەهەڵەدا چووە كە قەناعەتی وایە (خەواریج) لەسەر ماددە لە عەلی جیابوونەتەوە، یان كۆیلەو پیشەوەرو ئەو بەزمانە بوون.. چونكە ڕاستییەكەی ئەوەیە خەواریج لەسەر (فیكر) نەك ماددە لە عەلی جیابوونەتەوە خەڵكانێكیش بوون زیاتر ئەهلی فیكر بوون نەك ئەهلی كاسبیو كەسابەت، زوهدو دونیا نەویستی خەواریجیش بەناوبانگە لە مێژوودا.. كەواتە نە ئەفكاری خەواریجو نە پاڵنەری خەواریجو نە حاڵی خەواریج نابێتە یارمەتی دەر بۆ دیدە ماتریالیزمییەكەی فوئاد مەجید میسری كە بەزۆر ئەیەوێ مێژووی ئیسلامی پێدا بكاتو لەوسەرەوە دەری بهێنێت!!.

---

[٤٣٧] دراسات في الفرق (ص ٨٨ ـ ٨٩).

[٤٣٨] ارشاد الساري (٨٥/١٠).

فوئاد مەجید میسری لەم بەشەشدا وابزانم زۆرترین هەڵەو غەڵەتی هەیە، هەر لە پاش سەرباسەکەوە یەکسەر ئەڵێ: "کاتی خۆی قورئان هیچ ڕێو شوێنێکی بۆ چۆنییەتی دامەزاندنی دەوڵەت دانەناوە، تاقە ئایەتێك لە قورئاندا نییە باسی دەوڵەتو شێوەی پێکهێنانی دەوڵەت بکات، پەیامبەر بۆ خۆشی تا لەژیاندا بوو هیچ هەوڵێکی نەداوە دەوڵەتی ئیسلامی.. دابمەزرێنێت.. نەبوونی (حدیث)یش لەبارەی دەوڵەتو شێوەی پێکهاتنییەوە بەڵگەیەکی دیکەی ئەم بۆچوونەیە"[439].

بەڕاستی فوئاد میسری لەم حوکمەیدا چەند ناڕەوایيو نەزانینی داوەتە پاڵ خۆی:

یەکەم: دەریخستووە هیچ ئاگاداریيەکی لە قورئان نییە.

دووەم: دەریخستووە هیچ ئاگاداریيەکی لە فەرموودەش نییە، ئەمە چۆن؟ قورئان لە باسی "حکم"و "حوکمڕانی"داو پێغەمبەر ﷺ لە ژیانیدا بەهێزترین حکومەتی لە سەردەمی خۆیدا دروست کرد.. فەرموودەی زۆریش هەیە دەربارەی "حکم"و سیاسەتو ئیدارەدانی گەلو وڵاتو دەوڵەت.

با بۆ هەریەکەیان تەنیا دەقێك یان دوان بنووسین، چونکە خۆ نووسەری ناوبراو بە شێوەیەکی گشتی نەفی ئەو مەسەلەیە لە قورئانو فەرموودەو ژیانی پێغەمبەر ﷺدا ئەکاتو خوا یاربێت بەدووروو درێژی لە شوێنی تردا باس لەو مەسەلەیە ئەکەین.

لە قورئاندا: خوای گەورە لە دەیان ئایەتداو بە لەفزی "حکم" باسی حوکمو حوکمڕانی ئەکات، بۆ نمونە لە قورئاندا ئەفەرموێت:

. (وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ ..) (المائدة: ٤٩).

. (..وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: ٤٤).

. (أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ)(المائدة: ٥٠).

لە فەرموودەدا: پێغەمبەر ﷺ لە دەیان شوێندا باسی (حکم)و حوکمڕانی دەکات، بۆنموونە ئەفەرموێت:

.. ينقض عرى الاسلام عروة عروة، أولها نقضا الحكم وآخرها الصلاة..

. كانت بنو اسرائيل تسوسهم الانبياء، فكلما هلك نبي بعث الله نبيا آخر..

. لە ژیانی پێغەمبەردا ﷺ: پێغەمبەر ﷺ هەر لە مەککەدا حاڵی بوو کاری ئەو بریتییە لە دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسیی بەهێز تا دوای خۆی ئەم ئایینە بپارێزرێت.

. هەوڵدانی بۆ پەیداکردنی (دار الهجرة) بۆچی بوو؟ ئەگەر بۆ دۆزینەوەی ڕێوشوێن نەبێت بۆ دامەزاندنی ئەو قەوارەیە؟

. فەرزکردنی (هیجرەت) لەسەر مسوڵمانان بۆ مەدینە بۆچی بوو؟! ئەگەر بۆ ئەوە نەبوبێت ئەو (قەوارەیە) بەهێزو مەحکەم بکات بە پیاوو پارەو پلان.

. نووسینی بەیاننامەی مەدینە یان دەستوری مەدینەو داهێنانی برایەتی نێوان ئەنصارو موهاجر بریتی نەبوو لە یەکێتیی گەلو وڵاتو ڕاگەیاندنی قەوارەیەکی سیاسیی تازە؟!

. باشە قبوڵکردنی (سوڵحی حودەیبییە) کە لە ڕووکەشدا هیچ سودێکی بۆ مسوڵمانان نەبووە، بۆچی بوو؟ بۆ ئەوە نەبێت کە پێغەمبەر ﷺ قورەیش ناچاری ئەوە بکات دان بنێن بەوەدا کە موسڵمانانیش بوونو شەرعییەتیان هەیەو خاوەنی "قەوارەی تایبەتی خۆیانن"!

باشە دامەزراندنی سوپایەکی هەڵمەتبەری بەهێز بۆ پاراستنی ئەو دەوڵەتە مانای چی ئەگەیەنێت؟ ئەوە نەبێت پێغەمبەر ﷺ خاوەنی دەوڵەت بووەو بەرنامەی گەشەکردنی بۆ داناوە.

دەی باشە کاکی نووسەر! ئیتر ئەشێت لەسەر ئەو قسانە بەردەوام بیتو خۆشت هەر بە پیاوێکی بە ویژدانو خوێندەوار بزانیتو بە مافی خۆتی بزانی لەسەر ئیسلامو ئەهلی ئیسلام بنووسێ چ لەسەر مێژوویانو چ لەسەر واقعیان.

کاکە فوئاد! بۆ زانیاریت ئیسلام وەك قورئانو فەرموودە بە چوار شێوە ڕێو شوێنی بۆ دەوڵەت دامەزراندن سەلماندووە:

[439] کۆمەڵگا، ل (١٩٢).

**١. لەفزی حوکم. ٢. سروشتی یاسا ئیسلامییەکان. ٣. مێژووی چوارده سەده دەسەلاٌت. ٤. ئەو سەروەتە زۆرەی یاساو ڕێنمایی فقهی ئیسلامی.**

**یەکەمیان: لەفزی حوکمو هەموو موشتەقاتەکانی ئەو لەفزە وەك (حَكَمَ)و (يَحْكُمُ) و (حُكْمُ) و(يُحاكَم) و (أحكم).. هتد[٤٤٠]، بەو شێوەیەش لە فەرموودەشدا بە لەفزی (يسوس)، (سیاسەت)و (حکم).. باس لە دەوڵەتو حوکمڕانی ئەکات.**

**دووهەمیان: سروشتی (بڕیار)و یاساکانی ئیسلام دوو جۆرە، ئەو بڕیارو یاسایانە بە شێوەیەکی (تاك)ی جێبەجێ ئەبن.. ئەو یاسایانەی کە بە (کۆمەڵ)و (دەوڵەت) نەبێت جێبەجێ نابن.. جۆری یەکەمیان وەك: (نوێژو ڕۆژوو حەج.. هتد).**

**جۆری دووەمیان وەك: (قصاص، ئیقامە حوجە، جیهاد، ڕاگرتنی مەحاکم، وەرگرتنی زەکاتو دابەشکردنی بەسەر کەسەکانیدا).**

**دەی ئەگەر ئیسلام قەوارەیەکی سیاسیو دەوڵەتی نەبێت کام عەلمانی خێری پێ ئەکات ئەو یاساو سیستەمە سیاسییەی بۆ جێبەجێ بکات؟!**

**دەی کەواتە ئەو یاسایانە خۆیان لە خۆیاندا یانی ئەوەی کە ئیسلام بەبێ "حوکمو حکومەت" مەرەکەبی سەر کاز ئەبێت[٤٤١].**

**سێیەم: مێژووی زیاتر لە (چوارده سەده) لە سوڵتانی ئیسلامی ئەگەر مانای حوکمو دەوڵەتداری نەبووبێت، مانای چی بووە؟ ئاخر زیاتر لە چوارده سەده ئیدارەدانی ئوممەتی ئیسلامی نەك میللەتێك بە تەنیا بەڵکو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی نەك وڵاتێك بە تەنیا بەچی ئەکرێت ئەگەر ئیسلام ڕێو شوێنی بۆ ئەو دەسەلاٌتە گەورەیە دانەنابێت..**

**چوارەم: کە نە کۆتا خاڵی ئێمەیەو نە کۆتا خاڵیشە لەم بوارەدا، ئەو هەموو سەروەریە فقهییە لە ئیسلامدا لە کێوە سەرچاوەیان گرتووە؟**

**کە لە هەرچی دەستوورەکانی دنیادا هەیە ئەوەندە بە دوورو درێژی باسی حوکمو حوکمڕانی نەکراوە، هەر زانایەك لە زەمانو چەرخی خۆیدا هەستاوەو لە ژێر ڕۆشنایی (قورئان)و فەرموودەو ژیانی پێغەمبەرﷺو ئەصحابی پێغەمبەرﷺدا کتێبێکی گەورەی داناوە بۆ ئەوەی ببێتە یاسا بنەڕەتییەکان بۆ حوکمڕانی لە سەردەمی خۆیداو بتوانێت گۆڕانکارییەکان بگرێتە خۆی، کتێبی (الخراج)ی ئیبن ئەبی ئادەمو ئەوەی (ئەبو یوسف) و (أحكام سلطانية)ەکەی فەرائی حەنبەلیو ئەوەی ئەبی یەعلای ماوردی شافعی و (السياسة الشرعية)ی ئیبن ئەیمییەو (الطرق الحكمية)ی ئیبن قەییمی جەوزیەو کێو کێی.. مانای چییان هەیە لای تۆو ئایا ئەوانە کتێب نین! لە حوکمو چۆنییەتی حوکمڕانیدا، ئایا فقهی ئیسلامیو کتێبەکانی فەرموودە هەموویان یەك بابەتی تایبەتییان تێدا نییە بەناوی "كتاب الأحكام" یان ناوی "كتاب الامارة" کە دەیان فەرموودەو ئایەتیان ڕاڤە کردووە، ئەگەر نازانی "پرسیارکەو دانا بە!" ئەگەر ئەشزانی "زانای بە ویژدان بە".**

**- کاکە فوئاد! مەگەر زانایانی ئیسلام نافەرموون: ئیسلام هاتووە بۆ پاراستنی هەشت شتی پێویست لە ژیاندا.**

**١. پاراستنی دین، چونکە مرۆڤ بەبێ دین نایکرێتو هەرگیز بەرەو کەمال ناتوانێت بڕواتو بەڵکو بەرەو داڕمانو قەیران ئەڕوات، تەنانەت ئەگەر مرۆڤ دینی ڕاستەقینەش نەناسێ گیانو دەروونی داوای دینێکی لێ ئەکات باپڕ خورافاتو شتی ناعاقلاٌنەش بێت!!**

**٢. پاراستنی نەفسو ڕۆح، چونکە بەبێ نەفسو ڕۆح ژیان هەمووی ئەکوژێتەوەو، ئەگەر شوراو پەرژین بۆ پاراستنیگیانی خەڵکی دانەنرێت ئەوە هیچ شتێکی تر نرخی نامێنێ.**

**٣. پاراستنی ماڵ، چونکە بەبێ ماڵ هەموو کەس ژیانی ڕائەوەستێت.**

**٤. پاراستنی نەوە، چونکە مرۆڤ ئەگەر بەردەوام نەوەی لێ نەبێت پاش ماوەیەك ژیان کز ئەبێتو ئەوەستێت.**

---

[٤٤٠] زیاتر لە (٣٠) شوێنی قورئاندا لەفزی (حکم، یحکم، أحکم، یحاکم ..) هاتووە، هەمووشی مەبەستی پێی حوکمڕانییە. سەیری (مفردات القران الكريم)، الحصمي ماددەی (حکم) بکە.

[٤٤١] فوئاد مەجید میسری خۆی دژ بەخۆی ئەڵێ: "ئاینی ئیسلام پەیامبەر بە نێردراوی خواوەند دادەنێو پێی سپاردووە کاروباری کۆمەڵگا، ڕێك بخات دیارە کۆمەڵگاش بەبی دامەزراندنی دامو دەزگای دەوڵەت مومکین نییە بەڕێوەبچێ". (ل ٩٢).

٥. پاراستنی عەقڵ، چونکە ئەگەر (عەقڵ) نەپارێزرێت ژیان بە خەڵکی شێتو مەست نابرێت بەڕێوە.

٦. پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ، چونکە مرۆڤ بە سووکو سەلیمیو بێ ئابڕووی ناتوانێ ژیان بباتە پێشەوە.

٧. پاراستنی دەوڵەت، چونکە مرۆڤ بەبێ دەوڵەت ناتوانێت یاساو ڕژێم بەرقەرار بکاتو خۆشت ناڵێی "کۆمەڵگا بەبێ دامەزراندنی دەزگای دەوڵەت مومکین نییە بەڕێوە بچێت".

٨. پاراستنی ئەمنی وڵاتو میللەت، چونکە دەوڵەت بەبێ دابینکردنی ئەمنییەت بۆ خەڵکی ژیانیان لارسەنگ ئەبێت[٤٤٢].

جا ئیسلام بۆ پاراستنی هەریەك لەو شتە پێویستیانە هەندێ شوراو دیواری داناوە بۆ پاراستنیان کە زانایان ئەیکەنە سێ شورا بەم ناوانە: شتە فەرزەکان، شتە کەمالیاتەکان، شتە جوانەکان.

بۆ نمونە دامەزراندنی دەوڵەتو پاراستنی یەکێکە لە شتە پێویستییەکان لە ژیاندا، چونکە کۆمەڵگە بەبێ دامەزراندنی دەوڵەت مومکین نییە بەڕێوە بچێت.

بۆیە ئیسلام بۆ بەدەستهێنانی ئەم شتە پێویستە سێ ئەرکی داناوەو کردوویەتییە شورا بۆ پاراستنی:

١. شورای شتە فەرزەکان: "(هەڵبژاردنو دانانی خەلیفەو ئەنجومەنی ڕاوێژکاری) واجبی سەرشانی هەموو موسڵمانانە".

٢. شورای شتە تەکمیلییەکان: "بەرزڕاگرتنی خەلیفە، پاراستنی نهێنییەکانی.. گوێگرتنو گوێڕایەڵی بۆ خەلیفەو بۆ جێگرو نوێنەرەکانیشی لە هەرێمەکاندا".

٣. شورای شتە جوانکارییەکان: "ئامۆژگاریکردنی بە نهێنی نەك لەناو خەڵکدا، هاوکاریکردنی دەزگاکانی حکومەت لەلایەن جەماوەرەوە، دالّدەنەدانی پیاوخراپو خەڵکی یاخی کە بە زاراوەی شەرعی پێی ئەوترێت (محدث)[٤٤٣]".

هەربۆ ڕۆشنکردنەوەی زیاتر ئەڵێین: با فوئاد مەجید میسری ئەو هەموو فەتوایەی کە هەیە دەربارەی دانانی خەلیفەو هەڵبژاردنی (ئەهلی حەلو عەقد)و دیوانەکانی جوندو مەزالمو وەزارەتی (تەنفیز)و وەزارەتی تەفویز.. هتد، وردبکاتەوەو وەردی باتەوەو لێی ورد بێتەوە بەڵکو قەناعەتی بۆ دابمەزرێت کە ئەو فەتوایانە لە خۆڕاییو هەروا لە بۆشدا نەوتراون هەر هەموویان لەژێر ڕۆشنایی ئایەتێك یان فەرموودەیەکدا وتراون، بۆنموونە ئیمامی نەوەوی ئەفەرموێت: "وأجمعوا على انه يجب على المسلمين نصب خليفة.."[٤٤٤]، هەموو زانایان ـ ئیجماعیان ـ هەیە لەسەر ئەوەی (فەرزو پێویستە) لەسەر موسڵمانان خەلیفە بۆ خۆیان دابنێن.

لەوانەیە فوئاد مەجید میسری ئەوە بزانێت وشەی (واجب) لە شەرعدا بۆ شتێك بەکاردێت کە ئایەتێك یان فەرموودەیەك بە یەکێك لە سیغەکانی ئەمر وترابێت کە لە (ئوصول فقه)دا باسی زیاتر لە (١٠) سیغەی بۆ ئەمر هاتووەو زانایانیش ئەفەرموون: "الأمر للوجوب" سیغەی ئەمر بۆ واجبکردن بەکار دێت، خۆشت هەقە بزانی کە زانایان لە هەموو ئەو نووسینانەدا پشتیان بە ڕیوایەت بەستووەو ئەوەش یانی های لە ئیسلامدا ڕێو شوێن دانراوە بۆ دەوڵەتو دەوڵەتداری، کاکە فوئاد! ئەگەر دانانی پێشەواو خەلیفە واجب نەبوایە، بۆ سەحابە حەڵاڵ بوو پەلە لە دانانی خەلیفەدا نەکەنو دوای ناشتنی پێغەمبەر ﷺ بە شێنەییو لە سەر خۆ باسو خواستیان لەسەر بکردایە[٤٤٥].

زانایان دەفەرموون: ئەوەی بە دەسەڵاتو حکومەت ئەچەسپێت بە قورئان خۆی ناچەسپێت[٤٤٦].

---

[٤٤٢] هەندێ لە زانایان شتە پێویستەکان بە پێنج شت دائەنێن (دین، نەفس، عەقڵ، ماڵ، مناڵ). سەیری (الموافقات الشاطبی) بکە.

[٤٤٣] پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (لعن الله من آوى محدثا، لعن الله من غير منار الارض)، نەفرینی خوا لەو کەسە بێت کە خەڵکی خاوەن بیدعەو یاخی دالّدە ئەدەن، نەفرەتی خوا لەو کەسەش بێت کە سنوورەکانی زەوی ئەگۆڕێتو موڵکەکان تێکەڵ بە یەکتر ئەکات. فەرموودەکە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە.

[٤٤٤] شرح مسلم مع ارشاد الساري (٨/٩).

[٤٤٥] ئیمامی نەوەوی دەربارەی ئەو قسەیەی کە ئەڵێ: دانانی خەلیفە واجب نییە، ئەفەرموێت ئەو قسەیە بەتاڵە بەپێی (ئیجماع)، ئەوەش نابێتە بەڵگە گوایە ئەسحابی پێغەمبەر ﷺ ماوەیەك بێ خەلیفە بوون لە کاتی ڕاوێژکردنیاندا لە (سەقیفە)دا یان لە ڕۆژانی ڕاوێژکردندا لە کاتی مردنی حەزرەتی عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت)، چونکە ئەوان وازیان لە دانانی خەلیفە نەهێنابوو بەڵکو لە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێو شوێندابوون بۆ دانانی کەسی شیاو بۆ ئەو جێگەیە. (شرح صحيح مسلم مع ارشاد الساري، ٨/١٠).

[٤٤٦] قسەکە لە بنەڕەتدا هی خەلیفەی سێهەمی ڕاشدینە (عوسمانی کوڕی عەففان) کە ئەفەرموێت: "ان الله ليزع بالسلطان مالا يزع بالقران".

. هەروەها بۆ باس ئەشێت کە زانایانی ئیسلام چەند بنەمایەکی شەرعی، (قواعد شرعی)یان لە دەقەکانی قورئانو سوننەت دەرهێناوە، لەوانە: "مالایتم الواجب الا به فهو واجب"[٤٤٧] دەی خۆ جێبەجێکردنو یاساو ڕێنماییەکانی ئیسلام هەمووی واجبە، (سورە أنزلناها وفرضناها) دەی ئەو یاساو واجبانەش بە دەوڵەتو حوکم نەبێت جێبەجێ نابن کەواتە، دروستکردنی دەوڵەت "واجیبە" هەوڵدان بۆشی لە واجباتی ئەم دینەیە.

جا کاکە فوئاد:

١. ئەوە قورئان پڕیەتی لە ئایەت دەربارەی حوکمو حوکمڕانیو دەوڵەت.

٢. ئەوە فەرموودە پڕیەتی لەی فەرموودەی "قەولی"و "فعلی"و "تەقریری".

٣. ئەوە ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەمووی هەوڵ بووە بۆ دروستکردنی قەوارەیەکی سیاسیی ئیسلامیی.

٤. ئەوە مێژووی زیاتر لە چواردە سەدە دەسەلآتی سیاسیی ئیسلام بۆ ئیدارەدانی ئوممەتێك نەك نەتەوەیەك، ئیمپراتۆریەتێك نەك ولآتێك، گەورەبێت یان بچووك.

٥. ئەوە ئەو سەروەتە فقهییە گەورەی کە زانایانی ئیسلام بەشێوەی "دەستور"و یاسا" لە دەقەکانی "قورئان"و "فەرموودە" وەریان گرتووە یان بە دەلیلی "منطوق" یان بە دەلیلی "مەفهوم"[٤٤٨].

٦. ئەوەش سەروەتێکی بێ شومار لە کتێبی ئیسلامی زانایانی کۆنو تازە لەسەر سیاسەتی شەرعیو ئەحکامی سوڵتانیو بڕیارە حکومەتییەکانو چۆنییەتی دانانی پێشەوای دەوڵەتو ئەنجومەنی شوراوجیاکردنەوەی هەرسێ دەسەلآتی "تەشریعی"و "تەنفیزی"و "قەزائی".. هتد.

٧. ئەوەش ئەو قەواعیدە شەرعییەی کە دامەزراندنی دەوڵەت بە "واجب"دادەنێت، چونکە زۆربەی واجبەکانی تری پێوە بەندە.

٨. ئەوەش ژمارەیەکی زۆر لە فەتوا کە باس لە ئیجماعی ئوممەتی ئیسلامیی ئەکات، دەربارەی ئەوەی کە دانانی قەوارەیەکی سیاسیی بۆ ئیسلام کە لە سەرۆكو دەسەلآتێکدا دەرئەکەوێت.. ئیتر نازانم کاکە فوئاد بۆ ئەڵێی تاقە ئایەتێك نییە لە قورئاندا باس لە دەوڵەت بکات!! پێغەمبەریش ﷺ بۆ خۆی لە ژیاندا هیچ هەواڵێکی بۆ دروستکردنی دەوڵەت نەداوە!! نەبوونی فەرموودەیش دەربارەی دەوڵەت دەلیلێکی تری ئەم بۆچوونەیە!! ئایا ئەمە ڕەوای هەقە؟!

. فوئاد میسری دوای ئەمە ئەیەوێت بیسەلمێنی کە ئەم قسەیەی خۆی کردوویەتی زۆر ڕاستەو بە حساب ڕەخنە لە "محمد احمد خلف الله" ئەگرێ کە نووسەرێکی بزرکاوی میسرییە، ئەیکاتە موجتەهیدو نووسەرێکی ئیسلامیی هاوچەرخ[٤٤٩]. گوایە وتوویەتی خوای گەورە بە ئەنقەست ئەم مەسەلەیەی (باسنەکردنی دەوڵەت لە قورئاندا!!) پشتگوێ خستووە، مەبەستی بووە دامەزراندنی دەوڵەت بە بنیادەم بسپێرێ[٤٥٠]. جا نووسەر ڕەخنە لە ناوبراو ئەگرێو چوار بەڵگە دێنێتەوە بۆ بێمانایی قسەکەی "خلف الله"، بە کورتی

١. دەق لەسەر ئەو مەسەلەیە نییە.

٢. جیاکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ لە خەڵك ناڕاستە.

٣. کە تەڕو وشك هەمووی لە ئیسلامدا باسکرابێت ئەی بۆ دەوڵەت ئەو نرخەی نەبووە باسبکرێت.

---

[٤٤٧] هەروەها (الضرر یزال) یان (درء المفاسد اولی من جلب المصالح).

[٤٤٨] زانایان بەڵگەکان بە گشتی ئەکەنە دوو بەشەوە: بەڵگەی ڕوونو دیار، بەڵگەی ئاماژە بۆ کراو.. ئەو ئایەت یان ئەو فەرموودەیەی بەڕوونیو بە وشەی دیارو تایبەت دان بە شتێکدا ئەنێ ناو ئەنێن "دلیلی منطوق" واتە قسەی لێکراوەو ناوی براوە، بەو ئاماژانەی قورئان یان فەرموودەیش کە باسی مەسەلەیەك دەکەن ئەوترێ "دەلیلی مەفهوم"، بۆنمونە خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ)، کەواتە: ڕاوێژکردن بە ئەنجومەنی شورا یەکێکە لە ئەرکەکانی پێشەوای دەوڵەت، ئەمە بەڕوونو ئاشکرایی.. ئەوەش وەردەگیرێ لێی کە "دانانی ئەنجومەنی شورا بۆ خەلیفەو پێشەوا" یەکێکە لە ئەرکەکانی (واجبات)ی ئوممەتی ئیسلامی، ئەوەی یەکەم "منطوق"ەو ئەوەی دووهەم "مفهوم"ە.

[٤٤٩] کۆمەڵگا، ل (٩٨)، لە لاپەڕەکانی دوایشدا هەر بەو لەقەبە ناوی دەبات.

[٤٥٠] کۆمەڵگا ل(٩٢)، گوایە لە وتارێك بە ناوی (القرلن والدولة)ی موحەممەد خلق الله وەریگرتووە کە لە (مجلة الکاتب)دا ژمارەی (١٣٩)ی ساڵی (١٩٧٢) لە لاپەڕە (٢٩)دا بلآویکردۆتەوە.

**٤. هیچ حیکمەتێك لەوەدا نییە، خوای گەورە مەسەلەی دەوڵەت بە (معلق)ی بهێڵێتەوە**[٤٥١].

**جا بە ڕاستی ئەم ئیشەی فوئاد مەجید میسری لە ئیشی کەسێکی فێڵباز ئەچێت کە بیەوێت بە بەردێك دوو چۆلەکە بکوژێت بە حسابی خۆی؟ لەلایەکەوە بیسەلمێنێ سپاردنی دەوڵەتو دروستکردنی بە بنیادەم "ئیشتبایە"و هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە، ئەمە پاش کەمێکی تر باس دەکەین. لە لایەکی ترەوە حکومەتو دەوڵەت ئەبێت تانو پۆی هەموو لەلای خواوە دیاری بکرێت!**

**جا با وەلامی ئەو "بەرد هاویشتنە بێهودەیە"ی فوئاد میسری بدەینەوەو پێشی بڵێین لە بەدبەختیدا بەردەکان چروکیان کردووە!**

**١. (محمد احمد خلف الله) نووسەرێکی بزرکاوی عەلمانییەو بڕوای بە بوونی دەوڵەتو حوکم نییە لە ئیسلامدا، (خلف الله) کەسێکە قەناعەتی وایە هەموو ئەو لەفزانەی بەکار هاتووەو وشەی "حکم"ی تێدایە بە هەموو موشتەقاتەکانییەوە، مەبەست پێیان "قەزاوەتو دادگاکانە" نەك دەوڵەتو حکومەت**[٤٥٢]**.. بەلام خۆ بەم "لۆژیکە" گۆجەش بێت مانای وایە ئیسلام بڕیار بەدەستە لە ناو حکومەتو دەوڵەتدا بۆی هەیە لێیان بپێچێتەوەو بڕیاری "شەرع" بدات بەسەریاندا وەك خۆشت لە لاپەڕە (٩٥)دا ئەڵێی: "بۆی هەیە کۆمەڵگاش کۆنترۆڵ بکات".**

**٢. قسەکەی (خلف الله)ش هەڵەیە بە دوو شێوە:**

**یەکەمیان: خوای گەورە نە ئەو مەسەلەیەی پشتگوێ خستووەو نە ئەنقەستیشە.**

**دووەمیان: تانو پۆی دروستکردنی دەوڵەتیشی نەداوەتە دەست بەنیئادەم.**

**بەڵکو ئیسلام (بنچینەکانی حوکمکردن، اصول الحکم)ی داناوەو ئەبێت حوکم لەسەر ئەو پرەنسیپو ئوسولانە دابمەزرێتو بەڕێوە ببرێت، بەلام درێژەی حکومەتداری داوەتە دەست عەقڵی پێگەیشتووی زانایان لە هەموو چەرخێکدا.. با ئەمەش بە نمونە بڵێین:**

**ئیسلام بڕیاری داوە حوکم ئەبێت لەسەر ئەم بنەمانە بوەستێت:**

**١. تەنیا خوا "حاکمە" (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ) واتە بڕیارێك کە خەڵکی ئەبێت جێبەجێی بکەنو نەگۆڕبێت تەنها هی خوایە.**

**٢. سەرۆكو گەورەی وڵات ئەبێت بە ڕەزامەندی گەلی مسوڵمان دابنرێت.**

**. خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ).**

**. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (من بايع اماما من غير مشورة فلا يبايع عليه هو ومن بايع).**

**. عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێت: "انما كانت بيعة ابي بكر فلتة وقى الله شرها".**

**. عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) ئەفەرموێت: "انه بايعني القوم الذين بايعوا أبابكر وعمر وعثمان على ما بايعوهم عليه، فليس للشاهد ان يختار ولا للغائب ان يرد وانما الشورى للمهاجرين والانصار، فان اجتمعوا على رجل وسموه اماما كان ذلك لله رضى"**[٤٥٣].

**٣. کاروباری دەوڵەت پێویستە بە "شورا" بڕوات بەڕێوە.**

**. خوای گەورە ئەفەرموێت (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)، هەروەها ئەفەرموێت: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ)**[٤٥٤].

**٤. حوکم پێویستە "دادگەریی" بەرقەرار بکات.**

**. خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ).**

**. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (مامن راع يسترعيه الله رعية فيموت يوم يموت وهو غاش لرعية لم يرح رائحة الجنة).**

---

[٤٥١] کۆمەڵگا، ل (٩٢ - ٩٣).

[٤٥٢] لە (مجلة الطليعة العربية) وتارێك هەیە بە ناونیشانی "یوسف القرضاوی یحب الکسر ویکره الفتح" نووسینی (محمد أحمد خلف الله) بە داخەوە لە کاتی نوسینی ئەم بابەتەدا ژمارەکەم لانەبوو.

[٤٥٣] نهج البلاغة (ص٤٢٤).

[٤٥٤] زانایان ئەفەرموون ئایەتی یەکەم کە "مەکی"یە باس لە "شورا"ی حیزب ئەکاتو ئایەتی دووەم کە مەدەنییە باس لە "شورا"ی دەوڵەت ئەکات. واتە هەم حزبو هەم دەوڵەت پێویستە بە شورا کارەکانیان بەرن بەڕێوە. (دستور الوحدة العقائدية، شرح اصول العشرين) محمد الغزالي.

**٥. شەریعەت سەرچاوەی سەرەكی تەشریعەو نابێت یاسایەك دەربكرێت لەگەڵ شەرعدا پێچەوانە بێت.**

**. خوای گەورە ئەفەرموێت: (وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللّهِ حُكْماً لِّقَوْمٍ يُوقِنُون)، هەروەها ئەفەرموێت: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيداً). یان ئەفەرموێت: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ).**

**. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (ان الله لم يجعل شفاء امتي فيما حرم عليها).**

**٦. دادگا سەربەخۆو ئازادبێت بۆ ئەوەی كەسی تر بۆی نەبێت دەست بخاتە كاورباری دەوڵەت. یاسا لە سەروو هەموو شتێكەوە بێت.**

**ئیتر دوای ئەمە عەقڵەكان ئازادن لە ئالیەت دۆزینەوەدا بۆ هەموو ئەو مەسەلانەی سەرەوە بۆ ئەوەی "داد"ی پێ بەرقەرار بكەن، یان "شورا"ی پێ جێبەجێ بكەن، یان (یاسادانان)ی پێ ئەنجام بدەن.. هتد.**

**ئیسلام زۆرێك لە پرسەكانی دەوڵەتی جێهێشتووە بۆ خەڵك و عەقڵ و بەرژەوەندی ڕۆژو خەڵكی ئەو ڕۆژە بۆ نموونە:**

**. ناوی سەرۆكی وڵات، دروستە ناوی خەلیفە بێت، یان سەرۆكی وڵات بێت. یان ئەمیر یان سوڵتان یان ڕابەر. هتد، ئیسلام هیچ ناوێكی (تەوقیف) نەكردووە، كە حەتمەن ئەبێت ئەو ناوە بێت و ناوێكی تر بە دروست نەزانێت.**

**. ئیسلام ڕێگەیەكی تایبەتی دانەناوە بۆ دانانی خەلیفە، ئەكرێ بە "هەڵبژاردنی گشتی" بێت ئەكرێ نوێنەرانی خەڵك هەڵی بژێرن، ئەكرێ ریفراندۆم بۆیەك كاندید بكرێ یان بۆ یەكێك زیاترو كێبەركێ دابنرێ و تا دێتە سەر یەكێكیان، وە هەروەها[455].**

**. تەمەنی سەرۆكی وڵات لە ئیسلامدا دیاری نەكراوە، ئەكرێ تا مردن بێت، ئەكرێت بۆ ماوەیەك بێت و كەماوەكەی تەواو بوو جارێكی تر دەرگای كێبەركێ بكرێتەوە لە ئەوو لە غەیری ئەو.**

**. ئیسلام ناوێكی تایبەتی دانەناوە بۆ جۆری حوكم نە جمهوری نە پاشای و نە عەلمانی[456]، نە كە هەنوتی، بەڵكو ئیسلام نە (عەلمانییە) كە دین لە دەوڵەت جیابكاتەوە، نە دەوڵەتی دینیشە سوڵتەی ئیلاهی بداتە خەلیفە.**

**. خەلیفە لە ئیسلامدا ئەكرێ مەرجی بۆ دابنرێ، ئەو مەرجانەی تێدا بوو سەرۆك بێت و ئەگەر مەرجەكانی تێدا نەما ئەوە لەسەر كار لابرێت یەكێكی تر دابنرێت..**

**. دەزگاكانی دەوڵەت ئەكرێت كەم بن، ئەگەر بەرژەوەندی لەوەدابوو زۆر بكرێت ئەوە زیاد بكرێت، هەر ناوێك بنرێت لەو دەزگایانە ئیسلام ڕێگە ناگرێت، مەگەر ناوەكە "عەبەس"و "ناجوان" بێت، ئەكرێ وەزارەتێك ناوی "وەزارە المظالم" بێت ئەشكرێ ناوی "وەزارەتی داد" بێت.. ئەكرێ كاوربارى "زانستو زانیاری" ناوی بنرێت "تربیه وتعلیم" ئەكری ناوی "وەزارەتی بیرو ڕۆشنبیری" بێت ئەكرێ ناوێكی تریشی ببێت.**

**. هەڵبژاردنی ئەندامانی شورا، ئەكرێ دوو ئەنجومەن بێت: یەكەمیان كاریان "یاسا دانان" بێت و دووەمیان كاریان "چارەسەركردنی گرفتی دەوڵەت و میللەت" بێت، یەكەمیان تەنیا لە زانایان و پسپۆڕانی ئەهلی (تەخەصوص) دروست بكرێت و دووهەمیان لە نوێنەرانی میللەت و حزبەكان و ناوچە جیاجیاكان دروست بكرێت كە هەریەكیان كێشەو گیروگرفتی میللەت و ناوچەی خۆی بنووسێت، ئەنجومەنیش ڕێگەچارەیان بۆ دابنێ، ئەشكرێ بە هەر جۆرێكی تر بێت كە ئەو ڕۆژو سەردەمە ئەیخوازێت، گرنگ ئەوەیە "داد" بەرقەرار بكەن.. بەهەرحاڵ ئیسلام لە مەسەلەی حكومەت داناندا ڕێگە بە "ئیقتباس" ئەدات و هانی سەرۆك و ئەندامانی شوراو هەموو مسوڵمانان ئەدات كە "ئیقتباس" بكەن بۆ پێشخستنی دەوڵەتەكەیان..**

**. پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (الحكمة ضالة المؤمن انى وجدها فهو احق بها).**

**. هەروەها ئەفەرموێت: (عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين).**

---

[455] هەریەك لەو ڕێگایانە لە مێژووی ئیسلامیدا نموونەیان لەسەر هەیە، عومەر كاندیدی ئەبوبەكر بوو، گەل قەبوڵی كرد، شەش كەس كاندیدی عومەر بوو "گەل" عوسمانی هەڵبژارد، عەلی هەڵبژاردەی "مهاجرو ئەنصار" بوو، مەعاویە بە "تەنازل"ی حەسەن لە هەقی خۆی كرا بە خەلیفە.. هەروەها.

[456] نقص كتاب، "الاسلام واصول الحكم" محمد عمارة، ص(٤٧).

**. پێغەمبەری خوا ﷺ (رسائل مختومة)ی لە ڕۆمو فارس وەرگرتووە، عومەر یاسای "دەواوین"ی لە فارس وەرگرت.. هەروەها.**

**ئیتر نە قسەکەی فوئاد میسری نە قسەکەی (محمد أحمد خلف الله) دروست دەرناچێت، کە ئەڵێن: دەوڵەت لە ئیسلامدا نییە.. ئەو ئەڵێ هەر نییەو ئەم ئەڵێ دراوەتە دەست خەڵك. خۆشی ئەوەیە فوئاد مەجید میسری بەبێ ئەوەی بیەوێت دان بە زۆر حەقیقەتدا ئەنێت، کە خودی پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕێوشوێنی بۆ دەوڵەتداری گرتووەتە بەر، سەیر بکە بۆ نموونە چی دەڵێت دەربارەی کاورباری ڕێکخستنی پێغەمبەر ﷺ لە مەدینەدا.**

**"پەیامبەر بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیانی ڕەوکردووان‌و دانیشتوانی (مەدینە) کە بوونە پاڵپشت‌و پەنای ئەوان‌و بە (ئەنسار) ناسراون، دەبوو هەنگاوی نوێ بهاوێژێ، دەبوو بە مەبەستی (ڕێکخستن)و دابینکردنی گوزەرانی موسڵمانان یاسای پێویست بهێنێتە ئاراوە.. بەکورتی ئاینی نوێ ڕووبەڕووی واقعێك بووەوە نەیدەتوانی هەر لە چوارچێوەی (باوەڕی ئایینی‌دا) گیر بخوات‌و لەسەر ئەو لایەنە چەق ببەستێت"[٤٥٧].**

**باشە خوێنەری بەڕێز! ئەمە "ئیعتراف" نییە لەلایەن نووسەرەوە "کە ئیسلام تەنها باوەڕی ئایینی نییەو لەو لایەنەدا چەقی نەبەستووەو بەڵکو یاسای داناوە بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵگاو دابینکردنی گوزەرانیان؟!". دەی خۆ ئێمەش هەروا دەڵێین! مەگەر ئەوەندە هەیە نووسەری ناوبراو قورئانیش بە قسەو گوتاری پێغەمبەر ﷺ دەزانێ یان وادەزانێ پێغەمبەر ﷺ لە خۆیەوە قسە دەکات‌و یاسا دائەنێت! لە کاتێکدا نە ئەمیان ڕاستەو نە ئەویان، قورئان قسەو بڕیارو تەعلیماتی خوایە، پێغەمبەر ﷺ لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو وەك قورئان ئەفەرموێت: (وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَى *إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى)، کەواتە قسەکانی ئەویش هەر بڕیاری خوایە مەگەر ئەو قسەو ڕەفتارانەی نەبێت کە بە سیفەتی "بەشەری" ئەیکات، نەك بە سیفەتی پێغەمبەری ﷺ[٤٥٨]، نەك هەر ئەمە کە نووسەر لە سەرەوە دانی پێدا ئەنێ بەڵکو دەربارەی ئیسلام ئەڵێ: "گۆڕانێکی چۆنایەتی لە بیرو هۆشی موسڵماناندا دروست کرد، بەهۆی ئایدیای ئاینییەوە کە تاکە کەسی موسڵمان بیروڕای کۆنی سەردەمی خێڵایەتی‌و تیرەگەری لە مێشك‌و دەروونیدا دەسڕدرایەوە هەستی دەکرد لە پێناو مەسەلەیەکی ڕەوادا ئەجەنگێ..و بە کوشتنیشی لەو پێناوەدا نەمر دەبێ‌و لەو دونیایش پاداشتی هەیە"[٤٥٩]. نەك هەر ئەمەش بەڵکو نووسەر خۆی ئەڵێ: "مافی خێڵ‌و تاکە کەس‌و مەفهومی تۆڵە سەندنەوە بەپێی یاسا گشتییەکانی ئیسلام گۆڕدران‌و بوونە مافی کۆمەڵگا"[٤٦٠]!!**

**جا لە ڕاستیدا نووسەر شەرحێکی جوانی ئەو قسەیە ئەکات کە لە "النزعات المادية حسين مروة" وەری گرتووەو ئەڵێت: "یانی مافی تایبەتی بووە مافی گشتی‌و نەریتی باوی عەشرەتگەری ناو کۆمەڵگای عەرەب کە تەنها باوەڕی بە دەسەڵاتی خێڵ هەبوو، لە کۆمەڵگای ئیسلامدا لە گۆڕنراو شەریعەت بووە بناغەی دەسەلات‌و کۆنترۆڵی هەموو مەسەلە کۆمەڵایەتییەکانی کرد"[٤٦١]!! کەچی زۆر سەیرە بە ڕاستیش سەیرە! فوئاد میسری دوای هەموو ئەو حەقیقەتانە لەسەر مەزهەبی "بشفڕی هەر بزنە" ئەڵێت: "هێشتا.. ناتوانین لەسەر پاکی دەقەکانی شەریعەتی ئیسلامدا بیروڕایەکی ڕوون‌و ئاشکرا لەمەڕ شێوەی دەسەڵاتی ئیسلام بدۆزینەوە"، پاشان یەك کۆمەڵە زۆر پرسیار ڕیز ئەکات بە خەیاڵی خۆی ئیسلام "بڕیاری کاربڕو کۆتایی" تێدا نەداوە لەو پرسیارانە:**

**١. کێ مافی ڕابەرایەتی هەیە؟**

**٢. ئەوانە کێن مافی هەڵبژاردن‌و دەستنیشانکردنی ڕێبەریان هەیە؟**

**٣. دەبێ ڕێبەر سەر بە چ تیرەو خێڵ‌و خانەوادەیەك بێت؟**

---

[٤٥٧] کۆمەڵگا، (ل٩٤).

[٤٥٨] زانایان قسەو ڕەفتاری پێغەمبەر ﷺ ئەکەنە ئەو دوو بەشە، سەیری (أفعال الرسول)ی عمر سليمان الاشقر نامەی دکتۆراکەی بکە.

[٤٥٩] کۆمەڵگا (ل٩٥).

[٤٦٠] کۆمەڵگا (ل٩٥).

[٤٦١] کۆمەڵگا (ل٩٦).

**٤. ڕێبەرایەتی مافێکی خوداییە یان مرۆیی؟!**

فوئاد مەجید میسری وا ئەزانێ ئەم پرسیارانە لە ئیسلامدا وەڵام نەدراونەتەوە، بەڵام با ئێمە زۆر بە سادەییو سانایی وەڵامی ئەو پرسیارانە لە ئیسلامدا باس بکەین، بەڵکو خوێنەری بەڕێز سوودی لێ وەربگرێ، چونکە لەوە ناچێ نووسەری ناوبراو سوودمەند بێت لێیان.

١. ڕێبەرایەتی مافی هەموو مسوڵمانێکی شیاوە کە بتوانێ پاسەوانی دینو دونیای خەڵك بکات[٤٦٢].

٢. نوێنەرانی ڕاستەقینەی خەڵك واتە: (ئەهلی حەلو عەقد) یان بە تەعبیری ئێستا "پەرلەمان" بۆیان هەیە سەرۆکی وڵات هەڵبژێرن ئەگەر ئاسان ئەیدا بە دەستەوە، ئەگەرنا ئەوە بە "ڕیفراندۆم" هەموو خەڵکی مافی هەیە، ڕێبەر دەستنیشان بکات، یان کاندید دەستنیشان بکەن بۆ ئەو شوێنەو لە مێژووی ئیسلامیشدا هەردوو جۆرەکە هەیە وەك لە پێشەوەش باسمان کردووە.

٣. ئەوە مەرج نییە لە هەر تیرەو تایەفەو میللەتێك بێت، خۆ تیرەی "ئەبوبەکر" لە تیرەی "عومەر"و لە تیرەی "عەلی"و "عوسمان" دوورتر بوو لە پێغەمبەر ﷺ کەچی کرایە خەلیفە. "عەلی" لە "عوسمان" نزیکتربوو لە پێغەمبەر ﷺ کەچی عوسمان کرایە خەلیفە، لەبەرئەوە مەرج نییە لە فلانە خێڵو لە فلانە عەشیرەت بێت، بەڵکو ئەوە پەیوەندی بە هەلومەرجەوە هەیە، ئیسلام ئەوەی نەکردووە بە مەرجی پێویست لە خەلیفەدا.

لەوانەیە لە شوێنێکدا میللەتێك زۆرینە بێت یان عەشیرەتێك یان تایفەیەك، وا بە بەرژەوەندی خەڵك بزانێت سەرۆك لەو میللەتە یان ئەو عەشیرەتو تایەفەیە بێت، تا زامنی گوێڕایەڵی زۆرینە بکرێت، وەك قورەیشی ئەوکاتە بۆ نمونە[٤٦٣].

سەیرە! فوئاد مەجید میسری زۆر مەزهەبیانەو لەسەر مەزهەبی "یەعقوبی"و "مەسعودی" ئەڵێت: "بڕیاردان لەسەر ئەوەی کێ دەبێتە ڕێبەرو چۆن ئەو پایەیەی ئەدرێتێ، مەسەلەیەکی ئەوەندە ئاسایییو سادە نییە بە ئەنقەست دوابخرێو درابێتە دەست مسوڵمانان، تا دوایی بەو جۆرەی حەزیان لێیە بڕیاری لەسەر بدەن!!"[٤٦٤]. جا بەڕاستی زۆر زیرەکانە ڕەگو ڕیشە بۆ ئەم فکرەیە دروست ئەکاتو باس لەوە ئەکات مسوڵمانان دوو ڕایان هەیە لەم مەسەلەدا:

١. یەکەمیان!! هەڵبژاردنی خەلیفە بە مافی خوا ئەزانێ.

٢. دووهەمیان بە مافی خەڵکی دەزانێ.

ئەم حوکمە ناڕەوایەی نووسەری ناوبراو لە دوو لاوە وێرانە:

لای یەکەم: جمهوری مسوڵمانان لە مێژوو لە ئێستاشدا ئەوە ئەڵێن کە ڕێبەر دیاریکردن مافی خەڵکەو بۆیان هەیە بە ڕێگەیەك لە ڕێگەکان ڕێبەر بۆ خۆیان دیاری بکەنو بیکەنە پاسەوانی "دین"و "دنیا"ی خۆیانو هاوکاری بکە بۆ پێشخستنی هەم دینو هەم دونیاش.

لای دووهەم: کۆمەڵێکی زۆر کەم لە شیعە ڕای پێچەوانەیان هەیە.

ئەوانیش هەموو شیعەیەك نا، شیعەی زەیدی وا ناڵێن، ئیسماعیلییەکان واناڵێن، تەنیا شیعەی دوانزە ئیمامی وادەڵێنو بەڵگەو موناقەشەکانیشیان نە قورئان نە فەرموودەی سەحیحو نە عەقڵو نە مێژوو نە واقیع لە گەڵیان نییە، با بە بەڵگە ئەم قسەیە بسەلمێنین:

. قورئان ئەفەرموێت: (وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ) سەرۆکی دیاری نەکردووە، هەروەها ئەفەرموێت: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ)، هەروەها ئەفەرموێت: (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ).

---

[٤٦٢] زۆر سەیرە فوئاد میسری ئەوە بە ستەمو ناحەقی بزانێت، کە کاندیدکراوان بۆ خیلافەت کەم بن یان هەموو خەڵك مافی خۆکاندیدکردنی نەبێ! ئەوە تا بە گاڵتەو ڕەخنەوە ئەڵێ: خۆکاندیدکردن بە چەند کەسێك ڕەوا بینراوە لە پەنجەکانی دەست تێپەڕ ناکات (ل٩٩) باشە کاکە فوئاد!! لەو ئەمریکا گەورەو فراوانەدا هەموو (چوار پێنج) نەفەرێك خۆیان کاندید ئەکەن، لە وڵاتانی تری دنیاشدا هەر نزیك لەو ژمارەیە خۆیان کاندید ئەکەن، ئەوە بۆچی ئەو کارە ئەکەیتە ڕەخنەو ستەم بۆ ئیسلام کەچی بۆ خەڵکی تر ئەیکەیتە سەروەری.

[٤٦٣] پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: (الناس تبع لقريش في الخيرو الشر) (رواه مسلم)، شرح صحيح مسلم مع ارشاد الساري(٣/٨)، نەوەوی ئەفەرموێت: "یانی خەڵکی هەر بە شوێن قورەیشدا ئەڕۆن لە ئیسلامەتیدا بێت یان لە جاهیلیەتدا".

[٤٦٤] کۆمەڵگا (ل٩٧).

. فەرموودەش دەفەرموێت: (عليكم بالسمع والطاعة، وان استعمل عليكم عبد كأن رأسه زبيبة)، ئەشفەرموێ: (لافضل لعربي على عجمي الا بالتقوى).

. بە عەمەلیش پێغەمبەر ﷺ چەند کەسی وەك (عەلی)و (حەمزە)و (ئەبوبەکر)و (عومەر)و فلان‌و فیساری لە خزمان‌و نزیکانی خۆی ئەکردە (سەربان) لە ژێر (ئیمارەتی) کەسێکی تردا، کە نەوەك ئەوان خزم‌و نە ئەوەندەش نزیکبوو لێی.

. عومەریش ئەفەرموێ: "لوكان سالم مولى حذيفة حيا لو ليته"[٤٦٥].

. عەلی –یش ئەفەرموێ: "انما الشورى للمهاجرين والأنصار فان اجتمعوا على رجل وسموه اماما كان ذلك لله رضى"[٤٦٦]. هەروەها کاتێك خەڵکی داوا دەکەن ببێتە ڕێبەرو سەرۆکیان ئەفەرموێت: "دعوني والتمسوا غيري.. فانا لكم وزيرا خير لكم مني اميرا"[٤٦٧].

جا ئەگەر "ئیمامەت" مافێکی خودایی بێت وەك فوئاد مەجید میسری‌و شیعەی ئیمامی ئەیڵێت ئەی (عەلی) چۆن ئەبێت قسەی وا بکات، عاقڵانیش ئەڵێن: "سەرۆکی خەڵك‌و وڵات پێویستە ملکەچی بەرژەوەندی بێت" لە مێژووشدا هەروا کراوە، واقعیی ئێستای دوونیاش هەروایە بە هەڵبژاردن سەرۆکەکانیان دیاری دەکەن، تەنانەت واقیعی شیعە خۆشیان ئێستا هەروایە، ئیمام خومەینی خەڵك کردیانە ئیمام‌و ئەو خۆی (خامنەئی) داناو میللەت‌و گەل ڕەفسنجانی‌و خاتەمی‌و کێ‌و کێ هەڵدەبژێرن.."، بەڵام فوئاد مەجید هەر بەمە کۆتایی پێ ناهێنێت بەڵکو وەك وتم ئەیەوێت ڕەگ‌و ڕیشە بۆ ئەم "فیکرە ئیلاهییە" دروست بکات! بۆیە بەرگری لە دەستەی یەکەمی خۆی ئەکات‌و ئەڵێت: دەستەی یەکەم.. بەڵگەو دەلیلیان بۆ مافی خودایی ڕووداوەکەی "غدیرخم"ە گوایە پێغەمبەر ﷺ دوای حەجی ماڵئاوایی لە شوێنێکدا کە بە (غدیرخم) ناسراوە مسوڵمانانی کۆکردووەتەوەو پێی ڕاگەیاندوون دوای خۆی (عەلی) ببێتە ڕێبەری مسوڵمانان.. هەموو سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلام حەقیقەتی ڕووداوەکەو گوتەی پەیامبەر دەسەلمێنێ"*[٤٦٨]. نەك هەر ئەمە، لە لاپەڕە (١٠١)یشدا جارێکی تر خوێنەرانی دڵنیا ئەکاتەوە کە "ڕووداوەکە جێی گومان‌و دوودڵی نییە"، پاشان ڕەخنە لەوە دەگرێت بۆچی "نص" نییە بۆ دیاریکردنی خەلیفە، پاشان ڕەخنەش لە هەڵبژاردنی ئەبوبەکر ئەگرێت لە "سەقیفەدا‌و هەڵبژاردنی ئەبوبەکر بە پرۆژەو دەستپێشخەری "ئەبوعوبەیدە" ئەزانێت‌و ڕەخنەش لە شێوازی عومەر ئەگرێ‌و ئەشڵێ: ".. دوای بریندارکردنی.. نەخشەیەکی بۆدانانی جێگرەکەی داڕشت"!!

ڕاستییەکەی ئەمەی سەرەوە یەك پارچە قسەی هەڵەق‌و مەلەق‌و لە ڕاستییەوە دوورن.

یەکەم: پێغەمبەر ﷺ لە (غەدیری خوم)دا (عەلی) نەکردووە بە جێگری خۆی! وەك فوئاد میسری دەڵێت.

دووهەم: هەموو سەرچاوەکانی مێژووی ئیسلامیش ئەمە ناڵێت، ئەو ئەیڵێ.

سێیەم: نەبوونی "نص"یش بۆ دانانی کەسێکی تایبەت جێگەی ڕەخنە نییە (وەك ئەو بۆی ئەچێ).

چوارەم: ڕووداوی (سەقیفە)ش بەو شێوەیەش نییە ئەو ئەیڵێت.. پێنجەم‌و شەشەم‌و.. هتد.

ئەرێ برا ئەمە کوێی ڕاست بکەینەوەو کامی چاك بکەین!* بەڵام بە شێوەیەکی گشتی با بڵێین:

---

[٤٦٥] الاسلام سعيد حوى (ل ٣٨٣).

[٤٦٦] نهج البلاغة.

[٤٦٧] نهج البلاغة.

* ئەڵێن کابرایەك لە مامۆستایەکی پرسیوە: ئەرێ مامۆستا ئەوە کچی چ ئەولیيایەك بووە خستیانە چاڵی سەنعاوەو سەگ خواردی؟ مامۆستاکە ئەڵێت: برام ئەوە کچ نەبوو کوڕ بوو ئەولییا نەبوو ئەنبیا بوو، چاڵ نەبوو بیر بوو، سەنعا نەبوو کەنعان بوو، سەگ نەبوو گورگ بوو ، نەیشی خوارد! جا هەندێ ڕستەی فوئاد مەجیدیش لەو بابەتەن!!.

[٤٦٨] کۆمەڵگا (ل٩١). بۆ پەندی دنیا لە پەراوێزدا دەڵێت: هەمان سەرچاوە واتە (النزعات المادية) و (حياة القلوب)ی المجلسي و(منهاج السنة) ابن تيمية، کە یەکەمیان کتێبی مێژوویی نییە، دووهەمیان کتێبی شیعەیە، سێیەمیان ئەو فەرموودەی ڕەتکردۆتەوە لە ڕووی (سند)و لە ڕووی (متن)ەوە، کەواتە عەیبە شتی وا بوترێت‌و پشتی قسەی پێ ڕاست بکرێتەوە !

. پێغەمبەر ﷺ نە لە (غدیرخم) عەلی داناوە بە خەلیفەو نە لە دوای خۆیشی، بەزۆر دەلیلو بەڵگە، زانایان ئەو فەرموودەیە لە ڕووی سەنەدو (متن)ەوە ڕەت ئەکەنەوەو بە (ضعیفي)ی ئەدەنە قەڵەمو ئەگەر (فرضا) زەعیفیش نەبێت مانای (مولی) سەرۆكو گەورە نییە، بەڵكو خۆشەویستییە.

. هەموو سەرچاوە مێژووییە باوەڕپێكراوەكانی ئیسلامیی ئەمە دەڵێن كە پێغەمبەر ﷺ (وەسیەتی) نەكردووە دوای خۆی عەلی یان غەیری ئەو ببێتە جێنشین.

. تەنانەت سەرچاوەكانی زۆرێك لە شیعە بەویژدانو خوێندەوارەكانیش ئەمە هەر دەڵێن.. بۆنمونە (علم الهدی) كە نووسەری كتێبی (الشافي)یەو برای "شەریف رضي" كۆكەرەوەی (نهج البلاغة)یە ئەڵێت: "لما قیل لعلي الا توصي؟ فقال ما أوصى رسول الله ﷺ فأوصي، ولكن اذا اراد الله بالناس خيرا استجمعهم على خيرهم كما جمعهم بعد نبيهم على خيرهم"[٤٦٩].

. عەلی خۆشی ئەمە دەڵێ: "انه بايعني القوم الذين بايعوا أبابكر وعمر وعثمان على ما بايعواهم عليه، فليس للشاهد ان يختار ولا للغائب ان يرد، وانما الشورى للمهاجرين والأنصار، فان اجتمعوا على رجل وسموه اماما كان ذلك لله رضى..".

. عەلی خۆیشی لە هیچ شوێنێكدا ئیستیدالی بەو ڕووداوە هەڵبەستراوەی (غدیرخم) نەكردووە، ئەوەش (نهج البلاغة) كە لای شیعە خۆیان پلەی (حوجیەتی) دووهەم سەرچاوەیە پاش قورئانو ئەڵێت: "انه فوق كلام المخلوق ودون كلام الخالق" یان ئەڵێن: "انه اخو القران"[٤٧٠]. ڕووداوی سەقیفەش دەردەخات كە نە عەلیو نە غەیری عەلی دەقیان لەسەر نەهاتووە ئەگینا ئەبوو یەكێك لەوێدا باسی بكردایە.. ئەبوایە عەلی لە دواییدا باسی بكردایە، ئەگەر عەلی لە زەمانی ئەبوبەكرو عومەرو عوسماندا باسی نەكرد وەك هەندێ ئەڵێن گوایە نەیوێراوە!!. دیارە نووسەری ناوبراویش بیانووی زۆریان بۆ دەهێنێتەوە، باشە ئەی لە سەردەمی خۆیدا بۆ باسی نەكرد، چونكە خۆ سەردەمی ترسو "تقیە" نەماوە بە ـ لۆژیكی ـ ئەوان! بۆ نەهات بڵێ: ئەرێ خەڵكینە ئەوە من بەیعەتێكم لە گەردنی ئێوەدا هەیەو پێغەمبەر ﷺ بۆمی وەرگرتووە لێتان لە (غدیرخم)دا، ئەوە بۆ لەبیری خۆتان بردووەتەوە؟! ئەرێ ئەبوبەكر، عومەر، عوسمان! ئێوە بەیعەتتان نەدامێ؟!

نەك ئەمانە لە (نهج البلاغە)دا نالێ بەڵكو ئەڵێ: "هەڵبژاردنی خەلیفە بە دەستی (مهاجرین)و (ئەنصار)ەو هەر پیاوێكیان هەڵبژاردو ناویان نا (ئیمام) ئەوە خواش پێی خۆشەو پێی ڕازییە!!".

هەر عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) خۆی ئەفەرموێت: "منیش هەروەك ئەبوبەكرو عومەرو عوسمان بوومەتە خەلیفەو هەمان مەرجیشم لەسەر دانراوەو بۆ كەس حەلاڵ نییە كە حازر بووە لەوێ یەكێكی تر هەڵبژێرێ، هەروەك حەلاڵ نییە بۆ ئەوەش كە لەوێ نەبووە، ئەمە ڕەد بكاتەوە"[٤٧١].

ئەوەش تۆ بە نووكە قەڵەمێك ئەتەوێ بڕیار بدەی ئەبو عوبەیدە ئەبوبەكری كردە خەلیفە لە سەقیفەدا، ئەوە وانییەو گوناحە بازدان بەسەر مێژوودا.. باشە ئەی ئەو هەموو گفتوگۆو "جەرو بەحسە"ی ئەهلی سەقیفە مانای چی ئەگەیەنێت لای تۆ؟ ئەم ڕایەك ئەڵێو ئەو ڕایەكو ئەبێتە موناقەشەو پاشان لەو خاڵە لێ ئەبنەوەو ئەچنە سەر خاڵێكی ترو تا دەگەنە ئەوەی كە هەموو بە ئەبوبەكر ڕازی دەبنو پاشان گفتی گشتی لە مزگەوتدا ئەدەنێ.

. خاڵێك زۆر گرنگە بۆ فوئاد مەجید ڕاستی بكەینەوە.. ئەویش ئەوەیە بۆچی ئیسلام درێژەی مەسەلەكانی دەوڵەتی دانەنا؟ لە وەڵامدا بەكورتی ئەڵێین لەبەر سێ هۆ:

١. لەبەر ئەوەی ئەگەر ئیسلام ئەو درێژەیە دابنێ ئەبێتە "دین"و لادان لێی بێدینییە.

٢. لەبەر ئەوەی درێژەی حوكم لەو ڕۆژەداو بەو كۆمەڵگە بچووكو سەرەتاییە جێبەجێ نەئەبوو ئەوەش جۆرێك لە "بێ موبالاتی" دروست ئەكرد بەرانبەر یاساو ڕێنماییە ئیسلامییەكان.

٣. لەبەر ئەوەی مەیدانی لە "عەقڵ" تەسك ئەكردەوەو لە جیاتی ئەوەی ئەو یاسایانە گەشە بەخۆیو كۆمەڵگە بدات، خۆشیو كۆمەڵگەی تووشی قەیرانو قەتیسبوون ئەكرد، بەڵام ئیسلام وەك وتمان بناغەكانی "حكم"ی داناوەو درێژەی

---

[٤٦٩] الشيعة وأصل البيت "احسان ظهير" ص٥٢ له (علم الهدى: الشافي) ص١٧، وەریگرتووە.

[٤٧٠] بۆ زیاتر ئاگاداربوون لە موناقەشەی زانستیو عەقڵی ئەم مەسەلەیە سەیری الشیعة والقران: احسان الهي ظهیر، بكە.

[٤٧١] چونكە ئەنصارو موهاجرین ئەو كاتەو لەو زەمانەدا نوێنەری هەموو مسوڵمانان بوونو شەرعییەتیان داوە بەو كەسەی كە هەڵدەبژێردرا.

یاساکانو ئالیەتەکانی جیٚ هیٚلاٌوە بۆ خەڵكو عەقڵی عاقلاٌن، ئەگەر سەیریٚکی ئەو سەروەتە فیکریو فقهییە گەورەیەش بکریٚت ڕاستی ئەم خاڵە دەردەکەویٚت کە عەقڵەیتەکان چەند گەشەیان کردووە لە ژیٚر ڕۆشنایی ئەو یاساو ڕیٚنماییانەدان، فوئاد میسری بە تانەو تەشەرەوە باسیٚکی "شورا" ئەکاتو گاڵتە بەو ئایەتانە ئەکات باسی "شورا" ئەکەنو گاڵتە بەو زاناو موجتەهیدانەش ئەکات کە وەك مەدح باس لەو شوورایە دەکەن، ئەڵیٚ: "زۆری پیٚ هەڵدەڵیٚنو گوایە قورئان باسی لیٚوە کردووە"[٤٧٢]، جا باس لەوە ئەکات گوایە ئەوە نە جیٚگەی فەخرەو نە ئەم مەبدەئەش جیٚبەجیٚ کراوە، نە لەلایەن پیٚغەمبەرەوە ﷺ نە لەلایەن سەحابەشەوە، چونکە "پیٚغەمبەر ﷺ خۆی بەردی بناغەی بۆ سیستەمی (وارثی) داڕشتووە، چونکە عەلی هەم ئامۆزاو هەم زاواشی بووەو نەوەی عەلی نەوەی خۆیەتی"[٤٧٣]. لەوەڵامدا ئەڵیٚین:

١. خوای گەورە لە دوو ئایەتدا باسی "شورا" دەکاتو وەزیفەی پیٚغەمبەر ﷺو مسوڵمانان دیاری ئەکات دەربارەی "شورا"، ئایەتی (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُم) کە لەناو چەند ئایەتیٚکدایە کە زانایانی ئیسلامی ئەو چەند ئایەتە ناو دەنیٚن "خصائص الصف الاسلامي" ئایەتەکان ئەمەیە: (فَمَا أُوتِيتُم مِّن شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ *وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ *وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْيُ هُمْ يَنتَصِرُونَ *وَجَزَاء سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُ عَلَى اللَّهِ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِين *وَلَمَنِ انتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِ فَأُوْلَئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيل *إِنَّمَا السَّبِيلُ عَلَى الَّذِينَ يَظْلِمُونَ النَّاسَ وَيَبْغُونَ فِي الْأَرْضِ بِغَيْرِ الْحَقِّ أُوْلَئِكَ لَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ *وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ) (الشورى: ٣٦ ـ ٤٣).

زاناکان ئەڵیٚن ئەم ئایەتانە باسی یاساو سیستەمی "حزب" دەکات پیٚش ئەوەی بگاتە دەوڵەت، ئیسلام بۆ حزبایەتی ئەم "بنامایە" ئەسەلمیٚنیٚو ئیتر خەڵك خۆی پیٚویستە ئالیەتی جیٚبەجیٚکردنی بۆ بدۆزیٚتەوە، تا حزبایەتی کردنەکە بەئەنجام بگات.

هەروەها ئایەتی (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) کە خوای گەورە لەناو کۆمەڵیٚك ئایەتدا باسی ئەکات کە ئەمانەن: (فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ إِنَّ اللّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِين *إِن يَنصُرْكُمُ اللّهُ فَلاَ غَالِبَ لَكُمْ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا الَّذِي يَنصُرُكُم مِّن بَعْدِهِ وَعَلَى اللّهِ فَلْيَتَوَكِّلِ الْمُؤْمِنُونَ *وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّ وَمَن يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لاَ يُظْلَمُون *أَفَمَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَ اللّهِ كَمَن بَاء بِسَخْطٍ مِّنَ اللّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ *هُمْ دَرَجَاتٌ عِندَ اللّهِ واللّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُون *لَقَدْ مَنَّ اللّهُ عَلَى الْمُؤمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبْلُ لَفِي ضَلالٍ مُّبِينٍ) (آل عمران: ١٥٩ تا ١٦٤).

زانایان ئەڵیٚن ئەم ئایەتەیان (مەدەنییە)و باس لە یاساو سیستەمی "دەوڵەت" ئەکات کە دەسەلاٌتی (سیاسیو سەربازیو ئابووری) بەدەستە[٤٧٤]، ئیسلام لە دەوڵەتیشدا بنەمای (شورا) ئەسەلمیٚنیٚتو ئالیەتی جیٚبەجیٚکردن ئەداتە دەست خەڵکی.. سەید قوتب لە کتیٚبی (في ظلال القران)دا زۆر ورد مەبەستو واتاکانی ئەم ئایەتانە باس ئەکات دەری دەخات کە پیٚغەمبەر ﷺ لەگەڵ ئەو گەورەییو ڕوشدەی خۆشیدا هەر ڕاویٚژی بەردەوامی هەبووە، لەگەڵ ئەسحابی خۆیدا تەنانەت بۆچوونە دەرەوە لە مەدینەدا بۆ (ئوحد) ئەو خۆی ڕای نەبوو بچنە دەرەوەی مەدینە خەویشی بینیبوو کە شتیٚکیان لیٚ دەقەومیٚ ئەگەر لە مەدینە بچنە دەرەوە، کە لە مەدینەش دەرچوون تووشی ئەو لیٚقەومانە گەورەبوون، ئەو هەموو قوربانییەیاندا کە (حەمزە)ی مامی پیٚغەمبەر ﷺ یەکیٚکیان بوو، دوای ئەوەی ئەگەڕیٚتەوەو شەڕ کۆتایی پیٚدیٚت، ئەوجا خوای گەورە ئەو کۆمەڵە ئایەتە زۆرەی سورەتی (آل عمران) دائەبەزیٚنیٚت ئەمجارە بە (صیغەی ئەمر) فەرمان بە پیٚغەمبەر ﷺ ئەکات کە ڕاویٚژ

---

[٤٧٢] کۆمەڵگا (ل١٠٠).

[٤٧٣] کۆمەڵگا (ل١٠١).

[٤٧٤] دەستور الوحدة العقائدية شرح اصول العشرين ـ محمد الغزالي، ل(٤٥).

به هاوەڵانی بکات وەك ئەفەرموێت: (فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ اللّهِ لِنتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنتَ فَظّاً غَلِيظَ الْقَلْبِ لاَنفَضُّواْ مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ..). (آل عمران: ١٥٩).

جا سەیید ئەفەرموێت ئەوە بۆ ئەوەیە کەس بیر لەوە نەکاتەوە کە ڕۆژێ لەڕۆژان بێ نیاز ئەبێ (بەڕاوێژو ڕاوێژکاری)[٤٧٥].

ئەوە یەك.

دوو: پێغەمبەر ﷺ بەردی بناغەی بۆ سیستەمی (وراثة) دانەناوە، چونکە ئەوە درۆیە گوایە (عەلی) کردبێتە جێنشینی خۆی بۆ دوای مردن وەك لە پێشەوە باسمان کردو سەلماندمان و "علی"یش خۆی وا ناڵێ.

سێ: ئەبوبەکر بە (شورا) هەڵبژێردرا، بەڵام بە دوو قۆناغ، قۆناغی یەکەم گفتی تایبەت بوو لە (سەقیفە بەنی ساعیدە)دا پاش حیوارو ڕا گۆڕینەوەیەکی زۆر، قۆناغی دووەم گفتی گشتی بوو کە لە مزگەوتا دراو بە بەرچاوی ئەنصارو موهاجرینەوە کە هەموو کەس بە نوێنەری خۆیانیان ئەزانین لە هەرێمە ئیسلامییەکانی ئەو وەخت و کاتەدا، وەك (عەلی)یش لە (نهج البلاغة)دا باس ئەکات و ئەفەرموێت: (انه بايعني القوم الذين بايعوا أبابكر وعمر وعثمان على ما بايعوهم عليه فليس للشاهد ان يختار ولا للغائب ان يرد وانما الشورى للمهاجرين والأنصار، فان اجتمعوا على رجل وسموه اماما كان ذلك لله رضي).

چوار: عومەریش بە "ڕیفراندۆم" بوو بە خەلیفە، ئەبوبەکریش کاندیدی کردووە "ئەنصارو مهاجرین"یش قەبووڵیان کرد بە "اجماع" نەك بە زۆرینەش، تەنانەت عەلی ئەفەرموێت: "ئەبوبەکر ئەگەر عومەری کاندید نەکردایە، قسەمان ئەبوو بەڵام هەموومان بە عومەر ڕازین"[٤٧٦].

پێنج: عوسمانیش کە لەو شەش کەسە بوو عومەر کاندیدی کردن بۆ سەرۆکایەتی دەوڵەتی ئیسلامی ئەوەبوو بازنەی کێبەرکێ کردنە کە تا ئەهات بچوك ئەبوویەوەو لە کۆتاییدا لە نێوان (عەلی)و (عوسمان) حەسر بوو، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هەستا بەو "ڕیفراندۆم"ەو (عوسمان) بە زۆرینەی دەنگی خەڵك کرایە خەلیفە، ئەمە قسەی ئێمە نییە، بەڵکو قسەی مێژوو نووسانە، ئەفەرموون: عەبدوڕڕەحمان پرسی بە هەموو کەسێك کرد لە "فەرماندەی سوپا"و کارمەندەکانی حکومەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەنصارو موهاجرین و تەنانەت پرسی بەو کچانەش ئەکرد کە لە پەردەدا بوون، بەو منداڵانەش کە لە حوجرەکاندا بوون، هەموو ئەیانوت (عوسمان)مان پێ باشترە[٤٧٧].

دەی کاکە فوئاد ئیتر عەیبە ئەوەندە کەللە ڕەقی بکەی لەسەر ناحەقی و هەر بڵێی "هیچ کام لە خەلیفەکانی ڕاشیدین پەیڕەوی مەبدەئی شورایان نەکردووە"[٤٧٨]. فوئاد میسری ڕەخنە لە ئیمامی عوسمان ئەگرێت و ئەڵێ: "خەڵك.. داوایان لێکرد دەستبەرداری خەلافەت بێ، ڕایگەیاند دەسەڵاتی ئەو لەخواوەیەو کراسێکە خوای گەورە بە باڵای بڕیوە، یان هیچ نرخێکی بۆ ئیرادەی سیاسیی جەماوەری مسوڵمانان دانەنا!!"[٤٧٩].

ئەم قسەیەش لە سێ چوار بڕگەیدا سەقەت بووە:

یەکەمیان: هیچ کەس ئەوەی نەوتووە کە ئەو ئەیڵێ گوایە عوسمان وتوویەتی: "دەسەڵاتی ئەو لە خواوەیە" ئەمە درۆکردنە بەدەم عوسمانەوەو درۆکردنە بەدەم مێژووەوە.. خۆ هەرچەندە خوا هەڵناگرێ نووسەری ناوبراو ئەم قسەیەی نەداوەتە پاڵ کەس و وادیارە هەر لە گیرفانی خۆی دەری هێنابێ.

دووهەم: "خەڵك داوایان لێ کردبێ دەستبەرداری خەلافەت بێ" ئەمەش هەڵەیە، چونکە خەڵك کە بکاتە نوێنەری مسوڵمانان کە ئەم خەلیفەی مسوڵمانانە بریتین لە "ئەنصارو مهاجرین" دەی نە ئەنسارو نە موهاجرین وەها داوایەکیان نەبووە، هەروەها ئەوانەی ئەم داوایەیان هەبوو کۆمەڵێکی بێگانە بە (مەدینە)و (سەحابە) بوون و باسمان کرد کە هەریەکەیان

---

[٤٧٥] في ظلال القران، سورەتی (آل عمران) ئایەتی (وشاورهم في الأمر) ج٣، ص١٢٥.

[٤٧٦] بۆ کۆمەڵێك وتەی (عەلی) بەرانبەر عومەر لە پەسەندیدەیدا سەیری (الشيعة وأهل البيت، ص٦٧) بکە.

[٤٧٧] البداية والنهاية (١٤٦/٧)، ئیبن کثیر ئەڵێت: "عەبدوڕڕەحمان ڕای ئەو ڕێبوارو سوارانەشی وەردەگرت ـ کە لەو سێ ڕۆژەدا دایان نابوو بۆ ڕاوێژکردن بە خەڵك ـ ئەهاتنە مەدینەو هەمووی عوسمانیان هەڵبژارد تەنیا (عەممارو مقداد) نەبێ کە ڕایان بۆ عەلی ئەدا".

[٤٧٨] کۆمەڵگا (ل١٠٠).

[٤٧٩] کۆمەڵگا (ل١٠٠).

گرێیەکی دەروونیو داخێکی شەخصی هەبووە، لە سەروو هەمووشیانەوە ئەمانە، ڕێکخستنێکی یەهودی نهێنی ئەیجولاَند کە سەرکردەکەیان (عەبدوڵڵای کوڕی سبأ) بوو وەك لە پێشەوە بەجۆرێك لە درێژە پێدان باسمان کرد[٤٨٠].

سێیەم: وازنەهێنانی عوسمان لە خیلافەت زیاتر لەبەر دوو هۆ بوو، یەکەمیان: ڕاوێژکردنی بوو لەگەڵ هەندێ لە سەحابەدا کە عەرزیان کرد: قوربان واز نەهێنی لە ئیمارەت، چونکە ئیتر دوای تۆ ئەبێتە (باو)و (مۆدێل) هەر کۆمەڵێك ڕەخنەیان هەبوو لە سەرۆکەکەیان خێرا پەنا ئەبەن بۆ یاخی بوونو ئاژاوە نانەوە[٤٨١]. دووهەمیان: فەرموودەیەك بوو کە لە پێغەمبەر ﷺی بیستبوو، کە ئەفەرموێت: (یا عثمان: عسى الله ان يقمصك قميصا من بعدي فان ارادك المبيتون[٤٨٢] على خلعه فلا تخلع، يقول ذلك ثلاثا)[٤٨٣]. چوارەم: فوئاد میسری ئەڵێ: "هیچ نرخێکی بۆ ئیرادەی سیاسیی جەماوەری مسوڵمانان دانەنا"، ئاخر ئەوە کەی وایە.. نە ئەوە ئیرادەی سیاسیی جەماوەر بوو، نە ئەوانیش نوێنەری جەماوەر بوون بەڵکو وەك وتمان تاقمێکی یاخی سەرلێشێواو بوون کە "محب الدين الخطيب" نووسەری گەورەی میسری ئەڵێ: "پێکهاتبوون لە دوو توێژ: توێژێکی فێڵبازی هەڵخەڵەتێنەر (مخادع)، توێژێکی ساویلکەی هەڵخەڵەتاو (مخدوع)، بەڵام حەزرەتی عوسمان نەیئەویست بە هیچ شێوەیەك سەحابە لەسەر ئەم یەك دڵۆپ خوێن بڕژن، تا ئەوەبوو (مخدوع و مخادع)ەکان فرسەتیان گرتو ئەو پیاوە گەورەیان شەهید کرد کە کەم میللەت لەو جۆرە پیاوانەی تێدا هەڵئەکەوێت کە گیانی خۆی بەخت بکات لە پێناوی خەڵکیداو دەستی پێوە بنێ، کە خەڵکی تر دەست بە هەموو شتێکی ترەوە ئەنێت لە پێناوی ژیانی خۆیدا"[٤٨٤].

عەلی (ڕەزای خوای لێبێت) لە (نهج البلاغة)دا زۆر بە وردی باس لەو تاقمە ئاژاوە چییە ئەکات کە هاتنە مەدینەو بە فێڵو تەڵەکە ئەو پەنە گەورەیاندا، کاتێك هەندێ سەحابە باس لەوە ئەکەن پێویستە یەکەم ئیشی ئەوەبێت تۆڵەی خوێنی عوسمان لە بکوژەکانی بکاتەوە، ئەفەرموێت: "يا اخوتاه لست اجهل ما تعلمون، ولكن كيف لي بقوة والقوم المجلبون على حد شوكتهم يملكوننا ولا نملكهم، وهاهم هؤلاء قد ثارت معهم عبدانكم، والتفت اليهم اعرابكم، وهم خلالكم يسومونكم ماشاؤوا، وهل ترون موضعا لقدرة على شئ تريدونه؟ ان هذا الامر امر جاهلية، وان لهؤلاء القوم مادة وان الناس من هذا الامر، اذا حرك. على امور: فرقة ترى ما ترون، وفرقة لاترى ما ترون، وفرقة لاترى هذا ولا ذلك، فاصبروا حتى يهدأ الناس، وتقع القلوب مواقعها، وتؤخذ الحقوق مسمحة، فأهدؤوا عني وانظروا ماذا يأتيكم به أمري ولا تفعلوا فعلة تضَعضَع قوة وتسقط منة، وتورث وهنا وذلة، وسأمسك الامر ما استمسك، واذا لم اجد بدا فآخر الدواء الكي"[٤٨٥].

لەو دەقەی سەرەوەدا حەزرەتی عەلی سێ چوار شت ئەڵێ:

یەکەم: ئەو پرسو کێشەیەی ئەم تاقمەی لەسەرە پرسو کێشەیەکی جاهلییە.

دووەم: ئەم تاقمە پشتیوانو هاندەرێکیان هەیە کە دەیانجوڵێنێت.

سێیەم: عەلی بڕیار ئەدات "قصاص"یان لێ بسەنێت، بەڵام ڕای وایە جارێ فیتنەکە بنیشێتەوە، هەڵخەڵەتاوەکان، بڕۆنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، وەك ئەفەرموێت: "فاصبروا حتى يهدأ الناس وتقع القلوب مواقعها وتؤخذ الحقوق مسمحة".

چوارەم: عەلی قەناعەتی وابوو ئەگەر کێشەکە بە سیاسەت ئیدارە بدات باشترە لەوەی بە چەك ئیدارەی بدات، بەڵام داخەکەم ئەوەبوو ڕێکخستنەکەی عەبدوڵڵای کوڕی سەبەئو ئەوان کاروبارەکانیان کۆنترۆڵ کردو تەنانەت قەناعەتیان بە عەلی-یش کرد سەنتەری خیلافەت لە (مەدینەوە)وە بگوازێتەوە بۆ (کوفە) کە زۆربەیان خەڵکی ئەوێ بوون، ئیتر لەوێ بە

---

[٤٨٠] بگەڕێوە بەشەکانی پێشتری ئەم کتێبە.

[٤٨١] تحقيق موافق الصحابة (١/٤٧٥).

[٤٨٢] لە ڕیوایەتێکی تردا ئەفەرموێت: "واراد المنافقون" لە جیاتی (المبيتون) هەمان سەرچاوە (١/٤٧٦).

[٤٨٣] تحقيق موافق الصحابة (١/٤٧٥).

[٤٨٤] "محب الدين الخطيب" ئەڵێ: ڕۆژئاوا پیاوێکی کردووە بە ڕەمزی (خەلاس)و قوربانیدان، بەڵام ئێمە لە کەمتەرخەمی خۆمان پیاوێکی وەك عوسمان ناکەینە ئەو ڕەمزە لە کاتێکدا ئەو پیاوەی ئەوان بەویستو ئیرادەی خۆی نەبوو کە وای لێ بکەن، بەڵام عوسمان بە هەموو شێوەیەك خۆی کردە قەڵغان بۆ خەڵك نەك خەڵك بکاتە قەڵغان بۆ خۆی. (العواصم من القواصم ص١١٢).

[٤٨٥] نهج البلاغة (ص٣٤٢ ـ ٣٤٣).

ئارەزووی خۆیان تالأویان ئەکرد بە قورگی حەزرەتی (عەلی)داو ئاگری فیتنەو ئاژاوەیان خۆش ئەکرد لە شوێنەکانی تردا.. ئێمە چەند جارێك لە پێشەوە ئەم باسانەمان هێنا وەك وەلأمێك بۆ فوئاد مەجید میسری[٤٨٦].

لەوانەیە فوئاد مەجید میسری و خوێنەرانیش بپرسن کە مەسەلەکە وابوو لە نەزەری عەلی-دا ئەی بۆچی ئاوەها هۆگریان بوو؟ بۆچی سەنتەری خیلافەتی گواستەوە بۆ (کوفە) لە بری مەدینە؟ ئەی کە ئەو هەموو تالأوەی چەشت بە دەستیانەوە وەك خۆی بەدەمی خۆی لە پیرۆزترین کتێبی شیعەدا کە (نهج البلاغة)یە ئەیگێڕێتەوە، ئەی بۆچی وێڵی نەکردن و بگەڕێتەوە مەدینەو ناو ئەسحابی پێغەمبەرﷺ؟ لە وەلأمدا من ئەوەندە ئەزانم کە حەزرەتی عەلی ئومێدی ئەوەی پێیان هەبوو کە چاك بېن و خەڵکیشیان پێ چاك بکات و وەك خەلیفەکانی پێش خۆی پەیامی ئیسلامیان پێ بگەیەنێتە هەموو دنیا، بەڵام وەك عەرەب ئەڵێن "تجری الریاح بما لا تشتهي السفن"، وەك خۆی لە زۆر شوێندا ئەفەرموێت: "ئەمەوێت بە ئێوە دەردێك دەرمان بکەم سەیر ئەکەم ئێوە خۆتان دەردەکەن!"[٤٨٧].

. فوئاد مەجید میسری هەندێ شت ئەڵێ نە بە ئینسان و نە بە واقعیی کۆمەڵگە مرۆییەکان و نە بە سروشتی مێژوو نە بە هیچ ناخوات، کابرایەکە لە خەیاڵێکی زۆر ئایدیدیانەدا ئەژی، بۆ نموونە ئەڵێ: "هەڵبەت باوەڕی ئاینی وەك شێوەیەك لە شێوەکانی هۆشیاری کۆمەلأیەتی ڕۆڵی لە بلأوکردنەوەو سەرخستنی سیاسیەتی داگیرکردنی ولأتانی دوورو دراوسێدا بینیوەو فاکتەرێکی گرنگ بووە بۆ هاندانی تاکە کەسی مسوڵمانان تا لە پرۆسەی شارو داگیرکردندا بەشداری بکا، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ فاکتەرە ئابوورییەکە پشتگوێ بخەین کە دەوری سەرەکی لە فراوانکردنی قەڵەمڕەوی ئیسلامدا بینیوە"[٤٨٨].

جا نووسەر لە پەراوێزی ئەم قسەیدا ئەڵێ: "ڕێبەرانی ئیسلام.. دابەشکردنی دەستکەوتی شەڕیان کردە هاندەرێکی ئابووری و پێشتریش قورئان شەرعییەتی بە تالأنکردنی ماڵ و موڵکی نامسوڵمانان دابوو.. (وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ..)".

لەم جۆرە دەقانەوە دەردەکەوێ فوئاد مەجید میسری بیرو بیرکردنەوەی تەنیا لە بازنەیەکی تەسك و بەڕاستی داخراویشدا دێت و ئەچێت؟ وا دیارە بڕوای وایە شەڕ لە ناو خەڵکیدا ڕوونادات، ئەگەر ڕووشیدا ئەوە ئەکرێ لە شەڕدا خەڵك گوڵبارانی یەکتر بکەن لە جیاتی فیشەك باران و تیربارانی یەکتری!! باشە ئەگەر وانییە یانی چی ئەو جۆرە ڕەخنانە ئەگریت..

ئیسلام دینێکی واقعییە، بەرنامەو تەعلیماتی پێیە بۆ ئاشتی و بۆ شەڕیش و بۆ پەروەردەو بۆ فێرکردنیش، یاسای سزادان و جینایاتی هەیە، یاسای ئابووری و ڕاگەیاندن و.. هتد پێیە. ئەزانێ خەڵك بەشەڕ دێن، بۆیە دەستوور بۆ شەڕکردن دادەنێت، ئەزانێت تەنانەت مسوڵمانانیش لەناو خۆیاندا "دوو کەس یان دوو بنەماڵە یان دوو عەشیرەت.. هتد" بەشەڕ دێن، بۆیە ڕێنمایی بۆ ئەوەش دائەنێت، هەروەها ڕێنمایش بۆ مامەڵە لەگەڵ بەندی و ئەسیران و مامەڵە لەگەڵ دەستکەوتەکانی شەڕدا، مامەڵە لەگەڵ زەوی و زاری ولأتانی ژێردەستدا.. ئیسلام ڕێنمایی بۆ تەواوی ئەو مەسەلانە دائەنێت.

باشە کاکە فوئاد! ئەگەر دوو میللەت یان دوو دەوڵەت بوو بە شەڕیان لەسەر هەرچی تۆ قەناعەتت هەیە شەڕی لەسەر دروست ببێت "ئابووری، دین، جنس، مرۆڤایەتی.." بەرنامەو ڕێنمایی تۆ چییە بۆ ئەو شەڕەو ئەنجامەکانی ئەو شەڕە؟ پێش بەرپابوون و گەرمبوونی شەڕەکە چیبکرێت تا ڕوونەدات؟ ئەگەر هەر ڕوویدا چیبکرێت؟ کە شەڕ تەواوبوو چی بکرێت لە مانە: (ئەسیر، دەستکەوتەکانی شەڕ، شوێن و مەڵبەندو هەرێمەکانیان)؟ ئەگەر ئاشتی کەوتە نێوان و هەردوولاو پێی ڕازی بوون مەرجت چییە بۆ ئەو ئاشتینامەیە؟ ئەگەر یەکێکیان فێڵی کرد، تۆڵەو سزای تۆ چییە بۆی؟ ئەی ئەگەر ئاشتی نەکردوو هەر لە خۆسازداندا بوو بۆ هێرشکردن، بەرەی بەرامبەر چی بکات؟.. هتد.

کاکە فوئاد! ئەو پرسیارانە پرسیاری بێمانا نین، پرسیاری ناواقیعی و نا مەعقولیش نین، دەی حەتمەن تۆ هەر کۆمەڵێك وەلأمت پێیە بۆیان، جا ئەگەر ئەو وەلأمانەی تۆمان کردە چەند برگەیەکی یاسای و پرۆتۆکۆلی و سیفەتی ئیلزامیمان پێدان،

---

[٤٨٦] بگەڕێوە بۆ بەشەکانی پێشووتری ئەم کتێبە.

[٤٨٧] نهج البلاغة، (ص ٢٦١).

[٤٨٨] کۆمەڵگا (ل ١٠٤).

**ئەوکاتە ئەزانی (شەڕ) چییە، (ئاشتی) چییە، پرەنسیپو مەبادیئی شەڕو ئاشتی چەند جیاوازن لە یەکتری، جا ئەگەر بە ئینسافەوە سەیری ئەو ڕەوشتە ئیسلامییە بکەی کە ئیسلام دایناوە بۆ شەڕ ئەوکاتە ئەزانی ئیسلام چەند پێشکەوتووترە لە چاو خەڵکانی تردا.**

**لەبەرئەوە شەڕ شەڕەو ئاشتی ئاشتییە، "لائحە"و ڕێسای شەڕ نابێت تێکەڵ بە "لائحە"و ڕێسای ئاشتی بکرێت.. لە شەڕدا کەس گوڵ ناگرێتە یەکتری، یان ئەسیر لە یەکتری نەگرنو لێبگەڕێن: (گوناحە با بڕوات!! هەرچەندە هاتووە بۆ پیاوکوشتنیش!!) یان دەستکەوتەکانی شەڕ هەڵبکێشرێتەوە بۆ ئاسمان، یان ئاگرێك لە ئاسمانەوە بێتو بیسووتێنێت، یان پشت گوێ بخرێتو فڕێ بدرێت.. بەڵکو ئەو دەسکەوتانە یان هەمووی بۆ دەوڵەت ئەبێت، یان هەمووی بۆ شەڕکەران ئەبێت یان هاوسەنگی لەو نێوانەدا دروست ئەکرێتو یاسایەك پشکی هەردوولا دیاری ئەکات، ئیسلام ئەمەیانی کردووە لەبەرئەوە ئەو یاساو ڕێنماییانەی ئیسلام هەر لە ڕێگەوە جێگەی موناقەشە نییە.**

**حیکمەتو جوانیو فەلسەفەی هەر یاساو ڕێنماییەکیش بە بەراوردکاری ئەزانرێت کامیان ئیمتیازی بەسەر ئەوی تریاندا هەیە، هەندێ جاریش شەڕ بەو پێیە ئەکرێت کە بەرانبەرەکەت ئەیکاتو ئەگەر تۆش وەك ئەو مامەڵەی وەك خۆی (المعامل بالمثل)ی لەگەڵدا نەکەی ئەو تێکت ئەشکێنێتو لەناوت ئەبات.**

**. نووسەر لەسەر مەزهەبی "شەڕ بە کۆنە قین ئەکرێت" قسەیەکی (حسین مروه) لە (پەراوێزی ژمارە (٢)ی ل (١٠٥)دا دەهێنێتو ئەڵێت: لە سەردەمی (خەلیفە عومەری کوڕی خەتتاب)دا مسوڵمانی غەیری عەرەب بۆی نەبوو بچێتە سوپای ئیسلامەوە، هۆی ئەمە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی گوایە عەرەب (مسوڵمانی عەرەب) خۆیان بەرز زانیوەو خۆیان جیاکردووەتەوە لە مسوڵمانی غەیری عەرەب[٤٨٩].**

**ئەم بوختانەی بەدەم هەرکەسێکەوە بکردایە ئەکرا هەندێ لەسەری بووەستی، بەڵام بەرانبەر بە خەلیفە عومەر بکرێ کە ئەفەرموێت: "متى استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا". زۆر زوڵمێکی گەورەو کارێکی ناشایستە ئەکات.. عومەر کە ئەفەرموێت: "نحن قوم اذلاء فأعزنا الله بالاسلام، فاذا ابتغينا العزة في غير الاسلام اذلنا الله" عومەر کە ئەفەرموێ: "لو ان سالما مولى حذيفة حيا لوليته" عومەر کە مناڵ بگریایە لە شەودا هەوڵی ئەدا ماڵەکە بە خەبەر بهێنێ بۆ ئەوەی مناڵەکەیان ژێر بکەنەوە، عومەر تەنانەت یەکێکی وەکو (فەرج فودە) بە سەرسامییەوە باسی ئەکات لە "الحقيقة الغائبة"ەکەیدا کەچی فوئاد مەجید میسری ئەوەندەی (فەرج فودە)ش بە ویژدان نییە!!**

**با من ئەمەت بۆ ڕاست بکەمەوە: عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) قەناعەتێکی هەبووە وەك شەخصی خۆی ئەویش ئەوەیە بە چاکی نە ئەزانی (علوج) بێتە ناو مەدینە، هەرچەندە خاوەن بەهرەو دەستڕەنگینیش بن لەبەر دوو هۆ:**

**یەکەم: کەس لەناویاندا نەبێتە گەرای فیتنە.**

**دووهەم: ئەو پاكو صەفای کە لەمەدینەدا هەیە لێڵ نەبێتو هەر بەو پاکییە بمێنێتەوە کە لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ هەبووە، بەڵام موغیرەی کوڕی شوعبە لە ڕێگەی عەبباسی مامی پێغەمبەرەوە تکای کرد بۆ یەکێك کە ناوی (ئەبو لوئلوئە)بوو بە بیانووی ئەوەی کە دەست ڕەنگینە (موغیرە) ڕەچەی شکاندو ئەوەبوو هەر ئەم غوڵامەی موغیرە دوایی ئەو پەنە گەورەیەی داو عومەری شەهید کرد، عومەر کە پرسی کێ بوو ئەو خەنجەرەی لێدام، وتیان: غوڵامەکەی موغیرە بوو، فەرمووی: نەمووت با (علوج) نەیەتە ناو مەدینە. عومەر پیاوێکی زاناو عاقڵو واقیعی بین بوو، ئەیزانی ئەمانە تیایاندا هەیە لە (فتوحات)دا زەرەری کردووەو لەوەڕی حەرامی لە دەست دەرچووە، بۆیە تا پەروەردە نەکرێتو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە ئیسلامو حەقیقەتی ئیسلام تێنەگات هەر بە دوای فیتنەو تۆڵەسەندنەوەدا ئەگەڕێت، بەڵام کە لە ئیسلامو حەقیقەتی ئەهلی ئیسلام حاڵی بوو، ئەوە خۆی ئەبێتە پیاوێکی گەورە بۆ ئیسلامەتی..**

---

[٤٨٩] کۆمەڵگا (ل١٠٥).

ئەو بیرو بۆچوونەی ئەویش ڕاست دەرچوو[٤٩٠]، ئیتر ئەوە كەی مانای ئەوەیە عومەر عەرەبچێتی كردووە، یان "عەرەب"ی بە زل زانیوە، ئەوە ئەو شتە نییە، بەڵكو هەندێ هەیە كۆنە قینێكی هەیەو شەڕی پێ ئەكات لەگەڵ عومەرداو بوونەتە سەرچاوەش بۆ نووسینەكەی فوئاد میسری.

. فوئاد زۆر بە "تەركیز"ەوە ڕەخنە لە حەزرەتی عوسمان ئەگرێتو هەموو ئەوانەی كە "مەسعودی"و "یەعقوبی" ئەیدەنە پاڵ ئەوو موعاویەو خولەفای بەنی ئومەییە، ئەمیش وەك شتی ڕاستەقینەی بەڵگە نەویست، وەریان دەگرێتو ئەیانگوازێتەوە، بۆ نموونە ئەڵێ: "لە سەرەتای دەسەڵاتدارێتیی خەلیفە عوسمانەوە مسوڵمانان هەستیان كرد پارەو پوولی باجو خەراجو جزیە لە بریتیی ئەوەی لە (بیت المال)دا كۆبێتەوە، دەچێتە گیرفانی خەلیفەو ئەوانەوە كە خەلیفە دەسەڵاتی پێ بەخشیوونو هەمووشیان خزمو كەسوكاری خۆیو لە بنەماڵەی بەنی ئومەییە بوون"[٤٩١].

"كەڵەكەكردنی سەروەتو سامانو خۆشگوزەرانییەك خەلیفە عوسمان لەسەر حسابی خەڵك بۆ خۆیو بنەماڵەكەی دابینی كرد.. چاوپۆشی لێ ناكرێ.. كڕینی كانیو ئاوو باخی گەورە گەورەو ڕانە هوشترو كەڵەكەكردنی پارەو پوولو شتی نەختینە سەروەتو سامانێكی بێ شوماریان بۆ پێك هێنا"[٤٩٢].

"زوبەیری كوڕی عەوام لە هەریەك لە شارەكانی (بەسرە)و (كوفە)و (ئەسكەندەریە) كۆشكی بۆ حەوانەوەی خۆی دروستكرد"[٤٩٣].

"تەلحەی كوڕی عوبەیدوڵڵا" لە كوفە خانوویەكی گەورەو لە مەدینەش خانوویەكی بنیات نا.. دەرامەتی زەویو زارەكانی لە عێراق ڕۆژانە گەیشتوونەتە هەزار دینار"[٤٩٤].

"عەبدوڕڕەحمانی كوڕی عەوف-یش كە مرد میراتەكەی هەزار سەر هوشترو سەد ئەسپو دە هەزار مەڕو زەویو زارێكی زۆرو چواریەكی سامانەكەی بایی هەشتاو چوار هەزار دینار بوو"[٤٩٥].

لە هەمووی بێتامتر ئەڵێ: "خەلیفەیەك دەست لە خەزێنەی مسوڵمانان وەربداو شەش سەد هەزار درهەم بە دیاری بدات بە كچەكەی خۆی، هەروا بە سوكو ئاسانی تەختی خەلافەت بەجێ ناهێڵێ، بۆیە دەستە دەستە مسوڵمانانی هەژارو زۆرلێكراو شەكوای حاڵی خۆیان بردە بەردەمیو داوایان لێكرد بە هانایانەوە بێو لە دەست زوڵمو ستەمی كاربەدەستانی ڕزگاریان بكا، خەلیفەی مسوڵمانان ئامادەنەبوو بەپیری داخوازییەكی ڕەوای لەو جۆرەوە بچێ، كاتێكیش پێیان وت: مادام ئەوان لەسەر كار لانادەی خۆت دەست لە خەلافەت بكێشەوە، وتی: .. بەو خوایە لە ملم بدرێ لەوەم پێ چاكترە كراسێك لەبەر خۆم دابكەنم خوای گەورە لەبەری كردووم"[٤٩٦].

خۆزگە فوئاد مەجید میسری ئەم پرسیارەی لەخۆی بكردایە: كەسێك بە دوای خۆشگوزەرانیدا بگەڕێ خۆی بە كوشت ئەدات یان هەمیشە خۆی لە مردن ئەشارێتەوە؟ كەسێك حەز لە ژیانو خۆشگوزەرانی بكات هەموو شتێك ناكات بە قوربانی خۆیو حەزو ئارەزووەكانی، ئایا ئەو جۆرە كەسانە لە پێناوی پاراستنی ژیانی خۆیاندا ئامادە نین هەركەس بێتە بەردەمیان لێی بدەنو بیكوژن تا ڕێگەی حەزو ئارەزووەكانیان لێ نەگرێت، بەڵام خۆ عوسمان وای نەكرد بەڵكو خۆی كرد بە قەڵغان بۆ خەڵك نەك خەڵك بكات بە قەڵغان بۆ خۆی! هەرچۆن بێت قسەكەی سەرەوەی فوئاد مەجید چەند كونو كەلەبەرێكی تێدایەو پێویستە باسی بكەین:

یەكەم: عوسمان لە جاهیلییەتیشدا هەر خانەدانو خاوەن پارەو سەروەت بووە، یەكێك بووە لە پیاوە زەنگینو دەوڵەمەندەكانی مەككە.

[٤٩٠] محاضرات في تأريخ الشعوب الاسلامية (الدولة الاموية)، ل (٣٢٥)، عمر بن الحطاب الصلابي، ص٦٦١.

[٤٩١] لە (مروج الذهب)ی مەسعودی شیعە مەزهەبەوە وەرگیرتووە.

[٤٩٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٩٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٩٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٩٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٩٦] كۆمەڵگا (ل١١٠).

دووهەم: لە زەمانی پێغەمبەریشدا ﷺ هەر دەوڵەمەندو بەخشندەو نانبدەو خاوەن سەروەت‌و سامان بوو.

سێیەم: لە زەمانی ئەبوبەکرو لە زەمانی عومەریشدا ئەو هەر خاوەن سەرمایەو دەوڵەمەندبوو، عوسمان کەسێك نەبوو لە سایەی خیلافەتدا دەوڵەمەند بووبێت بەڵکو هەر بە پارەدارو دەوڵەمەندی هاتبوو، مەگەر سوپای تەنگانە (جیش العسرة) خۆی بە تەنیا هەرچی تفاقی شەڕ هەیە بۆی تەکمیل نەکرد . خۆ ئەو کاتە خەلیفە نەبوو . عەبدوڕڕەحمانی کوڕی خوباب ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: "پێغەمبەرم ﷺ لەسەر مینبەر بینی خەڵکی هان ئەدا بۆ ئەوەی سوپای عوسرەیان[٤٩٧] پێ بخاتە ڕێ، عوسمان هەستاو فەرمووی: قوربان سەد هوشتر بە هەموو تفاقێکەوە لەسەر من دیاری بێت لە ڕێی خوا! دوای ئەوەش پێغەمبەر ﷺ هەر خەڵکی هان ئەدا بۆ بەخشین، عوسمان پاش ماوەیەکی تر هەستاو فەرمووی: ئەی ڕەسولی خوا! دووسەد هوشتر بە هەموو تفاقێکەوە لەسەر من.. پاش ئەوەش پێغەمبەر ﷺ هەر خەڵکی هان ئەدا بۆ بەخشینی زیاتر.. عوسمان جارێکی تر هەستایەوەو فەرمووی: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ سێ سەد هوشتر لەسەر من بە هەموو تفاقێکەوە! پێغەمبەر زۆر بە دڵخۆشییەوە هاتە خوار لەسەر مینبەرەکەوە ئەیفەرموو: (ما علی عثمان ما عمل بعد هذه، ما علی عثمان ما عمل بعد هذه)"[٤٩٨].

عەبدوڕڕەحمانی کوڕی سەموورەش ئەڵێ: منیش بینیم عوسمان هاتە لای پێغەمبەر ﷺ بوخچەیەکی پێ بوو (هەزار) دیناری تێدابوو، خستییە بەردەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەی خەرجی بکات بۆ بەڕێکردنی سوپای عوسرەت، پێغەمبەر ﷺ کە کردیەوەو ئەم دیوو ئەو دیوی بە پارەکە ئەکرد ئەیفەرموو: (ما ضر ابن عفان ما عمل بعد الیوم، یرددها مرارا)[٤٩٩]. دوای ئەمە عوسمان هەرچی بکات هەر زیانی لێ نادات.. هەر ئەیوتەوە.

نووسەرانی (سیرە) بە وردی کۆی ئەو بەخشینانەی عوسمانیان بۆ سوپای عوسرە کردووەو ئەڵێن: ئەمەندە (صدقە)ی لەماڵی خۆی دەرکرد بۆ سوپای عوسرەت لە کۆتاییدا هەرهی ئەو بریتیی بوو لە (نۆسەد هوشترو سەد ئەسپ، بێجگە لە پارەی نەختینە)[٥٠٠]. دەی ئەم پارە زۆرە هی خیلافەت بوو یان هی ڕەنج‌و کاسبیکردنی خۆی بووە؟! نووسەری بێویژدان! نەك هەر ئەمانە.. ئەی ئەو ساڵانەی وشکانی‌و بێ ئاوی بوو "بیری ڕۆمە"ی نەکڕی لە ماڵی حەڵاڵی خۆی‌و نەیبەخشییە موسڵمانان، "بیری ڕۆمە" هی کابرایەکی (غیفاری) بوو، ئاوەکەی ئاوی خواردنەوە بوو، موسڵمانانیش زۆریان پێویستی بە بیرێکی وا هەبوو بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانیان، پێغەمبەر ﷺ بە کابرای غیفاری فەرموو: ئەو کانیە ئەفرۆشی بە کانییەك لە بەهەشتدا؟! کابرا وتی: ئەی ڕەسولی خوا ﷺ خۆم‌و ماڵ‌و منالم تەنیا ئەمە شك ئەبەین‌و هیچی ترمان نییە. عوسمان بەمەی زانی ڕۆیشتە لای کابرای غیفاری‌و بە (سی‌و پێنج) هەزار درهەم، بیرەکەی لێ کڕی‌و هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: قوربان، ئەوەی بۆ ئەو کابرا وەعدتدا، هەمان وەعدیش ئەدەی بە من؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵێ! عوسمان وتی: قوربان دەی ئەوە من کڕویمەو بە خشیم بە موسڵمانان[٥٠١].. هەرئەمەش نا.

لە سەردەمی ئەبوبەکریشدا هەرهەمان دەستکراوەیی‌و خووڕەوشتی هەبوو، (مالەقی) لە کتێبی "التمهید والبیان"دا ئەڵێت: "لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیقدا (ڕەزای خوای لێ بێت) نەبوونی‌و گرانییەك ڕوویدا لە مەدینەدا، عوسمانیش کاروانێکی هەزار هوشتری چوو بوو بۆ شام بۆ هێنانی شتومەك‌و خواردەمەنی، کە هەزار هوشترەکە بە بارەوە هاتنەوە لە بەرقاپی ماڵی عوسماندا مۆڵیانداو یەخیان کرد، بازرگانەکانی مەدینە هاتنە لای عوسمان بۆ کڕینی شتەکان، عوسمان فەرموی: چەند قازانج ئەدەن؟ وتیان: بۆ هەر دینارێك دینارێك ئەدەین، عوسمان فەرمووی: زیاترم پێدراوە! وتیان: دوان،

[٤٩٧] سوپای "عوسرەت" ئەو سوپایە بوو پێغەمبەر ﷺ ڕێکی خست بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی سوپای گەورەی (ڕۆم) بێتەوە، چونکە هەواڵی ئەوە هاتبوو کە (ڕۆم = غەسان) بە نیازن پەلامارێکی گەورە بدەن‌و هێزی ئیسلامی لە (جزیرة العرب)دا نەهێڵن، سەرەتا ئەوەبوو نوێنەری پێغەمبەریان ﷺ شەهید کرد، کە نامەی پێغەمبەری ﷺ پێ بوو بۆ شرحبیلی کوڕی عەمری غەسسانی‌و پاشان کەوتنە خۆکۆکردنەوەی بۆ پەلاماردانی مەدینە.

[٤٩٨] سنن الترمذي (مناقب: ٦٢٥/٢) رقم الحديث (٣٧٠٠).

[٤٩٩] سنن الترمذي (٦٢٦/٥).

[٥٠٠] الرحيق المختوم/ المباركفوري (ص٤١٥).

[٥٠١] فتح الباری (٩٧٠/٣)، ئێستا بەو بیرە ئەوترێ (بیری عوسمان) کە ئەکەوێتە ناو باخێکەوەو وەقفە لەسەر مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ، هەرچەندە ئاوەکەی زۆر کەمی کردووە، پاش ئەوەی دوو بیری ئێرتیوازی قوڵیان لە نزیکەوە لێداوە، (تحقيق مواقف الصحابة: ٣٧٥/١).

پاشان سیان و چوارو تا پێنج دینار هەر ڕۆیشتن، عوسمان فەرمووی: زیاتریان پێداوم.. بازرگانەکان وتیان: ئێمە ئاگامان لە شار هەیەو بڕوا ناکەین کەسیش پێش ئێمە هاتبێتە لات، عوسمان فەرمووی (یەك بە دە) قازانجیان دلومەتێ، ئێوە ئەتوانن بمدەنێ؟! وتیان نەخێر.. عوسمان فەرمووی: دەی خوای گەورە یەك بە دە قازانجی داومەتێ، چووە خزمەتی ئەبوبەکرو فەرمووی: ئەوە ئەو ماڵەم گشتی بە خشی لە ڕێگەی خوادا فەرموون دابەشی بکەن بەسەر هەژاراندا"[502].

دەی فوئادی میسری! ئیتر عوسمان هەر خۆی بە دەوڵەمەندی هاتبوو یان وەك تۆ ئەڵێی خیلافەت دەوڵەمەندی کردبوو؟ من وابزانم تۆ لەوەدا ناهەقت نییە کە لەم جۆرە هەڵوێستانە تێنەگەی، تۆ نازانی (ئیمان) چییەو ڕۆڵی چییە لە گۆڕینی (عەقڵیەت)و (نەفسیەت)ی خەڵکدا، مێژوونووسان دەڵێن: "یەکێك لە مەرجەکانی نووسین لەسەر مێژووی ئیسلام حاڵیبوونە لە ڕۆڵی ئیمان و نرخی ئیمان لە ناو خەڵکدا"[503]. ئەوان دڵیان بە ماڵێك خۆشبووە کە ئیسلام لازمی بووبێت و کاری تێی کەوتبێ، عوسمان خۆی دەوڵەمەندو پارەدار بووەو هەروا هاتووە نەك خیلافەت دەوڵەمەندی کردبێت، هەروەها عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف -یش کە تۆ باسی ئەکەی، عەبدوڕڕەحمان کاتێك کۆچی کرد بۆ مەدینەو پێغەمبەر ﷺ کردیە برای ئەنسارییەك ئەوەبوو برا ئەنصارییەکەی نیوەی ماڵەکەی دانا بۆی و ئامادەییشی دەربڕی یەکێك لە ژنەکانیشی تەڵاق بدات بۆ ئەوەی ئەو بیخوازێت، بەڵام عەبدوڕڕەحمان فەرمووی: "بارك الله في أهلك ومالك أين سوقكم؟!" ئەوەبوو خێرا دەستی دایە کاسبیکردن و زۆری نەبرد پێشی زۆرێك لە بازرگانەکانی مەدینەی دایەوەو ئەویش لە سوپای عوسرەدا بۆ نموونە: "دووسەد هۆقە زێڕی بەخشی"[504]. ئێ خۆ ناشکرێ ئێمە لەبەر ئەوەی وەڵامی بڕگە بڕگەی ئەوەی تۆ بدەینەوە، بێین ژیانی یەکە یەکەی سەحابە باس بکەین، وەك لە مێژوودا باسکراون، چونکە ئەوە زۆر ئەخایەنێت و لە ناوەڕۆك و مەبەستی کتێبەکەش دوور ئەکەوینەوەو کوردیش ئەڵێ: "مشتێك نمونەی خەرمانێکە"، بەڵام تەنیا ئەوەندە ئەڵێین: کاکە فوئاد! بەرەی سەحابە بەرەیەکی ناوازەی مرۆیی بوو لە هەموو ژیانی مرۆڤایەتیدا پێ ناچێ بەرەیەکی ناوازەی لەو شێوازە هەبووبێت کە شاعیرێکی گەورەی وەك مەولەوی لە چامەیەکی شیعری زۆر ناسك و پڕ فەلسەفەدا باسیان ئەکات و ئەفەرموێ:

ئەوانن ئەوان چاکیان بناس
"خیر امه اخرجت للناس"
ئەدەس ئەوان کەوت دەرەجەی قەبووڵ
ڕەزامەندی حەق صوحبەتی ڕەسول
بکە بەچاوی دڵ تەماشایان
لەم قورئانەدا مەدح و سەنایان
ئینصافت بوێ نەظەر کە ورد ورد
چلۆنە شەخصێ خود ثەنای کرد
نەك هەر لە جایێ، جایەکێ، جا دوو
ڕاس وەبێ جا دوو (جاهدوا، جادوا)
بە موجاهەدەی ئەصغەرو ئەکبەر
بە جودی مەیسور یان مەعسور یەکسەر
بە جەلای فیطرەت لە ژەنگی فەترەت
بە جەلای مەوطین مەئلوف و هیجرەت
بە نەفس و بە ماڵ (في سبيل الله)
(بالله، مع الله، في الله، لله)

---

[502] تحقيق مواقف الصحابة (٣٧٧/١).

[503] تحقيق مواقف الصحابه (٢٧١٠/١).

[504] الرحيق المختوم (ص٤١٦).

**(والله اشترى وهم قدشروا**

**منهم، بل مالهم ماعتوا)**

**ناكەن چە حاجەت پێوان لە (أوان)**

**صەد هەمباری غەیر بە مشتی ئەوان**

**های لەو تەصدیقەو عەزمو ئاهەنگە**

**لەو بەزلی ماڵو ڕۆحە بەو ڕەنگە**

**لەو قەولە فیكری چاك لێكەرەوە**

**لە گەرمەی جەنگدا داتە دەرەوە**

**(من فم الانصار والمهاجرة!**

**اما الغنيمة، اما الآخرة)**

**هیچ وارید نەویٚ لە شەئنیاندا**

**بەسن بۆ دەلیل لە فەزڵیاندا**

**ئەدوی هەركامیٚ لەوانە كەوی**

**تۆشیاری یەكیٚ لەمانە دەوی[٥٠٥].**

**خۆزگە كاكە فوئاد! بۆ ماوەیەك وازت لەو قەناعەتە پێش وەختانەی خۆت ئەهێناو یەك دوو كتێبت لە ژیانی ئەسحابی پێغەمبەر ﷺ ئەخوێندەوە، بەلاّم بەبیٚ لایەنگیری، هاوڕێیەتییەكی ویژدانیت لەگەڵ ئەكردن.. ئەوكاتە بە دڵنیاییەوە ئەڵێم: بەبیٚ داخ هەڵكێشان بە زۆرێك لەو قەناعەتانەی خۆتدا ئەچویتەوە كە هەتە دەربارەی پێغەمبەرو سەحابەی پێغەمبەر ﷺ، ئەو كاتە زیاتر حاڵی دەبووی مەسەلە چییە خوای گەورە دەفەرمویٚ: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ)، یان دەفەرمویٚ: (..وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ..). نكولی لەوە ناكریٚت و ڕیٚ ئەكەویٚت ئەو جۆرە ژیانە لەوانەیە لە شێوەیەك یان زیاتر لە ناو خەڵكدا دووبارە ببێتەوە بەلاّم هەر ناگاتە ئەو لوتكەیەی كە ئەوانی لەسەر بوو[٥٠٦]، چونكە ئەوەی ئەوان دوو هۆكاری گەورەی لە پشتەوە بوو: یەكەمیان: كۆمەك و پشتیوانییەكی تایبەتی خوای گەورە بۆیان، چونكە مەبەستی بوو بیانكاتە پەرژین و پاسەوان بۆ ئیسلام و بانگبەری دینەكەی.. دووهەمیان: گەورەیی و لێهاتوویی پێغەمبەر ﷺ لە پەروەردەو پێگەیاندندا..**

**مامۆستا هەژار لە كتێبی (چێشتی مجێور)دا ئەڵیٚ: "لە درێژی تەمەنمدا كە ئێستا لە پلەی حەوتەمو لە شێستو سیٚ ساڵیدا ئەژیم، زۆرم حزب لە نزیكەوە دیتون، باسی ڕەفتارو ڕابردووی زۆریانم خوێندووەتەوە، زۆر چەتوونە هیچ كۆمەڵێك وەك ئەندامانی (ژ. ك) ئاوا فیداكاری و دڵ گەرمو یەكتر خۆشەویست بووبن، دەربارەی ئەصحابی پێغەمبەر ﷺ زۆر باسی یەكدڵی و فیداكاری هەیە، وەختە بڵێم ئەندامانی ئەو حزبەش شتێكی وابوون، خۆ دزینەوە لە فرمان، درۆ، خۆخوازی، فێڵبازی، بە جارێك تەرە بووبوو، لە حەوت كێوان ئاوابوو بوو، ماڵی دونیا هەر بۆیە مایەی دڵخۆشی بوو كە كۆمەڵە پێی لازم بیٚ"[٥٠٧].**

[٥٠٥] عقيدة مرضية/ مەولەوی/ مەلا عەبدولكەریمی موددەریس، ل٤٦٥.

[٥٠٦] سەید قوتب ڕەحمەتی خوای لێبێت ـ ئەڵیٚ: "كە خوا ئەفەرموێت (وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ) هۆكاری ئەو (پیاوەتی)ەش باسدەكاتو ئەفەرموێت: (وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُون)، چونكە دەروونی مرۆڤ پڕپڕە لە پیاوەتیو دەستكراوەییو لە خۆبوردەییو دڵسۆزی، ئەگەر پەروەردە بكرێتو (شح)و ڕژدیو بیٚ ویژدانی لیٚ دەربهێنرێت، ئەصحاب بە پەروەردەی قورئانو فەرموودە ئەو پەرچەیان لەبەردەم دەروونی خۆیاندا شكاند ئەوەبوو كانیاوی پیاوەتیو سەخاوەتو ئازایەتیان تەقیو بونە جێگەی پەسەندیدەی خواو پێغەمبەر ﷺ". سەیری (تفسير في ظلال القرآن، تەفسیری سورەتی (الحشر) ئەو ئایەتەی سەرەوە بكە).

[٥٠٧] چێشتی مجێور، هەژار ل (٦٠).

کاکە فوئاد! شتێکی سروشتییە خەڵکێك هەبن (زۆر دڵسۆزبن بۆ ئینسان) دڵسۆزبن بۆ بەرامبەرەکەیان، کاری وا بکەن زۆر بە زەحمەت جێگەی باوەڕی خەڵکانێك بێت کە لەو جۆرە ژیانانەیان نەدیوەو بۆیان ڕێنەکەوتووە ماوەیەك تێیدا بژین.. وابزانم ئەو قەناعەتە پێش وەختانەشت خەتایانە بۆ نمونە کە عەقیدەت وایە "بەرژەوەندی ئابووری دینەمۆی هەڵسوکەوتی مرۆڤە". ڕاستە مرۆڤ ئەگەر پەروەردە نەکرێت قومێك ئاو نادات بە دەم هەژارێکەوە ئەگەر نرخەکەی لێ وەرنەگرێت، بەڵام ئەگەر پەروەردە کرا ئەوە ئامادەیە ماڵو منداڵو گیانی خۆشی بەخت بکاتو (ایثار) بە خەرج بدات بەبێ ئەوەی چاوەڕوانی بەرامبەر بێت لە پاداشتدا.. بەڵام وەك شاعیرەکە ئەڵێ:

و من يك ذا فم مر مريض يجد مرا به الماء الزلالا

کەسێك کە دەمی تاڵ بێتو نەخۆش بێت، ئەوە ئاوی شیرینو زوڵاڵیش لە دەمیدا هەر تاڵە!

. فوئاد میسری بەبێ ئەوەی ئادابو سیاسەتی ئیسلام بەرامبەر (نەیارو موعارەزە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا) بزانێت، ناهەقی ئەکاتو وا دەرئەخات ئیسلام ڕازی نییە هیچ جۆرە ئۆپۆزسیۆنێك هەبێت! لە دەوڵەتەکەیدا، ئەوەتا ئەڵێت: "هەرچەشنە جموجوڵێکی کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، دژ بە ئایدۆلۆژیای دەسەڵاتداران خراونەتە خانەی کوفرو ئیلحادەوە"[٥٠٨]. لە کاتێکدا ئەمە لە دووڕووەوە وانییە: یەکەم: لە ڕووی (دەق)و یاسای ئیسلامییەوە. دووەم: لە ڕووی مێژوو مومارەسەشەوە.

. وەك دەق، خوا ئەفەرموێت (وَلاَ يُضَآرَّ كَاتِبٌ وَلاَ شَهِيد)، "نووسەر"و "شایەت" نابێت تووشی زەرەرو زیان بکرێن، نووسەر کە هەقێك ئەنووسێت یان شایەتێك کە هەقێك ئەسەلمێنێت.. ئەم ئایەتە یەکێکی وەك عەبدوڕڕەحمان ئەلکەواکیبی، لە کتێبی (طبائع الاستبداد ومصارع الاستعباد)دا ئەڵێ: "ئەم ئایەتە شیعاری ئازادی ڕۆژنامەگەرییە لە ئیسلامدا"[٥٠٩].

. هەروەها ئەفەرموێت: (وَلاَ تَكْتُمُواْ الشَّهَادَةَ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُه) شایەتی لەسەر هەر حەقیقەتێك مەشارنەوە، ئەوەی بیشارێتەوە دڵی گوناهبار ئەبێتو ئەگەنێت.

. پێغەمبەریش ﷺ ئەفەرموێت: (گەورەترین جیهاد ئەوەیە لە بەرانبەر سوڵتانێکی زاڵمدا هەق بڵێی).

. ئەبوبەکریش (خوای لێ ڕازیبێت) ئەڵێت: "اطیعونیی ما اطعت الله ورسوله، فان عصيته فلا طاعة لي عليكم"[٥١٠].

. عومەریش (خوای لێ ڕازیبێت) ئەڵێت: "خێر لە خەڵکدا نییە ئەگەر ڕەخنە نەگرن لە ئێمەی کاربەدەست، خێریش لە ئێمەدا نییە ئەگەر گوێیان بۆ نەگرین"[٥١١].

. (عەلی)یش (خوای لێ ڕازیبێت) ئەڵێت: "فأنە من استثقل الحق ان يقال له، أو العدل أن يعرض عليه، كان العمل بهما اثقل عليه، فلا تكفوا عن مقالة بحق أو مشورة بعدل، فاني لست في نفسي بفوق ان اخطيء ولا آمن ذلك من فعلي"[٥١٢].

. وەك مومارەسەو مێژوویش، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ تا هەموو سەردەمەکانی تر ڕێگە بە هەموو جۆرە موعارەزەیەك دراوە لە موسڵمانانەوە بووبێت یان لە غەیرە موسڵمانەوە بووبێت بەو مەرجەی دەستی نەدابێتە چەتەییو پیاو کوژی.

. لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ خەڵك هەبووە (مونافیق) بووەو بە ئاشکراو بە نهێنیی زەهری داکردووە لەناو خەڵکداو کەنەی کردووە لە ئیسلامو ئەهلی ئیسلامو پێغەمبەریش کەسی نەکوشتووەو چوار مێخەی کەسی نەکێشاوەو دارو فەلاقەی بۆ کەسیان هەڵنەخستووەو بە هەمووشیانی زانیوەو خوا ئاگاداریکردووە، نەك هەر ئەمە، بەڵکو تەنانەت لە لای هاوەڵانیشی ناوی نەبردوونو ڕیسوای نەکردوونو ناوەکانیانی نەداوە پێیان، تاکە کەسێك ناوی ئەو مونافیقانەی لابووبێت وەك

---

[٥٠٨] کۆمەڵگا ل(١١١).

[٥٠٩] طبائع الاستبداد ومصارع الاستعباد (الاعمال الكاملة/ محمد عمارة) ل١٤٣.

[٥١٠] النظام السياسي في الاسلام/ محمد عبدالقادر أبو فارس، ص٧٦.

[٥١١] فریشتەکانی سەرزەوی/ تەها بابان، ل٣٨.

[٥١٢] نهج البلاغة ص٢٥١.

نووسەرانی (سیرە) باسی ئەکەن (حوزەیفەی کوڕی یەمان) بووە، نە ئەبوبەکرو نە عومەرو نە عوسمانو نە عەلیو نە کەسی تر ناویانی نەزانیوە، نەك هەرئەمەش، بەڵکو ئەم سیاسەتە بوو بە (یاسا)و (باو) کە زانایان ئەفەرموون: "استقر أمر المنافقين على التعامل معهم بظواهرهم وتكال الى الله سرائرهم"[٥١٣].. هەر لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگە بە گاورو جولەکە دراوە ممارەسەی هەموو ئادابو شەعائیرێکی خۆیان بکەنو خاوەنی پەیمانی خۆیان بنو نەیشکێننو هەرکامیشیان غەدری کردبێت ئەوە خۆی ئەنجامی غەدرو ناپاکییەکەی هەڵگرتووە.

. لەسەردەمی (عەلی)یشدا دیارترین هێزی ئۆپۆزسیۆن بریتیبوون لە (خەوارج) کە نەك هەر مافی بوونیان هەبووە، بەڵکو تەواوی مافەکانی تریان بۆ داین کراوە، وەك هاووڵاتیبوون، موچەی دەوڵەت، ڕاگەیاندن،.. هتد. نەك هەر ئەمەش، بەڵکو دان بە (قەوارە)یاندا نراوەو پەیماننامەش کەوتووەتە نێوان ئەوانو دەوڵەتی خیلافەتەوەو ئێمەش لە پێشەوە شتێکمان لەم مەسەلەیە باس کرد.. عەلی (ڕەزای خوای لێ بێ) لەسەر چەند خاڵێك ڕێککەوت لەگەڵیاندا، لەوانە:

١. مافی دەرسو دەورو ئامادەبوونیان هەبێت لە مزگەوتەکاندا، کە بە تەعبیری ئێستا ئەکاتە مافی ڕاگەیاندنو خۆناساندن، چونکە ئەو کاتە مزگەوت هۆکارێکی ڕاگەیاندن بووە.

٢. مافی بەشداری بوونیان هەبووە لە "بيت المال"و "فەیئی موسڵمانان"دا، واتە مووچەو بژێوی.

٣. کەس شەڕیان تێنەپێچێت، مەگەر ئەوان دەست بدەنە شەڕو پیاوکوژی.

ئەم "یاسا"و "باوە" لە زەمانی عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیشدا هەر دەوامی کێشاو ئەوەتا بڕگەیەکی ڕێککەوتننامەی لەگەڵیاندا ئەوەیە کە "بە مووچەو جلوبەرگی دەوڵەتی خیلافەت ڕازی بن"[٥١٤].

. لەناو دەوڵەتی عەبباسیشدا بە هەمان شێوە ئەو هەموو تاقمو گروپە ئیسلامییو غەیری ئیسلامییە هەبووە لە "موعتەزیلە"و "شیعە"، .. هتد، کەسیش شەڕی تێ نەئاڵاندوون، مەگەر ئەوان شەڕیان ئاڵاندبێتە دەوڵەتو دەوڵەتیش بەشێوەیەك یان زیاتر سنووری بۆ دانابن.

. لەناو دەوڵەتی عەبباسیشدا ئەوەندە ڕێگە درا بە "ابداع"و داهێنان چەرخی زێڕین دروست بوو (کە ئەو کاتە ئەورووپا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هاوزمان بوون لەگەڵ دەوڵەتی عەبباسیدا)، هەرچی زانستی مرۆڤایەتی هەیە لە (فەلسەفە)و (فیکر)و (طب)و (هندسە)و .. هتد، هەمووی تەرجەمەکراو خەڵاتی گەورە گەورەش ئەدرا بەوەی بەشداریی لەو کارانەدا بکات[٥١٥].

ئیتر کوا ئەمەی فوئاد میسری ئەیڵێ: "هەر چەشنە جموجوڵێکی کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیری خراونەتە خانەی کوفرو ئیلحادەوە..؟!".

بەڵام ئەگەر تاقمێکی وەکو "قەرمەتییەکان" بۆ نمونە، یان "بابەکیەکان" کە دەستیان داوەتە چەتەگەریو شەڕەخۆریو پیاو کوشتن ئەوە دەوڵەتی خیلافەت بەمافی خۆیی زانیوە بەرگری لە خەڵك بکاتو "نان"و "ئەمنیەت"یان بۆ بپارێزێتو ڕێگە لەو چەتەگەرییە بگرێت، ئەی باشە بەڕای نووسەر ئەبوایە چی بکرایە؟

کۆمەڵێك کە خۆی ئەڵێت: "پەلاماری شاری مەککەیان داوەو لەسەر شەقامو ناو کۆڵانەکاندا "سێ هەزار حاجییان کوشتووە، ئەمە جگە لەوانەی کە بەدیلگیراونو نانو ئاویان نەداونەتێو لەبرسانا مردوون، بیری زەمزەمیان پڕکردۆتەوەو بەردە ڕەشەکەیان لەبنو بێخ هێناوەو ڕێگەیان لە حاجیان گرتووەو نەیانهێڵاوە بڕۆن بۆ حەجو باج و سەرانەیان خستۆتە سەریان.. هتد، باشە چی بکرێت لەم چەتەو ڕێگرانە؟ لێبگەڕێن وەك "میکرۆب" ئەمنیەتی هەموو خەڵك بخەنە مەترسییەوە، یان سنووریان بۆ دابنرێو تەمێ بکرێن؟ ئایا کەس هەیە لە ئەمڕۆدا لەو شتانە بێدەنگ بێت، هیچ دەوڵەتێك هەیە ڕێگە بدات "نەیاری چەکدار" لەوڵاتەکەیدا هەبێت، ئاخر بۆچی ئەوە بۆ دەوڵەتی خیلافەت "حەرام"و "ستەمکاری"

---

[٥١٣] جماعة المسلمين وشروط الالتزام بها، صلاح الصاوي، ص٤٦.

[٥١٤] پێشتر بە درێژی باس لەم بابەتە کراوە.

[٥١٥] الاسس الشرعية والفكرية للعمل الاسلامي ـ راشد بن علي، ص ٢٤٧.

بێت؟ بەڵام بۆ خەڵکی تر پاراستنی "ئەمن"و "نان"ی خەڵك بێت ئەم "دوو فاقی"ە لە فیکرو لە مومارەسەدا یانی چی؟ شاعیر جوان دەڵێ:

لاتنه عن خلق وتأتي مثله          عار عليك اذا فعلت عظيم

یان وەك شاعیرێکی فارس ئەڵێ:

... این گناهیست که در شهر شما نیزکنند[٥١٦]

نووسەر لە لاپەڕە (١١٤)ی کتێبەکەیدا سێ چوار زانیاری ناڕێك و ناڕەوا ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: "موسلیمی کوڕی عەقەبە کە چووە ناو شاری مەککەوە، سەربازەکانی حەوت هەزار ئافرەتی مەککەیان ئەتك کرد!"، ئەمەی لەکێ وەرگرتووە؟ ئەزانن لەکێ؟ لە کتێبی "تأريخ التعذيب في الاسلام" هادی عەلەوی عەلمانی و شیعە مەزهەب!![٥١٧].

یان ئەڵێ: ".. پاش ئابڵوقەدانی شارەکە زۆربەی دانیشتوانی کوشت"، ئەی ئەمەیان کێ ئەیڵێ؟ یەعقوبی و مەسعودی شیعە مەزهەب لە "تأريخ اليعقوبي ومروج الذهب"دا ئەیڵێن!!

نووسەر ئەڵێ: "خالد ئەلقیسری وتوویەتی: هەرکەس ڕەخنە لە شەخصی خەلیفەی مسوڵمانان بگرێ لەناو کەعبەدا هەڵیدەواسم"، ئەمەشی هەر لە "تأريخ التعذيب"ەکەی هادی عەلەوی وەرگرتووە دیسان!.

کاکە! مەسەلەی مێژوو ئەبێت لە مێژوونووسانەوە نەقڵ بکرێت، چونکە مێژوو نە لە کتێبی هادی عەلەوی و نە لە کتێبی "ڕەقیبان"ەوە نابێت وەربگیرێت لەبەر ئەوەی مرۆڤ ئەکەوێتە گومان و دوودڵییەوە، خوا ئەفەرموێت (ذَٰلِكُمْ أَقْسَطُ عِندَ اللّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلاَّ تَرْتَابُواْ)، بەڵام ئەمە بۆ کێ بووترێ؟ بۆ کەسێك سواری قسەی خۆی بوو بێت یان بۆ کەسێك خوا دوو گوێی پێ دابێت و بە عەقڵێش شت ورد بکاتەوە..

نووسەر باسی ئەو ڕێبازە فیکرییانە ئەکات کە لە سەردەمی عەباسییەکاندا هاتنە مەیدان و وەك شتێکی سروشتی چەند هەوڵێك بوون بۆ تەفسیرکردنی دین، بەڵام دیسان ئەکەوێتەوە ناو هەڵەی گەورە گەورەوە.. بۆ نموونە ئەڵێ: "بەپێی حوکمی قورئان مشتو مڕکردن دیاردەیەکی پەسەند نییەو ڕاستترین ڕێگە بۆ ئازادەمیزادی خاوەن باوەڕ ملکەچکردنەو قایل بوونە بە ئیرادەی خوا، (فَإنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلّهِ)"[٥١٨]. ئاخر ئەمە کەی وایە؟.. کوا لە قورئاندا حوکمی وا دراوە؟ یا کوا لە فەرموودەدا شتی وا وتراوە؟ ئێمە لە چەند شوێنێکدا وەڵامی ئەم بوختانەمان داوەتەوەو دووبارە کردنەوەی بەچاك و جوان نازانین.

فوئاد مەجید میسری ئەڵێ: "ڕێبەرانی ئیسلام.. کە پەلاماری هەر وڵاتێکی خاوەن فەرهەنگیان ئەدا کتێب و نووسراوو خەزێنەی فەرهەنگیان دەسووتاند.."، پاشان ئەو بوختانە ئەکات کە گوایە "بە ئەمری خەلیفە عومەر کتێبخانەی ئەسکەندەرییە سووتێنراوە"[٥١٩]، ئەم شتانەی سەرەوە دوو بوختانی گەورەی تێدایە:

یەکەمیان: ئەمری خەلیفە عومەر بۆ سوتاندنی کتێبخانەی ئەسکەندرەییە، دووەم: سوتاندنی فەرهەنگی وڵاتان.

یەکەمیان ئەو بوختانە بە تایبەتی درۆی شاخدارە بەسێ چوار بەڵگە:

١. کتێبخانەی ئەسکەندەرییە چەندەها ساڵ پێش ئیسلام نەماوەو تیاچووە.

٢. ئەو مەسەلەیە لە هیچ کتێبێکی باوەڕپێکراودا وەك (طبري)و (ئیبن کثیر)و (بە لازەری)دا باس نەکراوەو نەوتراوە.

---

[٥١٦] الشيعة واهل البيت/ ص ١٢٦.

[٥١٧] یەکەم کەسێك ئەم زانیارییە ناڕاستەی خستە نێو "المدائني" بوو کە ساڵی (٢٢٥ك) مردووە کە ئەڵێت: "دوای ڕووداوی (حرە) هەزار منداڵی زۆڵ پەیدابوو، یەکەم کەسیش کە ئەم زانیارییە بێبناغەی گواستەوە (ابن الجوزي)یە لە کتێبی (المنتظم)دا، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو زانیارییە نە لای (طبري)و نە لای (خەلیفەی کوڕی خەیات)ڕاست نەبوو، کەسیان باسیان نەکردووەو پشتگوێیان خستووە، هیچ ڕیوایەتێکی ڕاست و سەنەددار نییە لە مەسەلەی ئەتك و ئیغتصابی مەدینەدا، مەبەستیش تەنیا ناشیرینکردنی سوپای شام نییە بەڵکو ناشیرینکردنی سوپای فتوحاتی ئیسلامییە، تەنانەت (فلهاوزن)ی ڕۆژهەڵاتناسیش ئەم مەسەلەیە بەشتێکی بێ بناغەو ناڕاست ئەزانێ". (بۆ زیاتر سەیری معاويه ابن ابى سفيان) شخصيته وعصره/ د. على محمد الصلابى ـ ص ٥٣٠ ـ ٥٣٣.

[٥١٨] کۆمەڵگا (ل١١٦).

[٥١٩] کۆمەڵگا ل ١٣٩ ـ ١٤٠.

**٣.** ئەو بوختانە تەنیا کەسێکی گاور مەزهەبی وەك "جۆرجی زەیدان"باسی ئەکات لە کتێبی (تأريخ التمدن الاسلامي)ەکەیدا کە ئێمە لە پێشەوە باسی دیدو بۆچوونو ڕادەی نازانستیو بێ ئینصافی خۆیو کتێبەکەیمان کرد کە پێکهاتووە لە کۆمەڵێك درۆی بێ پەردەو گشتاندنی زاڵمانەو ناڕەوایانە، گزیکردن لە گواستنەوەی قسەدا، قسە گۆڕینو هەڵگەڕاندنەوەی، گواستنەوەی زانیاری لە کتێبی پڕو پیرەژن.. هتد"[٥٢٠].

**٤.** یەکێکی وەك (وڵ دیوارنت) خاوەنی کتێبی (قصة الحضارة) ئەمە بە خورافە ئەزانێت..

لەگەڵ ئەوەدا فوئاد میسری ئەم زانیارییەی نەداوەتە پاڵ هیچ کەس، وا ئەزانێ خەڵك ناگەڕێت بەدوایدا تا بزانێ ئەم زانیارییە هێلکەو بەچکەی کێیە؟!

دووهەم: ئەو بوختانە بەگشتی درۆی شاخدارە بە چەند بەڵگە:

**١.** مسوڵمانان کتێبەکانیان پڕە لە شتی گواستراوە، کە لە کتێبی میللەتانی ترەوە وەریانگرتووە، جا ئەگەر ئەو کتێبانە نەمابن ئەو نەقڵانە لەکوێوە وەرگیراون؟.

**٢.** مسوڵمانان بە تایبەتی لە دەوڵەتی عەبباسیدا "دار الحكمه"یان دانا کە ئیشی ئەوەبوو فەرهەنگو زانستی هەموو میللەتان تەرجەمە بکاتو بۆ ئەو کارەش گەورەترین خەڵات تایبەت ئەکرا، جا ئەگەر نەمابن چییان تەرجەمە کردووە؟!

**٣.** وەرگرتنی یاسای "دەواوین" کە تەنانەت تا خیلافەتی (مأمون)ی عەبباسیش هەر بەزمانی (فارسی) ئیشی پێئەکراو لە سەردەمی (مأمون)دا تەرجەمە کرا بۆ عەرەبی، ئەمە بەڵگە نییە لەسەر ئەوەی مسوڵمانان هیچ جۆرە حەساسییەتێکیان بە فەرهەنگی میللەتانی تر نەبووە؟!.

جا ئیتر نازانم فواد میسری لە خوتو خۆڕایی بۆ خۆی ئەکاتە دەلاڵی بیرو بۆچوونو کەلوپەلە پڕتەزویرەکەی جۆرجی زەیدان..

یان سەیر کەن چۆن بەهەموو قەناعەتێکەوە ئەڵێ: "ئیبن عەبباس لە پەیامبەرەوە ئەگێڕێتەوە وتوویەتی: (پێشینان بەهۆی نووسینەوە دووچاری گومڕاهی بوون)"[٥٢١]، نازانم کێ بڕوا ئەکات ئەمە وابێت؟! پێغەمبەر ﷺ چۆن وا دەڵێت؟ کە خوا یەکەم ئایەت دایبەزاندووەتە سەری پێی ئەفەرموێ: (اقرأ)!! هەروەها ئەفەرمووێ: (اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ *الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ)، لەمەش سەیرترو سەمەرەتر ئەوەیە، ئەڵێ: بۆ ئەم فەرموودەیە سەیری جۆرجی زیدان: "(تأريخ تمدن الاسلام (٤٣٢/٣)) بکە، یان سەیری (حلاج/ مير فطروس، ل ٦٨)" بکە!!

جا توخوا کەسێك کەمترین ئاگاداری ببێت لە مەرجەکانی نووسین ئەوە نازانێت کە زانیاری مێژوو ئەبێت لە کتێبە مێژووییەکانو فقه لە کتێبە فیقهیەکانو فەرموودە لە کتێبەکانی فەرموودە.. هەروەها وەربگیرێت. مەعقولە فەرمودە لە جۆرجی زەیدان وەربگری؟! مەعقولە پێغەمبەر ﷺ کە خۆی (٤٠) سەحابەی هەبووە بەناوی نووسەرانی وەحیو کاریان نووسینەوەی قورئان بووە لە ژیانی پێغەمبەردا، کەچی بفەرموێت: میللەتانی پێشوو بۆیە لەناوچوونو سەریان لێ تێکچووە، چونکە خوێنەوارو نووسەر بوون!! پێغەمبەرێ ﷺ کە بفەرموێ (اطلب العلم من المهدى الى اللحد)، وە بفەرموێت: (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة)، بفەرموێت: (أكتبوا لأبى شاة)، یان بفەرموێت: (استعن بمينك)هەروەها پێغەمبەر ﷺ خۆی مەرجی بۆ ئازادکردنی یەکەمین وەجبە ئەسیری کافران ئەوەبێت هەر یەکێکیان ئەبێت (١٠) منداڵی مسوڵمانان فێری خوێندنو نووسین بکات.. چۆن شتی وا ئەفەرموێت کە تۆ ئەیڵێی؟!

فوئاد میسری ئەم بەشەی کتێبەکەی بە ریزێکی تر بوختانو قسەی نەگونجاو لەگەڵ واقیعو عەقڵیدا کۆتایی پێ دێنێو دەڵێت: گەشە سروشتییەکان بەپێچەوانەی ویستو ئارەزووی دەسەڵاتدارانو دامەزراوە ئاینییەکانەوە بوو، ئەوانە

---

[٥٢٠] بۆ درێژەی زیاتر سەیری کتێبی (قضايا الثقافة والفن والادب) (ل ٤٢٣) کە لە گۆڤاری المنار (١٩١٢/١٥) وەرگیراوەو ئێمەش لە بەشەکانی پێشووتری ئەم کتێبەدا ئەم بوختانەمان زانستیانە پووچ کردەوە.

[٥٢١] کۆمەڵگا ل ١٣٩.

**بیرو ڕاکانیان لە باوەڕی ئاینەوە سەرچاوەی دەگرتو بنەماکانی ئاینیش پشتگیری لە گەشەکردنی زانستو سوود وەرگرتن لە فەرهەنگی گەلانی تر ناکەن[٥٢٢].**

**ئەمەش بەقەدەر بێژەنگێك كونی تێدایە..**

**یەکەم: ئەوکارە بە پێچەوانەی ویستو ئارەزووی ئەوان نەبووە بەڵکو خەلیفە خۆی کاغەز ئەنووسێت بۆ پاشای ڕۆمەکانو داوای لیّ ئەکات کەچی نووسراوی زاناو حەکیمەکانی خۆیان هەیە بۆی بنووسێت، تا ئەم بیداتە لیژنەی تایبەتو تەرجەمەی بکەن[٥٢٣].**

**دووهەم: ئاین پشتگیری لە گەشەی زانستو زانیاری ئەکات نەك وەك تۆ ئەڵێی ڕێگە لە گەشە بگرێتو لە پێشەوە شتێکمان باسکرد لەم بارەیەوە.**

**سێهەم: گەورەترین گەشەی زانستو زانیاریو مەدەنییەت لە قۆناغەکانی دەوڵەتی خیلافەتدا ڕوویداوە، لەپێشەوە شتێکی زۆرمان لەو ڕاستییە باسکرد کە دەوڵەتی خیلافەت "بانکی داناوە، "شیك"ی داهێناوە، جۆرەها کارگەی کاغەزو شوشەو ڕستنو چنینو ئیصلاحیی زراعیو کەشتیگەلی جەنگیو بازاری ئازادو.. هتد"، داهێناوە. دەوڵەتی خیلافەت سەرەتاکانی هەموو زانستەکانی (طب)و (کۆمەڵناسی)و (جبر)و هندسە)و زانستی مێژووی داهێناوە.**

**چوارەم: خەلیفە عومەر سوودی لە یاسای (دەواوین) وەرگرت کە هی فارسەکان بوو، مێژووی کۆچی داهێنا، ئیقتباسیش وەك لە پێشەوە وتمان "سوننەتێکی نەبەوی"و "سوننەتێکی خەلیفەکانی ڕاشیدین"و "سوڵتانە ئیسلامییە" یەك لەدوا یەکەکان بووە.. دەی ئیتر ئەو قسانەی سەرەوەی تۆ چی لیّ بکەین، ئەگەر بیدەینەوە بەسەر خۆتدا، تۆ ئەیدەیتەوە بەسەر کێدا؟**

[٥٢٢] کۆمەڵگا ل ١٣٩.

[٥٢٣] رجال الفکر والدعوة، الندوي/ بەرگی دووەم شێخ الاسلام ابن تیمیە، هەروەها (المدارس الاسلامیة بین الاجحاف والانصاف) اکرام کریم، ص ١٢٥.

# بەشی پێنجەم

# یاخیبوونی هەندێ کەس و گروپ لە دەوڵەتی خیلافەتدا

**فوئاد مەجید میسری هەر لە سەرباسەکەیەوە کە ئەیدات بەم بەشی پێنجەمە بە هەڵەیەکی گەورە دەست پێ ئەکاتو ئەڵێ: "بەشی پێنجەم ڕاپەڕینە جەماوەرییەکانی دژ بە دەوڵەتی خەلافەت"[٥٢٤].**

**یەکەم: ئەوانەی ئەو باسیان ئەکات زیاتر ڕێکخستنی نهێنی بوون نەك ڕاپەڕینی جەماوەری.**

**دووهەم: شتی بچووك بچووك بوون لێرەو لەوێ نەك شتی گەورەو جەماوەری[٥٢٥].**

**سێیەم: بەدەستی بێگانە جوڵێنراون، مامۆستا هەژار وتەنی "کلیلیان لەشوێنی تر بووە"، خۆشت شتێکی وا دەڵێی لەلاپەڕە (١٥٨)دا کە هاوپەیمان بوون لەگەڵ (تیونیل)ی ئیمپراتۆری بێزەنتییەکان.**

**چوارەم: ئەوانە تیایاندا بووە بۆ دینی تریان بۆ "ڕەگەزی تر" کاریان کردووە خۆت ئەڵێی دەربارەی "بابەك" بەلازەری هەر بە کافرو بێ دین ناویان دەبا، تەنانەت یەعقوبیش بە "ڕێگرو چەتەو پیاو کوژ باسیان دەکات"[٥٢٦]،هەر خۆت دەڵێی ئامانجی ڕاپەڕینەکەی!! بابەك زیندووکردنەوەی ئاینی (مەزدەك) بوو[٥٢٧].**

**بەڵام فوئاد میسری لەم بەشەدا بەتایبەتی لەم برگەدا واتە ڕاپەڕینی بابەکی خورەمی، ڕازی نابێت کەس شتێك بڵێت، کە ئەو حەزی لێی نییە! نەقسەی (طبري) قبوڵەو نە قسەی مەسعودی و ئیبن کثیرو بەلازەریو دکتۆر حەسەن ئیبراهیمو نە قسەی هیچ کەسێکی تر بەڵکو ئەیەوێت هەمووکەس هەروەك ئەو بڵێت: بابەكو شۆڕشی بابەکی، ڕاپەڕینی جەماوەری!!و ڕاپەڕینی بەرگ سوورەکان.. هتد، ئەوەتا لە لاپەرە (١٤٨)دا ئەڵێت: مێژوو نووسێکی وەك تەبەری کە زۆر بەدووروودرێژی لە بارەی ڕاپەڕینی بابەکەوە نووسیویەتیو یەك بەیەك شەڕو پێکدادانو چۆنێتی گرتنو پاشان دادگاییکردنی بابەکیش دەگرێتەوە، کەچی بێ سڵەمینەوە تۆمەتی کوفرو لە ڕێوڕەسمی ئاین دەرچوونو بە دڕەوشتی دەخاتە پاڵ ڕاپەڕینەکە، یان دەربارەی مێژوونووسانی تر کە لەسەر بابەك نووسیویانە لە لاپەڕە (١٤٧)دا ئەڵێ: ئەمانە بە حوکمی ئەوەی توێژێکی ڕۆشنبیری سەردەمەکەیان بوون، بەم یان بەو شێوە پەیڕەوی ئایدۆلۆژیای باوی سەردەمەکەیان کردووە.. پڕکێشیان نەکردووە حەقیقەتی دروشمو ئامانجەکانیان وەك خۆی بنووسن نەبا دەسەڵاتداران بە تۆمەتی داکۆکیکردن لە یاخیبووان تاوانباریان بکەن".**

**تۆ با بزانین مێژوونووسان چی دەڵێنو بەڵگەیان چییە لەو قسانەی دەیکەن ئەوجا تۆش وەرە چی لە گیرفانو هەگبەکەتدا هەیە دەری بهێنەو بزانە خەڵکی خوێنەوارو ژیر کامیان ئەکڕنو کڕیاری ئەوەشی ئەمێنێتەوە کێن، ئەو کاتە حەزت لەهەرلایەك بوو بدەرە ئەو لایە خۆت ئازادی، بەڵام گۆڕینی مێژوو لە خوێنەری کورد بۆ کەس ناچێتە سەر، نە تۆو نە جگە لە تۆش.**

---

[٥٢٤] کۆمەڵگا (ل١٤٥).

[٥٢٥] نووسەر خۆی لە ل (١٤٨)دا دەڵێ: دکتۆر حەسەن ئیبراهیم لە سێ بەرگ کتێبی (تأریخ سیاسیی اسلام)دا بێجگە لەوەی هەمان تۆمەتی کوفرو ئیلحاد شوێن بابەك دەخا، ئەوەندەش بێ بایەخانە تەماشای ئەو ڕاپەڕینە مێژووییەی کردووە لە چەند دێڕ نووسین زیاتری پێ ڕەوا نەبینیوە، ئێ باشە کاکە فوئاد خۆ مێژوو بەزەوقو میزاج نییە، یان خۆ ڕۆمان نووسین نییە "جۆرجی زەیدان" ئاسا هەر لە خۆتەوە چیرۆكو مەشهەد زیاد بکەیو بینووسی بۆ ئەوەی شتەکە خۆش دەربچێت!! مێژوو سەنگی مەحەکەو ڕیوایاتە، زیاد پێوە نانی خیانەتەو ئەگەر ئێستاش نەزانرێت زۆر نابا هەر دەرئەکەوێتو ئابڕووی پینەچییەکەی ئەڕوات لە دونیاو ئاخیرەتدا.. لەڕاستیدا وەك ئەنوەر جوندی باس دەکات "ڕیوایەتەکانی جۆرجی زەیدان شتی چنراوی خەیاڵی خۆی زۆری تێ ئاخنیوەو ناویشی ناوە (روایات الاسلام) بەڵام لەناو نووسەرانی میسردا پێی ئەوترێت (روایات جورج زیدان) ڕۆمانەکانی جۆرجی زەیدان!!".

[٥٢٦] کۆمەڵگا (ل ١٤٨).

[٥٢٧] کۆمەڵگا (ل ١٥٦).

# ڕاپەڕینی بابەکییەکان

مێژوونووسان ئەڵێن "لە باکووری ولاَتی فارسداو لە نێوان ئازەربیجان‌و ئاراندا ناوچەیەکی ئاوەدان هەیە پێی ئەوترێت (ئەلبەز) کە ڕووباری ""ڕەشی گەورە"ی پێدا ئەڕوات، بابەك لەم ناوچەیەدا فیتنەیەکی گەورەی هەڵگیرساند کە ماوەیەکی زۆری خایاند لە هەردوو سەردەمی (مأمون)و (معتصم)دا سەرەتای فیتنەکەی لە ساڵی (٢٢١)ی کۆچییەوە دەستی پێکرد کە سەردەمی (مأمون) بوو، درێژەی کێشا تا ساڵی (٢٣١)ی کۆچی کە سەردەمی (معتصم)بوو[٥٢٨]، واتە ئەم فیتنەیە (١٠) ساڵی خایاند[٥٢٩]. ولاَتی فارس لە کۆنەوە بەوە بەناوبانگە کە پڕیەتی لە بیروباوەڕو مەزاهیبی دینی، جیاجیا، پێش هاتنی پێغەمبەریش ﷺ یەکێك لەو تاقم‌و ئایینانەی هەبوون ناویان (خورەمییەکان)[٥٣٠] بوو کە دوو تاقم بوون.

یەکەمیان: خورمییە پێشینەکان (الخرمیة الأولون)و بەرگ سوورەکان (المحمرە)یشیان پیێ ئەوترێت‌و گەورەکەیان ناوی (مەزدەکی کۆنە)ەو فەرمانی پێکردوون کە تا ئەتوانن ڕابوێرن‌و دەست لە خۆشی‌و ڕابواردن هەڵنەگرن‌و بخۆن‌و بخۆنەوەو خۆیان لە یەکتری جیانەکەنەوە، و ژن‌و پیاو پێکەوە ڕابوێرن‌و کەسیان نەبێت بە دیکتاتۆر بەسەر ئەویتریانەوە لە حەلاَڵ‌و ماڵی یەکتردا هاوبەش بن‌و کەسیان ڕیێ لە هاوڕێکەی نەگرێت ئەگەر ئارەزووری خێزانەکەی ئەوی کرد! لەگەڵ ئەمانەدا بڕوایشیان بەخێرو شەڕو خۆ ئەزیەتدان هەبوو، بۆ چوونێکی سەیرو تایبەتیان لە میواندارِیدا هەبوو، کە لەناو هیچ میللەتێکی تردا ئەوە نەبووە، ئەویش ئەوەیە کە هەرکەسیان دەعوەت بکردایە، ڕێگەی هیچ شتێکیان لیێ نەئەگرت کە داوای بکردایە! مەزدەکی ئەخیریش هەر لەسەر ئەم مەزهەبە بوو کە لە سەردەمی (قوبادی کوردی فەیروز)[٥٣١]دا پەیدا بوو، نەوشیروانی گەورەی فارسەکان "پێش ئیسلام" لە هەڵمەتێکیدا بابەك‌و هەرچی موریدو هاوڕێیانیشی هەیە ئەکوژێت‌و کۆتاییان پیێ دێنیێ..

دووهەمیان: (خورەمییە بابەکییەکان)ە کە بەناوی خوڕەمی بابەکی سەر گەورەیانەوە ناویان دەرکردووە، ئەم کابرایە بە شوێنکەوتووانی خۆی ئەوت من خواتانم، گۆڕانکارییەکی زۆری لە مەزهەبی (خوڕەمی)دا دروست کرد، شەڕو تالاَنی‌و کوشتن‌و کوشتارو ئەتك کردنی کوژراوی داهێنا کە لە مەزهەبی خوڕەمی‌دا شتی وا نەبووەو نە ئەکرا[٥٣٢].

(ابن سمعان)یش لە کتێبی (الانساب)دا ئەڵیێ (خوڕەمییەکان یان خوڕەم دینییەکان) بەو تایەفە ئەوترێت لە (باطني)یەکان کە هەرچییان ویست‌و حەزیان لە هەرچی بوو، ئەیکەنە دین بۆ خۆیان، بۆیەش ئەم لەقەبەیان ناوە لە خۆیان، چونکە هەرچی شتی حەرام هەیە بۆ خۆیانیان حەلاَڵ کردبوو، وەك عەرەق‌و لەزەت بردن‌و مارەکردنی خوشك‌و دایك‌و هەرچی لەزەتی پیێ بدایەن، کاتێك گەیشتنە ئەوەی لەم بەرەڵلاییەدا یەکسان بوون بە (مەزدەکییەکان)ی ناو ئاگر پەرستەکان، کە لەسەردەمی (قوباد)دا یاخی بوونیان ڕاگەیاندو ئافرەتیان بە هەموو کەس حەلاَڵ کردو لە هەموو کەسیشیان حەلاَڵ کردو شتی حەرام نەما لە ناویاندا ئەوەبوو نەوشیروانی کوڕی قوباد هەموویانی لەناوبرد[٥٣٣].

بابەکی کوڕی بارام لە لادێیەکدا بەناوی (بلال ئاوا) هاتۆتە دونیاوە، کە جاویدانی کوڕی شەهرەك پاشای شاخی (بەز) ناو دەرئەکات، بابەك پەیوەندی پێوە ئەکات، جاویدان کە ئەبینیێ بابەك کابرایەکی زۆر زیرەك‌و بەشەخسییەت‌و تەڵکە بازە[٥٣٤] لە خۆی نزیککردەوەو کاتێکیش کەمرد ژنەکەی جاویدان ئەیویست (بابەك) بچێتە جێگەی جاویدان بۆیە هەرچی خوڕەمی هەیە کۆی کردنەوەو پێی وتن: جاویدان پێش ئەوەی بمرێت، پێی وتم: من ئەمشەو ئەمرم ڕۆحەکەی منیش کە

---

[٥٢٨] فوئاد مەجید لە لاپەڕە (١٥٧)دا ئەڵیێ: لە (٢٠١)ەوە بۆ (٢٢٢)ی کۆچی خایاند، پێدەچیێ ئەمەیان ڕاستر بێت، چونکە (معتصم) لە ساڵی (٢٢٢)ی کۆچییدا مردووە، (٢٣١)یانی چی؟

[٥٢٩] محاضرات في تأريخ الشعوب والامم الاسلامية (١٩٦/٢).

[٥٣٠] هەمان سەرچاوە (١٩٦/٢).

[٥٣١] قوباد نووسەرە عەرەبییەکان بە (قوباذ) ئەینوسن.

[٥٣٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو (١٩٦/٢)

[٥٣٣] محاضرات في تأريخ الأمم والشعوب الأسلامية (١٩٧/٢).

[٥٣٤] دەقە عەرەبییەکەی ئەڵیێ: (رأى فيه فهما وشهامة وخبثا).

**دەرئەچێت ئەچێتە لەشی ئەم کوڕە خزمەتکارەمانەوە، منیش ئەمەوێت بیکەم بە سەرۆکی تایەفەکەمان، بۆیە کە مردم لەمە ئاگاداریان بکەو پێشیان بڵێ: هەرکەس سەرپێچی ئەم بڕیارەم بکات و شتێکی تر هەڵبژێرێ ئەوە دینی نییە، خەڵکەکەش ئەمەیان قەبوڵ کردو ژنەکەی جاویدانیش شوی کر بە (بابەك)[٥٣٥] دوای ئەوە ئیتر بابەك دەستی دایە چەتەگەری و خەڵك ڕووتکردنەوەو کەمین دانان، یەکەم جار لە ساڵی (٢٠١)ی کۆچیداو لە کاتێکدا کە (مأمون) بە (مروە)دا ئەڕۆشت بۆ بەغداد یەکێك لە سەرکردەکانی بەسوپایەکەوە ناردە سەریان بەڵام نەیانتوانیی تێکیان بشکێنن، پاشان سەرکردەیەکی تری بەناوی عیسای کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبی خالد..و.. تا لە کۆتاییدا (موعتەسەم) ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی موسعەبی ناردە سەریان و بڵاوەی پێکردن و نزیکەی (٦٠) هەزار کەسی لێ کوشتن و ئەوەیشیان مانەوە چونە لای پادشای ڕۆمەکان و ئەویش مووچەی بۆ بڕینەوەو کردنیە لەشکرێکی شەڕکەرو لە هەرکوێدا پێویستی پێیان ببوایە شەڕی پێدەکردن[٥٣٦]، ئەم فیتنەی بابەکیانە تا ساڵی (٢٢١)ی کۆچی خایاندو بەردەوام ڕێگەیان بە خەڵکی دەگرت و ڕووتیان دەکردنەوەو تا ئەوەبوو موعتەسەم سەرکردەیەکی عەسکەری بەتواناو شارەزای لە میللەتی تورك بەناوی (ئەفشین) بە سوپایەکەوە بۆ ڕێك خستن، ئەفشین نەخشەیەکی وردی داناو هاتە (بەرزەند)و سوپاکەی لەوێدا دامەزراند، چەند قولەو قەڵایەکی دروست کردو پاسەوانی بۆ هەموو ڕێگەکان دانا، تا خەڵك و بازرگانەکان ڕووت نەکرێنەوەو هەواڵگرێکی زۆری بڵاوکردەوە بەناوچەکەدا بۆ ئەوەی جوڵەو هەڵسوکەوتی بابەك هەمووی بزانێت.. چەند شەڕێکی بچوك لەنێوانیاندا ڕوویداو تا کۆتا شەڕ سوپای ئەفشین پەلاماری (بەز)یاندا لە هەموو لایەکەوەو ئەوەبوو بابەك و براکەشی بەدیل گیران لەگەڵ حەڤدە پیاوی بنەماڵەکەیداو بردیانە (سامەڕا) لەوێدا بابەکیان کرد بەداراو براکەیشیان نارد لە بەغداد بیکەن بەدارا[٥٣٧].**

**مێژوونووسان ئەڵێن: "ژمارەی ئەوانەی کە بابەك کوشتوونی لەو بیست ساڵەدا بریتییە لە (٢٥٥٠٠) بیست و پێنج هەزارو پێنج سەد کەس و ئەو بەندیانەش کەلای مابوونەوەو لەدەستیان ڕزگاریان کرد بریتی بوون لە (٧٦٠٠)کەس"[٥٣٨].**

**پاش ئەمە با بزانین فوئاد مەجید چی تر لە مێژوونووسانەوە ئەگوازێتەوە، دەربارەی بابەکی خوڕەمی و خوڕەمییەکان، نووسەر دەڵێ: "خوڕەمییەکان باوەڕیان بە موڵکییەتی گشتی زەوی هەبووە"[٥٣٩]، نووسەری کتێبی (الفرق بین الفرق) کە ساڵی (٤٢٩)ی کۆچی مردووە بەناڕەوا هێرش دەکاتە سەر ڕاپەڕینی بابەك و ئەڵێ: "شەوێکیان هەبوو فویان لە چرا دەکردو ژن و پیاو تێکەڵ دەبوون و بێ جیاوازی مومارەسەی سێکسییان کردووە[٥٤٠]".**

**- نوێژکار نەبوون و مانگی ڕەمەزان ڕۆژوویان نەگرتووەو باوەڕیشیان بە جیهادو شەڕکردن لەگەڵ کافراندا نەبووە[٥٤١].**

**- بەلازەریش هەر بە کافرو بێ دین ناویان دەبا[٥٤٢].**

**- "یەعقوب"یش بە ڕێگرو چەتەو پیاوکوژ باسیان دەکات[٥٤٣].**

**- دکتۆر حەسەن ئیبراهیم.. هەر هەمان قسەو باسی مێژوونووسانی پێش خۆی دەڵێتەوە[٥٤٤].**

---

[٥٣٥] محاضرات في تأريخ الشعوب (ج٢/١٩٧).

[٥٣٦] هەمان سەرچاوە لاپەڕە (١٩٨/٢).

[٥٣٧] هەمان سەرچاوە ل(١٩٩/٢).

[٥٣٨] هەمان سەرچاوەو لاپەڕەی پێشوو.

[٥٣٩] کۆمەڵگا، ل (١٤٧)، هەروەها ابن کثیر لە (البدایة والنهایة)دا هەمان قسە لە زمانی (ابن الجوزي) و (ابوبکر الباقلاني)یەوە ئەگێڕێتەوە.

[٥٤٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٤١] کۆمەڵگا، ل ١٤٧.

[٥٤٢] کۆمەڵگا، ل ١٤٨.

[٥٤٣] کۆمەڵگا، ل ١٤٨.

[٥٤٤] کۆمەڵگا، ل ١٤٨.

. وەنەبەێت شاعیرانیش وەك بەشێکی ئەو توێژە ڕۆشنبیرە دەوریان لە مێژوونووسان کەمتر بووبێ.. ئەوانیش بۆ شێواندنی حەقیقەتی ڕاپەڕین و زڕاندنی ناوی سەرکردەو ڕابەرەکانیان دریغییان نەکردووە[545].

چەند نموونەیەکی شیعری (بوحتوری و عەلی کوڕی جەهم و ئەبو تەمام) ئەهێنێتەوە لە باسی خراپی بابەکییەکاندا.

. هەندێ توێژەرەوەی ئێرانی بابەك دەکەنە شۆڕشگێڕی نەتەوەیی و گوایە ئالای ڕزگارکردنی ئێرانی لە دژی خەلافەتی عەبباسی و دەسەلاتی عەرەب بەرز کردۆتەوە[546].

دروشمەکانی بریتیبوون لە: ڕزگارکردنی جوتیاران و دابەشکردنی زەوی و پەیرەوکردنی یەکسانی و سەرنگومکردنی پایەکانی دەوڵەتی خەلافەت[547].

. ساڵی (٢١٨)ی کۆچی ژمارەیەك لە چیاییەکانی هەمەدان و ئەسفەهان و ماسبەزان چوونە سەر (ئاینی بابەك)[548].

. هاوسەرەکەی جاویدان پاش مردنی مێردەکەی (بابەك) دەکاتە سەرکردەی بزووتنەوەکەو ڕایدەگەیەنێت کە (ئاینی مەزدەك) زیندوو دەکاتەوەو خەڵکی هەژارو بێ نەوا لەو دۆخە ناهەموارە ڕزگار دەکا[549].

. فوئاد مەجید میسری پاش ئەوەی باسی گرتن و کوشتنی (بابەك) ئەکات، ئەڵێ: بەو جۆرە پەردە لەسەر بزووتنەوەیەکی مەزنی جەماوەری!!و ژیان و بەسەرهاتی ڕێبەرو سەرکردەیەك تەختی خەلافەتی عەبباسی هێنایە لەرزە دادرایەوە[550].

جا خوێنەرانی بەڕێز ئەوە حەق وتنە یان ناهەقی وتن! ئێمە نووسەر ئەدەینە دادگای ئێوەو بزانن چەند هەقیەتی، تاقمێکی گێرە شێوێنی چەتەو بەرەڵڵای وەك بابەکییەکان بەشۆڕشگێڕو ڕاپەڕینی جەماوەری بداتە قەڵەم و گلەیی بکات لەوەی بۆچی مێژوونووسانیش وەك ئەمیان نەوتووەو عەیب و عاری ئەو (پاڵەوانەیان)! دەرخستووە، بەڵام من تەنیا یەك تێبینی ئەدەم بەنووسەر خۆی، ئەویش ئەوەیە: لە هەموو دین و مەزهەب و فیکرو دەوڵەتێکدا هەندێ هێڵی سوور هەیە، بە هیچ شێوەیەك بەزاندنی ڕێگەی پێ نادرێت، هەرکەسیش ئەو هێڵە سوورانە ببەزێنێت پێویستە لێپرسینەوەی توندی لەگەڵدا بکرێت بەتایبەتی کاتێك سووربێت لە سەری و بە حیوارو گفتوگۆ دەستی لێ هەڵنەگرێت..

دین هێڵی سوورە، نامووسی خەڵکی هێڵی سوورە، ئازادی خەڵکی لە موڵکییەت و بازرگانی و گەشت و گوزاردا هێڵی سوورن، کلك گرێدان لەگەڵ بێگانەدا بەزاندنی هێڵی سووری ئەمنیەتی دەوڵەتە.. دەوڵەت ئەبێت پاسەوانیان بێت، جا هەرکەس هەستاو حەزی لە هەرچی کرد پەتی بۆ شل بکرێت، ئیتر سودی دەوڵەت و یاساو دامەزراوە چییەو بۆچی ئەبێت ببێت؟ بەرژەوەندی گشتی کەی بەرقەرار ئەبێت کە بەرژەوەندی فلان و فیسار پێی پێدابنێت و بیخاتە ژێر کەوشەکانییەوە.. ئەمەش ئەو نیهێنییەیە کە چەند جارێك دووبارەم کردۆتەوە ئەویش ئەوەیە فوئاد مەجید میسری نە خۆی بیرکردنەوەی حکومەتیانەی هەیە، نە لەبیرکردنەوەی حکومەتیانەش تێدەگات و ئەیسەلمێنێت..

## ڕاپەڕینی زنجەکان[551]

فوئاد میسری هەر لەسەرتاوە زۆر هەوڵ ئەدات بەشان و باڵی ئەم زنجانەدا هەڵبدات و باس لە چالاکیی و پەلاماردان و گرتنی ئەم شارو ئەو شاریان دەکات و هۆی ئەم سەرکەوتنەیشیان ئەگەڕێنێتەوە بۆ ڕەوایی کێشەکەیان، پشتیوانی خەڵکی بۆیان، لاوازی دەوڵەتی خیلافەت، سەربازی هەڵهاتووی دەوڵەتی خیلافەت[552]، پاش ئەمانە یەکسەر ئەڵێ: "ڕاستە

[545] کۆمەڵگا، ل ١٤٩.

[546] کۆمەڵگا، ل ١٥١.

[547] کۆمەڵگا، ل ١٥١.

[548] کۆمەڵگا، ل ١٥٤.

[549] کۆمەڵگا، ل ١٥٦.

[550] کۆمەڵگا، ل ١٦٤.

[551] هەرچەندە فوئاد میسری هەر بە (زەنگ) ناویان ئەبات.

[552] کۆمەڵگا، ل ١٧٠ ـ ١٧١.

کەسیش نکوڵی لەوە ناکات کە سەرکردەی ڕاپەڕین کەسێکی ئێرانی بووە، بەڵام ڕاپەڕینی کۆیلە پێکهاتەیەکی نەتەوەیی نەبووەو ناشبێ بە ڕاپەڕینێکی ئێرانیانە لە قەڵەم بدرێ، وەك ئەوەی تویژەرەوەیەکی هاوچەرخ بۆی چووە"[553]، فوئاد میسری هەر خۆی بەم شێوەیە (بیروباوەڕو فیکری زەنگ) ئەناسێنێو ئێمە ئەیکەینە خاڵبەندی:

١. ئەمانە تاقمێکی سەر بە (خەوارج) بوون، (مەسعودیش) هەر پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە عەلی موحەممەدی بورقوعی (ڕێبەری زەنگییەکان) سەر بە خەواریج بووە[554].

٢. ئامانجەکانی ئێرانی بووە.

٣. هەوڵی بۆ تێکدانی ئاین بووە (خواجە نیزامولملك) دەڵێ: "ئاینی عەلی کوڕی موحەممەدی بورقورعی لە هەموو ڕوویەکەوە وەك "مەزدەك"و "بابەك"و "قەرمەتیان"و "زەکەریای ڕازی" بووە"[555]، هەروەها دەڵێ: "پێدەچێ ڕێبەری کۆیلە نەیتوانیبێ بە ئاشکراو بێ پەردە بیروڕای خۆی لەمەڕ مەسەلەی ئایین دەرببڕێ، بۆیە هەر جارەی بەجۆرێك مەزهەبی خۆی نیشان داوە"[556].

٤. ئەم بزووتنەوەیە خاوەنی فیکر نەبوون، تەنیا پەلاماردانو چەتەییان زانیوە، فوئاد میسری خۆی دەڵێ: "ڕاستە ڕێبەری ڕاپەڕین ڕۆشنفکربووە، بەڵام لە ئاستێکدا نەبووە بنەمایەکی فیکریو سیاسیی بۆ ڕاپەڕیوان داڕێژێ، ئەو هەر ئەوەندەی بەس بووە، کە هەزاران هەزار[557]! کۆیلە ئامادەی فیداکاریو خۆبەختکردنن، هێرشیان دەکردو پەلاماریان دەدا بەبێ ئەوەی لە هیچ شتێكو هیچ هێزێك بگەڕێنەوە"[558].

٥. خەلیفە عوسمانو عەلیو هەموو هاوەڵانیان بەکافر داناوە، نووسەریش ئەڵێ: ئەمانە نەفرەتیان لە عوسمانو عەلیو نەوەی ئەبو موسای ئەشعەریو عەمری کوڕی عاس کردووە ئەڵێ: "شتێکی شاراوەش نییە کە خەوارج بە هەموو لقەکانیەوە دژی عوسمانو عەلی بوونو تەنانەت شەڕیشیان لە دژی عەلی بەرپاکردووە.."[559].

نووسەر لە لاپەڕە (١٦٥)دا دەڵێ: "ساڵی (٢٥٥)ی کۆچی کۆیلەکانی خوارووی عێراق لە پێناوی چاککردنی باری ژینو نەهێشتنی کۆیلەدا ڕاپەڕینێکی مەزنیان دژی دەوڵەتی خیلافەت بەرپار کرد"، کەچی لەلاپەڕە (٧٨)دا ئەڵێ: "هەڵەیەکی تریش کە ڕاپەڕین تێی کەوت ئەوەبوو بانگەوازی بۆ گۆڕکردنی کۆیلایەتی نەکرد..، کۆیلە خۆشیان لە باری کۆمەڵایەتییەوە هۆشیارییەکی ئەوتۆیان نەبووە". ئەوەی تێبینی ئەکرێ ئەم تاقمە یاخیبووانە هەموو جارێ شوێنێکی عاسیو قایمیان هەڵبژاردووەو تێیدا مۆڵیان داوەو ئیتر دەستیان داوەتە چەتەییو ڕێگریو خەڵك گرتن بە بارمتەو ئەسیر.. ئەوەتا بابەکییەکان (٦٧٠٠) ئەسیریان لەو شاخانەدا گیردابوو، زنجەکانیش هەروەها ئیبن کەسیر لە (البداية والنهاية)دا کە باسی تێکشکاندنی زنجییەکان ئەکات لە (مەنیحە)دا ئەڵێت: ".. پێنج هەزار ئافرەتی موسڵمانیان ڕزگارکرد لە دەستیانو ناردنیانەوە بۆ ناو کەسوکارەکانیان بۆ (واسط)"[560]. پاشان ئەڵێ: "لە شاری (المنصورة)شدا کە ڕێبەری زنجییەکانی لێبوو (١٠) هەزار ژنو[561] منداڵی مسوڵمانی لە خەڵکی بەسرەو کوفە ڕزگار کرد ناردنیەوە بۆ ناو ماڵو منداڵی خۆیان"، خوا جەزای بەخێر بداتەوە[562]، ئیبن کەسیر شتێکی زۆر خۆشو بەمانا باسدەکات) کە دیارە بە دڵی فوئاد مەجید نییە بۆیە خۆی لێ نەداوە، ئیبن کەسیر ئەڵێت: پاش گرتنی شارەکە ئەبو ئەحمەدی موەفەق سەرکردەی سوپای

---

[553] کۆمەڵگا، ل ١٧١، مەبەستی نووسەر (عەلی میر فطروس)ە کە باوەڕی وایە ڕاپەڕینی "زەنگ" ڕاپەڕینی میللی ئێرانیانە.

[554] کۆمەڵگا، ل ١٧٤.

[555] کۆمەڵگا، ل ١٧٦.

[556] کۆمەڵگا، ل ١٧٦.

[557] نووسەر هەر هەمیشە بەو سەخاوەتییە ژمارە لێدەدات.

[558] کۆمەڵگا، ل ١٧٨.

[559] کۆمەڵگا، ل ١٧٤.

[560] البداية والنهاية (١١ ـ ٤٩).

[561] لە پەراوێزدا (ناشر)ە کەی نووسیویەتی (لە ئیبن أثیر)دا ئەڵێ: بیست هەزار (١١ ـ ٤٨).

[562] هەمان سەرچاوە (٤٨/١١).

**مسوڵمانان. فەرمانیدا بە ڕووخاندنی مۆڵگەو بارەگاکانیان و حەقدە ڕۆژ لەوێدا ئەمێنێتەوەو کۆمەڵێك ئەنێرێت بەدوای هەموو ئەوانەی هەڵاتوون کە بە هەرکەسێك ئەگەیشتن بە زمانێکی شیرین و نەرم و نیانەوە دڵیان کەمەند کێش ئەکردەوە بۆ لای هەق، هەرکەس قەبوڵی بکردایە ئەوە زیاد ئەکرا بۆ لای سوپایەك و ئەوەشی دەستی بکردایەتەوە ئەگیرا یان ئەکوژرا، مەبەستی ئەبو ئەحمەد گەڕانەوەی ئەو خەڵکە بوو بۆ لای دین و بۆ لای هەق.. لە پاشاندا نامەیەکی نووسیی بۆ ڕێبەری زنجەکان (خوا ڕووی ڕەش بکات)[٥٦٣]، تا تۆبەی خۆی ڕابگەیەنێت لە ئەو هەموو شتە ناڕەوایانەی کردوویەتی وەك گوناهی ئاشکراو زوڵم لە خەڵکی و حەرامخۆری و خۆ بە پێغەمبەر زانینەکەی و وڵات وێران کردن و حەڵاڵ کردنی ئافرەتی خاوەن مێردو "ئەمان"یشی پێدا ئەگەر پەشیمان ببێتەوەو دەست لەو شتانە هەڵبگرێ، کە چی ڕێبەری زنجەکان هیچ وەڵامێکی نامەکەی ئەبو ئەحمەدی موەفەقی نەدایەوە[٥٦٤]. وەك سوکایەتی پێکردنێك بۆی، ئەبو ئەحمەدی موەفەق بڕیاریدا بە پەنجا هەزار شەڕکەرەوە بچێتە سەری و ڕووی کردە شاری (المختارة) کە ڕێبەری زنجان خۆی تێدا قایم کردبوو، سەیر ئەکات قایمکاریی زۆری کردووە بۆ شارەکەو خەڵکی زۆریشی تێ ترنجاندووە، ئەمیش گەمارۆ ئەخاتە سەری لە (١٥) شەعبانی ئەو ساڵەدا (واتە ساڵی ٢٦٧)ی کۆچی ئاگادارییەکی بڵاو کردەوە کە هەموو کەس بەر لێبوردن ئەکەوێت تەنیا ڕێبەری زنجەکان نەبێت، ئەمە وایکرد خەڵکێکی زۆر ڕێبەری زنجیان بەجێهێشت و هاتنەوە لای ئەبو ئەحمەدی موەفەق[٥٦٥]، ئەم گەمارۆدان و هەوڵی بێهێزکردنەی موەفەق بۆ ڕێبەری زنجییەکان درێژەی کێشا تا ساڵی (٢٧٠)ی کۆچی ئەو شارەشی لە دەست سەندووەو ئەوەبوو ڕێبەری زنجییان ڕای کرد بۆ شارێکی ترو ئەبو ئەحمەد هەر بە دوایدا ڕۆی و لەوێش دەری پەڕاند بەسەر شۆڕی و زەلیلی، پاشان شەڕێکی سەروماڵی تر ڕوویدا لە نێوانیاندا کە شەڕەکە تەواوبوو یەکێك مژدەی ئەوەی هێنا کە ڕێبەری زنجەکان کوژراوەو کەللەکەیان هێنایەوە بۆ (موەفەق) کاتێك کە دڵنیابوو ئەمە کەللەی عەلی کوڕی موحەممەدی بورقوعییەو فەرماندەو سەرکردەی سوپاکەی شایەتییاندا وەك (ئیبن کثیر) ئەڵێت: "موەفەق سوجدەیەکی شوکری برد بۆ خواو گەڕایەوە بۆ شاری (موەفەقییە)"[٥٦٦].**

**ئەمە سەربوردەی زنج و ڕێبەری زنجیان بوو کە فوئاد میسری لە خوتوو خۆڕایی ئەیەوێت لە خەڵکی کوردی بکاتە پاڵەوانێکی بێ وێنە کە دژ بە ئیسلام و دەوڵەتی خیلافەت شۆڕشی کردووەو هەستاوە، ئەگەر عەلی کوڕی موحەممەدی بورقوعی پیاوێکی ئێرانی بووبێت و هەوڵی بۆ تێکدان و سەرنگومکردنی دەسەڵاتی ئیسلام و عەرەب بووبێت، ئەوە بە فوئاد مەجید میسری چی؟! کێ ڕای سپاردووە کە باس لە نەبەردییەکانی فارس و ئێران بکات و پیاوەکانیان بە (پاڵەوان)و یاخی بوونەکانیان بە (شۆڕشی جەماوەری و چی و چی) بداتە قەڵەم؟! یاخوا ئەم ماستە مووی تێدا نەبێت و کاسەیەکی بێ ژێرکاسە بێت.. ئەگینا یانی چی ئەم نووسەرە ئەیەوێت کورد بهێنێتە گریان بۆ هەرەسی دەوڵەتی فارسی ساسانی و تێکشکاندنی دەوڵەتی بێزەنتی ڕۆمیی!!**

---

[٥٦٣] "ئیبن کەسیر ئەڵێ: وکتب الموفق الی صاحب الزنج قبحه الله کتابا (١١/٤٨)".

[٥٦٤] البدایة والنهایة (١١/٤٨).

[٥٦٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٦٦] ئەو شارەبوو کە لە بەرامبەر (مەنسور)دا دروستی کرد بۆ ئەوەی شەڕی خوێنڕێژی (استنزاف) بکات لەگەڵ زنجەکاندا (ابن کثیر، ١١/٤٩) ئەوەبوو لە پاشاندا شارەکەش بوویە مەڵبەندێکی گەورە بۆ بازرگانی و هاتووچۆی خەڵکی.

## بزووتنەوەی قەرمەتییەکان

فوئاد مەجید میسری ئەم باسی قەرمەتیانە لە لاپەڕە (١٨٠)ی کتێبەکەیەوە تا لاپەڕە (٢٠٠) لەسەریان ئەڕوات و ئەوەی کەلای مێژوونووسان و لای تاقمە گومڕاکان و لای شیعەو لای عەقڵ و لای دین قەبووڵ نییە ئەو قەبووڵی کردووەو هێناویێتیی.

فوئاد میسری سەرسامی خۆی بە قەرمەتییەکان دەردەبڕێت، ئێمە بە چەند بڕگەیەك کورتەی ئەو قەناعەتەی ئەنووسین پاشان بیروباوەڕو حەقیقەتی ئەم قەرمەتییانە ئەنووسین وەك مێژوونووسان دەیڵێن:

. لە لاپەڕە (١٨٠)دا ئەڵێ: "دوای شکستخواردنی ڕاپەڕینی زەنگ! خەڵکێکی زۆری قەرمەتی کە لەو ڕاپەڕینەدا هاوبەشییان کردبوو مەشقی سەربازییان پێدرابوو، گەڕانەوەو پەرەیاندا بە بزووتنەوەکەی خۆیان"[٥٦٧].

. قەرمەتییەکان باڵێکی ڕادیکاڵی ناو بزووتنەوەی ئیسماعیلی بوون و پاشان لێیان جیابوونەتەوە[٥٦٨].

. قەرمەتییەکان هەرگیز ناوی ڕێبەرو پێشەوای خۆیان بەزمانیاندا نەهاتووە هەواداران و لایەنگرانی بزووتنەوەکە نەیانزانیوە کێ سەرکردەو ڕابەریانە[٥٦٩].

. نووسەر بە عینادییەکی سەیرەوە ئەڵێ: "بیروڕای سیاسیی و فەلسەفی قەرمەتییەکان لە هەر کوێوە سەرچاوەی گرتبێ!! هیچ لەو حەقیقەتە ناگۆڕێ کە ئەو بزووتنەوەیە بە مەبەستی هێنانە کایەی سیستەمێکی دادپەروەرتر سەرەتا بەنهێنی کاری کردووەو پاشان بووەتە بزووتنەوەیەکی جەماوەری ڕەگ و ڕیشە داکوتراو"[٥٧٠].

. "حسەین کوڕی مەنسوری حەللاج و چەند کەسایەتی دیکەی هۆشیاری ناو کۆمەڵگەی ئیسلام بەنهێنی پەیوەندییان بەم بزووتنەوەیەوە کردووەو بۆ سەرخستنی دروشمە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکانی تێکۆشاون"[٥٧١].

. تا ئەمڕۆ مێژوونووسان بە تەواوی بۆیان ساغ نەبووەتەوە ئاخۆ یەکەمین ڕێکخراوی قەرمەتیان کێ و چۆن پێکی هێناوە[٥٧٢].

. هەر هەوادارێك دەبوو ساڵانە دینارێك ئابوونەوە بدات.. بێجگە لە ئابوونەی ساڵانە داواشی لە هەوادارانی کرد پێنج یەکی سامان یاخود داهاتی خۆیان بدەنە سندوقی بزووتنەوەکەیان[٥٧٣].

. نووسەر ئاگای لەوە نییە کە ئەنجومەنی زنجیەکان لە شەش کەس پێکهاتبوون و ئەمەی قەرمەتییەکانیش هەر لە شەش کەس پێکهاتبوون[٥٧٤]، کە ئەم ژمارە شەشە دەلالەتی تایبەتی خۆی هەیە لە فکری یەهودییەتدا[٥٧٥].

. کە باسی (ئەبو سەعید جەناب)یش ئەکات کە یەکێك بووە لە ڕێبەرانی قەرمەتییان، ئەڵێ: "گوێی بە جیاوازی ئایین و ڕەگەز نەدەدا.. ئامۆژگاریشی ئەکردن کە خۆشگوزەرانی شتێکە دەبێ لەم دونیایەدا بەدەست بهێنرێت"[٥٧٦].

. نووسەر باسی شەڕو پەلاماردان و تاڵانییەکانی قەرەمەتییەکان ئەکات، بۆ نموونە لە لاپەڕە (١٩٢)دا ئەڵێ: "ڕێگەیان لە حاجیان گرتووەو ماوەی چوونە مەککەیان نەداوە". لە لاپەڕە (١٩٣)یشدا ئەڵێ: "دوای ئەوەی چوونە ناو مەککە لەسەر

---

[٥٦٧] کۆمەڵگا (ل١٨٠).

[٥٦٨] کۆمەڵگا (ل ١٨١).

[٥٦٩] کۆمەڵگا (ل ١٨٢).

[٥٧٠] کۆمەڵگا (ل ١٨٢).

[٥٧١] کۆمەڵگا (ل ١٨٢).

[٥٧٢] کۆمەڵگا (ل ١٨٢).

[٥٧٣] کۆمەڵگا (ل ١٨٣).

[٥٧٤] کۆمەڵگا (ل ١٨٥).

[٥٧٥] یەهود ئەڵێت: خوا زەوی و ئاسمانەکانی لە شەش ڕۆژدا دروستکردو ڕۆژی حەوتەم خوا ماندوو بوو، پشووی تێدا داوە کە ئەکاتە ڕۆژی شەممە، بۆیە شەممە پشووی ڕەسمی جولەکەیە، ئەوەش دیارە بە شێوەیەك یان زیاتر جولەکە دەستی بووە لە ناویاندا وەك لەدواوە ڕوونتر باسی دەکەین.

[٥٧٦] کۆمەڵگا (ل ١٩١).

شەقام و لەناو کۆڵانەکاندا (سێ هەزار) حاجییان کوشتووە ئەمە بێجگە لەوانەی بە دیلیان گرتوون و لە برسانا مردوون.. دووهەمجاریش کە بەو هێزە گەورەوە پەلاماری مەککە ئەدەن و شەش ڕۆژ لەوێ دەمێننەوەو لەو ماوەیەدا کەس نەیتوانیوە هیچ ئەرکێکی ئاینی بە جێ بهێنێ و (٣٠) هەزار حاجیشیان کوشتووەو بیری زەمزەمیان پڕکردۆتەوەو بەردەشەڕەکە (حجر الاسود)[٥٧٧]یان لە بن و بێخ دەرهێناوە..".

لە لاپەڕە (١٩٤)یشدا ئەڵێ: ".. پاشان پەلاماری کوفەیان داو تاڵانیان کرد".

. نووسەر لەلاپەڕە (١٩٦)یشدا باسی خۆڕاگری و قارەمانێتیی ئەم حاجی کوژانە ئەکات و سەری لە خۆڕاگرییان سوور دەمێنێ و ئەڵێ: ".. قەرمەتییان توانیویەتی سەدەو نیوێك بە پێوە خۆی ڕابگرێ و ببێتە خاڵێکی درەوشاوە لە مێژوودا!!".

هەر نووسەر خۆی دەڵێ: ".. گوێ نەدانیان بە پیرۆزی مەککەو خانەی خوداو قیبلەی مسوڵمانان بەو جۆرەی لە پێشەوە باسکرا، بە ئاشکرا دەری دەخات ئەوانە بیروڕای کۆمەڵایەتییان دووربووە لە ئاینی ئیسلام"، نووسەر لە خەڵکی ترەوە شت ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: "لە نێوان قەرمەتیان و ڕەوتی کۆمەڵایەتی مەزدەکیان و بابەکیان پەیوەندییەکی پتەو هەیە.. لەسەرەتای دروستبوونیاندا خۆیان وا نیشان داوە سەر بە ئیسماعیلیانن، بەڵام لە قۆناغێکی تردا، بە کردەوە نەك هەر پشتیان لەو ڕێبازە بەڵکو لە ئاینی ئیسلام کردووە"[٥٧٨].

ڕاشکاوانەتر لە لاپەڕە (١٩٧)دا ئەڵێ: "خواکردن بە عەقڵ و عەقڵکردن بەخوا بواری نەداون ئەرکە ئاینییەکان بەجێ بهێنن و دەستبەرداری (طقوس)ی ئاینی بوون و مەسەلەی "حەج" و "نوێژ" و "ڕۆژوو"یان ڕەت کردۆتەوەو بۆ هەریەك لەو ئەرکانە (تأویل)ێکیان کردووە"، لە لاپەڕە (١٩٨)یشدا ئەڵێ: "هەڵوێستیان لە حەرامکردنی هەندێ خۆراك و حەڵاڵکردنی هەندێکی تر بە پێچەوانەی ڕێو ڕەسم و یاساکانی ئاینی ئیسلامەوە بووە..".

. نووسەر وەك ئەوەی ئاگای لێ نەبێ خۆی لە پێشەوە چی وتووە، بە دڵنیاییەکەوە ئەڵێ: "تا ئەمڕۆ هیچ سەرچاوەیەکی مێژوویی پرکێشی ئەوەی نەکردووە، تۆمەتی چەوساندنەوەی جەماوەری بخاتە پاڵ دەوڵەتی قەرمەتیان"[٥٧٩] ئەی باشە گۆشتی (٣٠) هەزار حاجی هەژاری بێ چەك و پەشتەماڵ لەبەرچییە؟ چەوسانەوەیان خەڵات و بەراتە؟! بەدیلگرتنی حاجی و خەڵك و نان پێنەدانیان تا لە برسا ئەمرن چەوسانەوە نییە؟ هەر خۆت بۆ نەگبەتی خۆت سێ لاپەڕە پێش ئەم حوکمە نارەوایەت باسی سەرچاوەکانی دارایی قەرمەتیان ناکەی کە ساڵانە "خومسی" داهاتی خەڵکیان وەرگرتووە[٥٨٠] و باج و سەرانەیان لە خەڵك سەندووەو.. خۆت ناڵێی سەرچاوەی تری دارایی دەوڵەت بریتییە بووە لە:

. باجی کەشتیوانی.

. باجی سەر دانیشتوانی عوممان.

. باجی سەر ئەو حاجیانەی ساڵانە بۆ مەککەو مەدینە دەچوون.

. باجی سەر ئەوانەی لە دەریادا ڕاوی مروارییان کردووە. ئەمە بێجگە لەو باجانەی بەسەر هەندێ ناوچەی خوارووی عێراقیاندا سەپاندبوو! داهاتی بەروبوومی کشتوکاڵی ناوچە کشتوکاڵیەکانی بەحرەین خۆشی[٥٨١]... باشە ئەمانە چین؟ گوڵ و ڕیحانەو دادی کۆمەڵایەتی و یەکسانی وخۆشی خەڵاتە یان زوڵم و زۆرو چەوساندنەوەو لەناوبردنی (دین) و ئەخلاق و خۆشی ژیانە.. لەم دەقانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە قەرمەتییەکان چ دەعبایەکی سەیرن، وا فوئاد میسری عاشقیان بووە،

---

[٥٧٧] نووسەر بەو شێوەیە (حجر)ی بەبێ ئەلیف و لام نووسیوە، کە هەڵەیەو ڕاستییەکەی (الحجر الأسود)ە.

[٥٧٨] کۆمەڵگا (ل ١٩٦).

[٥٧٩] کۆمەڵگا (ل١٩٨).

[٥٨٠] واتە: هەموو پارەدارێك پێویست بووە ساڵانە یەك لەسەر پێنجی داهاتەکەی بداتە قەرمەتییەکان!!

[٥٨١] کۆمەڵگا (ل١٩٥).

* ئیسماعیلییەکان: تاقمێکن لە شیعە باتنیەکان و خۆیان بە شوێنکەوتەی ئیسماعیلی کوڕی جەعفەری سادق ئەزانن و بڕوایان بە حەوت ئیمام هەیە نەك دوانزە ئیمام، زۆربەی دەستە شیعە مەزهەبەکان لە منداڵدانی ئەمانەوە هاتوونەتە دەرەوە، وەك: قەرمەتیەکان، فاتمیەکان، حەشاشینەکان، ئاغاخانیەکان،... سەرچاوەن بۆ زۆربەی بیروباوەڕە توندەکان وەك: جێگۆڕکێکی گیانەکان( تناسخ الارواح)، قسە لە بوونی خواو لە نەبوونی خوا ناکرێت، خومس ئەدەن بە ئیمامی مەعسوم، هەموو شتێك بۆیان حەڵاڵە.. بڕوانە: الموسوعة الميسرة، ١/٤٥.

کورتەی قەناعەتو ڕاوبۆچوونی نووسەر لەسەر قەرمەتییەکانو بیرو باوەڕیانو دەوڵەتەکانیان کورت ئەبێتەوە لەم خاڵانەدا:

١. دان ئەنێت بەوەی کە مەزدەکیو ئێرانی نەشئەت بوون، لە لاپەڕە (١٩٧)دا ئەڵێ: "قەرمەتیات هەڵسوکەوتیان لە سۆسیالیزمەوە نزیك بووەو لەوانەیە پەیڕەوی باوەڕی مەزدەکیان کردووە، یان هەر ئەو مەزدەکیانە بوون کە لە سەردەمی ساسانییەکاندا بە نهێنی لە هەمان ناوچەدا ژیاونو ئەمجارە بەناوێکی دیکەوە سەریان هەڵداوەتەوە".

٢. زۆرترین ئەفکاری (ئیسماعیلییەکانیان)* پێ بووە، بڕوا بوون بە ئیمامی مەعصوم، وەرگرتنی خومس، هێنانی (الحجر الأسود) بۆ کوفەو بۆ دەوڵەتی خۆیان، زیارەتی ئیمام بریتیی بووە لە (حج))لایان. (کۆمەڵگا، ل ١٩٧).

٣. تاقمێکی بەرەڵاو ئیباحی بوونو حەڵاڵو حەرامیان لانەبووە. (ل ١٩٨).

٤. خەریکی ڕاوو ڕووتو تاڵانو بڕۆ بوون بە بەردەوامیو باج و سەرانەی ناڕەوایان لە خەڵكو لە حاجیانی ماڵی خوا وەگرتووە. (ل ١٩٥).

٥. زۆر (بەربەری)و (دڕندەو خوێنڕێژ) بوونو لە زەتیان لە کوشتنی خەڵکی بینیوە با حاجی ماڵی خواش بووبێت. (١٩٢).

٦. لە (ئیسماعیلییەکان) جیابوونەتەوە، کە ئەم ئیسماعیلیانە لای شیعەش کافرنو دوای ئەم جیابوونەوەیە ئەوەندی تریش بەرەڵا بوون. (ل ١٨١).

هەرچەندە هەر ئەمەی فوئاد مەجید میسری دانی پێدا ناوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەمانە (هێزی نەیار) نەبوون لە ناو دەوڵەتی خیلافەتداو خاوەنی هیچ مەشروعێکی ئیصلاحیش نەبوون، ئەوە نەبێت تاقمێکی "فرسەت تەڵەب" بوون، بەدوای بەرەڵڵاییو تاڵانو فیتنەو چەتەییدا گەراونو دەستێکی پیس لە پشتیانەوە جوڵاندوونیو بەری داونەتە گیانی خیلافەتی ئیسلامی کە دەیان زاڵمو دونیا خۆری وەك (کیسرا)و (قەیسەری زاڵمی ڕۆمی)دا بەدەست مەزلومانەوە تا ئەوەی بە زوڵم پێکیانەوە نابوو، مەزلومان بە داد لێیان بسەننەوە.. بەڵێ هەرچەندە ئەمەی نووسەر خۆی بەسە، بەڵام با هەرهیچ نەبێت پێناسەیەکی کورتی ئەم قەرمەتیانە بکەین: ئیبن کەسیر باسی ڕووداوەکانی ساڵی (٢٨٧)ی کۆچی ئەکاتو ئەڵێت: (لەم ساڵەدا تاقمی قەرمەتییان دەستیان دایە جموجوڵ، قەرمەتییەکان تاقمێك مولحدو "زندیق"[٥٨٢] بوون کە بەشوێن فەلسەفەی فارسەکاندا ئەڕۆشتین کە بڕوایان بە پێغەمبەرایەتی "مەزدەك"و "زەردەشت" هەبووە کە بە بیروڕای ئەو دوانە شتە حەرامەکان حەڵاڵن بۆیان، پاشان هەر ئەمان بوون کە بوونە شوێنکەوتەی هەموو زووڕنالێدەرێك بۆ بێ دینی، بەزۆری لەلایەن شیعەی دوانزە ئیمامییەوە تەحریك ئەکرانو گەندەڵ ئەبوون، لە ڕێگەی بیروڕاکانی ئەوانەوە ئەچوونە ناو بەتاڵو خورافات، لەبەر ئەوەی لە هەموو کەس بێعەقڵتر بوون.. ئەم تاقمە پێشیان ئەوترێت (ئیسماعیلییەکان) لەبەر ئەوەی ئیسماعیلی ئەعرەجی کوڕی جەعفەری صادق-یان بەهی خۆیان ئەزانی.. پێشیان ئەوتن (قەرمەتییەکان) لەبەر ئەوەی "قەرمەتی کوڕی ئەشعەثی گاوان"[٥٨٣]یان بە گەورەی خۆیانی ئەزانی.. ئەڵێن: سەرۆکەکەیان لەسەرەتای کارەکەیدا فەرمانی بە شوێنکەوتەکانی ئەکرد کە پەنجا نوێژ لە شەوو ڕۆژێکدا بکەن تا سەرقاڵیان بکات بە نوێژکردنەوەو نەیانپەرژێتە سەر ئەوەی ئەم بەرنامەی ئەم چییەو خەریکی چ فیڵ و تەڵەکەبازییەکە، پاشان دوانزە نەقیبی داناو ڕێبازێکی بۆ شوێنکەوتوانی دانا ئەویش ئەوەیە بانگەشە بۆ ئیمامێك بکەن لە ناو (ئەهلی بەیت)دا.

پێشیان ئەوترێت باتنییەکان: چونکە لە ئاشکرادا شیعەی ڕافزی بوونو لە ناخدا کافری ڕووت بوون،

- خوڕەمیو بابەکیشیان پێئەوترێت..

- بەرگ سوورەکانیشیان پێ ئەوترێت، چونکە بۆ ئەوەی لە عەبباسییەکان - کە بەرگی ڕەشیان ئەپۆشی - جیا بکرێتەوە، ئەمانە بەرگی سووریان ئەپۆشی.

---

[٥٨٢] زندیق: بریتییە لە کەسێك لەناخەوە بڕوای بە هیچ دینێك نییە، بە دەمیش ڕێز لە دین ئەگرێت، بەڵام بۆ بەتاڵکردنەوەی دین پەنا ئەباتە بەر "تأویل"و "قیاساتی عەقڵی" (المنجد مادة تزندق).

[٥٨٣] قرمط بن أشعث البقار.

. "تەعلیمییە"شیان پێ ئەوترێت، لەبەر ئەوەی بڕوایان بە عیلمێك هەیە لە "ئیمامی مەعصوم"ەوە وەری بگرن.

. "سەبعییەکان"یشیان پێئەوترێ، چونکە (لەعنەتی خوایان لێ بێت) بڕوایان وایە کە دونیا ڕۆحیانەتی حەوت ئەستێرە ئەیبات بەڕێوە[٥٨٤]. "ئیبن جەوزی" بەدرێژی باس لە بیروباوەڕی قەرمەتیان ئەکات پێش ئەویش "ئەبوبەکری باقەلانی . کە یەکێکە لە موتەکەلیمە مەشهورەکان لە کتێبی (هتك الاستار وكشف الاسرار) بە درێژی ڕەدی ئەفکارەکانیا ن ئەداتەوە، وەڵامی ئەو کتێبەشی داونەتەوە کە هەندێ لە قازییەکانیان لە میسر لە زەمانی "فاتمییەکان"دا نووسیویانە بەناوی "البلاغ الاعظم والناموس الاكبر" کە بیروڕاکانیان ئەکاتە (شازدە پلە)، یەکەم پلەیان ئەوەیە کە کاتێك یەکێك بانگ ئەکەن بۆ لای خۆیان ئەگەر لە ئەهلی سوننەو جەماعەت بێت ئەوە سەرەتا باسی فەزڵی "عەلی" بۆ دەکەن بەسەر ئەبوبەکرو عومەریشدا، ئەگەر هاتە سەر ئەم بیروڕایە پلەیەکی تر بەرزی ئەکەنەوەو داوای لێدەکەن جنێویان پێبدات، چونکە ستەمیان لە "عەلی"و "ئالی بەیت" کردووە، پاش ئەمە ئەو بیروڕایەی تێدا زەرع ئەکەن کە ئوممەتی موحەممەدیش گێلو گوناهبارن کە بەوە ڕازی بوون، پاش ئەمانە ئەیگەیەننە ئەوەی کە ڕەخنە لە خودی ئایینی ئیسلامیش بگرێو گاڵتەی بێت پێی!.. مەبەستمان ئەوەیە لەم ساڵەدا ئەم تاقمە دەستیان کردە جموجوڵو پاشان کارەکەیان تەشەنەی کردو گەیشتە ئەوەی کە پەلاماری مزگەوتی حەرامو (مەککە) بدەنو خوێنێکی زۆری بێگوناه بڕژنو بەردەڕەشەکە لە بێخ بهێننو بیدزنو بیبەن بۆ وڵاتی خۆیان لە ساڵی (٣١٧)ی کۆچییدا"[٥٨٥]. ئیبن کەسیر باسی پەلامارەکەی مەککەیان ئەکاتو شتی زۆر سەیرو سەمەرەیان باس ئەکات، بۆ نموونە ئەڵێ: "کە قەرمەتییەکان بە شمشێر خەڵکیان ئەکوشت ڕێبەری قەرمەتییەکانیش سەیری دەکردن[٥٨٦]و کەیفی ئەکردو ئەیوت: انا بالله وبالله انا.. اخلق الخلق وافنيهم انا" پاش ئەوە هات فەرمانیدا بە یەکێك کە بەردەڕەشەکە لە بێخ دەربهێنێت، ئەویش هاتو بە شتێکی قورس کە بەدەستیەوە بوو پێیدا هاتو ئەیقیڕاند: "اين الطير الأبابيل؟ اين الحجارة من سجيل؟.."[٥٨٧].

هەروەها ئیبن کەسیر حەقیقەتێکی تر باس ئەکات کە ئێمە لە پێشەوە ئاماژەیەکمان پێدا، ئەویش ئەوەیە تا چەندێك جوولەکە دەستی هەبووە لەو ئاژاوەو یاخیبوونانەدا. (ئیبن کثیر) ئەڵێت: "قەرمەتییەکان زۆر هەواداری فاتمییەکان بوون کە لەم ساڵەدا[٥٨٨] لە وڵاتی ئەفریقادا نەشو نمایان کردبوو، ڕێبەرەکەیان خۆی ناونابوو (مەهدی)و ناوی (ئەبو موحەممەد عوبەیدوڵڵای کوڕی مەیمونی قەداح)بوو، لە (سلمیە) خووم فرۆش بوو، کابرایەکی یەهودی بوو، وای ڕاگەیاند کە موسڵمان بووەو لە (سلمیە)ەوە چووە بۆ وڵاتی ئەفریقاو لە ناو خەڵکدا ئەیووت من لە نەوەی (فاتیمە)مو خەڵکێکی زۆری نەفامو بەربەر بڕوایان پێکردو ئەویش دەوڵەتێکی لێ تەشکیل دانو (سەجلماسە)ی گرتو شارێکی بە ناوی (المهديە) دروست کردو کردیە پایتەختی دەوڵەتەکەی"، قەرمەتییەکان بەردەوام نامەیان بۆ ئەنووسیو خەڵکیان لە دەور کۆئەکردەوە.. (ئیبن کثیر) باسی ئەوە ئەکات ئەم (مهدی)یە نامەیەك بۆ (ئەبو تاهیر) ئەنێرێو لۆمەی ئەکات لەسەر ئەوەی کە لە مەککەدا کردوویەتی، چونکە دەمی خەڵکی لێ کردوونەتەوەو هەموو ئەو نهێنییانەی هەیانبووە بەم کارە ئەوان ئاشکرایان کردووە بۆ خەڵکی، فەرمانیشی پێئەدات کە هەرچی تاڵانکردووە بیداتەوە بە خاوەنەکانی، ئەویش گوێڕایەڵی ئەکاتو بۆی ئەنووسێتەوە کە: ئەوەی فەرمووتە جێبەجێی ئەکەین" پاشان ئیبن کەسیر شتی سەیرو سەمەرەی زۆری تر باس ئەکات، لەسەر زمانی هەندێ لەو کەسانەوە کە ماوەیەك لایان ئەسیر بوونو پاشان خوا ڕزگاری کردوون لە دەستیان، بۆ نمونە لە زمانی یەکێکیانەوە ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: ".. ئەوەی ئەسیرێکی لابووایە چی ئیشی قورس هەیە پێی ئەکردو شەویشی لێ ئەهاتو سەرخۆش ئەبوو دەستی ئەکردە هاتو هاوارو نەڕە نەڕ بەسەریدا، شەوێکیان ئەوەی منی ئەسیر

---

[٥٨٤] بۆ باس ئەشێت هەندێك هەبوون کە خۆیان کردبوو بەناوی سوپای حەزرەتی (علی)دا هەمان بیروباوەڕیان هەبووە، وەك (ئیمامی عەلی لە (نهج البلاغة ص١٥٦)دا باسیان ئەکاتو ڕەدیان ئەداتەوەو ئەو عەقیدەیان بۆ پووچ ئەکاتەوە.

[٥٨٥] البداية والنهاية (٧١/١١و ٧٢).

[٥٨٦] لەم هێرشەیاندا ڕێبەرەکەیان (ئەبو تاهری جەنابی) بوو کە کوڕی (ئەبو سەعیدی جەنابی)یە.

[٥٨٧] البداية والنهاية (١٨٢/١١).

[٥٨٨] مەبەستی ساڵی (٣١٧)ی کۆچییە.

کردبوو، مەست بوو بوو پێی وتم: ئەریٚ تۆ چی دەڵێی دەربارەی موحەممەدەکەتان؟ وتم: نازانم! وتی: پیاوێکی عاقڵو سیاسەتمەدار بووە؟![٥٨٩]، پاشان وتی: ئەی دەربارەی ئەبوبەکر چی دەڵێی؟ وتم نازانم! وتی: کابرایەکی سووكو سەلیمو زەعیف بووەو عومەریش کابرایەکی تووڕە کەللە شەق بووەو عوسمانیش کابرایەکی نەفامو ئەحمەق بووەو (عەلی)یش پیاوێکی درۆزنو خۆ هەڵکێش بووە. بۆی مومکین نەئەبوو قسەیەك فێری ئەمو قسەیەك فێری ئەو بکات؟! ئەمانە هەمووی درۆو دەلەسەن[٥٩٠].. بەیانی کە ڕۆژ بوویەوە هاتە لامو پێی وتم: ئەوەی شەویٚ پێم وتی نابیٚ بە کەسی بڵێی!"[٥٩١].

هەندێك بەم شێوەیە پێناسەی (قەرمەتییەکان) ئەکەن: "قەرمەتییەکان: بزووتنەوەیەکی باتنی ڕووخێنەرن، پشت بە ڕێکخستنی نهێنی سەربازی ئەبەستن، بەدەم شیعەن‌و خۆیان بە هەواداری (ئالو بەیت)و (موحەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیمام جەعفەری صادق) ئەزانن، بەڵام لە ڕاستیدا تاکە ئامانجو مەبەستیان بڵاوکردنەوەی (ئیلحادو شیوعییەتو بەرەڵڵایی‌و ئیباحیەت‌و ڕووخاندنی ڕەوشت‌و دەوڵەتی ئیسلامییە. بۆیە پێشیان ئەوتریٚ (قەرمەتییەکان) لەبەر ئەوەی (حەمدان قەرمەتی کوڕی ئەشعەث) یەکەمجار لە ناوچەی کوفەدا بانگەشەی بۆ ئەکردن"[٥٩٢].

## ئەفکارو بیروڕاکانی قەرمەتیان

١. قەناعەتیان بە دەوڵەتی گشتی هەیەو بڕوایان بە مۆڵکییەتی تاکەکەسی نییە لە هیچ شتێکدا.

٢. قەناعەتیان وایە خەڵك هەموو بەشدارە لە ئافرەتانداو ڕایان وایە کەس مافی ئەوەی نییە ژنەکەی لە خەڵکی تر بێبەش بکات!

٣. عونفو توندوتیژی وەسیلەی کاریگەری دەستیانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان.

٤. بڕوایان وایە بەهەشت واتە خۆشی‌و لەزەتی ئەم دونیاو جەهەننەمیش بریتییە لە ڕۆژوگرتن و حەجکردن‌و نوێژ.

٥. پەنا ئەبەنە بەر (تأویل) بۆ هەڵوەشاندنەوەی دین، بۆنمونە ئەڵێن:

. لە شپیسی (جەنابەت) ئەوەیە نهێنی بدەی بە کەسێك شایانی نییە.

. ڕۆژوو ئەوەیە نهێنیی نەدرکێنی.

. زیندوو بوونەوە (بعث) ئەوەیە ڕات بێتە سەر بیروڕاکانی ئەمان.

. پێغەمبەرایەتی: ئەوەیە لە خوای یەکەمەوە (فەیزێك) بباریٚتە سەر کەسێكو ئەویش بیڕژیٚ بەسەر خەڵکیدا.

قورئان: بریتییە لە فەلسەفەکانی موحەممەد.

٦. هەموو کەسێك لە ناو خۆیاندا قەبوڵ ئەکەن هەردینێکی هەبیٚو بە دڵی ئەو ئەکەن[٥٩٣].

## ڕەگو ڕیشەی بیروڕاکانیان

١. فەلسەفەیەکی ماتریالیزمیان هەیە کە زۆربەی لە فەیلەسوفو ڕێبەرانی فارسەوە وەرگیراوە.

٢. بنەماکانی (خەواریج)و (دەهرییەکان) لە فیکرو لە سیاسەتیاندا بە ئاشکرا دیارە.

٣. زیرەکانە بۆچوونەکانی (مەزدەك)و (زەردەشت) بەکاردەهێنن.

---

[٥٨٩] سبحان الله! مێژوو چۆن دووبارە ئەبێتەوە! ئەوەتا لەم ڕۆژەیشدا نووسەرە عەلمانییەکان چۆن بە هەموو شێوەیەك ئەیانەوێت سیفەتی پێغەمبەرایەتی لە پێغەمبەر ﷺ بکەنەوەو هەوڵ بدەن ئەوە بخەنە ناو خەڵك گوایە موحەممەد پیاوێکی عەبقەری‌و خوێندەوار بووەو ئەم قورئانەش زادەی بیری خۆیەتی.. بیرمە ساڵی (١٩٨٣) کوڕێك کە ئێستاش هەرماوە وتی: چەند گەنجێکی خوێنگەرم ئەچنە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی‌و ڕێیان لە لایەنێکی کۆمۆنیستی ئەکەوێت پاش ئەوەی هەندیٚ مەشقیان پیٚ ئەکەن لەسەر تفەنگو چۆنییەتی بەکارهێنانی، ئەیانەوێت چەکیان بدەنیٚ، بەڵام ئەو کەسەی بڕیاربووە چەکەکانیان بداتیٚ پێیان ئەڵێت: ها! ئەوە بزانن پێش ئەوەی ئەم چەکانە هەڵبگرن ئەبیٚ ئەوە بزانن، نە خوا هەیەو نە پێغەمبەر! ئەو چەند گەنجەش ئەسڵەمنەوەو چەکەکان وەرناگرن‌و ئەچنە لای بەرپرسەکەو ئەڵێن: فلان کەس وای وتووە! بەرپرسە کۆمۆنیستەکەش کە ئەزانیٚ ئەمانە ماویانە ئەڵیٚ: درۆی کرد، خوا هەیە، ئەڵێن: کوڕە ئەڵیٚ پێغەمبەریش نییە! ئەویش ئەڵیٚ: ئەوەشیان هەر درۆیە.. پێغەمبەر هەشبووەو عەبقەریش بووە!!

[٥٩٠] دەقە عەرەبییەکە ئەڵیٚ: هذا کله مخرقة.

[٥٩١] البداية والنهاية (١٨٣/١١).

[٥٩٢] الموسوعة الميسرة في الاديان والمذاهب المعاصرة (٣٩٥/١).

[٥٩٣] الموسوعة الميسرة (٣٩٧/١).

٤. بناغەی بیروڕایان ئەوەیە خەڵك هەموو مافیان لە دووشتدا هەیە، ماڵی یەکتریو ژنی یەکتری.

٥. فیکرەی جەوهەری لایان ئەوەیە زۆرترین خەڵك تەییار بکەن بۆ مەبەستەکانیان کە لای خۆیان ڕۆشنەو لای ئەوان نادیارە[٥٩٤].

عوبەیدوڵڵای کوڕی حوسەینی قەیرەوانی کە (مەهدی)یان پێدەوت کاغەزێك بۆ (سولەیمانی کوڕی حەسەنی کوڕی سەعید جەنابی) ئەنێرێتو هەندێ ڕێنمایی بۆ ئەنووسێو ئەڵێ: "خەڵك بانگ بکە بۆ لای خۆتو ئەو حەزی لە چییە تۆ وابکە، هەرکەسێ بینی واپیشان بدە کە تۆ لە ئەسڵو عەشرەتی ئەوانی، (ڕشد)ت لە هەرکەسێکدا بینی پەردەی بۆ لابدە، لە هەر شوێنێکدا (فەلسەفەچی)ت بینی بیگرەو دەستی لێ بەرمەدە، چونکە قەڵای قایمن بۆ ئێمە، منو ئەوان هەردولامان بۆیەك ئامانج هەوڵ ئەدەین ئەویش ڕەتکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی فیکرەی پێغەمبەرایەتییەو مەبەستمانە ئەوە بڵاوبکەینەوە لە ناو خەڵکیدا کە ئەم دونیایە ئەزەلییە هەر لە کۆنەوە هەبووە"[٥٩٥].

ئەمەیە حەقیقەتی (قەرمەتییەکان) کە کاکە فوئاد ئەیەوێ لەم خەڵکەیان بکاتە فریادڕەسو پیاوانی ڕۆشنفکرو ڕێبەرانی ڕاپەڕینی جەماوەری کە بێجگە لە ئیلحادو ئیباحیەتو فریودانی خەڵکیو بەکارهێنانیان بۆ بێگانە هیچی تریان پێ نەبووەو ئەوەش مێژووی ڕاستەقینە بابێت بێجگە لە ئەو چەتەگەریو شڕە خۆریو خوێنڕێژییو بەرەڵڵاییە، با سەروەرییەك بداتە پاڵیان.. ئیتر خۆ ئەوە بە قسەو میزاجی ئەمو ئەو نابێتو ئەبێت مێژووی ڕاستەقینە قسە بکات.

لە بەشێکی سەربەخۆی کتێبەکەیدا فوئاد مەجید میسری باسێکی درێژی ناڕەوا دەربارەی (سۆفیزم) ئەکات، سۆفیزم بە پیشخواردنەوەو یاخی بوون ئەداتە قەڵەم، ئێمە وەڵامێکی سەربەخۆمان بۆ نووسیوەو لە هەڵی گونجاوتردا (خوا بیەوێ) بڵاوی دەکەینەوە. بەڵام نووسەر دوو مەسەلەی تری زۆر بێمانا لەم بەشەدا باس ئەکاتو ئێمەش بە وەڵامدانەوەی هەردووکیان کۆتایی بەوەڵامو ڕەخنەکانمان دێنین خوێنەری بەڕێز بەو هیوایەی لە کتێبێکی تردا جارێکی تر ببینەوە هاوڕێیو هاوسەفەری یەکتری.

مەسەلەی یەکەم: فوئاد میسری قەناعەتی وایەو لەسەر زمانی (ڕازی)ەو ئەڵێ: "قورئان هیچ شتیکی بە کەڵکی تێدا نییە"[٥٩٦].

مەسەلەی دووەم: قەناعەتی وایە: "حەللاج ڕۆشنبیرێکی گەورەو سیاسەتمەدارێکی لێهاتووی سەردەمەکەی بووە"[٥٩٧] و قسەکانی قسەی فەیلەسوفێکی گەورەو بناغەدارە، وەك لە لاپەڕە (٢٤٥)دا هەوڵی سەلماندنیان ئەدات، جا ئێمەش بەکورتیو بە چڕو پڕی وەڵامی ئەم دوو قسە سەقەتەی ئەدەینەوە کە ئەمیان لەو خراپترو ئەویان لەم نا عاقڵانەترە.

یەکەم: ئایا ڕاستە قورئان هیچ شتێکی بەکەڵکی تێدا نییە؟!

فوئاد مەجید میسری ئەڵێ: "(ڕازی) بە ئاشکرا مەسەلەی ئیعجازی قورئان دەداتە دواوە"[٥٩٨].

"ڕازیی"[٥٩٩].. بیرۆکەی پێغەمبەرایەتی (فکرة النبوة).. ڕەت دەکاتەوە، یانی.. ئەڵقەی پەیوەندیی نێوان خولقێنەرو خولقاو (خالق ومخلوق) چز دەکاو بە ڕەوای نازانێ، پەنا بریێتە بەر شتێك لە دەرەوەی عەقڵەو ناونراوە پەیامبەرێتیی"[٦٠٠]، هەروەها دەڵێ (ڕازی) بە توندی ڕەخنە لە بابەتەکانی ناو قورئان دەگرێو پێی وایە:

---

[٥٩٤] الموسوعة المسيرة (١/٣٩٨).

[٥٩٥] قواعد المنهج السلفي، ص٩٥، کە لە (الفرق بين الفرق/ بغدادي ل٢٩٤) وەریگرتووە.

[596] کۆمەڵگا (ل٢٦٤).

[597] کۆمەڵگا (ل٢٦٩).

[598] کۆمەڵگا (ل٢٤٩).

[599] زۆر گەڕام بۆ ژیاننامەی ئەم (ڕازی)یە لە نێوان زانایانی (سەدەی دووهەمو سێیەم)دا، بەڵام تەرجەمەو ژیاننامەکەییم نەدۆزییەوە، بە قسەی فوئاد مەجید بێت، ئەبێ ئەم (ڕازی)یە هاوچەرخی ئەم کەسانە بووبێت سەیری (سەقەطي= سۆفی)و (جاحظ = موتەکەیم)و (ئەبو یەزیدی بەسطامی= سۆفی)و (ئەبو حاتەمی ڕازی = حەدیسزان)و (ئەبو سەعیدی جەنابی ڕێبەرو گەورەی قەرمەتیان)و (ئەبو عەلی جوبائی = ڕێبەرێکی گەورەی موعتەزیلەکان)و (مەهدی خاوەنی ئەفریقا)و (حەللاج)، کەچی لەو سالانەدا واتە لە (٢٥٠)ی کۆچی، کە ساڵی لە دایکبوونی ئەم ڕازییەیە تا ساڵی (٣١٣) کە ساڵی وەفاتیەتی، وەك نوسەر لە لاپەڕە (٢٤٩)ی کۆمەڵگاکەیدا ئەڵێ، ناوێکی وام نەدۆزییەوە لە (البدايه والنهايه)دا، ئەڵێ گوایە (أبو حاتم الرازی) لە کتێبێکدا، موناقەشەی (ڕازی فەیلەسوف) ئەکات لە کاتێکدا: ڕازی فەیلەسوف زانایانی (سەدەی شەشەم)ە، کە زانایەکی زانستی کەلامەو جا نازانم، ئەم (ڕازی)یەی نووسەر باسی ئەکات کێیە؟ قەناعەتی وابووە، قورئان پڕە

**یەکەم: پڕیەتی لە ئەفسانەی کۆن.**

**دووهەم: بابەتەکان زۆربەیان ناکۆکن و دژ بەیەکن.**

**سێهەم: هیچ شتێکی بەکەڵکیان تێدا نییە[٦٠١].**

**فوئاد میسری لە دەمی (ڕازی)یەوە ئەڵێ: "کتێبە زانسییەکان لە قورئان بەسوودترن و خەڵکی بۆ کاروباری ڕۆژانەی ژیانیان، زۆرتر سوودیان لێوەرگیراوە"[٦٠٢]، هەر لەسەر زمانی ئەم (ڕازی)ەوە ئەوە ڕوون ئەکاتەوە کە ئەتوانرێت "وەك قورئان و بەڵکو لە قورئان جوانترو پاراوتر دابنرێ"[٦٠٣]، جا زۆر گزیبازانەو لە ژێر لێوەوە ئەیەوێ بە خوێنەر بسەلمێنێ کە ئەم قورئانە (خەدیجە)و (بوحەیرا)و (وەرەقەی کوڕی نەوفەل)و (ئومەییەی کوڕی سەڵتو کێ و کێ ڕۆڵیان لە دانانیدا هەبووە!![٦٠٤].. بائەمە بەس بێت و بچینە سەر وەڵامی ئەو وڕێنەو قسە مناڵانە.. ئێمە بەگشتی ئەڵێین: قورئان کتێبێکەو هەیەو کۆمەڵێکی زۆر "ڕێنمایی"و "یاسا"و "زانیاری"ی تێدایەو یەکەمجار لە مێژوودا لەسەر زمانی موحەممەد پێغەمبەر ﷺدا باسیکراوەو ئەو داویەتیە پاڵ خوا، ئەوانەی وا ئەزانن هی خوا نییەو خوا داینەناوە، ئەبێ یەکێ لەم گریمانانە بڵێن:**

**یان موحەممەد ﷺ خۆی دایناوە.**

**یان وەك فوئاد میسری ئەیگوازێتەوە، لە سەرچاوەیەکی تری وەك (بوحەیرا) (وەرەقە)و ئەمانەوە وەرگیراوە.**

**یان قورئان مادام بە کەسی تر ناوترێ و کەس ناتوانێت وەك ئەو بهێنێ، کەواتە هی دەسەڵاتێکە لەسەرووی مرۆڤەوەیە کە ئەویش خوایە..**

**ئێمە ناچارین بە کورتی هەریەك لەو خاڵانە باس بکەین، چونکە وەك ئێوەی خوێنەری بەڕێز ئەزانن، ئەو باسە قسە زۆر هەڵدەگرێت و کتێبەکەی ئێمەش لەوە زیاتر گەورەی بکەی، لە ئاستی خۆی دەرئەچێت، هەرکەس بیەوێت بە درێژی و تێرو تەسەلی باسی موعجیزەی قورئان. بخوێنێتەوە با یان "النبأ العظیم"ی "دکتۆر موحەممەد عەبدوڵڵا دراز" یان "مناهل العرفان/ الزرقانی، جڵدی دووهەم/ مەبحەسی شانزە بخوێنێتەوە.**

**هەڵوەشاندنەوەی گریمانی یەکەم: موحەممەد ﷺ خۆی داینابێت..**

**ئەم قورئانە پێغەمبەر ﷺ داینەناوە لەبەر زۆر بەڵگە:**

---

لەقسەی پڕووپووچ و شتی بەکەڵکی تێدا نییە، ئەگەر بیویستایە لە قورئان جوانتری ئەوت!! ئەی باشە بۆ جوانتری لە قورئان نەوت، یان وەك قورئانی نەوت و فوئاد میسری و ئەو جۆرە کەسانەی بخستایەتە ئیسراحەت و ئەوەندە ماندووی نەکردنایە لە ڕەتکردنەوەی قورئان و ئیسلامدا.

دوور نییە ئەم ڕازییە یەکێك بێت لەو کەسانەی کە "مەهدی ئەفریقیا" بۆ کوڕەکەی ئەبو سەعیدی جەنابی ئەنووسێ و پێی ئەڵێ: ڕێتکەوت لە هەر فەلسەفەچییەك دەستی لێ بەرمەدە، چونکە قەڵای قایمی ئێمەن.

بۆ زانیاری زیاتری خوێنەران فوئاد میسری و حسین مەروەش باسی سێ کەس بە ناوی (الرازی) ئەکەن، ئەبوبەکری رازی (٨٥٤ ـ ٩٣٢ھ)، (فەخرەدینی ڕازی ٦٠٦ھ)، ئەبو حاتەمی ڕازی (٣٢٢ ـ ٩٣٣) بەپێی کتێبەکەی (حسین مروه)، بەڵام چ فوئاد میسری و چ حسین مەروەش، تێکەڵییەکی زۆریان کردووە لەم ناوانەدا، جا نازانم ئەوە بە قەسدی وایان کردووە سەریان لە خوێنەر شێواندووە، یان لە ڕاستیدا بۆیان جیا نەکراوەتەوە، حسین مەروە لە (النزعات)ەکەیدا خۆی ئەڵێ: "ئەبو حاتەمی ڕازی لە زانایانی چەرخی (چوارەمی کۆچییە: ٢/٥٤٥)"، ئەڵێ: ئەم ئەبی حاتەمی ڕازییە کتێبی لەسەر ئەبوبەکری ڕازی نووسیوەو ئەڵێ: یەکێکە لە ڕێبەرە گەورەکانی ئیسماعیلەکان (٢/٥٤٥) ئەڵێ: کابرایەکی "باطني" بووە چووەتە ناوچەی (دەیلەم)و خەڵکی زۆری لێکۆبووەتەوە کەچی ئەڵێ (٢/٥٤٥): ئەم ئەبی حاتەمی ڕازییە کتێبی لەسەر ئەبوبەکری ڕازی نووسیوەو بە "ملحد" ناوی بردووە (٢/٥٥٠)، ئاخر ئەبوبەکری ڕازی (٢٠٠) ساڵ دوای ئەبوحاتەمی ڕازی لە دایك بووە، ئەمە چۆن ڕوویدا؟! کە دووسەد ساڵ پێش ئەوەی لە دایك ببێ کتێبی ڕەخنەیی بنوسێ، هەروەها ئەبو حاتەمی ڕازی وەك لە (البدایه والنهایه)دا هاتووە لە ساڵی (٢٧٧ك) وەفاتی کردووە نەك (٣٢٢ ـ ٩٣٣) کە نازانم ئەو دووساڵە چییە، حسین مەروە نووسیویەتی، بەو قسەیە بێت کابرا زیاتر لە سێ سەد ساڵ ژیاوە!.

[600] کۆمەڵگا (٢٥٠).

[601] کۆمەڵگا (ل٢٦٤).

[602] کۆمەڵگا (ل٢٦٤).

[603] کۆمەڵگا (ل٢٥٦).

[604] کۆمەڵگا (ل٢٦١)، بە (متن)و (حاشیە)کانەوە.

خۆی دان بەوەدا ئەنێت کە قورئان هی ئەو نییەو هی خوایەو ئەم تەنیا ئیشی ئەوەیە ئەم قورئانە کە هیی (رب العالمین)ە لە (جوبرەئیلی ئەمین)ەوە وەریگرتووەو لە بەری بکات بیگەیەنێتە خەڵکی، ئیتر ئەم نە (وەکیلی خوایە)و نە سێیەری خوایە، بەڵکو بەندەیەکە وەك ئەو هەموو بەندەی تر کە خوا هەیەتی، ئەوەتا ئەفەرموێت: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلاً صَالِحاً وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَداً) (الكهف: ١١٠). (قُلْ مَا كُنتُ بِدْعاً مِّنْ الرُّسُلِ وَمَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِي وَلَا بِكُمْ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَى إِلَي ..) (الأحقاف: ٩).. خواش ئەفەرموێت: (وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ* نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ* عَلَى قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ* بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ* وَإِنَّهُ لَفِي زُبُرِ الْأَوَّلِينَ) (الشعراء: ١٩٢ . ١٩٦).

دەی کەسێك خۆی دان بە مەسەلەکەدا بنێت وەك یەکێك لە پرەنسیپەکانی یاسا دەڵێت: "الأقرار سيد الأدلة"، ئیتر ڕێگەی ئەوە ئەمێنێ کەسێك پێچەوانەی ئەوە بڵێت..

عەقڵ نایبڕێ کەسێك جوانترین و بەهێزترین، بەرهەمی (فیکری) خۆی کە لە ڕاستیدا لە لووتکەی فەخرو شانازیدا بێت، بداتە پاڵ خەڵکی ترو خۆی لێ بەری بکات، ئەوەی لای خەڵك باوە ئەوەیە زۆرکەس شتی بەهێزو جوانی خەڵك ئەدزێت و ئەیداتە پاڵ خۆی و خۆی پێوە هەڵدەکێشێت لە ناو خەڵکدا، نەك بەرهەمی جوانی خۆی و گوشراوی ژیانی بداتە پاڵ خەڵکی تر..

لەوانەیە بوترێ: ئاخر پێغەمبەر ﷺ، ئەم قورئانەی بۆیە دایە پاڵ خوا بۆ ئەوەی لای خەڵك (پیرۆز) بێت، ئەمەش بە زۆر بەڵگە هەڵەو ناڕەوایە:

یەکەم: ئەم قورئانەو ناوەرۆکی ئەم قورئانە، لە ئاستی پێغەمبەر ﷺ زۆر بەرزترە .

دووەم: پێغەمبەر ﷺ لەناو خەڵکدا، جیاوازی لە نیوان قسەی خۆی و قسەی خوادا بۆ کردوون و هەموو قسەکانی خۆی ناویان (فەرموودەیە)و قسەکانی خوا ناویان (قورئانە)، کەچی خەڵکی هەمان ڕێزیشیان بۆ قسەکانی خۆشی هەبووەو هیچ کات پێویستی بەوە نەبووە قسەی خۆی بداتە پاڵ خوا، ئەوەی ئاگای لە ژیانی پێغەمبەر ﷺ بوو بێت ئەزانێت هەرگیز بە سواری درۆ نەڕۆیشتووە بۆ هیچ کارو مەبەستێك، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەرگیز ڕێگەی نەداوە شتێك کەوا نییە لە بنەڕەتدا بدرێتە پاڵی، با بۆ بەرزکردنەوەو ڕێزلێنانی زیاتری ئەویش بوو بێت.. بۆ نموونە:

ڕێگەی نەداوە کەس بەشان و باڵیدا هەڵبدات، یان لە بەری هەستن، ئەنەس ئەڵێ: "ماكان في الدنيا شخص احب اليهم رؤية من رسول الله ﷺ، وكانوا اذا رأوه لم يقوموا له، لما كانوا يعلمون من كراهته لذلك" (اخرجه البخاري)[٦٠٥]. یان ڕێگەی نەئەدا بە پێوە لە کاتی دانیشتندا دەستەو ئەزەر بوەستن "لا تطروني كما أطرت النصارى ابن مريم أنا عبد، فقولوا عبدالله ورسوله" (رواه البخاري).

هەندێ (جاریە)و گۆرانیبێژ لە شایی (ربیعەی کچی موعەوەز)دا گۆرانیان ئەوت و دەفیان لێ ئەدا و یەکێکیان ئەیوت: "وفينا نبي يعلم ما في غد"[*] پێغەمبەر ﷺ گۆرانییەکەی پێ بڕی و فەرمووی: "لا تقولي هكذا، وقولي ماكنت تقولين" (رواه البخاري).

خواش لە قورئاندا هەروا ئەفەرموێت: (قُل لاَّ أَقُولُ لَكُمْ عِندِي خَزَآئِنُ اللّهِ وَلا أَعْلَمُ الْغَيْبَ..) (الأنعام: ٥٠)، (وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ) (الأعراف: ١٨٨).

. ئیبراهیمی کوڕی کە مرد لە کاتی ناشتنەکەیدا خۆرگیرا، ئەسحاب وتیان: خۆر لەبەر خاتری ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ گیراوە، پێغەمبەر خێرا چووە شوێنێکی بەرزو فەرمووی: مانگ و ڕۆژ دوو ئایەتی خوان، نە بۆ ژیان و نە بۆ مردنی کەس ناگیرێن، ئەگەر شتی واتان بینی خۆتان بە نوێژکردنەوە خەریك بکەن!! (ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی ئەکات).

---

[605] سلسلة الأحادث الصحيحة الألباني، رقم الحديث (٣٥٨) (٦٣١/١).

[*] واتە: پێغەمبەرێکمان لەناودایە ئەزانێ بەیانی چی ئەبێت.

ئەم قورئانە ئیعجازو زانیاری وردی ئەوەندە زۆری تێدایە، کە نە لە ئاستی موحەممەدو نە لە ئاستی هیچ زانایەکی ئەو سەردەمەو سەردەمەکانی دوای ئەوو ئەم سەردەمەشدا نییە، ئەو هەموو ئیعجازە کەی بە مرۆڤ ئەوترێت، نەخوازەڵلا موحەممەدێکی نەخوێندەوارو لە سەردەمێکی وەك ئەو سەردەمەشدا، ئێمە لە بڕگەی دووهەمدا باسی دەکەین..

قورئان "بێ دڵی" ئەوی چەندجار کردووە، لە چەند شوێندا ڕەخنەی لێ گرتووە، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرموێت:

. (مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَن يَسْتَغْفِرُواْ لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُواْ أُوْلِي قُرْبَى..).

. (مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُ أَسْرَى حَتَّى يُثْخِنَ فِي الأَرْضِ..).

. (عَبَسَ وَتَوَلَّى* أَن جَاءهُ الْأَعْمَى* وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّهُ يَزَّكَّى) (عبس: ١ ـ ٣).

. (..وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَاهُ..) (الأحزاب: ٣٧).

. (وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ الْأَقَاوِيلِ* لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِالْيَمِينِ* ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ الْوَتِينَ) (الحاقة: ٤٤ ـ ٤٦).. الخ الآيات.

دەی کەواتە کەسێك مەبەستی بێت "پیرۆزی" بۆ خۆیو قسەکانی دروست بکات، ڕاستە بەو شێوەیە بکات، یان ئەوانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ مرۆڤێکە وەك هەموو مرۆڤەکانی تر، بەڵام ئەوەندە هەیە کە (نیگا)ی بۆ دێتو ئەویش لەسەریەتی کە:

١. جوان لێی حاڵی بێتو لەبەری بکات.

٢. بیگەیەنێتە خەڵکیو بۆیان باس بکات.

٣. بۆیان ڕۆشن بکاتەوەو تەفسیریان بۆ بکات.

٤. بەسەر خۆیو خەڵکیشدا جێبەجێی بکات[٦٠٦].

زیاد لە ئەمانەش هەمووی، ئەم قورئانە زۆر لە ئاستی پێغەمبەر ﷺ بەرزترە، کە ئەکرێ زۆر بە کورتیو چڕی باس لە بابەتەکانی قورئان بکەین، کە زانایان ئەیکەنە چوار دەستەی گەورەو سەرەکی:

دەستەی یەکەم: بابەتە مێژووییەکان (هەواڵی میللەتەکانو شارستانییەتە پێشووەکان).

دەستەی دووەم: بابەتەکانی داهاتوو (هەواڵی ڕووداوەکانی لەمەودوا کە ڕوو ئەدەن).

دەستەی سێیەم: بنچینەکانی زانستە دینیو مرۆییەکان (وەك بیروڕا ئاینییەکان، زانستە کۆمەڵایەتییەکان، زانستە یاساییەکان، زانستەکانی پزیشکیو فەلسەفەو زیندەوەرزانیو .. هتد).

دەستەی چوارەم: ئیعجازی "بەلاغی"و "بەیانی" ئەم قورئانە کە سەرنجی هەرچی زاناو دانا هەیە ڕای کێشاوەو ناتوانن تا دونیا دونیایە وەك ئەو بڵێن.

زانایان بۆ دەستەی یەکەم: ئەڵێن:

زانیارییە مێژووییەکان نە بە (عەقڵکاریو قیاسات)و نە بە (بیرکردنەوەو ئیرهاصات) دەستی کەس ناکەوێت، بەڵکو تاکە ڕێگەیە بۆ دەست کەوتنی زانیاری مێژوویی بریتییە لە "نەقڵو گواستنەوە بە ڕێگەی ڕیوایات"، دەی ئەو هەموو "زانیارییە مێژووییی"یانە، لەسەر ئادەمو نوحو ئیبراهیمو داودو سولەیمانو موساو عیساو میللەتانی (عاد)و (ثمود)و .. هتد، پێغەمبەر ﷺ لە کوێوە هێنای، ئەوە نەبێت کە خوای گەورە بە ڕێگەی جوبرەئیلدا بۆی ناردبێت، ڕاستە هەندێ ڕووداو هەر بەسەر زمانی خەڵکەوە هەبوونو باسکراون، بەڵام بەو دوورو درێژیو وردەکارییەوە، تەنیا (وەحی) نەبێت، هیچ ڕێگەیەکی تر نییە ئەو زانیارییانەی لێوەربگیرێن ئەوەتا ئەم نەوە تازەی کە ئێستا هەیە نازانێ حکومەتی مەهاباد کەی بووەو چۆن بووەو چۆن ڕووخاوە، کە هێشتا پەنجا ساڵێکی بەسەردا ڕۆشتووە! کەسیش نەهات بڵێ: ئەو بەسەرهاتو سەرگوزەشتانە لای یەهودو نەسارا هەبوونو هی ئەوانە، چونکە ئەم زانیاریانە لەگەڵ ئەوانەی ناو تەوراتو

[٦٠٦] النبأ العظيم/ محمد عبدالله دراز (ص ٢٠).

ئینجیلدا زۆر جیاوازن‌و زۆر دژن بەیەکتری[٦٠٧] و ئێمەش لە گریمانی دووهەمدا گەڕانەوەمان ئەبێت بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەم بۆچوونە بە بەڵگەیەکی تر.

زانایان بۆ دەستەی دووهەم ئەڵێن: ئەوەی قورئان هەواڵی پێداوە لە داهاتوودا ڕوو ئەدات ئەکرێ بیکەنە چوار پێنج بابەتی سەرەکی:

١. هەواڵی ئەوەی داوە کە ئەم قورئانە خوا ئەیپارێزێت‌و دەستی درۆزن‌و ساختەچی‌و دوژمنانی دینی پێناگات‌و وەك چۆن دەستیان گەیی بە تەورات‌و ئینجیل‌و لادانی دونیایان تێدا دروست کرد، ئەوەتا ئەفەرموێت: (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)، هەروەها ئەفەرموێت: (لاَ يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيراً)، یان ئەفەرموێت: (فَإِن لَّمْ تَفْعَلُواْ وَلَن تَفْعَلُواْ)[٦٠٨].

٢. داهاتووی ئەم دینە کە کەس ناتوانێ تێکی بشکێنێ‌و هەر ئەمێنێ‌و ئەم کۆمەڵەش دەستی لێ هەڵبگرن خوا کۆمەڵێکی تری بۆ پەیدا ئەکات‌و بە بەردەوامی کۆمەڵێکی بەغیرەت‌و زاناو دانا داکۆکی لەم دینە ئەکەن (..فَإِن يَكْفُرْ بِهَا هَـؤُلاء فَقَدْ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْماً لَّيْسُواْ بِهَا بِكَافِرِينَ). ئەگەر ئەمە کاری خوا نەبێت، پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەتوانێت وەها گرەنتییەك بدات، هەر هیچ نەبێ بۆ دوای مردنی خۆی؟! کەواتە بێگومان پارێزەرێکی تر هەیە بۆ ئەم دینە جگە لە پێغەمبەر ﷺ، کە لە هەموو چەرخ‌و سەردەمێکدا ئامادەو بەتوانایە بۆ پاراستنی دینەکە کە ئەویش خوایە.

بڕۆن لە مێژووش بپرسن، بزانن چەند جارو چەند کەس بە هەموو توانایەکیانەوە داهاتنەوە بۆ ئەم دینە، تا وا تێکی بشکێنن، ئیتر هەڵنەسێتەوەو کەسی نەمێنێ لەدەوری! کەچی ئەوان هەموو ڕۆیشتن‌و دین هەرما!! ئەوان ناویان نەماو پووان‌و ڕزین، دین هەر لە گەشەکردن‌و بڵاوبوونەوەدایەهەر چوار دەورەی قەرەباڵغ تر ئەبێ بە پیاوی زاناو بەتوانا.

لە مێژوو بپرسن، کام فکرەو کام دین ئەگەر ئەوەندەی ئیسلام‌و هەر لە ناو خۆیداو لە ناو کۆمەڵگەکەی خۆیدا ئەو هەموو (بزووتنەوە باتنی)و (کەس‌و ئەفکارە ڕوخێنەرەی) بۆ دروست بکرایە ئەی توانی خۆی ڕابگرێت جگە لە ئیسلام؟! ئایا ئەوانە وەك زانایەکی سوری دەڵێ: بەڵگەنین لەسەر ئەوەی ئیسلام هی خوایەو مومکین نییە بڕوخێنرێ، مومکین نییە تێك بشکێنرێ؟![٦٠٩].

لە مێژوو بپرسن، ئەوەی لەگەڵ ئەم دینەدا کرا، بزانن ئەگەر دەیەکێکی ئەوە لەگەڵ فیکرەیەکی تر یان دینێکی تردا بکرایە ئێستە هەر تۆزیشی مابوو؟! خوای گەورە ڕاست ئەفەرموێ: (هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ) (التوبة: ٣٣)، هەروەها ئەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ اللّهِ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ..) (الأنفال: ٣٦). هۆکەشی ئەوەیە کە ئەوەی زەوی‌و ئاسمانەکانی ڕاگرتووە، هەر ئەویشە دینی ڕاگرتووە، دەست لەم دینەش بەرنادات ئەو ڕۆژە نەبێت کە دەست لە ئاسمانەکان‌و زەوی بەرئەدات‌و بڕیاری تەواوبوونی دونیاو دەست پێکردنی قیامەت ئەدات..

٣. هەواڵی داوە کە پێغەمبەر ﷺ کەس ناتوانێت بیکوژێت‌و ئەیپارێزێت بۆ ئەوەی ئەم دینە بگەیەنێتە خەڵکی، (يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ وَاللّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ..) (المائدة: ٦٧). هەر ئەمە وایکرد کە پێغەمبەر ﷺ دوای دابەزینی ئەم ئایەتە ئەفەرموێ: "پێویست ناکات کەس پاسەوانیم بکات‌و لە کوشتنم بترسێ، چونکە خوای گەورە بڕیاری داوە ئەمپارێزێت"، ئەوەش بوو خوای گەورە لە هەموو ڕووداوو شەڕوو پێکدادانەکاندا پاراستی‌و لەسەر جێگەدا وەفاتی کرد.

---

[607] ئەو باسە نموونەو بەراوردکاری زۆری لەسەرکراوە، با بۆنموونە، نامیلکەیەکی بچووکی مەحمود غەریب هەیە بەناوی (هذا نبيك ياولدي) بخوێنرێتەوە، هەرکەسیش حەز لە زانیاری زیاتر ئەکات با (اظهار الحق)ی (رحمة الله) هندی بخوێنێتەوە.

[608] زانایان ئەڵێن: "لن" بۆ تەئبیدە، واتە: هەتا هەتایە ناتوانن وەك ئەم قورئانە بهێنن، ئەم بڕیارە ئەگەر خوا نەبێت، پێغەمبەر ﷺ چۆن ئەتوانێ (تەحەددا)ی وا بکات، ئەگەر بۆ خەڵك‌و سەردەمی خۆشی بیکات، چۆن زات ئەکات بۆ نەوەکانی داهاتووشی بکات؟!

[609] اجنحة المكر الثلاثة/ عبدالرحمن بن حنبكه الميداني، (ص٧٨).

٤. هەواڵی داوە کە پاش چەند ساڵێکی تر شەڕێك لە نێوان ڕۆمو فورسدا ڕوو ئەداتو (ڕۆمەکان) سەردەکەون بەسەر فارسەکانداو تێکیان ئەشکێننو ئەو ڕۆژەش خۆشیو دڵشادییەك لەناو موسڵماناندا دروست ئەبێت. ئەوەبوو ئەو ڕۆژەی موسڵمانان لە (بەدر)دا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا، هەواڵی ئەوەش بڵاوبوویەوە کە (ڕۆم) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە لە شەڕێکدا لەگەڵ فارسەکاندا[٦١٠].

زانایان بۆ دەستەی سێهەمی بابەتەکانی قورئان زۆر بەکورتی ئەڵێن:

ئەو زانستانەی کە قورئان باسی کردوون، دوو جۆری گەورەن، جۆری یەکەمیان یاساو ئەحکامن. جۆری دووهەمیان: ڕێنمایيو بەرچاوڕوونین. یاساو ئەحکامەکانیش خۆیان لە خۆیاندا سێ جۆرن:

جۆری یەکەم: ئەحکامو یاسا عەقائیدەییەکان.

جۆری دووهەم: ئەحکامو یاسا ئەخلاقییەکان.

جۆری سێهەم: ئەحکامو یاسا مەدەنییەکان، کە ئەمانەش ئەبنە دووبەشی سەرەکی: ئەحکامی "عیبادات"و ئەحکامی "موعامەلات".

ئەحکامی عیبادات بۆ ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان عەبدو خوایە وەك "نوێژو ڕۆژوو حەجو زەکاتدان.. هتد ئەگرێتەوە".

ئەحکامی موعامەلاتیش هەموو یاساکانی باری تاکەکەسیو یاساو بنەماکانی ئاشتیو شەڕو حوکمڕانیو کاربەدەستانو هاوولاتیانو چۆنییەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هاودینەکانو غەیرە دینەکان.. هتد، ئەکات[٦١١].

ئەوانەش یاساو ئەحکام نینو ڕێنمایيو بەرچاوڕوونین زانایان ئەیانکەن بە چەند بەشێکەوە:

. چیرۆكو سەرگوزەشتەی میللەتانو پێغەمبەرانو ولاتان لە ڕابردوودا، یارمەتیدانی عەقڵ بۆ عیبرەت وەرگرتن لێیانو تامو چێژ بردن لە بەسەرهاتیان.

. باسەکانی (مرۆڤ)و (نەفس)و (ڕۆح)و (فەزا)و (زەوی)و گیاندارو بێگیانو جولاندنی (عەقڵ)و (فکر) بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکانیان.

. باسەکانی (هاندانو ترساندن)و ئەو بەڵێنو پەیمانانەی کە خوا ئەیدات بە (ئیمانداران)و بە (کافران)، چ بۆ دنیا بیانداتێ، یان بۆ قیامەت بیانداتێ، کە لە دونیادا وەعد بە موسڵمانان ئەدات، سەریان بخات .بە حورمەتو بەڕێزیان بکات . کامەرانو دڵشادیان بکات، لە ئاخیرەتیشدا، سەربەرزوو سەرفرازیان ئەکاتو ئەیانخاتە بەهەشتی خۆی.

بەڵێنیش بە کافران ئەدات لە دونیادا: بێنرخیان بکات . پەستو دڵتەنگیان بکات . تووشی پەشیمانیو ڕەنج بەخەساریان بکات.. لە ئاخیرەتیشدا زەلیلو دۆڕاوو سەرکزیان بکاتو لە بەندیخانەی هەتا هەتایی جەهەننەمدا زیندانییان بکات[٦١٢].

بۆ ئیعجازی زانستی قورئان، تەنیا یەك نموونە زۆر بەکورتی دەڵێن: هەندێ لە زانایانیش لە کاتی خۆیدا وتوویانە: "گرنگ ئەوە نییە بتوانی لە ماوەیەکی قیاسیدا (دەنگ) بگوازێتەوە بۆ شوێنێکی دوور، تەنانەت ئەوەش گرنگ نییە کە بتوانرێ (وێنەش) لەو ماوە (قیاسی)یەدا بگەیەنرێتە شوێنێکی دوور، بەڵکو گرنگ ئەوەیە بتوانرێ (تەنێك) لە شوێنێکەوە بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی دوور لە ماوەیەکی (قیاسی)دا.. دەی قورئان پێش هەزارو چوارسەدو ئەوەندە ساڵ بەر لە ئێستا باس لە شتێکی وا دەکات لە ڕێگەی چیرۆکی یەکێك لە پێغەمبەرەکانەوە کە حەزرەتی سولەیمانە ...

قورئان دەفەرموێت: "أَيُّكُمْ يَأْتِينِي بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِي مُسْلِمِينَ؟ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِين. قَالَ الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ مِّنَ الْكِتَابِ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ فَلَمَّا رَآهُ مُسْتَقِرّاً عِندَهُ قَالَ هَذَا مِن فَضْلِ".

---

610 رواه الترمذي عن ابي سعيد/ اسباب النزول/ السيوطي (ص٣٨٣)ی پەراوێزی (مفردات القرآن).

611 بۆ درێژەی ئەم باسە سەیری (اصول الأحكام) (د. محمد الكبيسي و د. صبحي جميل) (ل٥٠)، بکە.

612 سەیری "اصول الدين الاسلامي" (رشدي عليان و قحطان الدوري) (ص٣٥٦) بکە بۆ زانیاری زیاتر.

واتە: سولەیمان بە ڕاوێژکارەکانی خۆی فەرموو: کێ ئەتوانێ عەرشی بەلْقیسم لە "یەمەن" ەوە بۆ بهێنێ بۆ "فەلەستین" پێش ئەوەی خۆیان بێن .. عیفریتێك لەناو پەرییەکاندا ووتی: من ئەتوانم لەو ماوەیەدا کە لە دەوامدای بۆتی بهێنم پێش ئەوەی لێرە بڕۆی. یەکێکی تر کە زانیاری باشی لە کتێبدا هەبوو وتی: من لە چاوترووکاندنێکدا بۆتی ئەگوازمەوە، کە سولەیمان بینی خێرا عەرشەکەی بەلقیس ئامادە بوو لەلایدا فەرمووی ئەمە فەزلی خوایە ..

جا هێنانی ئەم "عەرشە" نە"کەرامەتە" نە"معجزە"یەو نە"سیحر"یشە... چونکە سولەیمان خۆی نەیکرد تابڵێن ئەوە "معجزە"بوو، "ساحر"و "پیاوی سالح"یش لەناو باسەکەدا نییە، ئەوەی هەیە "الَّذِي عِندَهُ عِلْمٌ"، کەواتە گواستنەوەی ئەم عەرشە لەسەر بناغەیەکی زانستی کراوە، نەك شتیتر، مەسەلەکەش زۆر ئاسانەو ڕێگەی تێئەچێ وەکو "علم"و وەك "عقل"یش، چونکە هەموو ماددەی دونیا لەسێ بەش پێك دێت "ئەلەکترۆن"، "پرۆتۆن"، "نیوترۆن"، "ئەلەکترۆن کە بارگەی سالبی هەڵگرتووەو بەدەوری ناوکدا ئەسوڕێتەوە، کە بارگەی "موجەب"ی لە پرتۆنەکەیدا هەڵگرتووەو هێزی کێشکردن لەنێوانیاند هەیە، ئەگەر ناوك بەهێز بکرێت و ئەلکترۆنەکان ڕابکێشێ بۆ خۆی ئەوە تیشك دروست ئەبێت و تیشکیش لە یەك"چرکە"دا "٣٨٦" سێسەدو هەشتاو شەش هەزار میل ئەبڕێت، یانی ئەگەر تیشکێك لە مانگەوە دەربچێت بە "٦" چرکە ئەگاتە سەر زەوی، هەروەها زانایان گەیشتونەتە ئەوەی کە ماددە ئەبێتەوە بە "ووزە "و "ووزەش" ئەبێتەوە بە ماددە. کەواتە ئەگەر وتیان دەزگایەك دروست کراوە لە شێوەی "ئوتومبێلێکدا" یان کابینەیەکی تەلەفۆندا، تەنێك بخەیتە ناوی لە ماوەیەکی "قیاسی "دا ئەیگوازێتەوە بۆ شوێنیکی دوور، مسوڵمان یەکەمین کەسێك ئەبێت کە بڕوا بەو مەسەلەیە بکات، چونکە قورئان باسی شتێکی وای کردووە. ئەمە تەنیا نموونەیەکە هەرکەس ئەیەوێ زیاتر لەم باسە شارەزا بێت با هەندێ کتێبی وەك "الطب محراب الایمان"و یان "قصه الایمان" یان "مناهل العرفان" بەرگی دووهەم بخوێنێتەوە...

بۆ دەستەی چوارەمیش زانایان ئەڵێن: یەکێك لە گەورەترین لایەنی ئیعجاز لە قورئاندا، بریتییە لە لایەنی "بەلاغی" قورئان، کە چەند تایبەتمەندییەکی ئەم بەلاغەتە باس ئەکەن لەوانە:

١. جوانی داڕشتن و هۆنینەوەی ووشەکان بەشێوەیەك بەپێی دەستوری فۆنەتیك ڕەچاوی جوانی و شیرینی زۆری تێداکراوە، عەرەبی زان زۆر بەخێرایی هەست بە بەرزی ئاستی داڕشتنی قورئان ئەکات و کەسی ناعەرەبیش کە قورئان خوێنێکی شارەزاو دەنگ خۆش، چەند ئایەتێکی بۆ ئەخوێنێ هەست بەجوانی و وردەکاریەکەی ئەکات.

٢. هەموو توێژێکی خەڵکی تێر ئەکات، چ عەوامی خەڵك و چ خوێندەوار، هەردووکیان چێژ ئەبەن لەقورئان چ وەکو ئیقاع و مۆسیقاکەی چ وەکو ماناو مەبەستەکانی، هەر کەسەو بە پێی ئاستی "دەرکی" خۆی.

٣. "عەقڵ و عاتیفە" پێکەوە ئەدوێنێ و تێریان ئەکات، چونکە قسە لەگەڵ دڵ و عەقڵدا ئەکات، بۆ نموونە ئەفەرموێت: "وَمِنْ آيَاتِهِ أَنَّكَ تَرَى الْأَرْضَ خَاشِعَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ" (فصلت: ٣٩)

سەیری پشکی "عەقڵ"و پشکی "عاتیفە" بکە لەو ئایەتە کورتەدا.... باسی قیامەت و زیندووبوونەوە بە جوڵاندنی "عەقڵ" تاقبوڵی زیندووبوونەوە بکات...

یەکێك لە ئایەت و بەڵگە ڕۆشنەکانی خوا لە سەر زیندووبونەوەو دەسەڵاتی بێ سنوری خوا ئەوەیە: تۆ ئەم زەوییە ئەبینی کش و مات و ملکەچانە لەنگەری گرتووە، کە ئاو ئەڕژێنین بە سەریدا یەکسەر دەست بە جوڵەجوڵ دەکات و کەیف ئەخواو زیندوو ئەبێتەوە گیا شین ئەکات و تۆو سەر دەردێنێ "دەی ئەوەی ئەم زەوییە زیندوو ئەکاتەوە، هەر ئەوەیە مردووش زیندوو ئەکاتەوە، دڵنیا بن ئەو خوایە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا ئەڕوات".

٤. جوانی خوێندنەوەی بابەتەکان و سورەت و ئایەتەکان پێکەوە، بەڕادەیەك ئەوەی هەندێ ووردبێتەوە حاڵی دەبێ لە هۆنینەوەو ڕیزکردنی بابەت و ئایەت و سورەتەکاندا ووردەکاریەکی زۆر کراوە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: "سورەتی فاتیحە" بناغەو بنەڕتی هەموو قورئانە، باقی سورەتەکانی تر هەریەکەی لەلایەکەوە شەرحی برگەیەکی "فاتحە"ی کردووە ،نەك ئەمە بەڵکو ئیمامی سیوطی کتێبێکی داناوە بە ناوی "تناسق الدرر فی تناسب السور" ئەڵێ: "یەکێك لەو منەتە

گەورانەی خوا بەسەرمەوە ئەوەیە کە یارمەتیدامو عەقڵی کردمەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو نهێنیە گەورەیەی قورئان ئەویش ئەوەیە ئەم قورئانە هەمووی پێکەوە پەیوەستو گرێدراون بە یەکەوە". پاشان باسی نزیکەی نۆزدە جۆر پەیوەندی قورئان لەناو خۆیدا ئەکات، بۆ نموونە سەر باسەکان بەم شێوەیە ڕیز ئەکات:

یەکەم: ڕوونکردنەوەی هۆی ڕیز کردنی سورەتەکانو فەلسەفەی دانانی هەریەکەیان لەو شوێنەدا.

دووهەم: ڕوونکردنەوەی ئەوەی هەموو سورەتێك شەرحو لێکدانەوەی سورەتی پێش خۆیەتی.

سێهەم: ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە کۆتایی هەموو سورەتێك سەرەتایە بۆ سورەتی دوای خۆیو پێکەوە گرێ دراون.

چوارەم: گونجاوی سەرەتاو دەسپێکی هەموو سورەتێك، بۆ ئەو بابەتانەی لەسورەتەکەدا هاتوون.

پێنجەم: گونجاوی بابەتەکانی هەموو سورەتێك لە سەرەتاکەیەوە، لەگەڵ بابەتەکانی هەمان سورەت لە کۆتاییەکەیەوە.

شەشەم: گونجاوی ڕیزکردنی ئایەتەکان یەك لەدوای یەك بەشێوەیەك تەنسیق لەنێوان هەموویاندا هەیەو پێکەوە گرێ دراون ... ".

ئیمامی سیوطی ئەڵێ: "خوای گەورە کتێبە کەی خۆی بەسورەتی "فاتحە" کردووەتەوە، چونکە هەرچی مەبەستەکانی قورئان هەیە لە ناواخنی ئەم سورەتەدا دایناوە... هەر بۆیە سورەتی "فاتحە" ناونرا "أم القران"و "أم الكتاب"و "الأساس"، بەو شێوەیە بووەتە ئەدرەسو ناسنامەی قورئان ... حەسەنی بەصری خوای لێ ڕازی بێ ئەڵێ: "خوای گەورە چی زانستو زانیاری کتێبە پێشووەکان هەیە ئاخنیویەتیە سورەتە "مفصل"ەکان، هەموو سورەتە "مفصل"ەکانیشی ئاخنیوەتە ناو سورەتی "فاتحە"، بۆیە هەر کەسێك تەفسیری سورەتی"فاتحە" بزانێ وەك ئەوە وایە تەفسیری هەموو کتێبە ئاسمانییەکان فێر بووبێت"، ئەم قسەیە لە "شعب الايمان"ی بەیهەقیدا هاتووە ...

"ئیمام فخرالدین"یش ئەڵێ: "مەبەستی هەموو قورئان ئەوەیە کە چوار شت هەیە ڕۆشنی بکاتەوە بۆ خەڵك: ئیلاهیات، زیندوبونەوە، پێغەمبەرایەتی، کارو فرمانی خوا "قەدەرو قەزا": دەی "الحمد لله رب العالمین" باسی ئیلاهیاتەکەیە، "مالك يوم الدين" باسی زیندوو بوونەوەکەیە،"اياك نعبدو اياك نستعين" باسی "قەدەرو قەزاکە"یەو "جەبرییەت" هەڵدەوەشێنێتەوە، "اهدنا الصراط المستقيم"وە تا کۆتایی سورەتەکە باسی پێغەمبەرایەتیو کاری خوایە لەگەڵیان ... بەو شێوەیە سورەتی "فاتحە" هەر چوار مەبەستەکەی قورئانی گرتەوەتە خۆی."

پێنجەم: کۆکردنەوەی شێوازی "ئیجمال"و "بەیان" پێکەوە ..

شەشەم: کەمترین پیت بەکار ئەهێنێ بۆ دروست کردنی ووشەیەك وکەمترین ووشە بەکادێنێت بۆ دروست کردنی ڕستەیەكو کەمترین ڕستە بەکادێنێ بۆ گەیاندنی مەبەستێك، بەبێ ئەوەی کە کەموکوڕی لە قسەو مەبەستەکاندا دروست بکات، نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەگەر یەك پیت لە وشەیەکی قورئان، یان یەك ووشە لە ڕستەیەکدا، یان یەك ڕستە لە مەبەستێکدا دەربهێنی، خێرا پێوەی دیار ئەبێتو چەند بگەڕێی بە خۆی نەبێ چاك نابێتەوە، با نموونەیەك بۆ ئەوە باس بکەین لە جیاتی هەر سێ بڕگەکە:

خوای گەورە ئەفەرموێت "ليس كمثله شئ" واتە "هیچ شتێك لە هاوشێوەی خوا نییە"و بە عەرەبی یانی "ليس مثل مثله شئ"، خەڵك وائەزانێ ئەو "كاف"ە زیادەیەو بەس بوو بووترێت "ليس مثله شئ" بەڵام زانایان باسی فەلسەفەی ئەو "كاف"ە ئەکەن و دەری دەخەن کە نەك زیادە نییە، بەڵکو نەبوونی "کەلێن" لە واتاو مەبەستەکانی ئایەتەکەدا دروست دەکات .. چۆن؟

"زۆربە"ی زانایان ئەڵێن ئەو"كاف"ە پێویستە ببێت لەو ڕستەیەدا بۆ ئەوەی نەکەوینە ئەو گومانەوە کە لەوانەیە خوا هاوشێوەیەکی هەبێت، چونکە بڵێی "ليس مثله شيء" یان "ليس كالله شيء" ئەوە نەفی کەسێك ئەکات هاوشانی خوا بێت.. بۆ نمونە تۆ ئەڵێی "ليس لفلان ولد يعاونه"، کابرا منداڵێکی نییە هاوکاری بکات، یان ئەڵێی: " ليس محمد أخا لعلي".. لە هەردوو حاڵەتەکەدا تۆ نەفی ئەوەت کردووە کابرا منداڵێکی نییە هاوکاری بکات، یان موحەممەد برای عەلی نییە، بەڵام نەفی ئەوەی تێدا نییە کە کابرا منداڵی هەبێت.. بەڵام هاوکاری ناکەن، یان موحەممەد بەڵێ برای عەلی نییە بەڵام برای تری مومکینە هەبێت، ئایەتەکەش ئەگەر بڵێی (ليس مثله شيء) نەفی کەسێك ئەکات وەك خوا بێت لە دەسەڵاتو

سیفات‌و زاتدا، به‌لاَم نه‌فی ئه‌وه‌ی تێدا نابێت كه‌ مومكینه‌ خوا "شبیه"ی ببێت، به‌س نه‌گاته‌ ئه‌و .. به‌لاَم كه‌ وترا "لیس كمثله شيء" واته‌ كه‌س نییه‌ هاوتای خوا بێت، ئه‌وه‌ ئیتر ده‌رگای ئه‌و گریمانه‌ش به‌ ته‌واوتی دائه‌خرێت[613].

٧. گرێدانی باسه‌كانی دنیا به‌ ئاخیره‌ته‌وه‌، باسه‌كانی ژنان به‌ پیاوان‌و منالاَنه‌وه‌، باسه‌كانی "ئاشتی" به‌ "شه‌ڕ"ه‌وه‌، باسه‌كانی "كۆمه‌ڵ" به‌ "تاك" ه‌وه‌.

٨. یه‌كێكی تر له‌و ئیعجازه‌ گه‌ورانه‌ ئیعجازی "ژماره‌یی"یه‌ وه‌ك زانایان باسی ده‌كه‌ن ... بۆ نمونه‌: ژماره‌ی "بسم الله الرحمن الرحیم" له‌ قورئاندا له‌ "نۆزده‌" پیت دروست بووه‌، "ب١، س٢، م٣، ل٤، ا٥، ه‌٦، أ٧، ل٨، ر٩، ح١٠، م١١، ١٢١، ن١٣، أ١٤، ل١٥، ر١٦، ح١٧، ی١٨، م١٩"، سه‌یر له‌وه‌دایه‌ كه‌ ئه‌م "بسم الله الرحمن الرحیم"ه‌ هه‌موو بڕگه‌كانی واته‌ "اسم، الله، الرحمن، الرحیم" له‌ هه‌موو قورئاندا یان"١٩"یان به‌ ژماره‌یه‌ك به‌كارهێنراوه‌ كه‌ چه‌ند جاره‌ی "١٩" بێت!! سه‌یر بكه‌:

. ووشه‌ی"اسم" "نۆزده‌" جار له‌ قورئاندا هاتووه‌ .

. ووشه‌ی "الرحمان"، "په‌نجاو حه‌وت" جار هاتووه‌، واته‌ "٣ ×١٩".

. ووشه‌ی "الرحیم"، " ١١٤" جار هاتووه‌، واته‌ "٦×١٩"

. ووشه‌ی "الله"، "٢٦٩٨" جار هاتووه‌ واته‌ "١٤٢×١٩".

. ووشه‌ی "بسم الله الرحمن الرحیم" خۆیشی "١١٤" جار هاتووه‌، واته‌ "٦×١٩".

ئه‌مه‌ چ ئامارێكی ورده‌؟ ئه‌گونجێ ئه‌مه‌ هه‌ر له‌ خۆیه‌وه‌ ڕێكه‌وتبێت؟ یان وه‌ره‌ سه‌یری نهێنی ئه‌و پیتانه‌ بكه‌، كه‌ له‌ سه‌ره‌تای هه‌ندێ سوره‌تدا هاتووه‌، وه‌ك "الم، حم، ص، كهیعص"و به‌و شێوه‌یه‌ .. ئاماری له‌وه‌ی پێشوو ورده‌كارتره‌...

* هه‌موو ئه‌و پیتانه‌ی له‌ سه‌ره‌تای سوره‌ته‌كاندا هاتوون، هه‌ریه‌ك له‌و پیتانه‌ به‌ چه‌ند جاره‌ی "١٩"، له‌ناو ئه‌و سوره‌ته‌دا دووباره‌ ئه‌بێته‌وه‌[614].

بۆ نمونه‌ سه‌یر بكه‌:

. پیتی (ق) له‌ سوره‌تی (ق والقرآن المجید)دا په‌نجاو حه‌وت جار هاتووه‌ واته‌ (٣×١٩).

. پیتی (ص) له‌ سوره‌تی (ص والقرآن ذی الذكر)دا (سه‌دو په‌نجاو دوو) جار هاتووه‌ واته‌ (٨×١٩).

. پیتی (ن) له‌ سوره‌تی (ن والقلم)دا (١٣٣) جار هاتووه‌، واته‌ (٧×١٩).

. پیتی (ط) له‌ سوره‌تی (طه‌)دا (٣٤٢) جار هاتووه‌، واته‌ (٨×١٩).

. پیتی (یس) له‌ سوره‌تی (یس)دا (٢٨٥) جار هاتووه‌، واته‌ (١٥×١٩).

. پیتی (المر) له‌ سوره‌تی (الرعد)دا (١٥٠١) جار هاتووه‌، واته‌ (٧٩×١٩).

هه‌ر به‌و شێوه‌یه‌ هه‌موو سوره‌ته‌كانی تر، تۆ بڵێی ئه‌مه‌ هه‌روا له‌ خۆیه‌وه‌ بوو بێت‌و ڕێكه‌وت بێت، یان ئه‌م چنین‌و دارشتنه‌ به‌مه‌به‌ست‌و به‌ عیلم كراوه‌، بۆ زیاتر قه‌ناعه‌ت كردن، سه‌یری ئه‌م مه‌سه‌له‌یه‌ بكه‌: له‌ قورئاندا به‌ هه‌میشه‌یی كه‌ باسی "گه‌لی لوط" ئه‌كرێ ئه‌فه‌رموێ: "قوم لوط" .. "إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمِ لُوطٍ" هود/ ٧٠. "فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ، وَقَوْمُ إِبْرَاهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ". الحج / ٤٣. به‌لاَم ته‌نیاو به‌ته‌نیا له‌ سوره‌تی"ق والقرآن المجید"دا ئه‌فه‌رموێ: "أخوان لوط" نه‌ك "قوم لوط"، ئه‌زانی بۆ؟ چونكه‌ ئه‌گه‌ر بیوتایه‌ "قوم لوط" دانه‌یه‌ك پیتی "ق" زیادی ئه‌كردو ئه‌وكاته‌ ژماره‌ی "قاف"ه‌ هاتووه‌كان ئه‌بوونه‌ "٥٨" ئه‌و كاته‌ نه‌ئه‌بوویه‌ چه‌ند جاره‌ی (١٩)!!.

بۆیه‌ له‌ جیاتی "قوم لوط"، "أخوان لوط" به‌كار ئه‌هێنی وه‌ك ئه‌فه‌رموێت: "كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ، وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ". ق /١٢/١٣.

---

613 ـ ئه‌وه‌نده‌ی خوێنه‌ران لێی حالّی بن لێی له‌ سه‌لماندنی ئه‌م بابه‌ته‌م گواسته‌وه‌، هه‌ر كه‌سیش بۆ زیاتر شاره‌زابوون با سه‌یری (النبأ العظیم) ص١٣١ تا ١٣٦ یان "مناهل العرفان: ٣١٩/٢بۆ ٣٢٧) بكات.

614 ـ سبحان الله، وه‌ك چۆن "بسم الله الرحمن الرحیم" كلیلی سوره‌ته‌كانه‌، ئه‌و پیتانه‌ش حیسابی كلیلی سوره‌ته‌كانیان بۆ كراوه‌، به‌چه‌ند جاره‌ی نۆزده‌ده‌ دووباره‌ ده‌بنه‌وه‌.

هەروەها لە سورەتی "أعراف"یشدا ئەم شتە دووبارە بووەتەوە، لە ئایەتی "٦٩"دا ئەفەرموێ: "وزادكم في الخلق بصطة" واتە: بە "ص" وتویەتی بەڵام لە ئایەتی "٢٤٧"ی سورەتی "البقره"دا ئەفەرموێ "وزادة بسطة في العلم والجسم" هۆكەشی ئەوەیە، سورەتی "الأعراف" بە "المص" دەست پێدەكاتو "البقره" بە "الم" دەست پێدەكات، جا ئەگەر وانەبوایە، ئەو "كەلێن" ئەكەوتە ژمارەكە، لە كاتێكدا بنچینە وایە "س" بەكاربهێنرێ لە وشەكەدا [٦١٥].

زانایان شتێكی تریش ئەڵێن: "ئەو سورەتانەی سەرەتا بە پیتێكی دیاری كراو دەست پێ ئەكەن، ئەو ووشانە زۆرتر دووبارە ئەبنەوە، كە ئەو پیتانەیان تێدایە، ووشەی (قافی) زۆرتر لە سورەتی (ق)دا هەیەو ووشەی (صاد)ی لە سورەتی (ص)دا زۆرتر هەیە [٦١٦].

هەر بۆ زیادە ڕوونكردنەوە سەیری ئەم شتە ووردانەی تر بكە:

. ووشەی "الدنيا"و ووشەی "الاخره" لە قورئاندا هێندەییەك بەكارهاتوونو یەكی"١١٥" جار هاتوون.

. ووشەی "الملائكە"و ووشەی "الشياطين" لە قورئاندا بەقەدەر یەك هاتوونو یەكی (٨٨) جار هاتوون.

. ووشەی "الموت"و لێوەرگیراوەكانیو ووشەی "الحياة" لە قورئاندا بەقەدەریەك هاتوون، واتە "١٤٥" جار، ئەی مەگەر هەر "ژیان" نییە كە "مردن"ی بەسەردا دێت.

. ووشەی "الصيف"و ووشەی "الشتاء" یەكی (٥) جار لە قورئاندا هاتووە.

. ووشەی "السيئات"و ووشەی "الحسنات" بە لێوەرگیراوەكانیانەوە یەكی (١٦٧) جار هاتوون لە قورئاندا.

. ووشەی "الناس"و ووشەی "الرسل" یەكی "٢٤١" جار هاتوون. ئەی مەگەر پێغەمبەران بۆ خەڵك نین؟!

. ووشەی "الكفر"و ووشەی "الأيمان" یەكی "١٧" جار بەكارهاتون لە قورئاندا.

. ئایا ئەزانی ووشەی "الشهر"و "اليوم"و "الأيام" هەریەكەیان بە ژمارەی خۆیان لە قورئاندا هاتوون. واتە(١٢) جار ووشەی "الشهر" لە قورئاندا هاتووەو ساڵیش دوانزە مانگە.

(٣٠) جار ووشەی "الأيام" بەكارهاتووەو مانگیش (٣٠) ڕۆژە.

بەڵام (٣٦٥) جار ووشەی"اليوم" بەكارهاتووە، چونكە ساڵ (٣٦٥) ڕۆژە!!

ئەمە چ دیقەتو وردەكارییەكە ئەی خەڵكینە، ئەمە كەی لە توانای (مرۆڤ)دا هەیە ئەوەندە بە حسابات قسە بكاتو بەو شێوەیە بی پێوێت!!

ئەم هەموو ئیعجازە لەلایەكو، ئەو ئیعجازە زۆرەی تری قورئان لە لایەك، كە هەندێ لە زانایان باسی دەكەن، كە ئێمە لەم خاڵانەدا كۆی دەكەینە وەك:

١. كۆنترۆڵ كردنی خەڵكو كەمەندكێش كردنیان بۆ لای خۆی .. "ئیبن كەسیر" لە ئیمامی بەیهەقییەوە ڕووداوێكی سەیرو خۆش ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ: ئەبوجەهلو ئەبوسوفیان و ئەخنەسی كوڕی شەریق شەوێكیان لە ماڵ هاتنەدەرەوە بۆ ئەوەی خۆیان لە پێغەمبەر (ﷺ) دابگرن بزانن چی ئەكاتو چی ئەخوێنێو كەسیان ئاگایان لە یەكتری نەبوو تا بەیانی گوێیان بۆ قورئان خوێندنی پێغەمبەر گرتو كە ڕۆژ بوویەوە لە ڕێگە بە یەكتری گەیشتن زۆر لۆمەی خۆیانیان كردو وتیان باشە ئەمە ئەگەر خەڵك پێمان بزانێ چی دەڵێن با پەیمان بدەین دووبارەی نەكەینەوە، چونكە گێلو گەوارەكانی ناومان ئەمە بزانن كەمەندكێش ئەبن بۆی.

كە شەوی دووهەم هات هەریەكەیان وەك شەوی پێشوو، چوونەدەرەوەو لەهەمان شوێندا خۆیان داگرتو دەستیان كردە گوێ شل كردن بۆ قورئان خوێندنەكەی پێغەمبەر (ﷺ) كە ڕۆژ بوویەوەو بە هەمان شێوە لە ڕێگەدا گەشتنەوە بەیەك لۆمەی یەكتریان زۆر كردو وەعدیان بەیەكتریدا دووبارەی نەكەنەوە، بەڵام شەوی سێیەمیش هەر بە هەمان شێوە هاتنەوە بۆ گوێگرتن، كە لە ڕێگەدا بەیەكتری گەیشتنەوە پەیمانی قورسیان لە یەكتری سەند ئیتر شەوێكی تر نەیەنەوە، كە ڕۆژبوویەوەو خۆرو بان كەوت ئەخنەسی كوڕی شەریق گۆچانەكەی هەڵگرتو چوو بۆ ماڵی ئەبو سوفیانو وتی: "ئەرێ

615 ـ التعبير القرآني / د. فاضل السامرائي ص١٤.

616 ـ التعبير القرآني / د. فاضل السامرائي ص١٤.

باوكی "حەنزەلە" تۆ ڕاو بۆچوونت چۆنە؟ دەربارەی ئەو شتەی موحەممەد ئەیخوێند؟!! ئەبوسوفیان وتی: وەڵڵاهی باوكی "سەعلەبە" شتی وای تێدایە، زۆر مەعلومو ڕۆشنەو شتی واشی تێدایە نازانم مەبەستی چییە؟!

ئەخنەس ووتی: منیش بەهەمان شێوە وەك تۆم، هاتە دەرەوەو چوو بۆ ماڵی "ئەبو جەهل"و چووە ژوورەوەو ووتی: ئەرێ "ئەبولحەكەم"، ڕات چییە؟ لەوەی لە موحەممەدت بیست؟ ئەبو جەهل ووتی: چیم بیستووە؟ ڕاستیەكەی ئەوەیە ئێمەو بنەماڵەی "عەبدول مەناف" كێ بەركێی بەردەوام لەنێوانماندا هەیە، ئەوان شانازی ئەكەن بەوەوە كە نانی خەڵك ئەدەن، ئێمەش نان ئەدەین بە خەڵك، هاوكاری خەڵك ئەكەن، ئێمەش ئەیكەین؟ ... وەك دوو سوارمان لێهاتووەو لەپێشبڕكێداین، لەپڕێكدا ووتیان: ئێمە پێغەمبەرمان تێدا هەیەو لەئاسمانەوە هەواڵی بۆ دێت: باشە ئەی ئێمە چۆن ئەوە بەدەست بهێنین؟ وەلاهی نەبڕوای پێ ئەكەین نە شوێنی ئەكەوین، ئەخنەس هەستاو لەماڵەكە هاتە دەرەوە ..."[٦١٧] ... ئەڵێن كابرایەكی "نەسرانی" ئەدات بەلای یەكێكدا، قورئان ئەخوێنێت بە دەنگی بەرز، ڕائەوەستێو چاوی پڕ ئەبێت لە فرمێسك، لێی ئەپرسن ئەوە بۆچی دڵت پڕ بوو؟ ئەڵێت: بەلاغەتو دڵتەنگییەكەی دڵی پڕ كردووم![٦١٨]

٢. ئەو هەموو یاسا ووردو پڕ مەبەستانەی كە دایناوە، چ بۆ "حزبایەتی كردن" بەكاری بهێنی، چ بۆ "دەوڵەت كردن" بەكاری بهێنی.

٣. ئەو هەموو زانیارییە ووردەی لە سەر "طب"و "فەلەك"و "مێژوو"و "نەفس"و "ڕۆح"و "دەریاكان"و "گیانداران"... هتد، كە هەرگیز لە توانای كەسی ئەو سەردەمە نەبووە، نەك پێغەمبەر (ﷺ) ..

كەواتە لەمانەوە بۆمان دەرئەكەوێت كە پێغەمبەر (ﷺ)، نەتوانای هەبووە ئەم قورئانە دابنێ نەكەسیش ئەو كاتە بڕوای ئەكرد كە بتوانێ قورئان دابنێ، چونكە لە هەموو ڕوویەكەوە دیارە كە قورئان "معجزە"یەو معجزەیەكی زۆر گەورەش ...

ئەمەی كە ووتمان هەمووی وەلامی ئەوە بوو كە قورئان ئەگەر هی خوا نەبێ دوو گریمان هەیە:

گریمانی یەكەم: هی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی بێت.

گریمانی دووهەم: لە خەڵكی ترو سەرچاوەی تر وەریگرتبێ.

ئەوە گریمانی یەكەممان تەواو كرد، با زۆر بە كورتی گریمانی دووهەمیش بڕەوێنینەوە.

هەڵوەشاندنەوەی گریمانی دووەم: قورئان لە سەرچاوەی ترەوە وەرگیراوە زانایان ئەڵێن:

١. ئەو مامۆستایە ئەبێت كێ بێ كە پێغەمبەر (ﷺ) قورئانی لێوە وەرگرتبێت؟

. ئەگەر لە ناو عەرەبەكان خۆیاندا بووبێت، ئەوە عەرەب لە جاهیلیەتیەكی گەورەدا ئەژیانو هیچ سەرچاوەیەكی مێژوویی باس لەوەها گریمانو گومانێك ناكات.

. ئەگەر شتی وا هەبووبێت موشریكینی قوڕەیش بۆچی جامی توڕەیی خۆیانیان نەئەڕشت بەسەر ئەو كەسەدا، وەك بەسەر پێغەمبەردا ئەیان ڕشت؟

. ئەگەر شتی وا بووبێت، ئەو مامۆستا بۆ ئەوەندە گێلو داماو بووە، ئەم شانازیو ناوداریيەی لە دەست خۆی داوە؟!

. ئەگەر ئەڵێن "بوحەیرا" یان "وەرەقەی كوڕی نەوفەل" بووە، ئەوە بینینی پێغەمبەر "ﷺ" بۆ ئەو دووانە بە نهێنی نەبووەو یەكی جارێك بینیونی بە شایەتی مێژوو(*)، كە وەرەقەشی بینیوە خەدیجەی لەگەڵدا بووە، كە "بوحەیرا"شی بینیوە ئەبوسوفیانی لەگەڵدا بووە... پاشان با بپرسین: ئەو بینینانە ماوەكەیان چەند بووە؟ ئایا ئەو حیوارو قسەكردنە چی بووەو لەسەر چی بووە؟! پێغەمبەر"ﷺ"، "بوحەیرا"[٦١٩]ی لە شام بینیوە كە ئەو كاتە تەمەنی لە بیست ساڵاندا بووە،

---

[617] ـ مامۆستا پارەزانی لە كتێبی "نمونەیەك لە ئیسلام"دا ئەم ڕووداوە لە ژێر ناونیشانی "قورئان دڵان كەمەندكێش دەكات" ئەگێڕێتەوە، (السیره النبویه)، (ابن كثیر ٥٠٥/١) بكە.

[618] ـ أصول الدین ص٢٣٨.

* مێژووی ڕاستەقینە تەنیا ئەو دوو جارە باس ئەكات، كێش زیاد لەو دووجارە بڵێ ئەبێ بەڵگەی مێژوویی بهێنێ، ئەگینا قسەكەیان ئەبێتە قسە هەڵبەستن... سەیری (النبأ العظیم) محمد عبدالله دراز بكە..

[619] ـ هەمان قسەش بۆ ئومەیەی كوڕی ئەبی سەڵت ئەكرێ: گوایە ئەو شیعرو شتانەی لە (بوحەیرا)و پیاوانی كڵێسا وەرگرتبێت، سەیری كۆمەڵگا ل٢٦١ بكە.

بوحەیراش کە سەیری ئەکات سیماو ئەخلاقی پێغەمبەرێکی تێدا ئەبینیٚ، وەرەقەی کوڕی نەوفەلیش کە ئەبینیٚ شایەتی پێغەمبەرایەتی بۆ ئەدات‌و پێشی ئەڵیٚ: ئەگەر بمێنم ئەو ڕۆژەی گەلەکەت شاربەدەرت ئەکەن پشتیوانیت لیٚ ئەکەم بەدڵنیاییەوە .. کەواتە ئەم دووربینینە نابێتە بەڵگە بۆ ئەوەی قورئان لەو دوانەوە وەرگیرابێت .. لەبەر:

١. ئەوان "بوحەیرا" و "وەرەقە" شتی وایان نەوتووە.

٢. مەعقول نیە بەچەند دەقیقەیەك بینین ئەو هەموو "معارف "ە وەربگیرێت‌و لەبەر بکرێت!

٣. زانیارییەکانی ناو قورئان زۆر دژ بە زانیارییەکانی ناو "ئینجل" و "تەورات" ن.

٤. جولەکە بۆ نەیان ئەوت: موحەممەد ئەوەی تۆ شانازی پێوە دەکەی لە بناغەدا هی ئێمەیەو کۆتایی بە "ململانیٚ" یان بهێنن لەگەڵ ئیسلام و پێغەمبەردا.

٥. یان بۆ منەتان نەئەکرد بەسەریداو بڵێن "هذه بضاعتنا ردت إلینا" و بۆ خۆیان خەڵك لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوەو ئاوەها دەربەدەری شارو وڵاتان نەبوونایە.

٦. هەر کەسێك ڕێز لە خۆی بگریٚ پێویستە بەبەڵگەوە قسە بکات‌و هەر کەسیش ڕێزی خۆی لا نەبێت چۆن حەز ئەکات باگەزو پێوانەی بکات، بەڵام هەرچی بڵێت زۆر نابا سەری لە خۆهەڵوەشاندنەوە دەرئەچێت‌و سەرەتای قسەکانی کۆتایی قسەکانی هەڵدەوەشێنێتەوە، ئەوەتا ئەڵێن: بوحەیرا ووتی: ئەمە داهاتوویەکی گەورەی ئەبێت‌و ئاگاتان لێی بیٚ، "وەرەقە" ووتوویەتی: ئەمە ئەو "ناموس" یە هاتووە بۆ تۆ کە بۆ "موسی" هات، کەچی ئاگایان لە خۆیان نییە ئەڵێن: ئەم قورئانە یان تەڵقینی پێغەمبەریش کرد، ئاخۆ کابرا چۆن دان بەپێغەمبەرایەتییەکەیدا ئەنیٚ و خۆشی لیٚ ئەکات بە مامۆستا.

٧. قورئان پڕە لە ڕەخنەو لۆمە لەسەر "یەهودو نەصاری" و ڕیسوایان دەکات کە چۆن دەستیان خستووەتە دین و تێکیان داوە، ئەوەتا ئەفەرمویٚ: "وقالت الیهود والنصاری نحن أبناء الله واحباؤه"، "لقد کفر الذین قالوا ان الله هو المسیح ابن مریم"، "لقد کفر الذین قالوا ان الله ثالث ثلاثة"، " قل یا اهل الکتاب لم تصدون عن سبیل الله من امن تبغونها عوجا" لە سورەتی "النساء" دا یەك زنجیرەی درێژ لە تاوان‌و لادانیان ڕیز ئەکات‌و ئەفەرمویٚ: "فبما نقضهم میثاقهم وکفرهم بایات الله، وقتلهم الانبیاء بغیر حق وقولهم قلوبنا غلف .... تا ئەگاتە ئەوەی ئەفەرمویٚ: وبکفرهم وقولهم علی مریم بهتانا عظیما، وقولهم انا قتلنا المسیح عیسی ابن مریم ....تا ئەڕوات بۆ ئایەتێکی ترو ئەفەرمویٚ: "وبصدهم عن سبیل الله کثیرا واخذهم الربا وقد نهوا عنه واکلهم اموال الناس بالباطل ..." جا توخوا ئەمە ئەکریٚ قسەی ئەو سەرچاوانە بێت کە قورئانی لیٚ وەرگیراوەو مامۆستای پێغەمبەر "ﷺ" بووبن، یان بە پێچەوانەوە، قورئان مامۆستایەتی ئەوان ئەکات‌و ڕەخنەیان لیٚ ئەگرێت و هەڵەو پەڵەکانیان دەرئەخات‌و داوای تۆبەو بەخۆداچوونەوەیان لیٚ ئەکات.

٨. هەر قورئان باسی ئەوە ئەکات کە گاورو جوولەکە ڕەوشتیان بریتیی بووە لە شاردنەوەی "زانست" و زانیارییەکانیان‌و زۆر حەسودو بەخیل بوون ئەوەتا ئەفەرمویٚ: "یکتبون الکتاب بأیدیهم ثم یقولون هذامن عند الله لیشتروا به ثمنا قلیلا"، "قل من انزل الکتاب الذی جاء به موسی نورا وهدی للناس تجعلونه قراطیس تبدونها وتخفون کثیرا"، "یااهل الکتاب لم تلبسون الحق بالباطل وتکتمون الحق وانتم تعلمون ..." بەئاشکراو، ڕوونتر قورئان ئەفەرمویٚ: "وما انزلنا علیك الکتاب الا لتبین لهم الذی اختلفوا فیة" ئێمە ئەم کتێبەمان بۆ ئەوە ناردۆتە خوارەوە تا بەتەواوی ڕوونی بکەیتەوە بۆ گاورو جولەکەکان: ناکۆکی‌و کێشمە کێشمیان لەسەر چییە.

٩. ڕاستە قوڕەیش‌و کافرانی مەککە حەزیان ئەکرد کە ئەم قورئانە بدەنە پاڵ کەسێك وەك خۆیان مرۆڤ بێت، بەڵام زۆری نەئەبرد لەو قسەیە پەشیمان ئەبوونەوە، ئەیان ووت "إِنَّمَا يُعَلِّمُهُ بَشَرٌ"، ئەیان ووت "أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلاً" بەڵام ئەوان لەڕاستیدا "جدی" نەبوون لەم تۆمەتەیاندا "چونکە لەناخەوە بڕوایان هەبووە کە هیچ مرۆڤێك ناتوانێت، ئەوە بڵێت" بۆ ڕاستی ئەم قسەیە تۆزێك لەم ئایەتە ورد ببەرەوە .. "بَلْ قَالُواْ أَضْغَاثُ أَحْلاَمٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الأَوَّلُونَ" (الأنبیاء: ٥)!! سەیری ئەو دوودڵی‌و ڕاڕاییەی بێباوەڕانی تێکەوتووە".. بەڵکو ئەڵێن ئەم قورئانە کۆمەڵێك خەوی هەڵەج و بەڵەجە..نا بەڵکو درۆو هەڵبەستراوە ... نا بەڵکو قسەی شاعیرە... "ئەو دوو سیٚ ڕستەیە وێنەیەکی زۆر ڕۆشن و دیاری هەڵوێستی "شایەتێکی درۆزن" دەرئەخات کە ئیحراج ئەبێت‌و ئەمسەرو ئەوسەر ئەکات و

سەری لێ شێواوەو نازانێت بە چ لایەکدا شایەتومان بێنێ "انظُرْ كَيْفَ ضَرَبُواْ لَكَ الأَمْثَالَ فَضَلُّواْ فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلاً" (الإسراء: ٤٨)، الفرقان/٩.

مەسەلەی دووهەم: ئایا ڕاستە مەنسوری حەللاج شۆڕشگێرو فەیلەسوف بووە[٦٢٠]؟

فوئاد میسری ئەڵێ: "... حەللاج ڕای وایە وەك ئادەمیزادێك بە ڕەوشتی مرۆڤانەوە چووەتە جیهانی خواوەندەوەو ئەگەر سیفەتی خودایی لەخۆیدا نەبوایە ڕاستگۆ نەدەبوو"[٦٢١]، بوختانێکیش بەدەم "غەزالی"یەوە ئەگوازێتەوەو ئەڵێ: "یەکەم زانای ئیسلامیش کە مەسەلەی حەللاج زیندوو ئەکاتەوەو بەرگری لە بیروراو بۆچوونەکانی دەکا "غەزالی"یە"[٦٢٢]. دوای ئەوە ئیتر لەم لاولاوە سەرە مەقەستی خەڵك دەهێنێت‌و ئەیەوێ بیسەلمێنێ کە "حەللاج" کەسایەتییەکی گەورەو گرنگ بووە، بۆ نموونە ئەڵێ: " ئیبنو کەسیر" لە زمان خەزورەکەی "حەللاج"ەوە ئەڵێ: "کە دەمبینی ڕەوشت‌و هەڵسوکەوتی ئەوەندە جوان‌و ڕێك‌و پێکە، کچەکەی خۆمم لێ مارە کرد"[٦٢٣]. کەچی کە ئەگەڕێیتەوە بۆ "ئیبن کەسیر" سەیر ئەکەیت ئەمەی فوئاد مەجید میسری سەرە مەقەستەو ئەو واناڵێ، بەڵکو ئەڵێ: ".. ئەبو زورعەی تەبەری ئەڵێ: گوێم لە ئەبو یەعقوبی ئەقتەعی بوو ئەیوت: من کە ژنم دا بە حەللاج، لەبەرئەوە بوو ڕێگەو عیبادەتیم بە باش ئەهاتە بەرچاو، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم بۆم دەرکەوت کە ساحرو جادووگەرێکی فێڵبازو کافرێکی زۆر پیسە"[٦٢٤]. .. دەی تو خوا، خوێنەری بەڕێز، ئەمە؟! ڕاستە فوئاد میسری ئاوەها "قت"و "گوڵ" لە قسەی مێژوونووسان بکات‌و خوێنەر بخەڵەتێنێ؟!

لە لاپەرە (٢٤٤)یشدا ئەڵێ: "مەککی وتوویە[٦٢٥]، ڕۆژێك قورئانم ئەخویند، .. "حەللاج" پێی وتم: منیش دەتوانم هاوشانی قورئان بنووسم" هەر خۆی قسە ئەگوازێتەوە کە گوایە حەللاج دوو قۆناغی بووە لە ژیانیدا "سۆفێتی لە یەکەم قۆناغیدا"و لە پاشاندا خەرقەی سۆفیزمی فڕی ئەداو لەم قۆناغەدا نەیهێشتووە هەوادارانی خۆی شەهادەت بە زمانیاندا بێت[٦٢٦]". هەر لەهەمان لاپەڕەدا ئەڵێ: حەللاج لە پەنجا ساڵیدا وتویە: "تا ئێستا هیچ ئاینێکم نییە". هەروەها لە لاپەڕە (٢٦٩)دا ئەڵێ: "هەموو ئەو بیروڕایانەش (حەللاج) سەبارەت بە حەج‌و خانەی خوا هەیبوون هەمان بیروڕای قەرمەتیەکانەو جیاوازی لە نێوانیاندا نییە".

بەڵام ئەوەی ڕاستییە کە ئەم حەللاجە پیاوێکی گوماناوی‌و ساختەچی بووەو ویستویەتی لە ڕێگەی خۆ بەدیندار زانینەوە بگاتە مەرامی نامەشروعی خۆی، کە لە شوێنێکدا ئاشکرا بووە، ئەو شوێنەی جێهێڵاوەو شوێنێکی تری هەڵبژاردووە، جا با ئێمە لێ بگەڕێین و بزانین مێژوونوسێکی وەك ئیبن کەسیر چی دەڵێ: ئیبن کەسیر باسی ساڵی "٣٠٩"ی کۆچی دەکات‌و دەڵێ: "لەم ساڵەدا ئەبومەنسوری حەللاج کوژرا، باشتێك لە ژیاننامەکەی باس بکەین‌و بە کورتی باسی چۆنیەتی کوشتنەکەی بکەین بە "داد"و "ویژدان"ەوە، بێ ئەوەی ئارەزووبازی بکەین، یان ستەمی لێ بکەین، یاخود هێرشی ناڕەوا بکەینە سەری‌و پەنائەگرین بەخوا شتێك بدەینە پاڵی کە ئەو نەیوتبێت یان مانایەك لە قسەکانی دەربهێنین کە ئەو مانایە هەڵنەگرێت، دوای ئەمە ئەڵێن: حەللاج ناوی حسەینی کوڕی مەنسور کوڕی موحەممەدی حەللاجی[٦٢٧] ئەبو موغیسەو ئەبو عەبدوڵلاشی پێ ئەوترێت، باوکی کابرایەکی مەجوسی ئاگرپەرست بووەو ناوی "موحەمما" بوو، خەڵکی وڵاتی فارسەو لە شاری "البيضاء" لەدایك بووەو لە "واسط"دا گەشەی کردوەو هەندێکیش ئەڵێن لە "تەستوور"دا، ئەچێتە بەغدادو بەردەوام هاتوچۆی مەککە دەکات‌و لە گەرماو سەرمادا لە مزگەوتدا ئیعتیکاف دەکات‌و لەسەر ئەم کارەی

---

620 تیشك خستنە سەر ژیان‌و بەرهەمی "مەنصوری حەللاج" لە لایەن هەندێ مامۆستای زانکۆو نوسەری عەلمانییەوە جێگەی گومانەو ئەم وەڵامە کورتە بۆ ئەوانیشە.

621 ـ کۆمەڵگا ل٢٣٤.

622 ـ کۆمەڵگا ل٢٤٢.

623 ـ کۆمەڵگا ل٢٤٣.

624 ـ البداية والنهاية (١١/١٥٥).

625 ـ مەبەستی عەمری کوڕی عوسمانی مەکییە، کە ڕێبەری ئەو سەردەمەی سۆفیزم بووە.

626 ـ کۆمەڵگا ل٦٧.

627 ـ حەللاج: واتە هەلاج، کاری هەلاجی کردن بووە.

چەند ساڵ بەردەوام دەبێت، موجاهەداتی نەفسی خۆی زۆر ئەکات و لە مزگەوتدا هەمیشە لەناوەڕاستیداو لەو شوێنەدا کە سەقفی نەبووە دائەنیشێت، هیچێکی وای نەئەخواردو ماوەی ساڵێك خواردنی چەند لەتە نانێك و ئاو بوو بەتەنیا، لەشاخی "ئەبوقەبیس" لەسەر بەردێك و لەبەرئەو گەرمایە بەتەنیا دائەنیشێت، هاوڕێیەتی کۆمەڵێك لە ڕێبەرانی سۆفی کردووەو وەك جونەیدی کوڕی موحەممەد، عەمری کوڕی عوسمانی مەککی و ئەبوحەسەنی نوری.. "خەتیبی بەغدادی" ئەڵێ: سۆفیزم یەکڕانین لەسەری، زۆربەیان نەفی ئەوە دەکەن کە حەللاج سۆفی بوو بێت و لەوان بێت، بەڵام هەندێکیان وەکو ئەبو عەبباسی کوڕی عەتای بەغدادی و موحەممەدی کوڕی خەفیفی شیرازی و ئیبراهیمی کوڕی موحەممەدی نەسراوایی نیسابوری قەبوڵیانەو تەفسیری باشی قسەکانی ئەکەن و قسەکانیشیان نووسیوەتەوە، تەنانەت "ئیبن خەفیف" ئەڵێ: حوسەینی کوڕی مەنسور زانایەکی خواپەرستە.. "خەتیبی بەغدادی" ئەڵێ: ئەو کەسانەی کە نەفی ئەوە دەکەن، حەللاج لە سۆفیزم بێت ئەڵێن کابرایەکی جادووگەر بووە لە ژیانداو لەبیروباوەڕیشیدا زندیق بوو، منیش ئەڵێم "قسەکە هی ئیبن کەسیر"ە: لەو ڕۆژەوەی حەللاج کوژراوە، خەڵکی چەند ڕای جیاجیایان هەیە لەسەری، بەڵام فوقەهاو پێشەوایانی دین یەك ڕان لەسەرئەوەی "حەللاج" پیاوێکی دیندار نەبووەو بڕوای بە دین هەر نەبووەو بەکافری کوژراوە، نەك هەر کافر بووە بەڵکو پیاوێکی درۆزن و ساختەچی و جادووگەریش بووەو زۆربەی ڕێبەرانی سۆفیەکانیش هەروا دەڵێن.. سوفیانی کوڕی عویەینە ئەڵێ: لەناو موسڵماناندا، هەر زانایەك گەندەڵ بووبێت، جۆرێك لەکاریگەری و لەیەکچوونی بە جوولەکە تێدا دروست ئەبێت، کە حەللاج بیروڕای "یەکگرتن و توانەوەی لەگەڵ خوادا" بۆ دروست بوو، بوویە یەکێك لە لادەرو بەرەڵاکان... ڕیوایەتێکی دروست ئەگێڕنەوە کە سەفەرێکی هیندستان ئەکات و لەوێ فێری سحربازی ئەبێت و ئەڵێ: من بە جادووگەری خەڵك بانگ ئەکەم بۆ لای خوا!! لەهەر شارەی بەناوێکەوە خۆی ئەناساند، هیندستانییەکان کە نامەیان بۆ ئەنارد بە ناوی "موغیس"ەوە بۆیان ئەنووسی، سەرکەسیەکان بەناوی "موقیت"ەوەو خۆراسانیەکان بەناوی "مومەییەز"و ئەهلی فارس بەناوی "ئەبو عەبدوڵڵای زاهید"و ئەهلی خوزستان بەناوی "ئەبو عەبدوڵڵای حەللاجی نهێنیەکان"[٦٢٨].."ەوە.

هۆی ئەوەش پێی ئەوترێ "حەللاج = هەلاج" ئەڵێن لەبەرئەوە بووە لە ئەهوازدا خەڵك چی لە دڵیاندا بووە بۆی دەرخستوون.

ئەشوترێت هۆیەکەی ئەوەیە کە جارێکیان بەهەلاجێك ئەڵێ: بڕۆ بەدەم فیسارو فلانە ئیشەوەو بۆم ڕاپەڕێنە، هەلاجەکەش ئەڵێ دەستم گیراوەو خەریکی هەلاجیم، ئەویش ئەڵێ: من هەلاجیەکەی تۆ ئەکەم، تۆ بڕۆ ئەو ئیشە بۆ من بکە! کابرا ئەڕوات و خێرا ئەگەڕێتەوە سەیر ئەکات چی لۆکەی هەیە لە ئەمبارەکەدا شیکراوەتەوە بۆی! ئەڵێن: "حەللاج" بە دەزگای هەلاجیەکەی وتووە: ئادەی ئەو لۆکانە گشتی هەلاجی بکە، دەزگاکەش خێرا هەمووی هەللاجی کردووە!، بەڵام ئەمە "نەزەر[٦٢٩]"ێکی تێدا هەیە، هەرچەندە شتی وا ڕوو ئەدات و ڕوویداوە، چونکە "شەیتانەکان و جنۆکە" کۆمەکی خەڵکی هەواداری خۆیان ئەکەن لە هەندێ ئیشداو ئەوان ئیش بەئەو دەکەن...

هەندێکیش ئەڵێن: بۆیە پێی ئەوترێ "حەللاج" چونکە باوکی "هەلاج" بووە، بەڵگەی زۆریش هەیە لەسەر ئەوەی کە بیروڕای "حلول" هەبووە، بە تایبەتی سەرەتای ژیانی، یەکێك لەو بەڵگانە شیعرەکانێتی، بۆ نموونە ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| جلبت روحك فی روحی كما | یجبل العنبر بالمسك الفذق |
| فاذا مسك شیء مسني | واذا انت انا لا نفترق |

هەروەها ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| مزجت روحك فی روحی كما | تمزج الخمرة فی الماء الزلال |
| فاذا مسك شیء مسني | واذا انت انا فی كل حال .... |

---

[628] ـ حەللاجی نهێنییەکان: واتە چۆن پەموو لەناوکەکەی جیا ئەکەیتەوە، ئەویش ئاوەها نهێنی لە ئاشکرا جیاکردەوە، دیارە بە سیحرو جادووگەری.

[629] ـ زاراوەی "فیە نظر" زانایانی حەدیس بۆ ڕیوایەتێك بەکاری دێنن، کە ڕیواییەتەکە قسە هەڵبگرێت چ لە ڕووی (متن)ەوە چ لە ڕووی (سەنەدە)وە، واتە نە لە سەنەدەکەی دڵنیان و نە لە مانای مەتنەکەشی.

حەللاج هەرجارەی جۆرە جلێکی لەبەرکردووە، هەندێ جار جلی سۆفیانی لەبەرکردووە، هەندێ جار ئەوەندە جلی تەسکی لەبەرکردووە وەك ئەوە دیاربووە کە جلی لەبەردانییە، جاری واش بووە جلی سەربازو دەرەجە داری لەبەرکردووەو تێکەڵی منالی دەولەمەندو پاشاو سەربازانی کردووە!

خەتیبی بەغدادی بەسەنەدی خۆی قسەیەکی "حەللاج" دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: زانستی هەموو خەلکانی کۆن و تازە، ئەگەڕێتەوە بۆ چوار قسە: خۆشەویستی بۆ خواو، ڕقبوون لە کەمدەستی، و بەشوێن "وحی" ڕۆشتنداو، ترسی بەردەوام لە عاقیبەت شەڕی .. منیش ئەڵێم "قسەکە هی ئیبن کەسیرە" : حەللاج لە دوو مەقامەکەی ئەخیردا لێی تێکچوو، نەبەشوێن "وحی"دا ڕۆیشتووەو نەبەردەوامیش بووە لەسەر دینداری، بەڵکو سەری لەخۆی شێواندو دەستی دایە شتی لارو وێرو بیدعەو خورافات، خوا بمان پارێزێ ...

ئەبو زورعەی تەبەری ئەڵێ: خەڵکی هەریەکەی قسەیەك ئەکەن دەربارەی "حەللاج"، یەکێ قەبوڵی ئەکات و یەکێ ڕەشی دەکاتەوە، بەڵام جارێکیان لە موحەممەدی کوڕی یەحیای ڕازیم بیست کە ئەویش گوێی لەعەمری کوڕی عوسمان بووە کە نەفرەتی لە"حەللاج" کردووە، ووتویەتی: بەس دەستم بیگاتێ مەرجە بە دەستی خۆم بیکوژم! منیش پێم ووت: باشە شێخ گلەیی چی هەیە لەحەللاج؟ ووتی: ئەرێ ڕۆژێك ئایەتێکم ئەخوێند لەقورئان، سەیر ئەکەم پێم ئەڵێ: منیش ئەتوانم وەك قورئان بنوسم و لەناو خەڵکیشدا باسی بکەم!..

"ئەبوزورعەی تەبەری" ئەڵێ: لە "ئەبو یەعقوبی ئەقتەعم" بیست کە ووتی: من کەژنم دا بەحەللاج لەبەرئەوە بوو ڕێگاو عیبادەتیم بەباش ئەهاتە بەرچاو، بەڵام دوای ماوەیەکی کەم بۆ دەرکەوت کە ساحرو جادووگەرێکی فێڵبازو کافرێکی زۆر پیسە.. "ئەبوقاسمی قوشەیری"یش لە "رسالة"کەی خۆیداو لە "باب: حفظ قلوب المشايخ"دا ئەڵێ: "جارێکیان عەمری کوڕی عوسمان لە مەککەدا ئەچێتە لای حەللاج، سەیر ئەکات هەندێ پەڕەو وەرەقەی لایەو شت ئەنوسێ، ئەمیش ئەڵێت: ئەمانە چین؟ حەللاج ئەڵێ: ئەمانە بەربەرەکانێی قورئانیان پێ ئەکەم! عەمریش دووعایەکی لێ ئەکات، ئەوە بوو دوای ئەوە خۆشی نەدی‌و لەهیچ شتێکدا سەرکەوتوو نەئەبوو، گلەیی زۆریشی لە ئەبو یەعقوب کرد کە ژن بەشتی وا ئەدات.. عەمری کوڕی عوسمان دوای ئەوە بە هەموو لایەکدا نامەی ئەناردو نەفرینی لە حەللاج ئەکردو خەڵکی لە فرت‌و فێڵی حەللاج ئاگادار ئەکردەوە. (ئیبن کەسیر هەر بەردەوامەو دەڵێ):

هەندێ لە فرت‌و فێڵەکانی حەللاج

خەتیبی بەغدادی ئەڵێ: حەللاج یەکێك لە پیاوە تایبەتییەکانی خۆی ئەنێرێت بۆ ناوچەی (الجيل)و پێی دەڵێ: ئەچیتە ئەوێ‌و خۆت وانیشان ئەدەی کە پیاوێکی "سالح"و "عابد"ی‌و کارت خوا پەرستنە، کە متمانەیان بۆ دروست بووپێت، وا دەربخە کە چاوت کوێر بووەو هیچ نابینی‌و پاشان خۆت گۆج بکەو بڵێ قاچم شەلەل لێیداوە، کە کەوتنە دکتۆرو دکتۆر کاری بڵێ: ئەی خەڵکە باشەکە، ئەم دەواو دەرمانەی ئێوە کەڵکی من ناگرێت، دوای چەند ڕۆژێك وادەربخە کە خەوێکت بە پێغەمبەرەوە بینیوە پێی وتووی: دەوای دەردی تۆ لای قوتبی زەمانەیەو لە فلانە ڕۆژداو لە فلانە مانگدا ڕێی ئەکەوێتە ئەم ناوەو ئەمەش ناونیشانەکەیەتی.. جا حەللاج پێی ئەڵێ: من ئەو ڕۆژە دێم بۆ ئەوێ، کابرا ئەکەوێتە ڕێ‌و لە ناو خەڵکدا خۆی وا پیشان ئەدات کە هەمیشە خەریکی قورئان خوێندن‌و عیبادەت‌و خواپەرستییەو ماوەیەك بەردەوام خەریکی ئەمە ئەبێت تا خەڵکەکە بڕوای پێدەکەن‌و خوشەویستی ئەدەنێ، زۆری پێناچێ لە ناو خەڵکدا ئەڵێ: ئەرێ چاوم نابینێ! ماوەیەکی تر ئەڵێ قاچیشم لە ئیش کەوتووەو ناتوانم بڕۆم، خەڵکەکەش ئەوەی لە توانایاندا ئەبێت بۆی ئەکەن لە دکتۆرو دەواو دەرمان، کابرا هەروەك خۆی ئەمێنێتەوەو فەرق ناکات، پاش ماوەیەك ئەڵێت: ئەی خەڵکە باشەکە، ئەمەی ئێوە لەگەڵما ئەیکەن هیچ سودێك بەمن ناگەیەنێت، دەرمان‌و شیفای من لای یەکێکی ترە، شەوێك لەم شەوانەدا، بەخزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم لە خەودا فەرمووی: دەرمانی تۆ لای "قوتبی زەمانەیە"و لە فلانە مانگ‌و فلانە ڕۆژدا ڕێی ئەکەوێتە ئەم ناوە، خەڵکە هەژارەکە تا کوێر بوو دەستیان ئەگرت‌و ئەیانبرد بۆ مزگەوت کە خۆشی گۆج کرد، ئەیانکردە کۆڵ‌و زۆر بەڕێزەوە هەڵیان ئەگرت‌و ئەیانبرد بۆ مزگەوت، تا ئەو ڕۆژەی لەگەڵ حەللاجدا دیارییان کردبوو هات، ئەو ڕۆژە حەللاج بە دزییەوە خۆی ئەکات بە ئەو شارەداو جلێکی سپی سۆفییانەی لەبەردا ئەبێت‌و ئەچێتە مزگەوت‌و لە پەنای پایەیەکدا دەست بە عیبادەت کردن ئەکات‌و لا بەلای کەسدا ناکاتەوە، خەڵکیش کە سەیری ئەکەن‌و لێی وورد ئەبنەوە،

سەیر ئەکەن هەموو ئەو سیفەتانەی تێدایە کە کابرای نەخۆش بۆی هەڵداون، بەپەلە ئەچنە لای و دەستی ماچ ئەکەن و دەست بە جلەکانیدا ئەهێنن بۆ ئەوەی بەرەکەتی لێوەربگرن، دێنەوە بۆ لای کابرای ئیفلیج و هەواڵەکەی بۆ ئەگێڕنەوە، ئەویش ئەڵێ: ئادەی بۆمی وەسف بکەن، کە بۆی وەسف دەکەن، ئەڵێ: تەواوە ئەمە ئەو کەسەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە خەودا بۆی وەسف کردم و فەرمووی شیفای تۆ تەنیا لای ئەوە، هەڵمگرن و بمبەن بۆ خزمەتی، هەڵیان گرت و بردیان بۆ لای، کە قسەی لەگەڵدا کرد ناسییەوە و وتی: ئەبو عەبدوڵلا! لە خەودا بە خزمەت پێغەمبەر ﷺ گەیشتووم و فەرموویەتی شیفای من لە دەستی تۆدایەو خەوەکەی بۆ گێڕایەوە، حەللاجیش یەکسەر دەست بەرز ئەکاتەوە بۆ ئاسمان و دەست بە دوعا کردن ئەکات و پاشان تۆزێ تف ئەکاتە دەستی و ئەیهێنێت بە چاوی (کابرادا) یەکسەر چاوی ئەکاتەوە، بەشێوەیەك وانازانرێ هەرچاویشی هەرگیز کوێر بووبێ، پاشان هەندێ تفی تر ئەدات لە قاچی کابراو یەکسەر هەڵدەستێتەوەو دەست بە ڕۆیشتن ئەکات بە دیار چاوی خەڵکەکەوە، کە بەرپرس و کاربەدەستانی ئەو ناوچەیەش لە دانیشتنەکەدا ئەبن، دەنگە دەنگێکی زۆر لە خەڵکەکە بەرز ئەبێتەوەو دەست بە "الله أكبر" و "سبحان الله" ئەکەن، زۆر ڕێزو حورمەت ئەنوێنن بۆ "حەللاج" زیاتر لەو درۆو دەلەسەیەی دەری بری بۆیان، ماوەیەك لە ناویاندا ئەمێنێتەوەوە زۆر خزمەتی ئەکەن و ڕێزی لێئەگرن و خوا خوای ئەوەیان ئەبێت داوای ئەرکێکیان لێبکات، ئەمانیش بە دڵ و بە گیان بۆی جێبەجێ بکەن، ئەو ڕۆژەش بڕیار ئەدات خوا حافیزیان لێبکات، ماڵێکی زۆری بۆ کۆدەکەنەوەو ئەیدەنێ، کەچی ئەڵێت: من پێویستم بە ماڵی دونیا نییە، ئێمە بە زوهدو گوێنەدانە دونیا گەیشتوینەتە ئەم مەقامە، بەڵام وابزانم ئەم دۆستەتان هاوڕێ و ئەحبابی زۆری هەیەو هەمووشیان "ئەبدال"[630] ن لەبەرەکانی پێشەوەی "تەرسوس" خەریکی جیهادو حەج و خێر کردن و پێویستیان بە ماڵ ئەبێت بۆ کارەکانیان، کابرای گۆجەی ساغ بووەوە ووتی: ئا، شێخ ڕاست ئەفەرموێ! من مادامێك خوا چاوەکانی پێداومەتەوەو ئەم منەتی لەش ساغیەی پێ عەتا کردم، بڕیارمداوە ئەم تەمەنەی ماومە هەمووی لە جیهادکردندا خەرج بکەم، لە ڕێگەی خواداو خزمەتی ئەو "ئەبدال"و "پیاوچاکانە"دا کە ئەیانناسم، ساڵانە حەجی ماڵی خوا بکەم و زۆر هانیدان کە پارەیەکی زۆری بۆ کۆبکەنەوە لەو شتانەی لای خۆیان خۆشەویست و بە نرخە. حەللاج خوا حافیزی ئەکات و کابراش چەند ڕۆژێکی تر ئەمێنێتەوە، تا ماڵێکی زۆری بۆ کۆدەکەنەوە، کە بە هەزاران شتی نەختینەی ئاڵتون و زیوی تێدا ئەبێت کە زانی ماڵێکی زۆری بۆ کۆکراوەتەوەو ئیتر بەسە، خوا حافیزی لێکردن و ماڵەی دایە بەرو لەو شوێنەی وادەی لەگەڵ "حەللاج"دا بوو بەیەك گەیشتن و ماڵەکەیان وەك برا دابەشکرد لە نێوان خۆیاندا...

"ئیبن جەوزی" ئەڵێت: حەللاج پیاوێکی هەزار ڕەنگە بوو، لەگەڵ هەر کەسێکدا بەو شێوەیە بوو کە ئەو حەزی لێیەتی.. ئەچێتە ئەهواز پارە ئەبەخشێتەوەو ناویان ئەنێ: "درهەمی قودرەت" پرسیاری ئەم "درهەمی قودرەت"ە لە "علی جوبائی" ئەکەن، ئەویش ئەڵێ: ئەو جۆرە کارانە هەموو کەسێ بەفێڵ و جادووگەریی ئەتوانێ ئەنجامیان بدات، ئەگەر ئەتانەوێ تاقیبکەنەوە بیخەنە ژوورێك و دەرگای لێدابخەن، پاشان داوای لێبکەن با (دوو دانە درك)تان بۆ پەیدا بکات، "حەللاج" کە ئەمە ئەبیستێ، ئەهواز بەجێ دێڵێ و دەڕوات بۆ شوینێکی تر.."[631] بەو شێوەیە ئیبن کەسیر لە زمانی زانایانی هاوچەرخی "حەللاج"ەوە شتی زۆر سەیرو سەمەرە ئەگوازێتەوە، بۆ نموونە ئەڵێ: دوو کەس لە هاوڕێ نزیك و هەوادارەکانی کە بە فرت و فێڵەکانی ئەزانن وازی لێ دێنن، کە ناویان "ئەبو عەلی هارون کوڕی عەبدولعەزیزی ئەوراجی و ئەوی تریان ناوی "ئەلرباس" بوو، ئەم دوانە چی جادوو درۆو دەلەسەی هەیە دەریدەخەن بۆ خەڵکی"[632].. تەنانەت "بووکەکەی خۆی شتی پیس و نالەباری زۆری دەربارەی گێڕاوەتەوە. لەوانە شەوێك ئەچێتە ژوورەکەو ئەیەوێت دەستدرێژی بکاتە سەری، ژنەش ڕائەپەڕێت و حەللاج خێرا ئەڵێ: هەستە نوێژەکەت بکە! لە کاتێکدا مەبەستی بووە بچێتە

---

[630] ـ "ئەبدال" زاراوەیەکی سۆفیزمە، واتە جێگرەکانی (قوتبی زەمانە) کە کاتێك قوتب ئەمرێ لەناویاندا یەکێك ئەکاتە قوتبو کاروباری دین و دونیای پێ ئەسپێرێ!

[631] ـ البداية والنهاية (١١/١٥٢ تا ١٦٠).

[632] هەمان سەرچاوە (١١/١٦٠).

لای"[633]. هەر ئیبن کەسیر لە لاپەڕە (١٦٠)ی بەرگی (١١و ١٢)دا ئەڵێ: فەرمانی کردووە بە کچەکەی کە کڕنووشی بۆ بەرێت، کچەکەی ئەڵێت: باشە دروستە مرۆڤ کڕنووش بۆ مرۆڤ ببات؟ حەللاج ئەڵێت: بەڵێ، لە ئاسماندا خوایەك هەیەو لە زەویشدا خوایەکی تر هەیە، ئادەی بڕۆ لە ژێر ئەو حەسیرەدا چیت ئەوێت هەڵیگرە، کە ژێر حەسیرەکە هەڵئەداتەوە سەیر ئەکات پڕە لە تورەکەی پڕ لە درهەم!! هەروەها ئەڵێ: کاتێك کە لە ماڵی حامدی کوڕی عەبباسی وەزیردا زیندانی کرابوو، غولاَمێك کاتێ نانی بۆ ئەبات سەیر ئەکات حەللاج ژوورەکەی پڕ کردووە، ئەوەندە گەورە بوو، سەری لە سەقفی ژوورەکە توندکردووەو قاچی لە زەویدایە، غولاَمەکە لە ترسا ڕائەکات و خواردنەکە فڕێ ئەدات و "تا" دای ئەگرێت و چەند ڕۆژ نەخۆش ئەکەوێت[634]. ئەو ڕۆژەش دادگایی ئەکەن کتێبێکی حەللاج دەهێنن تێدا نووسیویەتی: هەر کەس ویستی حەج بکات و ڕۆیشتنی بۆ ئاسان نەئەبوو، با لە خانوەکەیدا ژوورێك بکاتەوە نەیەڵێ هیچ شتێکی پیسی تێکەڵ ببێت و نەشهێڵێ کەس بچێتە ناوی، کە ڕۆژانی حەج کردن هاتە پێشەوە با سێ ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت و بە دەوری ئەو ژوورەدا دەست بکاتە تەواف کردن، وەك چۆن تەوافی کەعبە دەکات، پاشان تەوافی ماڵەکەی بکات چۆن حەجاج تەوافی مەککە دەکەن، پاشان (٣٠) هەتیو دەعوەت بکات و بەدەستی خۆی نانیان بداتێ و خزمەتیان بکات، پاشان یەکی کراسێك بکاتە بەریان و سەرو (حەوت درهەم)یان بداتێ یان ئەڵێ: سێ درهەم. ئەگەر وای کرد ئەوە جێگەی ئەو حەجە فەرزەی بۆ ئەگرێت، وە هەرکەس سێ ڕۆژ بە بەردەوام بەڕۆژوو بێت و سەری چوارەم بە گەڵای "هیندبا" ڕۆژووەکەی بشکێنێ ئەوە ئیتر جێگەی ڕۆژووی ڕەمەزانی بۆ ئەگرێت و (پێویست نییە ڕەمەزان بگرێت) .. هەرکەسێ لە سەرەتای شەوەوە دوو ڕکات نوێژ دابیەستێت و نەیبڕێت تا بانگی بەیانی و ئەوجا سەلام بداتەوە، ئیتر پێویست ناکات لەوەو دوا نوێژ بکات!.. قازی ئەبوعومەر پێی دەڵێ: باشە ئەمانەت لە کوێ هێناوە؟ ئەڵێ لە کتێبی "الأخلاص"ی "حەسەنی بەسری"م وەرگرتووە! قازی ئەبوعومەر ئەڵێ: خوا درۆزنت کا، خوێن حەڵاڵ! هەمووومان کتێبی "الأخلاص"ی حەسەنی بەسریمان خوێندووە لە مەککە شتی وای تێدا نییە. وەزیر دێتە نزیکی قازی ئەبوعومەرو ئەڵێ: قوربان تۆ ئەفەرمووی خوێن حەڵاڵ! دەی ئەوەم بۆ بنووسە لە پارچە کاغەزێکدا... قازی بۆی ئەنووسێت و هەرچی زانای تری ناو مەجلیسەکەش هەیە هەموی ئیمزای خۆی ئەخاتە سەر نوسراوەکە.."[635]

"خەتیبی بەغدادی" ئەڵێ: عەبدوڵلای کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی ئاڵتونچی بۆی گێڕاینەوە کە ئەویش گوێی لە ئەبوعومەری کوڕی حەیرە بووە ووتوویەتی: .. کاتێك کە فەرمانی لەسێدارەدانی حسەینی کوڕی مەنسوری حەللاج دەرکراو لە زیندان هێنرا بۆ ئەوەی بکوژرێت، منیش هەروەك ئەو خەڵکە ڕۆیشتم بۆ سەیرکردنی، بەردەوام دڕم بە ئاپۆڕەی خەڵکەکە ئەدا بۆ ئەوەی لە نزیکەوە بی بینم، گوێم لێبوو بە دۆستەکانی خۆی ئەوت: لەم کارە زەندەقتان نەچێت، چونکە من دوای (٣٠) ڕۆژی تر ئەگەڕێمەوە بۆ ناوتان، کەچی لە سێدارەش دراو نەش گەڕایەوە!.."[636]. "ئەبوبەکری صولی ئەڵێ: جارێکیان حەللاجم بینی و لەگەڵیدا کەوتمە قسەکردن سەیر ئەکەم پیاوێکی نەخوێندەوارە، بەڵام زۆر لە خۆی ئەکات و ئەیەوێ قسەی عاقڵانە بکات، پیاوێکە گێل و موبالەغەچییە، پیاوێکی نیەتپیس و خۆ هەڵکێشە، زۆر حەزی لە ماڵی دونیایە، کەچی خۆی بە زاهید پیشان ئەدات، تا بڵێی بەرەڵایە، کەچی عیبادەتیش ئەکات..."[637].

حەللاج لە ناو خەڵکدا بڵاوی ئەکردەوە کە گوایە ئەتوانێ مردوو زیندوو بکاتەوەو جنۆکە خزمەتکاری ئەکەن و چی بوێ و حەز لە چی بکات بۆی ئامادە ئەکەن[638]. حەللاج کە درۆو دەلەسەکانی بۆ خەڵك دەرکەوت بازاڕی شکاو ئەوەی پێی بزانیایە گاڵتەی پێ ئەکرد، ئەگەر شتێکی بوتایە.. بۆ نموونە ئیبن کەسیر ئەڵێ: "حەللاج" ڕۆژێك بە کابرایەکی وت: ئیمانم

---

633 ـ هەمان سەرچاوە (١١/١٦٠).

634 ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

635 ـ البداية والنهاية (١١/١٦٠، ١٦١).

636 ـ هەمان سەرچاوە (١١/١٦٣).

637 ـ هەمان سەرچاوە (١١/١٥٩).

638 ـ هەمان سەرچاوە (١١/١٥٩).

پیێ بهێنه چۆلەکەیەکت ئەدەمێ، ڕیقنەکەی بکەیت بە سەر ئەوەندە (مەن) مسدا ئەیکات بە ئاڵتون بۆت! کابراش ئەڵێ: ئەی تۆ ئیمان بەمن ناهێنی من فیلێکت بۆ ئەنێرم، کاتێك پاڵ ئەکەوێ قاچەکانی لە ئاسمان توند ئەبێت، هەر کاتێکیش ویستت بیشاریتەوە ئەوە لە ژێر پێڵوی چاوتا ئەتوانی بیشاریتەوە! (حەللاج) دەم دائەچەقێنێتو بێدەنگ ئەبێت[639].

هەر ئیبن کەسیر ئەڵێ: ڕۆژێك ڕێبەرێکی "ڕافزەکان" بانگ ئەکاتو ئەڵێ: ئیمانم پێ بهێنە، "شیعە ڕافزی"یەکەش ئەڵێ: من کابرایەکم زۆر حەزم لە ژنەو وەك ئەبینی (کەچەڵ)و پیریش بووم، جا ئەگەر ئەمەو ئەوەم بۆ چاك بکەیتەوە ئەوە لە ناو خەڵکدا بڵاودەکەمەوە کە تۆ "ئیمامی مەعسوم"یت، ئەگەر حەزیش ئەکەی ئەڵێم پێغەمبەرەو ئەگەر ئەشتەوێ هەر ئەڵێم تۆ خوای!! ئەڵێ: حەللاج حەپەساو هیچ وەڵامێکی پێنەبوو[640].

ئەمە حەقیقەتی حەللاج، کە مێژوونوسێکی بە ویژدانی وەك ئیبن کەسیر باسی دەکاتو پێش ئەوەی پیتێکی لەسەر بڵێ، ئەڵێت: پەنا ئەگرین بەخوا کە شتێك بدەینە پاڵی کەنەیوتبێت، یان مانایەك لە قسەکانی دەربهێنین، کە ئەو مانایە هەڵنەگرێت..

کەچی فوئاد مەجید میسری ئەیەوێ ئەم کابرا ساختەچیو ساحیرو جنۆکاوییە لە کوردو لە لاوانی کورد بکاتە شۆڕشگێڕو فەیلەسوفو فریادڕەس!

ئاخر کاکە فوئاد خوا هەڵناگرێ، لەوانەیە دەیان کەسی ساختەچی وا لەم ڕۆژەشدا لە کوتو پیرەژنو خەڵکی داماو ببێتە قۆتبی زەمانەو فریاد ڕەسی هەمووان، بەڵام ئایا ڕاستە یەکێکی وەك تۆ لەبەر دەرگاکەیدا ڕیزت بۆ گرتبێت بۆ ئەوەی بەرەکەتێکی لێوەربگرێ، یان نەخۆشێکت بۆ چاك بکاتەوە .. باشە هەر لەم ڕۆژەدا چەند کەسی ساختەچی وەك حەللاج لەم وڵاتەی منو تۆدا هەیە؟ لە هەندێك بوەتە وەلی، نا بەڵکو پێغەمبەر نا تەنانەت خواش.. (پەنا بەخوا) داوای ڕزقو داوای منداڵو داوای لەش ساغیو چیو چی لێدەکات، بەڵام ئایا لە ڕاستیدا وایە؟! یان لەلای هەندێکی کەمی خاوەن مەبەستو هەندێکی زۆری تری بیر نەخۆش وایە؟ ڕاستییەکەی ئەوەیە کە خوا خوایەو بەندەش بەندە، نەخوا ئەبێتە بەندە، نەبەندەیش ئەبێتە خوا.. (وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ وَيَخْتَارُ مَا كَانَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ سُبْحَانَ اللَّهِ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ) (القصص: ٦٨). واتە: خوا هەرچی ویست دروستی دەکاتو هەرچی ویست هەڵی دەبژێرێ کەس ناتوانی هیچ هەڵبژێرێ، بێگەردیو بەرزو بڵندی بۆ خوا، لەو شیرکانەی ئەدرێتە پاڵی.

ئیتر ئەوە بابوەستێ کە (تەبەری) یان (ئیبن نەدیم)و (ئیبن جەوزی)و (ئیبنو مەسکەوەیە)و کێو کێی تر لە مێژوونووسان، چی دەربارەی ساختەچێتی و (بێ دینی)و فرتو فێڵی حەللاج ئەڵێن، کە فوئاد میسری خۆی هەندێکیان لێ ئەگوازێتەوەو گلەییان لێ ئەکات بۆچی ئەو شتە ناحەقانە (!!) دەربارەی "فریاد ڕەسو فەیلەسوفێکی گەورە"ی وا ئەڵێن؟!

---

[639] ـ هەمان سەرچاوە (١٥٧/١١).

[640] ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

## کۆتایی

خوێنەرانی بەڕێز!

لە ڕاستیدا من لەم گەشتەمدا لەگەڵ ئەم کتێبەدا، چەند ڕاستییەکم بۆ دەرکەتووە، حەز ئەکەم هەمووتانی لێ ئاگادار بکەم.

یەکەم: بۆم دەرکەوت فوئاد مەجید میسریو ئەوانەی کە هاوڕاو هاومەبەستی ئەون بە نیازن هیچ شتێکی پیرۆز لە ناو میللەتی کوردا نەمێنێ، نەخوا (جل جلالە)، نە پێغەمبەر ﷺ، نە قورئان، نە فەرموودە، نە هاوەڵان، نەکەلەپوری ئیسلامیی میللەتی کورد!

ئەوەتا دەربارەی خوا (جل جلالە) ئەڵێ: وێنەیەکی سەر زەمینەو لە زەینی ئادەمیزاددا چۆتە شێوەی هێزێکی ژوور زەمینییەوە"[641]. بەناوی حەللاجەوە ئەڵێ: "نەقسە لە بوونی خوا بکەو نەقسە لە نەبوونی بکە.."[642]. سەیر ئەوەشە ڕاڤەی ئەو قسەیە ئەکاتو ئەڵێ: "حەللاج داوا لە ئادەمیزاد ئەکا لە بریتی پەنابردنە بەر هێزێکی میتافیزیکی پشت بە هێزی واقیعی ببەستێ کە ئادەمیزاد خۆیەتی، لە جیاتی ڕوو کردنەوە ئاسمانو بیرکردنەوە لە شتە نادیارەکان، بیروهۆشی بێنێتەوە سەر زەوی"[643].

دەربارەی پێغەمبەرانیش بەناوی ڕازی ناوێکەوە ئەڵێ: "ڕەوا نییە پەنا ببرێتە بەر شتێك لە دەرەوەی عەقڵەو ناونراوە پەیامبەرایەتی، جا خۆی هۆکەی دەڵێ: "چونکە ئادەمیزاد هەموویان، چون یەکنو هەرگیز عەقڵ قەبوڵی ناکات، خواوەند تاکە کەسێك هەڵبژێرێو ئەرکی پەیامبەرێتی پێ بسپێرێو بە هۆی ئەوەوە ڕێگای ڕاست نیشانی خەڵکی بدا، فەرمانی وا بێجگە لە بەدبەختی و شەڕو شۆڕ، هیچ سودو قازانجێکی بە کۆمەڵگای ئادەمیزاد نەبەخشیوە"[644].

نووسەری خوێننامە کە لەگەڵ فوئادا سەروبنی یەکترین، بەناوی وجودییەکانەوە ئەڵێ: خۆزگە خوا هەبوایە، هەرچی ئەوەی بەسەرماندا دێت ئەوەیە کە خوا نییە، ئێستا کە نییە چی بکەین؟ خۆ بە زۆر دروستی ناکەین..[645] یان زۆر بێشەرمانە دەڵێ: "ئیسلام زیاتر لە هەزارو چوار سەد ساڵە بەسەر کۆمەڵگا دواکەتووەکانەوە بووە بە کەڵەگا"[646]. یان زۆر شێتانە ئەڵێ: "فەخرە بۆ یەکێکی وەکو من بەدەستی خوا تیرۆر بکرێم!.. چونکە چەندێك سەحابەکان بە نیاز نین بچنە دۆزەخ، منیش هەر ئەوەندە بۆ بەهەشت"[647]. ئیتر ئەوە مەپرسە دەربارەی هاوەڵان و خەلیفەکانی ئیسلامو مێژووی ئیسلام چی دەڵێن!

جا نازانم هەر لە ڕاستیدا ئەمانە هەر بە ڕاستیانە باوەڕیان بەخواو پێغەمبەرو بەئایینو بە قورئان نییە! باشە هەر لە ڕاستیدا ئەمانە چییان ئەوێت؟!!

- ئەیانەوێت هیچ شتێکی پیرۆز نەمێنێ لەناو کورددا؟!

- ئەیانەوێ کورد وەك ئێستاو وەك ڕابردووش هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نەمێنێ؟! ئاخر بۆچی؟ خۆ ئەگەر وردی بکەیتەوە:

١. ئەو کارە مەحاڵەو نە بۆ هیچ کەسێك چووەتە سەرو نەبۆ هیچ کەسێکیش ئەچێتە سەر..

٢. تا بڵێی کارێکی شێتانەو نا عاقڵانەیە لەبەر زۆر شت:

- ئیسلام مایەی دەرهێنانی کورد بوو لە ژێر چنگی هێزێکی سەرکوتکەری وەك ساسانییەکان، کەی عاقڵانەیە ئەمڕۆ خۆزگە بۆ ئەو ڕۆژانە بخورێت؟! کە کورد تێیدا ژێربار بووەو لە ژێر ستەمکاراندا بووە.

---

641 - کۆمەڵگا ل٣.

642 - کۆمەڵگا ل٢٧٣.

643 - کۆمەڵگا ل٢٣.

644 - کۆمەڵگا ل٢٥٠.

645 خوێننامە ل ئێم

646 - خوێننامە ل ئێم

647 - هەمان سەرچاوە ل ئێن

**. کورد پێش ئیسلام چی بووەو چی هەبووە؟ کورد پێش ئیسلام میللەتێکی تواوەو ونبوو بووە لە ناو میللەتانی تردا، خاوەنی هیچی خۆی نەبووە، نەزمان، نە کەلتوور، نە قەوارە، نە ئازادی.. نە هیچ.**

**. خۆ ئەگەر وەك عەلمانیە نەتەوەپەرستەکانی عەرەب کە کاتێك ئالآی ناسیۆنالیزمی عەرەبیان هەڵگرتو بڕیاری ئەوەیاندا کە عەرەب لە ئیسلام دابڕێن، کەوتنە ئەو گێژاوەی باشە عەرەب پێش ئیسلام چی بووە؟ کەلتوری چی بووە؟ قەوارەو قەبارەی چەند بووە؟ .. هتد.**

**ناچار بۆ سەلماندنی ئەوەی عەرەب هەر شت بوون لە مێژووشدا، پەنایان بردە بەر زیندوکردنەوەی فیرعەونیەت و بابلیەت، تاکەس نەڵێ: عەرەب کۆیلەو ژێر دەستی فارس و ڕۆم بووە، عەرەب خاوەنی هیچ نەبووە کۆمەڵێك بت نەبێت! لە کاتێکدا عەرەب لە قۆناغێکدا ژیاوە هەموو مێژوونووسان ناویان ناوە (جاهیلیەت).**

**ئەی باشە ئێوە پەنا بۆچی دەبەن؟! زیندووکردنەوەی "زەردەشتیەت"[648].**

**ئاخر خۆ (فارس) خۆیان بە خاوەنی ئایینی زەردەشتی ئەزانن! ئەوا گریمان بە زۆر "کە نیمانە" یان بەهەر فێڵ و حەواڵەیەك بووە زەردەشتیمان لە فارس داگیر کردو خۆماڵیمان کرد[*]، چی ئەبێ دوای ئەوە؟! ئاخر خۆ زەردەشتییەتیش هەر ئایینە! یان ئایا زەردەشتییەت چی تێدایە چاك بێت و لە دەستی ئیسلام دەرچووبێت و باسی نەکردبێت.. یان ئایا زەردەشتییەت کەی ئەگاتە هاوتای ئیسلام کە بۆ هەموو بوارەکانی ژیان تەواوی یاساو ڕێنمایی پێویستی داناوە.. دەی کەواتە خولانەوە بە ناو ئەم بازنەدا لە پێناو چیدایە؟**

**. ئایا ئەتوانرێت بەشداری زیاتر لە چواردە سەدەی خەڵکی کورد لە خزمەتکردنی ئایین و مرۆڤایەتیدا چز بکرێت.. واتە:**

**. مێژووی ئەو کۆمەڵە هاوەڵە کورد زمانەی کە لەناو هاوەڵاندا هەبوون و جێگەی فەخرو شانازی خۆیان و میللەتەکەشیان بوون وەك: جابان و ئەبوبەسیرو کێ و کێ.**

**. مێژووی ئەو هەموو زانا بلیمەتەی وەك ئامێدی و ئیبن تەیمیەو ئیبن ئەسیرو ئیبن خەلەکان و دەیانی تر.**

**. مێژووی ئەو هەموو سەرکردە گەورانەی وەك سەلاحەددین و ئەسەدەدین شێرکۆو گەیلانی و سەهرەوەردی و شێخ سەعیدی پیران و .. کێ و کێ.**

**. مێژووی ئەو هەموو شاعیرە بەرزو بڵندانەی وەك مەلای جەزیری و خانی و نالی و مەحوی و مەولەوی و کێ و کێ.. ئەمانە هەمووی دفن بکرێن و چز بکرێن؟ هەر لەبەرئەوەی بەباشی باسی دین ئەکەن؟! ئایا ئەمە کارێکی شێتانەو وێرانکارییانە نییە؟ بە نیاز بی هەموو ئەو مێژووە بخەیتە چاڵێك و ئاگری تێبەربدەی.. چونکە ئەوان هەموویان هەواداری ئایین بوون و ژێری زمان و سەر زمانیان هەر باسی ئایینە!**

**باشە خۆ ئەو مێژووە مایەی شانازی و سەربەرزییە بۆمان نەك مایەی سەرکزیی و سەرشۆڕی، کە فوئاد مەجیدو هاوڕاو هاومەبەستەکانی چاویان پێی هەڵنایەت.. باشە خۆ زۆر ڕۆشنە ئەوەی مێژووی نەبێ کەسێتی ون و نادیارەو نەئەتوانێ خۆی بناسێ و نەئەتوانێ خۆی بناسێنێ بە خەڵك! جا لە جیاتی ئەوەی من و تۆش ملۆیەك بخەینە سەر ئەو خەرمانە کە بە ماندووبوونی هەزاران و ملیۆنان عەقڵ و جەستەی ڕۆڵەکانی ئەم میللەتە دروستکراوە، کەچی تۆ ئەتەوێت ئاگری تێبەربدەی.. ئاخر بۆچی؟! لەبەرچی؟!**

**دووهەم: بە بەراوردکاری مێژووی دەوڵەتی خیلافەت لەگەڵ مێژووی دەوڵەتانی هاوچەرخی خۆیانداو لەگەڵ مێژووی ئەم دەوڵەتانەی ئێستاشدا، هەمیشە تەرازووی دەوڵەتی خیلافەت قورستر ئەبێت، ئەوە با مێژوو با ئێستاش شایەت بن و یەکێکی بەویژدان و خوێندەوار بەراوردیان بکات لە هەموو ڕویەکەوە:**

**. لە ڕووی ئایینی و ئازادی بیروڕاو وتووێژی ئایینیەکانەوە (حوار الأدیان).**

648 ـ لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥) دا لە هەندێ تەلەفزیۆنەکانەوە ئەوترا: دەنگ بدە بە لیستی (.......) ئەگینا زەردەشت لێتان زویر ئەبێت! !

* لەتیف هەڵمەت وەك نووسەرێکی دیاری کورد بە دڵنیاییەوە زەردەشتو زەردەشتییەت بە کەلەپوری کورد نازانێ، سەیری "پرسیارەکان هێشتا تینووی وەرامن" ل٧٦ بکە.

**. له ڕووی هێزی نەیاری خاوەن پرۆژەوە كە لەو دەوڵەتەدا چەندە مافی هەبووەو ئێستا چەندە بێ مافەو چەند سانسۆری لەسەرە... تەلەفۆنی چاودێری ئەكرێ، سایتی تاكەكەسیو كۆمپیوتەرەكەی، بازاڕەكان، كۆڵانەكان، ماڵەكان، كامێرایان بەسەرەوەیەو كەس ناتوانێ نەیاری بكات، مەگەر زۆر بە جەرگ بێتو دەست لە ژیانو گوزەرانی خۆی بشۆرێت..**

**. له ڕووی شەفافیەتەوە لە حوكمرانیدا.**

**. له ڕووی ڕەفاهیەتو نانو گوزەرانەوە.**

**. له ڕووی گەشەی عەقڵو ڕۆحو مەدەنیەتەوە، لە هەموو ڕەهەندەكانیدا.**

**. له ڕووی دڵخۆشیو ڕادەی نەخۆشیو سۆزی مرۆڤایەتیو یەكترناسینو یەكتر ویستنی میللەتان لەگەڵ یەكترا.**

**. له ڕووی پتەوی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكانەوە.**

**. له ڕووی ڕەحمو سۆزی ئینسانیەوە.**

**كە هەركەس بەشی "دووهەم"ی ئەم كتێبە بخوێنێتەوە (أن شاء الله) قەناعەتێكی تا ڕادەیەك باشی بۆ دروست ئەبێ، دەربارەی ئەم ڕاستییەو ئەیسەلمێنێ.**

**سێیەم: وا دیارە فوئاد مەجید میسری براوی بەوە نییە كە هێڵی سوور هەبێت لە فكردا یان لە كۆمەڵدا یان لە عەقڵدا یان لە دەوڵەتدا.. نازانم شتی وا بیروڕای مرۆڤی ساغە؟! یان هی كەسێكە خراپ لێی قەومابێت.. ئەگەر عەقڵ لە شتێكدا گەیشتە ئەنجام، ئیتر چۆن ڕێگە ئەدات هەموو ڕۆژێو هەموو كەسێ چاوبەو شتەدا بخشێنێتەوەو هەڵیوەشێنێتەوە**[٦٤٩]

**عەقڵ ئەڵێ: یەكو یەك دوو ئەكات، ئیتر تەواو، ناكرێ دوای ماوەیەك بوترێ كەمتر یان زیاتر ئەكات.**

**عەقڵ ئەڵێ: بوون لە نەبوونەوە نایەت، بەڵكو بوون لە بوونەوە هاتووە، كەواتە ئەبێت بوونێك هەبوو بێت كە "واجب الوجود" بێت، ئەم هەموو بوونەوەرەی لێوە هاتبێت ئەو بوونە یەكەمەش ئەبێت دارای هەموو سیفەتێكی تەواو بێت، چونكە ئەم بوونەی ئێستا دارای عەقڵو دەركو زانیاریو دەسەڵاتو ژیانو ..هتد.. كەواتە ئەبێ ئەو بوونە یەكەمییەش دارای هەموو ئەوانە بوو بێت، ئەمان سنووریان هەیە كە ئەو بۆی داناون ، كەواتە خۆی نابێت سنووری هەبێت، نە زانیاری نەدەسەڵاتی نە هیچ سیفاتێكی تری چونكە نەبوو بوون نادات، واتە "فاقد الشيء لا يعطی"، دەوڵەت چۆن هێڵی سووری نییە، لە دەستووردا، لە یاسادا، لە دامو دەزگاكاندا لە هاتوچۆدا.. سنوور وەك چۆن شت جوان ئەكات، واش شتەكان ئەپارێزێت، جا ئەگەر هەموو كەسێكو هەموو ڕۆژێك دەوڵەت هەر خەریكی گۆڕینی دەستوور ویاسا بێت، ئەو وڵاتو دەوڵەتە چۆن پێش ئەكەوێت؟**

**بۆیە نابێت ڕێگە بدرێت كەس گەمە بە ئایینی خەڵك بكات یان بە ناموسی یان بە ژیانی یان بە ماڵی یان بە ئەمنیەتی یا بە كەرامەتی یان بە هەرێمو دەوڵەتی، چونكە ئەوانە هێڵی سوورن، جا ئەگەر خەڵك ئازاد بوو لە سڕینەوەی ئایینی خەڵكداو، ئازاد بوو لە شكاندنی نامووسی خەڵكداو، ئازاد بوو لە لەناوبردنی ژیانی خەڵكداو، ئازاد بوو لە تۆقاندنی خەڵكداو ئازاد بوو لە حورمەت شكاندنی خەڵكدا، ئیتر ژیان چ تامێكی ئەمێنێ، ئیتر خەڵك چۆن ئەتوانێ لەو شوێنەدا بژی، پاشان بۆچی ئەوە بۆ هەموو كەسێك ئاساییە، كە سنوورو هێڵی سوور دابنێو نیشانەی یاساو حكومەتی یاسا بێت، بەڵام بۆ ئیسلامو موسڵمانان ستەمو چەوساندنەوە بێت؟! لە كاتێكدا، ئەو سنوورو هێڵە سوورانەی كە ئیسلام دایناوە لایەنگری یەكێك ناكات دژ بە ئەوی تریان، لایەنگری لەم میللەت بكات دژ بە ئەوی تریان، یان هەندێك بەندەی خوابنو ئەوانی تر بەندەی نەبن، یان خوا بەرژەوەندییەكی تایبەتی لەو شتەدا هەبێو مرۆڤەكان زیانی لێبكەن.**

---

[649] ـ كاتی خۆی لە یۆنان كۆمەڵێك دروست بوون بە ناوی "سوفسطائییەكان"، ئەمانە ئەمڕۆ شتێكیان بە "ماقول" ئەزانی، بەیانی بە ئەوپەڕی "ناماقول"یان ئەزانی، ئەمڕۆ شتێكیان لا "واجب" بوو، بەیانی لایان "مستحیل" بوو، "ئەرسطو" هاتە مەیدانو زانستی "منطق"ی دانا، بۆ ئەوەی كۆنترۆڵی قسەو بیروڕاكانیان بكات، تێیدا ئەوەی ڕاگەیاند كە بێگومان ئەبێ لە عەقڵدا هەندێ نەگۆڕ هەبێتو قابیلی ئەوە نەبێت چاوی پێدا بخشێنرێتەوە. ئەگینا پیرۆزی لە هیچدا نامێنێ. سوفستائیەكان سێ بەشن (عندی، عەنادی، لاأدری).

نەخێر، بەڵکو خوا خوای هەمووانە، بەرژەوەندی هەموان ڕەچاو دەکات لەو یاساو ڕێنماییانەدا، کە دایان ئەنێت، کاریگەری هیچ کەس‌و میللەت‌و ڕەگەزێکی لەسەر نییە، هیچ بەرژەوەندییەکیشی نییە لەوەدا، چونکە خوا، خوایەو بەندایەتیکردنی بەندەکان لەوە بەرزو بڵندتری ناکەن‌و کافر بوونیشیان لە پلەی خوایەتی ناهێننە خوارەوە، خوای گەورە شتێکی بوێ بەندە ناتوانێ لێی یاخی ببێت‌و لەدەستی ڕا بکات.

چوارەم: هەست ئەکەم فوئاد مەجید میسری! دوو شتی لێ تێکەڵ بووە، ئایین‌و ڕاڤەی ئایین، ئایین ئەو شەریعەتە موعجیزەیە کە تا دوارۆژ زیندوێتی خۆی ڕائەگرێ‌و بەهرە ئەبەخشێ بە مرۆڤەکان، نەوە دوای نەوە، ڕاڤەی ئایینیش: بریتییە لە فقهو تێگەیشتنی مرۆڤەکان بۆ ئایین لە چەرخ و سەردەمی خۆیانداو لە بازنەی "شتە گۆڕاوەکان"داو لە گۆشە نیگای خۆیانەوە ڕاڤەی دەقە ئایینییەکان ئەکەن.. یەکەمیان ڕەخنە هەڵناگرێ بەڵام دووەمیان ڕەخنە هەڵئەگرێ، ڕەدکردنەوەی یەکەمیان سەر لە کوفرو بێ دینییەوە دەر ئەکات، ڕەت کردنەوەو موناقەشەی بڕگەکانی دووەم مافێکی سروشتی نەوەکانی دوایین.

دەی یەکەم تێکەڵ بە دووهەم بکرێت، یان جێ گۆڕکێیان پێ بکرێت، ئەوە، یان نەزانینە یان فێڵکردنەو شتی تری لە دواوەیە. زانایەك یان عاریفێك یان فەیلەسوفێك یان سەرکردەو ئەمیرێك لە شوێنێکدا قسەیەکی کردبێت، ئەو قسەیە پێویستە بخرێتەوە تەرازووی شەرع، ئەگەر لەگەڵ شەرعدا گونجاو بوو ئەوە لەسەر سەروو لەسەر چاو، ئەگەر دژایەتیشی ئەکرد ئەوە ئەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، ئەو کەسە هەر کەس بێت‌و سەر بە هەر ڕەگەزو نەتەوەیەك بێت، ئیمامی مالیکی کوڕی ئەنەس ئەڵێت: "كل أحد يؤخذ من كلامة ويترك الا المعصوم ﷺ". بۆیە پێغەمبەر ﷺئەفەرموێ: "هەموو سەدساڵ جارێك خوای گەورە تازەگەرێك ئەنێرێت بۆ ئەم ئوممەتە، تا کاروباری ئاینییان بۆ تازەو نوێ بکاتەوە"[650].

ئەگەر وانەبێت ئیجتیهادو ڕای جیا جیای خەڵك ئیسلام تیرۆر ئەکات، هەروەك چۆن یەهودیەت‌و مەسیحیەتی تیرۆر کردو پڕی کرد لە "تەحریف"و "ئینحراف"و بیروڕای جیا جیای خەڵك.

ئایا لە ڕاستیدا دین هەروا مەسەلەیەکی لاوەکی و پەراوێزییە لە ژیاندا، یان مەسەلەیەکی جەوهەری‌و بنەڕەتییەو ناکرێ مرۆڤ خۆی لێ گێل بکات؟! ئایا خوا هەیە یان نا؟ ئایا ئەو خوایە کە هەیە لە مرۆڤ گەورەترو زاناترو بەدەسەڵات ترە؟ یان مرۆڤ لەو گەورەترو زاناترو بەدەسەڵات ترە؟ ئایا خوا کامڵە یان نوقسانە؟ ئایا ئەو خوایە ئەتوانێ‌و لە زانست‌و دەسەڵاتیدا هەیە یاسایەك بۆ ئەم مرۆڤە دابنێ، یان ناتوانێ؟ ئەگەر ئەتوانێ ئایا لە ڕاستیدا ئەو یاسایەی داناوە، یان دای نەناوە؟ ئایا کە دایناوە بۆ ئێمە هەیە چزی بکەین‌و پشتگوێی بخەین، یان هەر ئەبێت پێڕەوی لێبکەین؟ باشە ئەگەر ئێمە بە سوك سەیری ئەو فەرمان‌و یاسایانەی خوامان کرد، خوا زویر ئەبێ لێمان یان زویر نابێ؟ ئایا باش ئەکەین دژایەتی دین بکەین یان خراپ ئەکەین؟ باشە کەسێك پێرەوی لەو یاسایانە بکات‌و کەسێکیش پێڕەوییان لێ نەکات‌و دژایەتیان بکات، ئەبێ وەك یەك بن لە لای خوا؟

زیاد لەوەش ئایا ئایین مەنزومەیەکی گەورەی (عەقائدی، عیبادەتی، ڕۆحی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، یاسایی،..) لەخۆی نەگرتووە کە هەموو کەسێك سوودی تەواوی خۆی لێوەردەگرێ ئەگەر بیەوێت، مەگەر ئیسلام لە سەنتەرەکانی تەشریعدا لە هەموو دونیادا ئێستا نەبووەتە سەرچاوەیەك، مەگەر ئیسلام ئێستا لە هەموو دونیادا نەبووەتە مەسەلەیەك و خەڵك لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەکەن‌و ئەیانەوێ لێی تێبگەن‌و ئەو نهێنییە بزانن کە ئەو هەموو تواناو یاساو ڕێنماییانە چییە لە خۆی گرتووە. هۆی چییە ئیسلام توانیویەتی خۆی بگرێ لە بەردەم ئەو هەموو هێرش‌و پەلامارەی بە بەردەوامی کراوەتە سەری.

لە کۆتاییدا ئەپاڕێمەوە لە خوای گەورە کە بڕیاری ژیان‌و مردن هەر لەدەستی ئەودایە، دەستی من‌و خوێنەران‌و فوئاد مەجید میسریش بگرێت‌و هیدایەت لە دڵماندا دروست بکات‌و لە دوو دڵی‌و ڕاڕایی ڕزگارمان بکات‌و خۆشەویستی خۆی‌و

[650] پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێ: "ان الله تعالى يبعث لهذه الامة على رأس كل مئة سنة من يجدد لها امر دينها". صحيح الجامع الصغير "الألباني" رقم الحديث (١٨٧٤)...

ئاینی خۆی و ڕەزامەندی خۆیمان فێربکاتو سەربەرزی ڕۆژێکمان بکات کە ڕۆژی ئاینەو تەنیاو بەتەنیا هەر ئاین ئەخوات لەو ڕۆژەدا، نە ماڵ نە سامان نە پلەو پایە نەقسەی زل هیچی ناخوات.

وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين الرحمن الرحيم مالك يوم الدين

## سەرچاوەکان

سەرچاوەکان بەپێی بەکارهێنانیان لە کتێبەکەدا لە سەرەتاوە تا کۆتایی ریزبەندراون.


. المنجد في اللغة / دار المشرق/ المطبعة الكاثولكية/ بيروت –١٩٧٣ الطبعة ٢١.

. کۆمەڵگا لە سایەی دەوڵەتی خەلافەتدا، عباس عبدالكريم.

. الموسوعة السياسية، د. عبدالوهاب الكيالى و كامل زهيري.

. أسس العقيدة الاسلامية : عبدالرحمن بن حبنكة الميدانى.

. تأريخ الشعوب الاسلامية: كارل بروكلمان، تعريب، نبيه أمين ومنير البعلبكى، دار العلم للملايين، بيروت سنة ٢٠٠٠ الطبعة/ ١٤.

. قضايا الثقافة والفن والادب، كشف سموم كتب التغريب: أنور الجندى.

. أسمى المطالب في سيرة أميرالمؤمنين علي بن ابي طالب: علي محمد الصلابي.

. الأحكام السلطالنية: أبن الفراء الحنبلى.

. الاحكام السلطانية: الشافعى الماوردى.

. كشف الجانى محمد التيجانى في كتبه الاربعة: د. عثمان خميس.

. لأكون مع الصادقين / محمد التيجانى.

. كسر الصنم / أبو الفضل البرقعى.

. التربية الروحية بين السلفيين والصوفيين: محمد الشيخانى.

. البداية والنهاية: أبن كثير.

. ديوانى نالى: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، أنتشاراتی صلاح الدين ئەييوبى، أروميه، ١٣٦٤ى ئێرانی.

. الأعتصام: الأمام الشاطبي.

. تربيتنا الروحية: سعيد حوى.

. المنطلق: محمد أحمد الراشد.

. الرسالة المحمدية: سليمان الندوى.

. قصة الحضارة: ولَ ديورانت، المجلد (١٣).

. جامع العلوم والحكم: أبن رجب الحنبلي، تحقيق: شعيب الارناوؤط، وابراهيم باجس، مؤسسة الرسالة ط٧، ٢٠٠١م، بيروت.

. نهج البلاغة: للأمام على بن أبي طالب تحقيق حسين الأعلمي.

. الرسول: سعيد حوى.

. فقه السيرة: محمد الغزالى.

. مدخل الى الفقه الاسلامى: نظام الدين عبدالحميد.

. تربية الأولاد في الاسلام: عبدالله ناصح علوان.

. الى الشباب أولا: عبدالله ناصح علوان.

. تأصيل مناهج العلوم بالرجوع الى مصادرها الاسلامية، أنور الجندى.

. تأريخ الرسل والخلفاء والملوك: الامام الطبرى. كە بە (تأريخ الطبيري) ناوبراوە.

. بە ئیسلامکردنی کورد، مارستەرنامە یا هەڵەنامە: فازیل قەرەداغی.

. ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين: أبو الحسن الندوى.

. السيرة النبوية: أبو الحسن الندوى.

. مسؤل أمريكى أعتنق الأسلام: يحى العريضى.

. رؤية من الداخل: وليد الانصاري.
. الدعوه الى الاسلام: تۆماس ئارنۆلد.
. الاسلام: سعيد حوى.
. تفسير القرآن العظيم: أبن كثير.
. مباحث في الفقه المقارن: د. هاشم جميل.
. كفاية الاخيار شرح غاية الأختصار: الصديقي الشافعي.
. تحقيق مواقف الصحابة في الفتنة: د. أمحزون.
. منهاج السنة: أبن تيمية.
. محاضرات في تأريخ الأمم والشعوب الاسلامية: محمد خضر بگ.
. العواصم من القواصم: القاضى أبن العربي.
. يەك لە پەنا سیفرو خاڵی بیٚ بڕانەوە: عەلی شەریعەتی، و. هەژار موکریانی.
. بنەماكانی فیكرو سیاسەتی بزوتنەوەی ئیسلامی: لیژنەیەكی پسپۆڕ.
. فتوح البلدان: البلاذري.
. سيرة عمر بن عبدالعزيز: السيوطى.
. رجال الفكرة والدعوة: أبي الحسن الندوى.
. سيرة عمر بن عبدالعزيز: أبو محمد عبدالله بن عبدالحكم.
. المجموع: الأمام النووى.
. نيل الأوطار: الامام الشوكانى.
. ملامح الانقلاب الاسلامي: عماد الدين خليل.
. تأريخ الخلفاء: السيوطى.
. الفقه المنهجى: مصطفى ديب البغا.
. أصول الدعوة: عبدالكريم زيدان.
. مختصر صحيح مسلم: مصطفى ديب البغا.
. مجموع فتاوى ومقالات اخرى/ عبدالعزيز بن باز.
. فريشتەكانی سەر زەوی: طه بابان.
. المستصفى: الامام الغزالي.
. قواعد الأحكام في أصلاح الأنام: عزالدين عبدالعزيز بن عبدالسلام ط١، ٢٠٠٣، دار ابن حزم للطباعة والنشر والتوزيع، بيروت.
. السنة ومكانتها في التشريع الاسلامى: د. مصطفى السباعى.
. ملزمة، مبادىء حقوق الانسان، كلية القانون: دكتۆر سەيران، المرحلة الاولى، ٢٠٠٥.
. المصنوع في معرفة الموضوع، على القارى: تحقيق عبدالفتاح أبوغدة.
. دراسات في الفرق والعقائد الاسلامية: د. عرفان عبدالحميد.
. تأريخنا المفتى عليه" د. يوسف القرضاوى.
. المسند: للامام احمد.
. سيرة المصطفى: هاشم معروف الحسنى.
. التراتيب الادراية في الحكومة النبوية: الكتانى.
. معاوية الرجل الذى أقام دولة: أبراهيم الابيارى.

- خوێنامه: زەردەشتی، چاپی سێهەم.
- السلام العالمی والاسلام: سید قطب.
- حسن البنا وحكمة معاوية: محمد عبدالله السمان.
- نوابغ الفكر الاسلامی: أنور الجندي.
- شرح صحيح مسلم: النووي.
- تجارة الرقيق وأحكامه في الاسلام: عبدالرحمن الكواكبی.
- دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس.
- عمر الخطاب، شخصية وعصره، علی محمد الصلابي.
- فتح الباری بشرح صحيح البخاری: العسقلانی.
- الكافي: الكلينی، چاپی فارسی.
- تأريخ أبن خلدون: أبن خلدون.
- مفردات القرآن: د. الحمصي.
- نقض كتاب الاسلام واصول الحكم: محمد عمارة.
- الشيعة وأهل البيت: أحسان الهی ظهير.
- دستور الوحدة العقائدية: محمد الغزالی.
- في ظلال القرآن: سيد قطب.
- سنن الترمذی: الامام الترمذي.
- الرحيق المختوم: المباركفوري.
- عەقیدەی مەرضیە: مەلاعەبدولکەریمی مودەڕڕیس.
- چێشتی مجێور: مامۆستا هەژار موکریانی.
- طبائع الاستبداد ومصارع الاستعباد: عبدالرحمن الكواكبي.
- النظام السياسي في الاسلام: محمد عبدالقادر أبو فارس.
- جماعة المسلمين وشروط الالتزام بها: صلاح الصاوي.
- الاسس الشرعية والفكرية للعمل الاسلامی: راشد بن علی الاثری.
- معاوية بن أبي سفيان، شخصيته وعصره: علی محمد الصلابي.
- منهج التربية النبوية للطفل: محمد عبدالحافظ.
- مجموع الفتاوی: أبن تيمية.
- المدارس الاسلامية بين الاجحاف والانصاف: اكرام كريم.
- الموسوعة الميسرة في الأديان والمذاهب المعاصرة: الندوة العالمية للشباب الاسلامي.
- قواعد المنهج السلفي: د. مصطفى حلمي، ط٢، ١٩٩٢، دار الدعوة الأسكندرية.
- أظهار الحق: رحمة الله الهندي.
- تفسير القرآن الكريم: الشيخ محمود شلتوت.
- الموافقات: الشاطبي.
- التوحيد و الوساطة في التربية الدعوية: فريد الانصاري.
- سلسلة الأحاديث الصحيحة: الألباني.
- النبأ العظيم: محمد عبدالله دراز.
- أحنجة المكر الثلاثة: الميداني.
- أسباب النزول: السيوطي.

. أصول الأحكام: حمد الكبيسي وصبحي جميل.
. أصول الدين الاسلامي: رشدى عليان وعبدالرحمن الدوري.
. مناهل العرفان في علوم القرآن: الزرقاني.
. تناسق الدرر في تناسب السور: السيوطي.
. التعبير القرآني: فاضل السامرائي.
. الانتصار للصحب والآل من افتراءات السماوي الضال: د. ابراهيم بن عامر الموصلي
. پرسيارەكان هێشتا تينووى وەرامن، ئامادەكردنى: هەڵۆ بەرزنجى.
. هەندێ سەرچاوەى تريش كە لە شوێنەكانى خۆياندا ناويان براوە.

## ناوەرۆك( ژمارەی لا پەڕەكان هی كتێبە چاپكراوەكەیە )